قادر عەبدوڵڵا

# خانووەکەی مزگەوتی

لە هۆڵەندییەوە:

شەفیقی حاجی خدر

رۆمان





قادر عەبدوڵڵا

# خانووەکەی مزگەوتێ

## ڕووخانی شا و هاتنی ئایەتوڵڵا

ڕۆمان

و. لە هۆڵەندییەوە: شەفیقی حاجی خدر

ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: ٣٤٧

AWER
Nawandi Awer

**فانووەکەی مزگەوتێ**

**ابەت:** ڕۆمان

**ووسینی:** قادر عەبدوڵلا

**ەرگێڕانی لە هۆڵەندییەوە:** شەفیقی حاجی خدر

**ایپ:** وەرگێڕ

**یزاینی ناوەوە:** عەلی خەلیل هیدایەت مام شێخ

**ەرگ:** ئاکار جەلیل

**چاپی یەکەم:** 2016

**شوێنی چاپ:** چاپخانەی ڕۆژهەڵات/ هەولێر

**یراژ:** (١٠٠٠) دانە

**رخ:** (١٠٠٠٠) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٤٥٤) ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە.

ناوەندی ئاوێر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان: هەولێر-پشت پاریزگا-بەرانبەر دەرگای قەڵات

ژمارەی مۆبایل: 07504209495 - 07504242101

ئیمەیل Nawendi.awer@yahoo.com
فەیس بووک www.facebook.com/nawendi Awer

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ۝١ ﴾ القلم: ١

## ناوەڕۆک

## قادر عەبدوڵڵا و ئەم ڕۆمانە

ناوی ڕاستەقینەی ڕۆماننوس (*حسێن سجادی قائم مقامی فراهانی*)یە و ناوی خوازراوی نووسینیشی (**قادر عەبدوڵڵا**)یە.
قادر عەبدوڵلا لە 12-12-1954 لە ئەراک، لە ئێران لە دایک بووە. نووسەر لە خانەوادەیەکی دیندار گەورە بووە. باوکی کابرایەکی کەڕ و لاڵ بووە، وەستایەکی مافوورچن بووە. هەر ئەم کەم ئەندامییەی باوکی کاری کردۆتە سەر تافی لاویتی ئەو، بە شێوەیەک سالانێکی ناخۆشی هەبووە. لە ۱۹۷۷یشدا خوێندنی سروشتناسی لە زانکۆی تاران تەواو دەکا.
هەر لەو ڕۆژگارەوە دەچێتە ڕیزی گرووپێکی چەپ بە ناوی (*چریکهای فیدائی خلق*) و دژی ڕژێمی شا دەوەستێتەوە، دوای ڕووخانی ڕژێم و هاتنی شۆڕشی ئیسلامیش هەر دەبێتە چالاکوانێکی بەرهەڵستکار.
نووسەر هەر لەسەردەمی زانستگەوە نووسینی سیاسییانە بە قاچاخ بلاو دەکاتەوە، نووسینەکانی لە باری ژێر زەمینیدا ڕەواج پەیدا دەکەن.
یەکەمین داستانی خۆی بە کورد دەست پێدەکا و بەناوی (**کردها چه میگویند؟**) بڵاو دەکاتەوە. ئیدی لە بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی، پرس و چیرۆکی ناوگۆڕینەکەشی دێتە گۆڕێ.
نووسەر وەک لە زۆر چاوپێکەوتنەکانیدا ڕوونی کردۆتەوە، دوو برادەری هاوبیر(چەپ)ی کوردی دەبێ، یەکیان بە ناوی قادر لە ڕشتەی پزیشکی و ئەوی دیکەش بە ناوی عەبدوڵلا کە ئەندازیاری تەلارسازی لە تاران دەخوێنن. لەبەر بیروباوەڕ و چالاکییەکان، یەکێ لە برادەرەکانی بە دەستی ڕژێمی شا و ئەوی دیەکەش بە دەستی ڕژێمی ئایەتوڵڵا لەسێدارە دەدرێن.
کاتێکیش کتێبەکەی دەنووسێ، هیچ وەشانێک ئامادە نییە بە ناوی ڕاستەقینەی خۆی بڵاو بکاتەوە. بۆیە دەبێ ناوێکی خوازراو دابنێ، ئەویش سڵی لێناکاتەوە، ناوی یەکەمی هەردوو برادەرەکانی دەکاتە ناو و پاشناوی خۆی، ئیدی لەوکاتەوە واتە لە کاتی لەچاپدانی کتێبەکەی لە 1980ەوە ناوی دەبێتە قادر عەبدوڵڵا.

قادر عەبدوڵلا بەناچاری لەبەر کاری سیاسی ولات جێدێلی و له ١٩٨٨ له هۆڵەندا دەگیرسێتەوە. لەوێش ماندوونەناسانه خۆی خەریکی زمانی هۆڵەندی دەکا، تا دەتوانێ نەوەک هەر بڕی پێ بشکێنێ بەڵکو پێشی بنووسێ، له دوایشدا شاکاری نایابی وەک ئەم ڕۆمانەی (خانووەکەی مزگەوتیی)ی پێ بنووسی، کە لە 2007ەوە بە یەکێ لە دەیەمین ڕۆمانە هەرە باشەکانی هۆڵەندا داندراوە.

لە ڕێی ئەم ڕۆمانەوە ناوی قادر عەبدوڵلا دەچێتە پاڵ ناوی ڕۆماننوسێکی مەزنی هۆڵەندی وەک هاری مولیش، نووسری ڕۆمانی (دۆزینەوەی ئاسمان). قادر عەبدوڵلا تا هەنووکە 20 کتێبی بە زمانی هۆڵەندی نووسیون، کتێبەکانیشی چیرۆک، ڕۆمان و لێکۆڵینەوەی سیاسی بوونە. ئەو لەزمان ئەوەندە توانادار دەبێ، قورئانی پیرۆزیش وەردەگێڕیتە سەر زمانی هۆڵەندی. لە ڕێگەی کتێبەکانی تا ئێستا لە هۆڵەندا و ئەوروپادا 11 جار پاداشت کراوە. کتێبەکانی قادر عەبدوڵلا بەتایبەتی ئەم ڕۆمانە بە 27 زمانی زیندووی جیهان وەرگێڕدراون لەوانە (ئینگلیزی، ئەڵمانی، سوئێدی، فەرەنسی، دانیمارکی، چینی، عیبری، عەرەبی، یۆنانی، تورکی....) وا منیش لێرە بە کوردی دەیخەمە بەردەستی خوێنەری کورد، هیوادارم کەلێنی خۆی لەسەر ڕەفەی ڕۆمان لە کتێبخانەی کوردییدا بگرێ.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بە شتێک بکەم؛ ڕۆماننووسەکە لە دوو توێ بەندەکانی ڕۆمانەکەدا کۆمەڵێ ئایەتی قورئان و هەندێ پارچە شیعری هێناونەتەوە. هەرچی دەربارەی ئایەتەکانی قورئانە، نووسەر ئایەتەکانی بە ڕیزبەندیەکەی خۆی نەهێناونەتەوە، هەروەها لە هەندێ شوێن، تەنها نیوە یان کەمتر لەنیوەی ئایەتەکەی هێناوەتەوە. ئیدی بۆ وەرگێرانەکەی ئەو دەقانە، من هەر بە تەنها بە وەرگێران و لێکدانەوەی نووسەر لێنەگەڕام، بەڵکو بۆ وەرگێڕانی سەرجەم ئایەتەکان پەنام بۆ وەرگێڕانی مام هەژار بردووە. لەپاڵ وەرگێڕانەکەدا، دەقی ئایەتەکانیشم وەک خۆیان نووسیوەتەوە و ئاماژەم بە ژمارەی ئایەتەکانیش داوە. لەیەک دوو شوێنیش ڕۆمانووس سەرچێخ دەچێ، شتێکی نووسیوە و بە ئایەتی داناوە، بەڵام لەشوێنی خۆی و لە پەراوێزی لاپەڕەکەیدا ئاماژەم بۆکردووە.

بەر لە کۆتایی ئەم چەند دێڕانەش، دەبێ پێ لەوە بنێم کە کارێکی وا، وەک هەمیشەش لە وەرگێڕانەکانی دیکەدا ڕووبەڕووم بۆتەوە، هەر کارێک نەبووە، تەنیا و تەنیا هونەرەکەی بۆ خۆم گەڕابێتەوە، بەڵکو چەند برادەرێکی خۆشەویست لەپاڵ مندا، گەر لەمن زیاتریش نەبێ، بەقەد من پێیەوەی ماندووبوون، بۆیە پێویستە بە سوپاسەوە ناویان بێنم.

لە سەرەتاوە دەبێ سوپاس و پێزانینم بۆ بۆبرای خۆشەویستم، کاک **جەلال سۆفی** کە لە هۆڵەنداوە، کۆمەڵە کتێبێکی بە دیاری بۆ ناردم، لەوانە ئەم کتێبەی بەردەستە بوو.

وەک هەر وەرگێڕانێکی دیکە، من کێشەم لەگەڵ دەستخەتەکەم هەیە، بۆیە زەحمەتە یەکێکی دیکە بتوانێ بە ئاسانی دەستخەتە ناخۆشەکەم بخوێنێتەوە، کەواتە بە ناچاری هەردەبێ خۆم تایپی بکەم، ئیدی لێرەشدا کۆمەڵێ هەڵەی گەورە و بچووکی تێدەکەوێ، هەرچەند جارێکیش بەسەریدا بچمەوە، هەندێ هەڵە هەن، چاوم لە ئاستیاندا هەر نابینایانە بە سەریاندا گوزەر دەکا. بۆیە ئەرکی ڕاستکردنەوەی هەڵەکان، دواتر شێوەی زمان، ڕێزمان و ڕێنووس لە ڕێی ئەم برادەرانەی خوارەوە وەک ئێستای لێهات.

ئەدیب و چیرۆکنووسی ئازیز کاک **سابیر ڕەشید** هەر لە سەرەتاوە ئەرکی پێداچوونەوە و هەڵەچنی گرتە ئەستۆ. لە بارەی ڕێنووسیشەوە کۆمەڵێ تێبینی گرنگی دان، بە تایبەت سەبارەت بە واوەکان، هەر بۆ خۆشیش پێی دەگوتم تۆ دەردە کەمی واوەکانت هەن! ئیدی لەژێر ڕۆشنایی تێبینیەکانی ئەو، ڕێنووسەکەی ئەم وەرگێڕانەم لەگەڵ ئەوانی دیکە جیاواز بوو.

پاشان بۆ جاری دووهەم وەرگێڕی بە توانا کاک **ڕێباز مستەفا** سەرلەبەری دەستووسەکەی خوێندمەوە، ئەویش بەدر لەوەی ئەو هەڵە و کەموکورتیانەی تێدامابوون، ڕاست کردنەوە، لە دوو شتی دیکەش بە هانامەوە هات، یەکەمیان لە ڕاستکردنەوەی هەندێ ناوی فارسی، دووهەمیشیان لە وەرگێڕانی شیعرێکی فارسی کە لە دووتوێ کتێبەکەدا هاتبوو. نووسەر کۆپلەیەکی هەر بە فارسی و بە پیت و ڕێنووسی هۆڵەندی نووسیبووە، منیش بە دوای تەوای دەقە شیعرەکەدا گەڕام و هەموویم نووسیەوە.

پاشـان بە سوپاسـەوە کـاک حامیـد درووودیش ئەرکـی کێشـا و بەسـەریدا چووەوە و لەگەڵ وەرگێڕاوە سویدیەکەیدا بەراوردی کرد، تێبینییەکانی زۆر ورد و سوودبەخش بوون.

لە کۆتاییشـدا هەردەبـێ سـوپاس و پێـزانینم بـۆ کنێـر جەمیـلی هاوسـەر و کاکەڕای جگەرگۆشەکەم بکەم، چونکە ئەگەر ئەوان لە دەرفەتپێدان کۆمەکیان نەکردبام، بەو ماوەیە بۆم دەرنەدەچوو.

ئیدی بە هەوڵ و هیمەتـی ئەو ئـازایزانە، ئەم وەرگێڕانە بەم شـێوە دەکەوێتە بەردەستتان، هیوادارم لای ئێوەی بەڕێزیش جێی خۆی بگرێ.

ش. ح. خ

هەولێر، ١١-٠٧-٢٠١٦

## مێرووستان

**ئەلیف لام میم**. هەبوو نەبوو خانوویێک هەبوو، خانوویێکی زۆر کۆن بوو، خانووەکە پێیدەگوترا "خانووەکەی مزگەوتێ".
خانووەکە زۆر گەورەبوو، سی و پێنج هۆدەی هەبوون. سەردەمێکی دووروودرێژ بوو، بەرەبابێک لەوێ خزمەتی مزگەوتییان دەکرد.
هەر هەموو ژوورەکانی خانووەکە ئەرک و ناوی شیاوی خۆیان هەبوو، بۆ نموونە هۆدەی گومبەزەکە، ژووری ئاخاوتن، ژووری مافوورەکە، ژووری نەخۆش، ژووری داپیرە، ژووری کتێبان و ژووری قەلەکە.
خانووەکە لە پاشخانی مزگەوتەکە و بەرامبەری دروستکرابوو. لە گۆشەیەکی ناوەوەی پەیژەیەکی بەردین هەبوو، بۆ سەربانە تەختەکەی دەڕۆیشت، لەوێشەوە دەتتوانی بچیە مزگەوتێ.
لەوێدا لە ناوەڕاستی حەوشەی خانووەکەدا حەوزێکی شەش گۆشەیی هەبوو، خەڵک دەیتوانی بۆ نوێژ، دەستونوێژی لێهەڵبگرێ.
هەنووکەش خانووەکە هەنسوانێکە بۆ سێ خێزانی ئامۆزای یەکدی: (ئاغاجان)ی[1] بازرگان کە توجارباشییەکی بازاڕە ئاساییەکەی شارەکەیە؛ (ئەلسابری)[2]، مەلای مزگەوتێ و (ئاغا شوجاع)[3] بانگدەر.



ڕۆژەکە بەیانییەکی هەینی بوو، سەرەتای بەهاریش بوو. ڕۆژ بە خۆشی سەری دەرهێنابوو، باخچەکەش بۆنی خۆڵ، دار و گەڵا تازەکانی لێدەهات. ڕووەکەکان تازە چرۆیان دەردەکرد. مەلەکانیش لەم چڵ بۆ ئەو چڵی باخچەکە دەفڕین و دەیانخوێند. دوو دادەکانیش ئەو ناوەیان لە گەڵا وەریوی دارەکانی زستانە خاوێن دەکردەوە و منداڵەکانیش بە دوای یەکدا غاریان دەدا و خۆیان لە پەنای قەدی دارە گەورەکەدا دەشاردەوە.

---

[1] AgaDjan
[2] Alsabery
[3] Aga Shodja

لەوێدا کۆمەڵە مێروویێک لەبن دیوارە کۆنەکە پەیدابوون و دەروازەکەیان بە درێژایی دار کاژە پیرەکە وەک بەرگێکی رەشی جووڵەدار داپۆشی.
هەزاران مێروولە، کە بۆ یەکەمجار بوو رۆژ ببینن و هەست بە گەرمایی پشتیان بکەن، قەراپستێنەیان[4] دەکرد.
پشیلەکانی خانووەکەش لە نزیک حەوزەکەدا، لە دوراییەکەوە سەیریان دەکرد. دیاربوو لەو ئاپۆرە جوڵەدارەدا حەپەسابوون. منداڵەکانیش لە یاریەکەیان وەستان، هاتن و سەیری ئەو دەروازە سەرسامە بە جووڵەیان دەکرد. مەلەکانیش چیدیکە نەیاندەخوێند، دابەزیبوونە سەر لق و پۆپی دارهەنارەکان و بەدوای مێرووەکان ملیان شۆڕکردبۆوە.
- "دادە، دادە" منداڵەکان هاواریان کرد، "وەرن سەیرکەن."
دادەکانیش، کە لە دیوەکەی دیکەی باخچەکەدا بە کاروباری خاوێنکردنەوە سەرقاڵ بوون، هیچ کاردانەوەیەکیان نەنواند.
- "دەی وەرن سەیرکەن، خۆ لێرە بە ملیۆنان مێروولە پەیدابوونە!" یەکێ لە کیژۆڵەکان وای بانگ لێکردن.
دادەکانیش هاتن.
یەکێکیان گوتی، "هەرگیز شتێکی وام نەبینیوە."
ئەویدیکەش هەڵیدایێ، "هەرگیز نەشمان بیستووە."
لە سەرسامیان دەستیان لەسەر دەمیان دانا. ئاپۆرای مێروولەکانیش، ڕیزێکی دیکەی بەدواداهات و دەروازەکەیان داگرت، بە شێوەیەک ئەستەم بوو لە دەروازەکەوە، لە ڕێی قاپی پێشەوە بێیت و بچی.
منداڵەکان غاریاندایە نووسینگەی ئاغاجان، کە لەدیوەکەی دیکەی ناو خانووەکە بوو.
- "ئاغاجان،! ئاغاجان! یارمەتی! مێرووستان!"
ئاغاجانیش پەردەکەی لادا و سەیرێکی دەرەوەی کرد.
- "چی بووە؟"
- "دەکرێ بێیت؟ ئاخر ئیدی ناتوانین بچینەدەر، مێرووستانە، بە ملیۆنان مێرووبە ماڵ وەربوون!"

---

[4] قەراپستێنە: یەکتر پاڵنان.

- "وا هاتم."
ئەو عەبا شۆڕەکەی بەشاندا دا، کڵاوەکەی خستە سەر و لەگەڵ منداڵەکاندا هات.
ئاغاجان زۆر شتی لەو خانووەدا بەسەرهاتبوو، بەڵام شتێکی وای هەرگیز نەبینیبوو.
- "خۆ، ئەم شتە وا لە مرۆ دەکا، بیر لە سولەیمانی پێغەمبەر بکاتەوە،" ئەو وای بە منداڵەکان گوت، "هەر دەبێ شتێکی تایبەت لەگۆڕێدا بێ، دەنا ئەوان بەو ئاپۆرەیە زۆرەوە دەرنەدەچوون. خۆ ئەگەر باش گوێ هەڵخەین، گوێمان لێدەبێ چۆن لەگەڵ یەکدی دەدوێن. ئێمە لە زمانی ئەوان ناگەین. سولەیمان پێغەمبەر دەیتوانی بەزمانی ئەوان قسە بکا، من ئەوەم پێناکرێ. بە مەزەندەی من ئەوان خەریکی شتێکن، شتێکی شکۆدار، لەوانەشە لەبەر گۆڕینی شارەکەیانەوە بێ، کە بە هۆی هاتنی وەرزی بەهارەوەیە."
- "بیر لەشتێک بکەرەوە!" گوڵبێ، دادە تەمەن بچووکترەکە وای پێگوت. "بیانگەڕێنەوە نێو شارەکەیان، دەنا زۆری پێناچێ دێنە ژوور."
ئاغاجان لە ناو باخەکەدا چەمایەوە، چاویلکەی کردە چاو، لە نزیکەوە لە مێرووستان ڕاما.
ئینجا گوڵبانو، دادە گەورەکە هەڵیدایێ: "دەی ئەو سوورەتەی سولەیمان بخوێنەوە کە لەگەڵ مێرووستان قسەی دەکرد، ئەو مێرووانەی هەموو دۆڵەکەیان داگرتبوو، بۆ ئەوەی سەرباز و لەشکرەکەی نەتوانن بەوێدا تێپەڕن. سورەتی ئەلنەمل (النمل) بخوێنەوە، کە پێغەمبەر لەگەڵ خاتوو سلێمانکە دوا، ئەو دەمەی مەلەکە نامەیەکی ئەڤینی لە شاژنی سەبەئەوە بۆ هێنابوو."
منداڵەکان بە پرسنەیی[5] چاوەڕێی ئاغاجانیان دەکرد، ئاخۆ چیدەکا.
- "دەی، سوڕەتی (ئەلنەمل) بخوێنە بەرلەوەی وە درەنگ بکەوێ، داوا لە مێرووەکان بکە، بچنەوە شارەکەی خۆیان."
منداڵەکان سەیری ئاغاجانیان کرد.

---

- ٥ پرسەنیی: بەتازە، بە فزوڵی.

- "نامەی خۆشەویستییەکە بخوێنەوە، دەنا مێرووەکان دەست بەسەر هەموو خانووەکەدا دەگرن."
ئیدی بێدەنگییک باڵی بەسەردا کێشان.
ئاغاجان بە منگەمنگێکەوە گوتی، 'دەی، برۆ قورئانەکە بێنە!'
شابال[٦]، یەکێ لە کورەکان، خێرا چووە بەردەم حەوزەکە، دەستەکانی شوشتن بە لچکی یەکێ لە جلە وشکەکانی سەر رستەکە، دەستەکانی وشککردنەوە، بەغار چووە نووسینگەی ئاغاجان. قورئانێکی کۆنی هێنا و هاتەوە، ڕادەستی ئاغاجانی کرد.
بۆ گەڕان بەدوای سورەتی (ئەلنەمل)دا، لاپەڕەکانی هەڵدایەوە و گەیشتە سەر لاپەڕەی ٣٧٧. کەمێک بۆ پێشەوە چەمایەوە و کەوتە خوێندنەوەی سورەتەکە

﴿ وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ ۖ وَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰ إِذَا أَتَوْا عَلَىٰ وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾

**{ لەپاش داود، سولەیمان بوو بە جێنشین! بانگەوازیکرد: خەڵکینە! ئێمە فێری زمانی مەلان کراوین؛ هەموو شتێکیان پێداوین؛ دیارە ئەمەش چاکەیەکی ئاشکرایە. سوپای سلێمان تێکەڵاو لە جندۆکە و مرۆ و مەلان- دەنگدرابوون، هەموو بەریز دەڕۆیشتن. هەتا گەینە بوهلی مێروولان. مرۆچکەیەک دەنگی مێروولەکانی دا: بچنەوە ناو کونەکانوو! تا سولەیمان و لەشکری -بەبێ ئەوە پێ بحەسێن- دەبەر پێیانوودا نەبەن.}**
هەمووان تەماشایان کرد و بێدەنگ بوون، هەمووشیان چاوەڕێ بوون، ببینن ئاخۆ مێرووەکان چ کاردانەوەیەکیان دەبێ.
ئاغاجان دەیخوێندەوە و فوویێکیشی لە مێرووەکان کرد. دادەکان دوو پشکۆیان هێنان و دوو بخووریشیان سوتاندن، ئیدی دوو هەوری بۆنداریان لەسەر سەر پەیدا بوو. ئەوانیش لە تەنیشت ئاغاجاندا نوشتانەوە و فوویان لە

[٦] Shabal

دووکەڵەکە بۆ سەر مێرووەکان دەکرد، لەگەڵیشیدا دەیانگوت: 'سولەیمان، سولەیمان، سولەیمان، مێرووستانە، مێرووستان، دۆڵەکە، خاتوو پەپوو سلێمانکە، سولەیمان، سولەیمان، شاژنی سەبەء، سەبەء، سەبەء، سەبەء. سولەیمان، سولەیمان، سولەیمان، خاتوو سلێمانکە، مێرووستان، مێرووستان، مێرووستان، مێرووستان.'

منداڵەکان بە جۆشوخرۆشەوە چاوەڕێ بوون، ئاخۆ مێرووەکان بەتەمای چین.

دادە گوڵبانو گوتی، "دەی منداڵینە، ئێستا لاچن! ئەوان دەگەڕێنەوە! بەتەنها جێیان بێڵن!"

منداڵەکان چوونە نهۆمی سەرەوە لە پشت جامی پەنجەرەکانەوە تەماشای مێرووەکانیان دەکرد، کە بەڕاستی دەگەڕێنەوە.



چەندان ساڵ دواتر، شاباڵ وڵاتی جێهێشتبوو، رووی لە وڵاتی غەریبیان کردبوو، ئەم ڕۆژەی هەر لەبیر بوو، بە یادەوەری بۆ برادەرەکانی دەگێڕایەوە. بۆی گێڕانەوە، کە بەچاوەکانی خۆی بینی، دوای خوێندنەوەی سورەتەکە، مێرووەکان لەنێو کونەکانی دیوارە کۆنەکەدا و ڕۆیشتن و ئەوێیان چۆڵکرد.

## خانووەکەی مزگەوتێ

**ئەلیف لام را.** ساڵان هاتن و تێپەڕین. هەگیز بەو ئاپۆرایە زۆرە مێروولەکان لە شارەکەیان و لە کون و درزەکانی دیوارە کۆنینەکەی خانووەکە نەهاتنەدەر. ڕووداوەکە تەنها لە بیرەوەری ئاکنجییەکانی ئەوێدا مایەوە. لەو ماڵە کۆنباوەدا، ژیان ئاساییانە ڕێگای خۆی دەبڕی، ئێوارانیش هەردوو دادەکان هەروەک ئێوارەکانی دیکە لە ناندینەکەدا سەرقاڵی کارووباری ڕۆژانەیان بوون. پاشان ئەلسابری، مەلای مزگەوتێ دێتەوە ماڵ. ئینجا دەبێ دادەکان، مەلا بۆ نوێژی مەغریب لە مزگەوت ئامادە بکەن.



قەلەباچکە پیرەکە بە نزمی بەسەر خانووەکەدا فڕی. لەدەروازەی خانووەکەشدا گالیسکەیەک وەستا. گوڵبانو دەرگاکەی کردەوە، تا مەلا ئەلسابری بێتەوە ماڵ.

عارەبانچییەکەش سڵاوێکی لە دادەکە کرد و لێیدا ڕۆیشت. ئەو دوایین عارەبانچی شارەکە بوو، چونکە شارەوانی ئەسپهاژۆتنی لە نێو شاردا قەدەغەکردبوو. لەبری ئەوەدا عارەبانچییەکان هەر کاتێک مۆڵەتنامەیان وەرگرتبایە، تاکسییەکیان بە نرخێکی هەرزان دەدانێ. لێ گەلێ، پیرە عارەبانچییەک مابوو، هەر دەیکرد و دەیکۆشا لە تاقیکردنەوەی مۆڵەتنامەی ترۆمبێل لێخوڕین دەرنەدەچوو. ئیدی لە ڕێی ناوبژێکردنی مزگەوتەوە، ڕێگەی پێدرا هەروەک جاران بە گالیسکەکەی خۆی بۆ مزگەوت کاربکا. ئاخر مەلا ئەلسابریش پێیوابوو تاکسی گڵاوە. ئەو خۆی وا نەدەبینی، وەک هەر هاوڵاتییێکی ئاسایی بە تاکسی بێت و بڕوا.



ئەلسابری مێزەرێکی ڕەشی لەسەر دەنا، ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو، کە سەیدە و لە بنەچەی موحەمەد پێغەمبەرە، جبەیەکی شۆڕەشی لەوانەی پیاوانی ئاینی هەیان بوو بەسەر شانەکانی دادەدا. ئەو تازە لە مارەبڕینێکی ماڵباتێکی خزم گەڕابۆوە. منداڵەکانیش دەیانزانی، نابێ زۆر لە مەلا نزیک بکەونەوە. کەس نابێ لە کاتی نوێژدا خۆ لە مەلا بدا.

- "سەلام" منداڵەکان هاواریان کرد. مەلاش بە خەندەوە وەڵامی دانەوە، "سەلام!"

مەلا لەگەڵ هاتنەوەی لە بۆنەی مارەبڕینەکەدا، سەبەتەیەک شیرینی لەگەڵ خۆی بۆ منداڵان هێنابۆوە، جاری جاران بووایە سەبەتەکەی دەدایە دەستی یەکی لە کیژۆڵەکان. ئینجا منداڵەکان لادەکەوتن و مەلاش دەچووەوە ژووری کتێبان. لێ هەنووکە منداڵەکان گەورە بوونە، نەدەچوونە لای مەلا. مەلاش سەبەتە شیرینیەکەی ڕادەستی دادەکان دەکرد، ئەوانیش بەسەر منداڵەکانیان دابەشدەکرد.



کاتیکیش مەلا دەگەڕایەوە ماڵەوە، دادەکان دەستەکانی خۆیان لە حەوزەکە دەشوشت. بە خاولییکیش وشکیان دەکردەوە، ئەوسا دەچوونە ژووری کتێبان تا مەلا ببەنە گەرماوەکە.
هەموو شتێک بەبێدەنگی بەڕێوە دەچوو. یەکێ لە دادەکان بە ئەسپایی مێزەرەکەی لەسەر دەکرد و لەو لاوە لەسەر مێزێک دایدەنا. دادەکەی دیکەش جبەکەی لەبەردەکرد و هەڵیدەواسی. مەلا بە خۆی هیچی نەدەکرد. تەنانەت دەستیشی نەدەگەیاندە جلەکانی خۆی. دادەکان زۆر جاران لەسەر ئەوە سکالایان لای ئاغاجان دەکرد: "خۆ ناکرێ ئەو ڕەفتارە هەر بەردەوام بێ. ئەوەی ئەو دەیەوێ و ئێمە دەیکەین نە شتێکی سروشتیە و نە دروستیشە. لەو خانووەدا هەرگیز مەلایەکی وەک ئەومان نەبینیوە. خۆ ئەوە زۆر باشە، کە دەیەوێ پاکوخاوێن ڕابگیرێ، بەڵام ئەوەی ئەو شتێکی سەرپەڕە. تەنانەت بە خۆی دەست بۆ جلەکانیشی نابا. خۆ ئەو هەر بەو کەوچکەش نان دەخوا، کە لەنێو گیرفانیدا هەڵیگرتووە. ناشکرێ تا قیامەت لەسەر ئەو ڕەفتارەی بەردەوام بێ."
دادەکان هەر هەموو شتێک، کە لەخانووەکەدا رویدەدا، بە ئاغاجانیان رادەگەیاند. تەنانەت نهێنییەکانیشیان پێدەگوت، ئەوانەی کەس پەی پێنەدەبرد.



لەراستیشدا دادەکان[٧] داپیرەی ڕاستەقینە نەبوون. ئەوان دوو کیژی خزمەتکاری ئەو خانووە بوون، ئیدی شەست ساڵە لەوێ دەژین. ئەوان هێشتا گەنج بوون، کە باوکی ئاغاجان هێنابوونیە خانووەکە و هەر لەوێش مانەوە. کەسیش نەیدەزانی لە کوێوە هاتوون، ئەوانیش هەرگیز دەربارەی رابردوەکەی خۆیان نەدەدوان. لە ڕابردووشدا هەرگیز جێی بڕوا نەبوون، چونکە هەمووان دەیانزانی لەگەڵ مامی ئاغاجاندا کەینوبەینێکیان هەبوو، دەستیان لەگەڵیدا تێکەڵاو بوو. هەرکاتێک پیاوەکە بە سەردان هاتبا، ئەو جووتە کچە دەبوونە هی ئەو.

[٧] ڕۆمااننوس لە دەقەکەدا وشەی Grootmoeder (داپیرە)ی بەکارهێناوە، بەڵام لێرەدا هەر خۆیشی دەڵێ ئەوان داپیرەی ڕاستەقینە نەبوون. منیش لە وەرگێرانەکە وشەی دادەم بۆ بەکارهێنا، کە دەکرێ ئەو واتایە بدا. ئاخر ئەو دوو ژنە نە مێردیان کردبوو نە منداڵیشیان هەبوون.

دادەکان هەروەک چۆن قەلە پیرەکە، دارکاژەکە و ژێرزەمینەکە هی خانووەکە بوون، ئەوانیش هەروا. هەر لە ڕێی ئەوانیشەوە مەلا گەورە و بەخێوکراوە، هەروەها ئاغاجانیش. ئاخر ئەوان جێبەڕوای ئاغاجان بوون، پارێزەری دابونەریتی ماڵەکەش بوون.



ئاغاجان بازرگانی فەرش و مافووری دەکرد و لە شاری زەنجاندا[٨] کارخانەیەکی هەبوو، کۆنترین شوێنی بازاڕ بوو، تیایدا زیاتر لە سەد پیاو کاریان دەکرد. دەستەیەکی حەفت کەسی لە نیگارکێشان هەبوو، نەخش و نیگاری سەر مافوورەکانیان بۆ دادەڕشت.

بازاڕەکە بە خۆی شارێک بوو لەناو شاردا؛ دەکرا لە زۆر لاوە بۆ بازاڕەکە بڕۆیت. شەقامە تێکچڕاژاوەکانی، سەربانێکی گومبەزاویان هەبوو. بەسەدان دوکانۆکە بەرامبەر یەک ببوونەوە.

بازاڕەکان لە مێژ سەدەیە گرنگرتین خاڵی بەیەکگەیشتنی دارایی وڵاتەکەیان پێکهێناوە. لەو دوکانانەدا هەزاران بازرگان هەبوون، قوماش، زێڕ، دانەوێڵە، مافوور و ئاسنی جۆشدراویان دەفرۆشت.

بازرگانانی مافووریش ڕۆڵێکی چارەنووسسازانەیان لە مێژوودا بینیوە. لە سۆنگەی ئەو پێگە بێوێنەیەدا، ئاغاجان ڕۆڵێکی ڕابەرانەی لە مزگەوت هەروەک چۆن لە بازاڕدا هەبوو، دەبینی.



مافوورەکانی کارخانەی ئاغاجان بە نەخش و نیگاری ڕەنگین و بۆنی سەرسامانە ڕازابوونەوە. ئەو مافوورانەی نیشانەی کارخانەی ئەویان لەسەر بووبایە، زێڕئاسا بەنرخ بوون؛ خۆ ئەو جۆرە مافوورانە بۆ هەموو کەسێک نەبوون. بازرگانی تایبەت پێشتر ئەو جۆرە مافوورانەیان بۆ مەعمیلەکانی خۆیان لە ئەوروپا و ئەمریکا بەڕادان دەدان.

جۆری ئەو ڕایەخ و مافوورانە بێوێنە بوون. کەس نەیدەزانی ئاخۆ ئەو نەخش و نیگارە بێهاوتایانە لە کوێ دێن و کێش ئەو ڕەنگە نەخشینانەیان بۆ دادەهێنێ. ئەوەش هێزی کارخانەکە و نهێنی دەستکاری خانووەکە بوو.

---

[٨] Senedjan

لەوێدا هێشتا ڕۆژگاری ئەوە نەهاتبوو، هەر ماڵێک گەرماوی تایبەتی خۆی هەبێ. لە شارەکەدا چەند گەرماوێکی گەورە هەبوون. داب و نەریتیش واهاتبوو، پیاوەکانی خانووەکە دەچوونە کۆنترین گەرماوی شارەکە و شوێنێکی تایبەتیش لەوێ بۆ مەلای مزگەوتێ تەرخان کرابوو. کەچی دڵی مەلا ئەمەی نەدەخواست. ئەو نەیدەویست پێ بخاتە نێو گەرماوێک، کە بەدەیان پیاو تیایدا خەریکی خۆشوشتنن. ئەو هەر بەبیرکردنەوە لەوەی خۆی لەنێو ئەو پیاوانەدا بە ڕووتی ببینێتەوە، بێزی دەبووەوە و نەخۆش دەکەوت.

هەربۆیەشە ئاغاجان داوای لەوەستایەک کردبوو، لە نێو خانەوەکەدا جێگایەک وەک گەرماو بۆ مەلا دروست بکا. وەستاکانیش تەنها ئەزموونیان لەگەڵ گەرماوە گشتییەکاندا هەبوو. هەر بۆیەشە وەستاکە کونێکی لە هۆدەکەی پشت کتێبخانەکە کردەوە و گەرماوێکی سەرنجڕاکێشی بۆ مەلا دروستکرد.



ئەوێ ڕۆژێ وەک هەمیشە، مەلا بەتەنها بە دەرپێیەکی سپی لەسەر بەردە حەمام دانیشتبوو، یەکێ لە دادەکان سەتڵە ئاوێکی شیرتێنی بەسەر سەردا کرد.

- "ساردە" ئەو هاواری کرد، "ئاوەکە ساردە."

دادەکان کاردانەوەیان نەبوو. گوڵبێ پشتی مەلای بە سابوون دەشوشت و گوڵبانووش ئاوێکی هەندێ گەرمی بەسەر شانەکانیدا دەکرد، بەجۆرێک هیچ دڵۆپە ئاوێک بەملاو بەولادا نەڕژێ.

دوای ئەوەی هەموو جەستەیان بەسابوون کرد، یارمەتی مەلایان دا تا لەناو سەرشۆکەکەی[9] گەرماوەکە نقووم ببێ. گەرماوەکەش قووڵ نەبوو. ئەو بۆ ماوەیەک لە بن ئاوەکەدا مایەوە. کاتێکیش سەرئاو کەوتەوە، ڕووخساری خۆڵەمێشی ببوو. لە کۆتاییدا دادەکان یارمەتیان دا. دەمودەست خاولیێکی گەورەیان بەسەر شان دادا و یەکێکیشیان لەناوقەدی بەست، بردیانە بەردەم

---

[9] سەرشۆک: شوێنی خۆتێدا شوشتن.

زۆپاکە. بە نابەدڵێش خێرا دەرپێیەکەی داکەند و یەکێکی نوێی لەبەرکردەوە. ئەوان سەریان وشککردەوە، کراسەکەیان بۆ هێنا و دەستەکانیان تێهەڵکێشان. ئینجا مەلایان هێنایەوە ژووری کتێبەکان.

ئەوان لەسەر کورسیەکەیان دانایەوە و لەبەر ڕووناکاییەکەش سەیری نینۆکیان کرد. یەکێ لە دادەکان گۆشەیەکی نینۆکی پەنجەی شادەنوێژەکەی کرد.

پاشان هەموو جلەکانیان لەبەرکردنەوە، مێزەرەکەشیان لەسەر نایەوە، چاویلەکەیان لەسەر ستوندەکەی کەپووی بۆ دانا و پێڵاوەکەشیان بەپارچە پەڕۆیەک بۆ سڕینەوە.

هەنووکە مەلا ئامادەبوو، بچێتە مزگەوت. گوڵبانو ڕۆیشتە لای دارکاژەکە، کە کاتژمێرە کۆنەکەی پێهەڵواسرابوو، دەنگی لە سعاتەکە هێنا.

کاتژمێرەکە بۆ مجێوری مزگەوتەکە لەوێ داندرابوو؛ هەر کاتێک گوێی لێبووبا، لەسەر بانەکە بەدەردەکەوت، لەوێشدا بە پەیژەکە دادەبەزی بە بەردەم ژووری میوانان بۆ ژووری کتێبەکان دەڕۆیشت.

ئەو هەرگیز دادەکانی نەدەبینی. هەرکاتێک ئەو هاتبایە کتێبخانەکە، ئەوان دەچوونە پشت ستوونی ڕەفەی کتێبەکان، هەڵبەتە مجێورەکە سڵاوی لێدەکردن. ئەوانیش لەپشت لا کەنتۆری کتێبەکان وەڵامی سڵاوەکەیان دەدایەوە. مجێورەکە دەستی دەدایە ئەو کتێبانەی مەلا لەسەر مێزەکەی دانابوون و یاوەری مەلای بۆ نێو مزگەوتەکە دەکرد.

هەمیشە مجێورەکە لە پێشەوە دەڕۆیشت، نەبادا لەڕێگاکەدا لەپڕ سەگێک بەوێدا بڕوا. ئەو جێباوەڕی مەلا بوو، لە دوای دادەکان تاکە کەسێک بوو دەستی بە دەستی مەلا بکەوێ، مەلا هەر شتێکی پێی هەڵنەگیرابا، ڕادەستی مجێورەکەی دەکرد. مجێورەکەش بەقەد مەلا پاکوخاوێن بوو. ئەویش هەرگیز نەدەچووە گەرماوە گشتییەکەی ناوشار. ئەو لە ماڵ لەناو تەشتێکی گەورەدا، لە لایەن ژنەکەیەوە دەشۆرا.



لەوێش، لە مزگەوتەکدا چەند کەسێک چاوەڕێی مەلا بوون، تا بیگەیەننە شوێنی نوێژکردن. ئەوان ئەو کەسانە بوون، هەمیشە لە ڕیزی یەکەمی

نوێژکەرانی پشت مەلاوە، نوێژیان دادەبەست. هەرکاتێک بینیان، مەلا هات، هاواریان دەکرد: "درود بۆ پێغەمبەر موحەممەدا!" سەدان بڕوادار، کە بۆ نوێژ هاتبوونە مزگەوت، ڕێگای مێحرابیان بۆ مەلا چۆڵکرد.
ئەو بۆ میحراب ڕۆیشت و مجێورەکەش کتێبەکانی لەسەر مێزێکی تەنیشتی دانان.
ئیدی چاوەڕێی بانگدەر دەکەن، ئەو پیاوەی چووە سەر مێزێکی داری مزگەوتەکە و بانگی دا: "ألله اکبر! حی علی الصلاة! خودا گەورەیە! پەلە بکەن بۆ نوێژ."
هەر کاتێک ئەو لێ بەسەر مێزە دارینەکەی بانگدان دەکەوت، هەموویان دەیانزانی کاتی نوێژکردن هاتووە.



بانگدەرەکە ئاغا شوجاعی نابینا بوو، ئامۆزای ئاغاجان بوو. دەنگێکی خۆشی هەبوو. سێ جاران لە ڕۆژدا بەسەر یەکێ لە منارەکانی مزگەوت دەکەوت و بانگیدەدا: "حی علی الصلاة."
جارێکیان بەیانی سەرلەزوو، بەرلەوەی ڕۆژ هەڵبێ بانگی دەدا، جارێکیش سعات دوازدەی نیوەڕۆ و جارێکیش ئێواران کە ڕۆژ ئاوادەبوو. هیچ کەسێ پیاوەکەیان بە ناوی تایبەتی خۆی بانگ نەدەکرد، ئەو نازناوێکی شەرەفمەندانەی"بانگدەرەکە"ی بۆخۆی پەیداکردبوو. لەماڵیش هەر پێیان دەگوت بانگدەر.
- "ألله اکبر!" ئەو وا هاواری دەکرد.
ئیدی هەمووان ریز دەبوون و ڕوویان لە مەککە دەکرد.
ئاساییانە نەدەکرا نابینایەک بانگدەربێ، چونکە خۆدەبووا بیدیتبا، کەی مەلا دەچەمێتەوە، کەی مەلا کڕنوش دەبا و هەنیەی دەخاتە سەر زەوی، کەیش هەڵدەستێتەوە. لێ گەلۆ ئەم شتە بۆ ئاغا شوجاع گرنگ نەبوو، مەلا بە دەنگێکی بەرزتر دەیخوێند، تا بانگدەرەکە گوێی لێبێ، ئاخۆ کەی سەری دەخاتە سەر زەوی و کەیش هەڵدەستێتەوە.



بانگدەرەکە کوڕێکی چواردە سالانی هەبوو، ناوی شابال بوو. کیژێکیشی بەناوی شاهین هەبوو، مێردی کردبوو. ژنەکەشی بە نەخۆشییێکی کوشندە کۆچی دوایی کردبوو، بەلام بانگدەرەکە حەزی لێنەبوو ژن بێنێتەوە. بەڵێ جارووبار پەیوەندی لەگەڵ یەک دوو ژنی چیانشین هەبوو. ئەوکات و هەنووکەش باشترین قاتی لەبەردەکرد، کلاوەکەی لەسەردەنا، دەستی دەدایە داردەستەکەی و بۆ ماوەیەکی کورت وندەبوو. لە ماوەی دیارنەمانیدا، شابالی کوڕی دەبووە بانگدەری مزگەوتەکە، ئیدی ئەویش بۆ بانگدان لێ بەسەر منارەکە دەکەوت.



دوای تەوابوونی نوێژ، کۆمەڵە پیاوێکی بازاڕ مەلا ئەلسابرییان دەهێنایەوە ماڵ.

ئاغاجان هەمیشە درەنگتر لە مزگەوتەکە دەگەڕایەوە ماڵ، ئاخر قسەی لەگەڵ خەڵکی دەکرد. بەزۆری وابوو، ئەو دوا کەس بوو لە مزگەوتەکە دەردەچوو.

ئەم ئێوارەیان، ئەو هێشتا هەر لەگەڵ مجێورەکە سەبارەت بەچاکردنەوەی گومبەزەکە قسەی دەکرد. کاتێکیش بەرەو ماڵ بووەوە، گوێی لە شابالی ئامۆزا بوو بانگی دەکا.

- "ئاغاجان، دەکرێ کەمێک قسەبکەین؟"
- "هەڵبەتە، گەنجۆ!"
- "ئایا کاتێ ئەوەت هەیە لەگەڵمدا پیاسەیەکی لای ڕووبارەکە بکەین؟"
- "لای ڕووبارەکە؟ ئاخر لە ماڵ چاوەڕێمان دەکەن. خۆ دەڕۆین نان دەخۆین."
- "بەڵێ ئەوە دەزانم، بەلام شتێکی گرنگ هەیە."

ئیدی پێکەوە بەرەو ڕووباری سەفیجانی[10] ڕۆیشتن، کە هەندێک لە دوورەوە بە هێواشی ڕێی خۆی دەبڕی.

- "من نازانم چۆن دەست پێبکەم؛ دەکرێ ئێوە دەموودەست وەلام نەدەنەوە."
- "دەی گەنجۆ، بیڵێ!"
- "شتەکە دەربارەی مانگە."

---

[10] Sefiedgani

- "مانگ؟"
- "نەخێر، نەک مانگ، بەڵکو تەلەفزیۆن، مەلایەکە."
- "تەلەفزیۆن؟ مانگ؟ مەلایەکە؟ تۆ دەتەوێ چی بڵێی؟"
- "ئێمە، من مەبەستمە، مەلا دەبێ دەربارەی هەموو شتێک بزانی. ئەو دەبێ ئاگای لەو شتانە هەبێ، کە لە دەورووبەردا ڕوو دەدەن. ئەلسابری تەنها کتێبەکانی کتێبخانەکەی خۆی دەخوێنێتەوە، ئەوانیش کتێبی کۆن و پەڕزەردن، هی سەدەکانی لەمەوبەرن. ئەو هیچ ڕۆژنامە ناخوێنێتەوە. ئەو هیچی نوێ نازانێ... بۆ نموونە دەربارەی مانگ هیچ نازانێ."
- "دەی ڕونیکەرەوە، ئەلسابری دەبێ چی پێویست دەربارەی مانگ بزانێ؟"
- "ئەمڕۆ لە هەموو شوێنێک دەربارەی مانگ قسەدەکرێ. لە قوتابخانە، لە بازاڕ، لەسەر شەقام، بەڵام لە ماڵەکەی ئێمەدا ئەو باسوخواسانە هەر لەگۆڕێدا نین. ئایا دەزانی بەم زوانە چی ڕوودەدا؟"
- "دەی، چی ڕوودەدا؟"

"ئەمشەو خەڵک لەسەر مانگ دادەبەزن و تۆش هیچی دەربارە نازانی. لەوانەیە شتەکە نە بۆ تۆ و نە بۆ مەلا ئەلسابریش گرنگ نەبێ. ئەمریکییەکان دەیانەوێ ئاڵاکەی خۆیان لەسەر مانگ هەڵبدەن و مەلای شاریش ئاگای لە مەحمودی بێ زەواڵ نییە. تۆ لە وتارەکانی ئەو، هیچ گوێت لەو شتانە نابێ. ئەو دەبووایە ئەم مەغریبە شتێکی دەربارە گوتبا، بەڵام زانیاری نییە. ئەوەش بۆ مزگەوتەکەمان کارێکی باش نییە. لە مزگەوتدا دەبێ باسی ئەو شتانە بکرێن، کە لە ژیانی مرۆڤدا ڕوودەدەن." ئاغاجان بۆ ماوەیەک لەسەری وەستا.

- "کێشەکە لەوەدایە من ئەمەم لەگەڵ ئەلسابریدا باسکرد" شاباڵ لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛ "بەڵام ئەو هەر نەیدەویست گوێشی لێبێ. ئەو بڕوای بەو شتانە نییە."
- "باشە بەڕای تۆ، ئێمە چیبکەین باشە؟"
- "ئەمشەو دابەزینە سەرمانگ لە تەلەفزیۆن دەبیندرێ. من دەمەوێ تۆ و مەلا ببنە شاهیدی ڕووداوە مێژووییەکە."
- "لە کوێ؟"

- "لە تەلەفزیۆن."
- "ئێمە دەبێ سەیری تەلەفزیۆن بکەین؟" ئاغاجان بەحەپەساوییەوە وەڵامی دایەوە. "مەلای مزگەوتێ دەبێ تەماشای تەلەفزیۆن بکا؟ گەنجۆ، ئایا لەوە تێدەگەی کە دەیڵێی؟ خۆ هەر لەگەڵ پەیدابوونی تەلەفزیۆنەوە، ئێمە لەسەر مینبەر خەڵکمان لێ وشیارکردۆتەوە. بۆ ئەوەی گوێ لە (شا)ی گەندەڵ نەگرن، گوێ لە ئەمریکاییەکانیش نەگرن. هەنووکەش تۆ پێشنیازی ئەوە دەکەی، لە تەلەفزیۆنەوە سەیری ئاڵای ئەمریکا بکەین. تۆ خۆت دەزانی، ئێمە دژی شا و دژی ئەمریکییەکانیشین، کە (شا)یان هێنایەوە لەسەر تەخت دایاننایەوە. پێویست ناکا بیچمی شا و ئاڵای ئەمریکا لە ماڵەکەی خۆماندا ببینین. باشە بۆچی دەتەوێ لە بەردەم تەلەفزیۆندا دابنیشین؟ تەلەفزیۆن داردەستی بەهێزی ئەمریکییەکانە، ئەوان بەو ئامێرە بەرەنگاری کلتوور و دیینەکەی ئێمە دەبنەوە! من زۆر شتی سەیرم دەربارەی تەلەفزیۆنەوە بیستووە، بەرنامەی پیس پیس کە گیانی مرۆ نەخۆش دەخەن."
- "ئەوەی تۆ دەیڵێی وانییە. نەخێر هەمووی وانییە. خۆ لە تەلەفزیۆندا زۆر شتی باش و سەرنجڕاکێش هەروەک ئەوەی ئەمشەو نیشان دەدرێن. تۆ دەبێ سەیری بکەی! مەلاش هەقە تەماشای بکا! خۆ ئەگەر ئێمە دژی شا و ئەمریکا بین، ئەوسا پێویستە سەیری تەلەفزیۆنەکەیان بکەین. ئەمشەو ئەمریکاییەکان دەچنە سەر مانگ. تۆ گرنگترین پیاوی ئەم شارەی، پێویستە شتەکە ببینی. من ئالیێرێک لەسەر بانەکە دادەنێم."
- "دەتەوێ ئالیێرێک لەسەر بانی خانووەکەمان دابنێی؟ ئاخر بەیانی هەموو شارەکە پێمان پێدەکەنێ. هەموو دەڵێن: ئالیێرەکە لەسەر بانی خانووەکەیان بینراوە."
- "بە شێوەیەکی وا دایدەنێم، کەس هەستیشی پێنەکا."



پرسیارەکەی شاباڵ بۆ ئاغاجان کتوپڕانە بوو. گەنجەکە دەیزانی چۆن شتەکە بێنێتە خانووەکە، بەڵام ئەو وێرای چۆن بەدوای بیروڕاکەیدا بگەڕێ. ئەو خاسیەتەی شاباڵیش هەر زوو بۆ ئاغاجان دەرکەوتبوو. بۆیە بە ئامۆزاکەی زۆر سەرسام بوو.

ئاغاجان دوو کچ و کوڕێکی هەبوو. کوڕەکەی پێنج ساڵ لە شاباڵ بچوکتر بوو، بەڵام ئەو شاباڵی وەک پیاوێک دەبینی، دواتر لە بازاڕدا جێگای بگرێتەوە.

ئەو دەیەوسیت گەنجەکە خۆی لە کاروبارە گرنگەکانی ماڵ هەڵبقورتێنی. ئەو شاباڵی بە شێوەیەک وەک ڕۆڵەی خۆی خۆشدەویست و واشی پەروەدەکردبوو، دواتر جێگەی بگرێتەوە.

شاباڵ دوای گەڕانەوەی لە قوتابخانە، ڕاستەوخۆ دەچووە شوێنی کاری ئاغاجان. ئاغاجانیش هەموو پێشهاتێکی بازاڕای پێدەگوت.

ئەو باسی ئەو بڕیارانەی بۆدەکرد کە دابوونی و ئەوانەش بە تەمایە بیاندا و لەهەندێ شت پرسیشی.



هەنووکەش شاباڵ باسی تەلەفزیۆن و مانگی بۆکرد. ئەو گومانی بۆئەوە چوو، بیرۆکەکەی لە (نوسرەت)ەوە وەرگرتبێ. نوسرەتیش برا بچکۆلەی ئاغاجان بوو، لە تاران دەژیا.



کاتێک ئاغاجان و شاباڵ گەیشتنەوە ماڵ، ئاغاجان بە دادەکانی گوت: "من لەگەڵ مەلا لە کتێبخانەکەدا نان دەخۆم، دەمەوێ هەندێ قسەی لەگەڵدا بکەم. با کەسیش بێزارمان نەکا."

ئەو بەرەو ژووری کتێبان ڕۆیشت، لەوێدا مەلا لەسەر ناوکەوی[11] زەویەکە دانیشتبوو، کتێبێکی دەخوێندەوە. ئاغاجان چوو لە تەنیشتی دانیشت، لێیپرسی ئاخۆ چی دەخوێنێتەوە.

- "کتێبێک لەسەر خەدیجە، هاوسەرەکەی محەمەد، ژنەکە لەو سەردەمدا سێ هەزار وشتری هەبوو، یان با وابڵێین سێ هەزار ترومبێلی باربەر، گەر بەپێودانگی ژیانی هاوچەرخمان بدوێین. ئەوەش دەوڵەمەندییەکی نەناسراو بوو. هەنووکە من تێگەیشتم. محەمەد گەنج و هەژار بوو. خەدیجەش پیر و دەوڵەمەند. محەمەد پێویستی بە وشترەکانی ئەو هەبوو، ئەو باربەرانە بۆئەوەی دەست بە ئەرکەکەی بکا." مەلا ئەم قسانەی بە خەندەیەکەوە گوت.

---

[11] ناوکەو: نەرزیەی خانوو.

ئاغاجانیش گوتی: "ئایا ناکرێ روونی بکەیتەوە؟"

- "بۆچی نا؟ هەموو ژنێک خوازیار بوون هاوسەرێکی وەک محەمەدیان هەبێ، کەواتە، بۆ ئەو خەدیجەیەکی بێوەژنی هەڵبژارد؟ خەدیجە نزیکەی بیست ساڵ لەو بەتەمەنتر بوو."

دادەکان بە دوو مەجمەی خڕی گەورەوە هاتنە ژوور. مەجمەکانیان لە بەردەم ئەوان دانان و بە خۆشیان دەرچوون.

- "شاباڵ باسی مانگ دەکا." ئاغاجان لە کاتی نانخواردندا وای بە مەلا گوت، "ئەو پێیوایە، پێویستە ئێوە سەیری بکەن."

- "سەیری مانگ بکەین؟" مەلاش وایگوتەوە.

- "ئەو دەڵێ، دەبێ مەلای شارەکە زانیاری دەربارەی بەرەوپێشوەچوونەکانی وڵات و دنیا هەبێ. ئەو گلەیی ئەوەی هەیە، کە تۆ هیچ رۆژنامەیەک ناخوێنیتەوە، تەنها کتێبە کۆنەکانی کتێبخانەکە نەبێ."

مەلا چاویلکەکانی دانان، بە خۆی و دامەنە شۆڕە سپیەکەی کراسەکەی بێباکانە گوتی: "شاباڵ ئەم شتانەشی بەمن گوتوون."

- "گوێبگرە، رەخنەکانی هەر بەتەنها تۆ ناگرنەوە، بەڵکو منیش دەگرێتەوە، ئێمە لە رابردوودا تەنها بە دینەوە خەریک بووین. خۆ مزگەوت هەقە باسی شتی دیکەش بکا. بۆنموونە ئەو پیاوانەی ئەمشەو دەچنە سەر مانگ."

مەلاش گوتی: "من بڕوا بەمە ناکەم."

"ئەو پێیوایە، دەبێ تۆش بیبینی. ئەو دەیەوێ تەلەفزیۆنێک بێنێتە کتێبخانەکە."

"ئەرێ ئاغاجان، چیە ئەوە شێت بووی؟"

- "ئەو کوڕێکی زیرەکە و منیش متمانەم پێی هەیە. تۆش دەزانی، ئەو کوڕە گەنجێکی باشە. ئەو شتەش هەر لە نێوانی خۆماندا دەمێنێتەوە، شتەکەش زۆر ناخایەنێ. دوای دیتنەکە، دەستبەجێ ئامێرەکە لێرە هەڵدەگرێ."

- "ئاخر ئەگەر ئایەتوڵڵاکانی قوم پێیان زانی، کە ئێمە تەلەفزیۆنێکمان هێناوەتە ماڵ، ئیدی ئەوان..."

- "کەس بەو شتە نازانێ. ئەوە ماڵی ئێمەیە، شارەکەش هەر هی خۆمانە، ئێمە شتەکان دیاردەکەین، کە چۆن بن و چۆن نەبن. گەنجەکە لەسەر هەقە. ئەو دەڵێ نزیکەی هەموو ئەوانەی دێنە مزگەوتێ، ئامێرێکی تەلەفزیۆنیان لە

ماڵدا هەیە. ئەوەش راستە، کە تەلەفزیۆن لە ماڵەکەی ئێمەدا ڕێگەپێدراو نییە، بەلام خۆنابێ لە نێو چوار دیوارەکانی ئەم ژوورانەدا خۆمان زیندانی بکەین و چاوەکانیشمان لە ئاست ئەوەی لە جیهانی دەرەوەدا دەقەومێ، بنووقێنین."



لە پشت پەردەکانی ناندینەکەوە، دادەکان بینیان شاباڵ لەتاریکیدا سندووقێکی بردە ژووری کتێبان.

لە کتێبخانەکەدا، شاباڵ سلاوی لە مەلا و ئاغاجان کرد. بێئەوەی زیاتر سەیریان بکا، ئامێرە بچکۆلانەکەی دەرهێنا و لە نزیک دیوار لەسەر مێزێکی بچکۆلانەی دانا. وایەرێکی درێژی لە پاکەتەکەی دەرهێنا و سەرێکی لە پشتەوەی تەلەفزیۆنەکە ڕاکرد. سەرەکەی دیکەی لەگەڵ خۆیدا بردە دەر. لەوێ بە پەیژەکان لێوەسەر بان کەوت، پێشتر ئالیێرێکی لەسەر بان چەسپ کردبوو. وایرەکەی لە ئالیرەکە گرێدا، بەجوانیشی شاردەوە تا کەس نەیبینی، ئینجا دیسان هاتەوە ژوور.

ئەوسا دەرگای کتێبخانەکەی بە کلیل گاڵەدا، دوو کورسی لە بەردەم تەلەفزیۆنەکە دانا و گوتی: "فەرموون وەرنە ئێرە دانیشن."

کاتێ مەلا و ئاغاجان لەسەر کورسیەکاندا دانیشتن، شاباڵ تەلەفزیۆنەکەی پێکرد و گڵۆپی ژوورەکەشی کوژاندەوە.

ئەو دەنگی تەلەفزیۆنەکەی هێندێ کەم کردەوە و کورتە ڕوونکردنەوەیەکیشی بۆ دان: "ئەوەی دەیبینین، هەر ئێستا لە بۆشایی ئاسماندا ڕوودەدا. ئەپۆلۆی دوو بەم نزیکانە لە مانگ نزیک دەبێتەوە، ئیدی لەوێ دادەبەزن. ساتێکی ناوازەیە. سەیرکە، ئەوە خۆیەتی. ئای خوایە!"

مەلا و ئاغاجان هەندێ سەریان بردە پێشەوە و سەیریان کرد، لەو ساتەدا ئەپۆلۆ خەریکبوو لەسەر مانگ دادەبەزی. بێدەنگییەکی قووڵ باڵی بەسەر ژوورەکەدا گرت.



- "دەڵێی شتێک لە کتێبخانەدا هەیە." گوڵبانو وای بە گوڵبێ گوت، "شتێکی ئەوەندە گرنگ تەنانەت لێنەگەڕان ئێمەش بیزانین."

- "گەنجەگە بەسەر پەیژەکاندا سەرکەوت، ئەو چووە سەربان و شتێکی لەوێدا چەقاند و هاتەوە. ئەوان چرای ژوورەکەشیان کوژاندەوە. تۆ بڵێی لە کتێبخانەکەدا چیبکەن؟"
- "دەچین سەیر دەکەین."

بە نەرمی و هێواشییەوە، بەنێو تاریکیدا بەرەو کتێبخانەکە کشان.

- "سەیرکە! ئەوە وایەرێک لەسەر بانەوە بۆ ناو ژوورەکە دەڕوا."
- "وایەر؟"

ئەوان لەسەر پەنجەی پێیان چوونە لای پەنجەرەکە، بەڵام پەردەکان دادرابوونەوە. بە ئەسپایی لەپەنجەرەکەوە بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشتن. لەوێدا تیشکێکی تەلیسمای زیوین لە درزەکانی قاپیەکەوە دەبیندرا.

ئەوان گوێیان بە دەرگاکەوە نا.

- "ناکرێ و نابێ!" گوێیان لێبوو، مەلا وای دەگوت.
- "ناکرێ و نابێ!" بیستیان ئاغاجانیش وا دەڵێ.

دادەکان لە کونی کلیکی دەرگاکەوە تەنها رووناکاییێکی سەرنجڕاکێشی سەیریان بینی، کە کتێبخانەکەی پڕکردبوو.

بەنابەدڵیش لەتاریکیدا گەڕانەوە بۆ ناو خانووەکە و بزربوون.

## نەورۆز

لەگەڵ هاتنی بەهاردا، نەورۆز سەری ساڵی نوێی ئێرانی دێت.

لە بنەڕەتیشدا نەورۆز جەژنێکی شاهانە بووە، لە کۆشکەکانی یەکەمین پاشای ئێرانیەکاندا بە گەورەیی لەگەڵ هاتنی بەهاردا ئاهەنگی بۆ گێڕدراوە.

خەڵک بەر لە دوو هەفتە پێش نەورۆز بە پاککردنەوەی ماڵ دەستپێدەکەن. بۆ ئەوەی پێشوازی بەهار بکەن، گەنم لە مەرکانە دەچێنن، تا ئەوەی سەوزایی دەربچێ. لە لایەن خێزانەوە پۆشاک و پێڵاوی نوێ بۆ منداڵان دەکرِدرێ، تا سەردانی خزمان بە تایبەتیش داپیرە و باپیرەوە بکەن.

هەموو ئەو شتانەش لە لایەن ژنانەوە ڕێکدەخرێن، دوای لەخۆبوونەوەی ئامادەکارییەکان، ئەوسا نۆرەی خۆیان دێ، تا لەخۆیان بخەوتێن.[١٢]



لە خانووەکەی مزگەوتێشدا، دادەکان بە یارمەتی یەک دوانێکی دیکە خەریکی پاک و تەمیزکردنەوەی ماڵ دەبن. دەلاکە پیرەکەش دێت، بەڵکو ژنەکانی خانووەکە جوان و ئارایشت بکا. ئەو پرچیان دەبڕێ، برۆو لاروومەتەکانیان دەکا و گەندەمووەکانیانیشیان هەڵدەگرێ.

ئەو دەلاکە زیاتر لە پەنجا ساڵە ئەمە کاریەتی. یەکەمین جاریش، کە هاتە ئەم خانووە تازە کیژۆڵەیەکی تەمەن دە، دوازدە ساڵانە بوو. ئەوکات لەگەڵ دایکی هاتبوو. پاشان، کاتێ دایکی مرد، جێگەی گرتەوە و متمانەی کەسانی نێو خانووەکەی بەدەستهێنا.

ئەو ڕۆژەی ئەو دەهاتە ماڵەکە، بەشێکی خانووەکە چیدیکە بۆ پیاوان ڕێگەپێدراو نەبوو. ئیدی هەموو ڕۆژەکەی گوێت لە قاقا وتریقەی پێکەنینی ژنان دەبوو، بەبێ چارشێو، بە پێخواسی بەنێو ماڵەکەدا جرتوفرتیان بوو. دادەکانیش بە خۆیان نێرگلە، شەربەتی لیمۆ و شیرینەمەنی دیکەوە دەهاتن و دەچوون.

دەلاکەکە بەندوباوی شارەکەی بۆ باسدەکردن، ئاخر ئەو بەردەوام دەچووە لای خانمەکانی ماڵباتە دەوڵەمەندەکان، بۆیە زۆر شتی لەو بارەیەوە دەزانی. ئەو بەردەوام هەگبەیەکی کۆنینەی پێبوو، هەگبەکە پڕ لە بۆن، بۆیەی پرچ، میک ئەب، مقەسۆکە، قردێلەی پرچ بوو، هەموو ئەمانەشی بۆ فرۆشتن دانابوون.

کەلوپەلەکانی ئەو جوان و قشتیلە بوون، جیاواز بوون لەگەڵ ئەوانەی لەبازاڕدا دەفرۆشران. ئاخر ژنەکە کوڕێکی لە (کوێت) کاری دەکرد، هەموو جارێکیش کە بۆ ماڵ دەگەڕایەوە، هەگبەیەکی پڕ لە شتومەکی بۆ مەعمیلەکانی دایکی لەگەڵ خۆی دەهێنایەوە.

ئەمرۆش دەلاکەکە بەتایبەت لەبەر خاتری فەخری سادات[١٣]، هاوسەرەکەی ئاغاجان هاتبوو. فەخری سادات لەنێو بازنەی ماڵباتە دەوڵەمەندەکانی شاردا،

---

[١٢] لەخۆخوتان: بایەخ بەخۆدان، خۆجوانکردن.

خانمێکی بەرچاو بوو. هەندێ جاریش لە ناندینەکەدا یارمەتی دادەکانی دەدا، ئەو جلی بۆ منداڵەکانی دەدرووی کە هێشتا بچکۆلانە بوون، هەروەها کتێبیشی بۆ دەخوێندنەوە. لەڕاستیشدا خوێندنەوەی کتێب خەمی سەرەکی ئەو بوو. بەتایبەتیش ئەو کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاری ژنانە کە نوسرەتی شوبرای لە تاران بۆی دەهێنان.

خۆ ئەگەر ئاوهەوا خۆشیش بووبایە، باڵندەکانی دەگرتن. خانمەکە بە یارمەتی دادەکان تەڵەکەی لە ژێرزەمین دەهێنایە دەر. تەڵەکە، تریانێکی گەورەبوو، تایبەت بۆ تەموز دروستکرابوو، ستوندەیەکی لە ناوەڕاستدا هەبوو، بەداوێکی درێژیش بەسترابووەوە. فەخری سادات هەندێ دانی بە بن تریانەکە وەردەکرد و بە خۆیشی دەچووە لای حەوزەکە، لەسەر کورسییەک چاوەڕێی دەکرد تا مەلەکان دەهاتن.

ئەو مەلانەی لەپشت چیاکەوە دەهاتن، دوای نزیکبوونەوەیان یەکسەر بۆ دانەکە دەڕۆیشتن. هەر کاتێکیش ئەوان دەگەیشتنە بن تریانەکە، لەو سەرەوە فەخری سادات داوەکەی ڕادەکێشا، ئیدی سەری تریانەکە بەردەبۆوە و مەلەکان لەنێو تریانەکەدا گیریان دەخوارد.

فەخری سادات مەلەکانی بۆ چەند ڕۆژێک لە ژووری باڵندەکان دەهێشتنەوە، دان و ئاوی دەدانێ، قسەی لەگەڵ دەکردن، لێیانەوە ڕادەما، وێنە و نیگاری پەڕەکانی دەکێشا، پاشان ئازادی دەکردن.

کاتێکیش خانمەکە بە باڵندەکان سەرقاڵ دەبوو، هەموو ئەوانەی نێو خانووەکە بە دەنگێکی نزم لەگەڵ یەک دەدوان.

ئاخر، تازە دەلاکەکە لە مووکردنی قاچەکانی فەخری سادات ببووەوە، کە قەلە پیرەکە لەسەر ڕۆخێکی بانەکە هەڵنیشتەوە. مەلەکە بە توندی قیغاندی[14] و زەنگی هەواڵێ نوێی لێدا.

کەسیش نەیدەزانی تەمەنی قەلەکە چەندە، بەلام گومان لەوەدا نەبوو زەمانێک بوو هەبوو، چونکە ئاغاجان شتێکی دەربارەی مەلەکە لە ئەرشیفە کۆنەکەی مزگەوتێ خوێندبووەوە. قەلەکە بووبووە بەشێک لە خانووەکە. ئەو سەر بە

---

[13] Fagri Sadat

[14] قیغاندن: دەنگی قەل

گـومبەزەکە، منارەکـان، بانەکـان، پیـرە دارەکە و ئەو حەوزە بـوو کە ئـاوی لێدەخواردەوە.
لە دواییدا فەخـری سـادات خـۆی کـۆکردەوە و گـوتی: "سـڵاو، قەلـێ! ئەرێ هەواڵی خۆشت پێیە؟ تۆ بڵێی کێ لەڕێگابێ؟ کێ بۆ ئێرە بێ؟"



سەر لەئێوارەکەی، مجێورەکە لە مزگەوت هـاتەوە و لەپشـت ئەویشـەوە مەلا ئەلسـابری بە خـۆی و جلـی ئاهەنگئـامێز دەڕۆیشـت. بە شـێوەیەکی ئاسـایی ئەوان لەدەرگای پێشـەوە دەهاتنە ژوور، لێ هەنووکە بە پلیکانەکانی مزگەوت چوونە سـەربانەکە و لەوێشـەوە دابەزینە خـانووەکە. لەوانەشـە ئەوە بەهـۆی بەهارەوە بێ. بانەکەکان کە بە گڵێکی تـایبەتی بیابان سـواخ درابـوون، لەگەڵ گوڵ و گوڵوکی بیابان تێکەڵ ببوون و بۆنێکی بەهارەی نازداریان لێدەهات.
"تـۆ بڵێی کـاتی سەرخەوشـکاندنێکم هەبێ؟ هەسـت دەکەم بـاش نـیم." کاتێک ئەلسابری هاتە ژوور ئەمەی بە دادەکان گوت.
"بەڵـێ،" گوڵبـانوش وەڵامـی دایەوە، "تـۆ هێشـتا نیـو سـەعاتت مـاوە. ئـێمە چـاوەڕێی ئاغاجـان دەکەیـن؛ کە ئەویـش هـات، ئەوسـا هەمووـمـان بەیەکەوە خواردنی جەژنە گەورەکە دەخۆین. لە سەعات دوازدەی شەویشدا هەمووـمان دێینە حەوشـەکە و نـوێژی سـاڵی نـوێ بە کۆمەڵ دەکەیـن. زۆریـش نابـا یەک دوو مافوور لوول دەدەین. جارێ بێخەم بنوو، بەوەخت هەڵتدەستێنمەوە."



لەوێدا و لەبەر دەرگەدا تاکسیەک وەستا.
منداڵەکان غاریان دایە دەرەوە.
"ئەوە مام نوسرەتە[15]!" ئەوان وا هاواریان کرد.
فەخـری سـادات پەنـجەرەی ژوورەکەی خـۆی لە نهـۆمی دووهەمـدا کـردەوە، بینی نوسرەت بەتەنیا نییە، بەڵکو ئافرەتێکی گەنجی لەگەڵدایە. ئیدی خـانمەکە چارشێوێکی بەسەر خۆی دادا و هاتەخوار.

---

[15] Nosrat

کاتێکیش نوسرەت لەگەڵ ژنەکەدا هاتنە ژوور، ئەو ناوە کشومات بوو. ژنە گەنجەکە هیچ چارشێوی نەپۆشیبوو، تەنها هەورێیکی بەسەر سەردا دابوو، پرچیشی لەبن هەوریەکەدا تەواو دیار بوو.
خەریکبوو دادەکان ئەم بارە بە چاوی خۆیان بڕوانەکەن.
- "ئاخر چۆن ئەو خوێڕیە دەوێرێ ژنێک، کە جلێکی وای پۆشیبێ لەگەڵ خۆی بێنیتەوە ماڵێ؟" ئەمە گوڵبانو بوو وایگوت.
- گوڵبێش پرسی؛ "ئەوە کێیە؟"
- "ئێ من چووزانم، ئەوەش ئافرەتێکی سووک."
زینەت خانم[16]، ژنی مەلا لەگەڵ سەدیقەی[17] کیژی هاتە گەڵ ئەوانی دیکە. هەروەک بانگدەرە نابیناکە، شاباڵیش لەپشت پەنجەرەوە سەیری ژنەکەی کرد. ئەو وایدەبینی مامی ئازایە، ژنێکی وای هێناوەتە ماڵ. ئەو بە مامەکەی کارانگاز بوو، چونکە بە داب و نەریت پابەند نەبوو، هەر جارێک دەهاتەوە، ماڵ شتێکی نوێی دژی شتە کۆنباوەکان پێبوو.
لە مێژووی خانووەکەدا ئەوە یەکەمین جار بوو، ژنێکی بێ چارشێو، یان بەبێ ڕووپۆشێکی شیاو ڕووی تێبکا.
هەمووان تەماشای ژنەکەیان دەکرد. تۆ بڵێی پێویستبێ بەخێرهاتنی ژنەکە بکەن یان نا؟ ئەرێ ئاغاجان ڕای دەبێ چۆن بێ؟
ئێوارە درەنگ بوو، تازە خەریکبوو تاریکیی دابێ، بەلام دادەکان لەبەر چرای گلۆپەکاندا بینیان، ژنەکە دوو نایلۆنی نەرم و تەنکی لەبەردایە، تێیدا قاچەکانی دەبیندرێن.
نەسرین و ئەنسی، کچەکانی ئاغاجان مامە نوسرەتی دەم بەخەندەیان ڕامووسی.
- "من ئەمەتان پێدەناسێنم" نوسرەت وایگوت، "ئەوە شادی[18]، دەزگیرانەکەی منە."
شادیش خەندەیەک گرتی و سلاوی لە کیژەکان کرد.

---

[16] Zinat Ganoem
[17] Sediq
[18] Shadi

- "ئۆو، وای چەند جوانە!" نەسرین کیژە گەورەکەی ئاغاجان وایپێگوت. "ئەرێ مامە کەنگێ ئەو یارەت گرتووە؟ بۆچی ئێمە پێماننەزانیوە؟"
- "ئەویندار؟ چۆن ئەویندار؟" گوڵبانو وای بە گوڵێ گوت و پەردەکانیان دادانەوە. "ئەو درۆ دەکا، ئەو کەس مارە نابڕێ، ئەو، ئەو تارانییە سووکەی هەر بۆ ڕابواردن لەگەڵ خۆی هێناوە. ئەرێ ئاغاجان لە کوێیە، نابێ بەو شتە قایل بێ."
فەخری ساداتیش ژنە تارانییەکەی ماچ کرد و گوتی: "شادی، وای چ ناوێکی خۆشە. بەخێر بێیت بۆ ماڵەکەمان!"
- "ئەرێ ئاغاجان لە کوێیە؟ ئەدی بانگدەرەکە دیار نییە؟" نوسرەت وای لێپرسین. "ئەدی مامۆستا لە کوێیە؟ ئەدی شاباڵ؟"
- "ئاغاجان هێشتا نەهاتۆتەوە ماڵ، بەڵام ئەلسابری لە کتێبخانەکەی خۆیەتی،" خێزانی مامۆستا وای وەڵام دایەوە.
- "من دەچم بە سەریدا دەدەم،" نوسرەت وای گوت بەرەو ژووری کتێبان ڕۆیشت.
فەخری ساداتیش ژنەکەی لەگەڵ خۆ بردە هۆدەی میوانان و هەموو کچەکانیشی ڕەگەڵ کەوتن.
دادەکانیش لە ناندینە گەورەکەدا وەستان و چاوەڕێی ئاغاجانیان دەکرد. ئەوان ڕێگەی دەرەوەیان خستبووە بن چاودێرییەوە، هەر ئاغاجان گەیشت، هاواریان کرد "نوسرەت لێرەیە!"
- "وای چەند باشە، کتومت لەگەڵ کۆن و نوێ. برا بچکۆلەکەم هێشتا منی لەبیر نەچۆتەوە. ئیدی ئاهەنگەکەمان گەرمتر دەبێ،" ئەو بە کەیف خۆشییەوە وایگوت.
- "بەڵام شتێک هەیە،" گوڵبانو بە خەمەوە وایگوت.
- "چی؟"
- "ئەو ژنێکی لەگەڵ خۆدا هێناوە."
- "ئەو دەڵێ کەوا عاشقی بووە،" گوڵبێ ئەمەی خستە سەر.
- "ئەوە هەواڵێکی خۆشە. لە دواییدا برایەکەم هۆشی هاتەوە سەر."
- گوڵبانو پێیگوتەوە، "وا خێرا دڵخۆش مەبە."

"ژنەکە چارشێوی بەسەرەوە نییە. ئەو تەنها هەورییەکی بچکۆلەی بەسەرسەردا داداوە."

"نایلۆنەکانیش!" گوڵبێ بە هێواشی بۆی زیاد کرد.

"ئەوە چییە؟"

- "نایلۆن جووت گۆرەوییەکی درێژی تەنکە. خۆ ئەگەر لە پێی بکەی هەروەک ئەوەیە هیچت لە پێدا نەبێ. ئیدی ئەو جۆرە ژنەی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە ماڵێ. خوایە، لێمانەگری. بەخت بەوەی باشبوو، تاریک داهاتبوو کە ئەوان هاتنە ژوور. وادابنێ ئەوان بە ڕۆژی ڕووناک بە بەردەم مزگەوتێدا بڕۆیشتبان، ئەوسا بەیانی هەموو خەڵکی بازاڕ دەکەوتنە مقۆمقۆ: ئەوە ژنێک بە خۆی و نایلۆنەکانی قاچییەوە لە خانووەکەی مزگەوتێ دایە!"

- "دەی باشە، بایی پێویستم زانی،" ئاغاجان بە حەوسەڵەوە وایپێگوتن، "من قسەی لەگەڵدا دەکەم. دەمەوێ بە گەرمی بەخێرهاتنی ژنەکە بکەن. جووت گۆرەوەیەکی ئاساییشی بدەنێ. ئێوە چارشێوی زۆر جوانتان لە ماڵێدا هەن. چارشێوێکی وەک دیاری بدەنێ."

- "پێموایە ئەو دەزگیرانی نوسرەت نییە. ئەو هەروا ژنێکی لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە ماڵێ." گوڵبانو وایگوت.

- "جارێ ئێمە ئەوە نازانین،" ئاغاجانیش وای پێگوتەوە، "هیوا بخوازن، کە دەزگیرانی بێ. ئەدی ئەو هەنووکە لە کوێیە؟"

- "لە ژووری کتێبان یان لە ژووری بانگدەرەکە، پێموابێ لەوێ لە شوێنێکە."

ئاغاجان دەیزانی برا بچوکەکەی خراپ نییە، هەمیشەش دژی دین و دابونەریتی ماڵەکە دەجوڵێتەوە، بەڵام هەنووکە ، کە ژنێکی لەگەڵ خۆی هێناوەتە ماڵ، دەبێ ئاگای لەخۆی بێ."

- "باشە، شتەکە باش دەبێ،" ئەو وای بەدادەکان گوت و بەرەو ژووری بانگدەرەکە ڕۆیشت.



- "خواردن!" گوڵبانو وای هاواری کرد.

- "دەی، کوڕان ، کچان! فەرموون خواردن!" گوڵبێش وای لێسەندەوە.

هەموویان چوونە ژووری ئاهەنگەکە.

پیاوەکان بە خۆیان بە جلی جەژنەوە لێوەژوور کەوتن، ژنەکانیش هەموویان لە لای ڕاستی ژووره گەورەکەی خواردن دانیشتن.
فەخری سادات خانمە تەهرانییەکەی بە ئاغاجان، مامۆستا و بانگدەرەکە ناساند.
- "کچەکەم، بەخێر بێیت!" ئاغاجان وای پێگوت. "ئێمە نەمانزانیوه، کە نوسرەت دەزگیرانەکەی خۆی دێنێتە ماڵ، دەنا ئاهەنگێکمان بۆدەگێڕا."
مەلا ئەلسابریش لە دوورەوە بەخێرهاتنی کرد. کاتێکیش فەخری سادات ژنەکەی بە بانگدەرەکە ناساند، بە پێکەنینەوە پێیگوت، "ئێمە خانمێکی تارانیمان لێرە لەگەڵدایە، ئەو خانمە لەهی شارەکەمان ناچێ، هەر بەتەواویش لەگەڵ ئەو ژنە چاییانەی پەیوەندیت لەگەڵدا هەن، جیاوازە. ناویشی شادییە و زۆر جوان و ناسکیشە. دوو چاوی رەش، پرچێکی قاوەیی، ڕیزە ددانێکی سپی هەن و خەندەی شیرینیشی لەسەر لێوانە. ئەم ئێوارەیەش چارشێوێکی قاوەیی گوڵگوڵی بە خۆی داداوە، کە دادەکان پێیان بەخشیوە. لەوە زیاتر چیت دەوێ بیزانی؟"
- "کەواتە جوانە!" بانگدەرەکە بە پێکەنینەوە. "من لەوە بەدەر لە نوسرەتم چاوەڕێ نەدەکرد."
دادەکان بە ئاگردانێکی بچکۆلە هاتنە ژوور و بخور(ئەسفەند)یان لەسەر سوتاندبوو، بۆنەکەی دەماردەمار دەڕۆیشت. کچەکانیش لە ناندینەوە خواردنەکەیان هێنا و دایان نا.
- "ئەرێ چاوەڕێی ئەحمەد[19] ناکەین؟" مامۆستا ئەلسابری وایپرسی.
- "لێم مەگرە،" ئاغاجان وەلامی دایەوە، "کاتێ من نوسرەتم بینی، هەر لەبیرم چوو پێتانبڵێم. ئەحمەد لەبازاڕ زەنگی بۆلێدام. ئەو نایەت. ئەوان لە قوم ئاهەنگی خۆیان هەیە."
ئەحمەد کوڕی مەلا ئەلسابری بوو. تەمەنی حەڤدە ساڵان بوو، نێردرابووە بەر خوێندنی پێگەیاندنی ئیمامی مزگەوتان، لە لای ئایەتوڵلای نەرمڕەوی گەورە، گولپایەگانی لە شاری قوم دەخوێنێ.



[19] Ahmad

دادەکان ژەمێکی بەتام و نایابی ساڵی نوێیان ئامادەکردبوو، هەمووشیان لەسەر مێزەکە مانەوە.
دوای خواردن، شیرینیان هێنا، شیرینییەکەش تایبەت بە جەژنی سەری ساڵی نوێ دروستکرابوو.
ژنەکان شادییان لەنێوخۆ گرتبوو، هەر پرسیاریان دەربارەی تاران و ئافرەتانی تاران لێدەکرد. شادییش وردە دیاری وەک بۆیەی نینۆک، قەڵەمی لێو، گۆرەوی نایلۆن و مەمکدانی بۆ هێنابوون. پیاوەکانیش کە بینییان ئیدی جێگەی ئەوان نەماوەتەوە، هەڵسان و گەڕانەوە ژووری مێوانان.
نزیکی نیوەی شەو بوو، کاتێ یەکێ لە دادەکان گوتی: "خانمان، ئایا ئێوە بۆ نوێژی ساڵی نوێ ئامادەن؟"



نوسرەت هەندێک بۆ شادی چەمایەوە.
- "ئەرێ ئەوان بۆ کوێ دەڕۆن؟" شادی وایگوت.
- "هەمووان دەچن نوێژ دەکەن، بەڵام ئەوە بۆ من هیچ ناگەیەنێ، بۆیە منیان لەگەڵدا ناڕۆم." لەبن گوێی ژنەکەشدا ئەمەی چرپاند، "من تۆ دەبەمە ژووری کتێبانی ئەم خانووە."
- "بۆچی، سا لەوێدا ئێمە چی دەکەین؟"
- "دەتۆ وەرە، دواتر بۆت دەردەکەوێ،" وای پێگوت و دەستی گرت.
نوسرەت پێلی شادی گرت و بەسەرپەنجەی پێی بە پشت دار کاژەکە چوونە ژووری کتێبان. بە ئەسپاییش قاپیەکەی داخست.
- "باشە بۆچی چراکە دەکوژێنییەوە؟"
- "وا بە دەنگ قسە مەکە. دادەکان گوێیان لە هەموو شت دەبێ و هەموو شتێکیش دەبینن. خۆ ئەگەر بزانن ئێمە لێرەین، ئەوا وەک دوو مۆتەکە لێمان دەردەکەون،" ئەو وای گوت و خەریکی ترازاندنی قۆپچەکانی بلوزی شادیش بوو.
- "ئەیەڕۆ، وامەکە! لێرە نا،" ژنەکە بەچرپەوە وایگوت و بە نەرمیش پاڵێکی بە نوسرەتەوە نا تا لە کۆڵ خۆی بکاتەوە.

ئەمجارە لەناوقەدەوە ژنەکەی گرت، رایکێشایە لای دۆلابی کتێبەکان و تەنورەکەشی هەڵدایەوە.

- "وامەکە، من لێرە دەترسێم."

- "ئێرە جێگای ترس نییە، بەلام وروژێنەرە، رۆحە پرەکەی ئەم خانوووە لە پەنا دۆلابی ئەم کتێبانەدا خۆی حەشارداوە. حەفتسەد ساڵی دوورودرێژە مەلاکان لەو هۆدەیەدا خۆیان بۆ نوێژ ئامادە دەکەن، لێرەدا زۆر شت روویداوە بەلام ئەمەیان هێشتا نەقەوماوە، منیش دەمەوێ لەگەڵ تۆدا بیقەومێنم. من دەمەوێ جوانترین شت بخەمە سەر مێژووی تۆماری ئەم ژوورە."

- "ئۆی نوسرەت،" بە هەناسەبڕکێوە.

نوسرەتیش مۆمێک کە لەسەر مێزی مامۆستا بوو، داگیرساند.



- "ئەرێ ئەو هەمووانە لە کوێن؟" گوڵبانو لەناو حەوشەکەوە وا هاواری کرد. "خێرا بن، مامۆستا ئامادەیە!"

لە حەوشەکە دووو مافووری گەورە بۆ نوێژ ڕاخرابوون. تەنها نوسرەت و ژنەکەی دیار نەبوون.

- "من پێت دەڵێم، ئەو کەسێکی سەرسەرییە، ئەگەر دەرفەتی هەبێ مزگەوتەکەش شەرمەزار دەکا، بەلام من ڕێگای نادەم، ئەو هەر دەبێ بۆ نوێژەکە بێ!" گوڵبانو وایگوت.

- "باشە دەبێ لە کوێ بن؟"

نیگای چاوەکانیان بڕیە سەر ژووری کتێبان.

دادەکان چوونە بەر دەرگای کتێبخانەکە، بەلام نەوێران قاپیەکە بکەنەوە. ئەوان بە ئەسپایی لە پەنا پەنجەرەکەدا دانەوینەوە، لە درزی پەردەکەوە سەیری ژوورەوەیان کرد، بینیان مۆمە کۆنەکە، کە هەرگیز دایان نەگیرساندبوو، پێکراوە و وادەسووتێ.

دەستیان لەنزیک چاوەکانیان دانابوو، بە وریاییەوە سەیری ناوەوەیان دەکرد.

لەبەر تیشکی مۆمەکەدا، لا دۆلابەکانی کتێبەکان دەهەژان. ئەوان هێدمە گرتی بوون، چونکە ئەوەی لە ژوورەوە بینیان شت بوو نەک گەمە! لە کۆتاییدا چاویان لەسەر یەک گیربوو.

تۆ بڵێی ئەوان چی بکەن؟ ئایا شتەکە بە ئاغاجان بڵێن؟

نەخێر، لەو شەوە تایبەتەدا ئەو خەبەرپێدانە شتێکی باش نابێ. باشە ئەدی ئەوان لەئاست ئەو گوناحە ناقۆلایە چیبکەن، کە نوسرەت لە ژووری کتێبان دەیکا؟

بێدەنگی! یەکێکیان بەچاو بە ئەوی دیکەی گوت.

ئەوە ئەرکی ئەوان بوو بێدەنگ بن، هەروەک هەموو دادەکان، کە هەندێ جار ئەوانیش بۆ ئەوان وایاندەکرد. پێویستە ئەوان دڵێکی گەورەیان هەبێ، هەموو ئەو نهێنی و رازە نەدرکاوانەی خانووەکەی تێدا هەڵبگرن. کەواتە ئەوان نە شتێکیان بیستووە و نە بینیویشیانە.



مامۆستا دەستی بە نوێژ کرد. هەمووان لەپشتی مەلاوە ڕووەو مەککە ڕاوەستان. دادەکان بێ ئەوەی کەس هەست پێبکا هاتنە ڕیزی ژنەکان. بێدەنگیەک باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشا، تۆ تەنها گوێت لە نوێژی مامۆستا دەبوو:

**اللَّهُ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُورٌ عَلَى نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (٣٥)**

{ئەو ڕووناکییە.

ڕووناکی ئەو وەک تاقێکە چرای تێدا هەڵکرابێ.

چراکە لە جامێک دابێ، جامەکە وەک ئەستێرە ترووسکەی بێ.

ماکی چرا لە زەیتونێکی ممبارەک دەستکەوتبێ.

ڕۆنی چراکە هەر لەخۆیەوە تیشک دەدا.

ڕووناکی لەبان ڕووناکی.}

## خالخالی

کیژەکانی ماڵەکە گەورە ببوون، یەکێکیشیان وادەی مێردکردنی هاتبوو، بەڵام تۆ بڵێی چۆن بتوانن شوو بکەن، کە تائێستا هیچ پیاوێک لە دەرکەی ماڵەکەیانی نەدابێ و داوای دەستیانی کردبێ؟
لە زەنجاندا هەرگیز کوڕێکی لایدە نایە و لەدەرگا بدا تا داوای دەستی کچەکەیان لێبکا، زۆر جاران پێناوەکان[20]، ئەم کارە دەکەن. کۆمەڵە ژنێکی بە تەمەن، مشووری ئەوە دەخۆن پیاوێک بۆ کچەکەی ماڵێ بدۆزنەوە. ئەمەش زۆر جار لە ئێوارانی زستانە ساردەکاندا ڕوویاندەدا.

هەندێک ماڵبات هیچ پێناوێکی پێویست نەبوو. ژنەکانی خێزانەکە چارشێویان دەپۆشی و پیاوەکانیشیان کڵاویان لەسەر قیت دەکردەوە. ئیدی بەیەکەوە و لە ناکاو بەسەر ماڵێکیان دادەدا، کە کیژی هەبووبا و لەسەر گەیی مێردکردن بووبایە.
ئەو خێزانەش، کە کچێکی تەمەنی مێردکردنی هەبووبا، بەردەوام حیسابی ئەو ناوەخت یان ئەو لەپڕ لە دەرگادانەیان دەکرد. بۆیە هەموویان و هەردەم بۆ بەخێرهێنانی مێوانەکانیان ئامادەبوون.
لەوێدا شەوگەلێک هەبوون، گفتوگۆو باسوخواسی دووروودرێژیان دەربارەی زێڕ و مافوور دەکرد کە زاوا یان بووک لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا. بۆ ئەو ماڵەش کە هاوسەرگیرییەکە سەری نەدەگرت، زاوا پارچەیەک زێر یان بڕێک پارەی دەدایە بووکێ.
کاتێکیش پیاوەکان دەگەیشتنە ڕێکەوتن، باقی باسوخواسەکەی دیکەی وەک جلوبەرگی بووکێ، خشڵ و ئاڵتونی مارەییەکە بۆ ژنان لێدەگەڕان.

---

[20] پێناو ئەو کەسەیە (بەزۆریش ئافرەتە) نێوانی کوڕ و کچێک دەکا. لە هەیرانەکاندا ئەم وشەیە زۆر بەکاردێ.

کاتژمێری دەستی ژنانە، تازە هاتبوونە بازاڕ و دەفرۆشران، بۆیە هەموو بووکێک حەزی لێبوو شتێکی وا جوان و رازاوەی هەبێ.
لەو جۆرە ئێوارانەدا، هەروەک کە چرای دراوسێکان لەپشت جامی پەنجەرەکان دادەگیرسا، ئیدی دەتزانی، خەریکی قسەوباسی ژن و ژنخوازین.
لەو مالانەدا ژوورەکان گەرم دەکرین پەنجەرەکانیش لە دوکەلی نیرگلە تۆخ دەبن. لێ ئەو شەوە درێژانە بەگوێرەی ئەو خێزانانەی ئەزموونیان هەیە ترسناکە، چونکە کچێکیان لەبن هەنواندا هەیە، گەیی مێردکردنی هاتووە، بەلام خۆ کەس نییە بۆ ئەو مەبەستە لەدەرگەیان بدا.

لە خانووەکەی مزگەوتێشدا، سەدیقەی کچی مامۆستا ، کاتی مێردکردنی هاتبوو.
ئەوان بە بێدەنگی چاوەڕوان بوون، بەلکو لە دەرگاکەیان بدرێ، بەلکو زەنگێکی تەلەفۆنیان بۆ لێبدرێ، بەلام خۆ خەریکە زستان بەسەربچێ، کەچی هیچ کەسێکیش بۆ ئەم جۆرە داوایە نەهات.
ئاخر بۆ کچەکانی خانووەکەی مزگەوتێ زۆر سەختبوو کوڕێک بە ئارەزوی خۆیان وەک هاوسەر بدۆزنەوە. هەموو کەسێکیش بۆ داوای دەستیان نەدەهات. بۆ کچە ئاساییەکانی شارەکە، بایی پێویست کوڕگەل هەبوون: کوڕە دارتاشێ، کوڕە وەستایەکی دیوار، نانەواچییەک، فەرمانبەرێکی شارەوانی، کوڕە بەڕێوبەرێکی قوتابخانە یان کوڕێک کە تازە لە کۆمپانیای هێلی ئاسندا وەرگیرابێ. بەلام خۆ ئەو جۆرە کوڕانە بۆ کچەکانی خانووەکەی سەر بەمزگەوتێ لایەق نەبوون.
ڕژێمی شا گەندەل بوو، کەواتە ئەوەی لە لای حکوومەت مووچەخۆر بوو، نەیدەتوانی داوای دەستی کچێک بکا. باشە ئەی مامۆستایەک؟ لەوانەیە بیتوانیبا. لە ڕاستیدا تەنها کوڕە بازرگانە بەرچاوەکان بۆئەوان دەستیان دەدا.
زستان هات و تێپەڕی، کچە تۆلازەکانیش، کە کەس نەهات داوای دەستیان بکا، دەیانزانی هێشتا سالێکی دیکەشیان لەپێشدا ماوە، چاوەڕوان بن.
خۆشبەختیش لەوەدایە کە ژیان هەموو کاتێک پڕ بەپێستی دابونەریت

نایەتەوە، هەندێجار ڕێکەوت ڕێوشوێنی دیکەش لەخۆ دەگرێ. ئیدی هەر بەوجۆرەش لە شەوێکدا لە دەرگە درا.

- "کێ لەوێیە؟" شاباڵ، کوڕەکەی بانگدەرەکە وا هاواری کرد.

- "من،" دەنگێکی متمانە بە خۆی پیاوێک لەپشت دەرگاکەوە هات. شابال قاپیەکەی کردەوە، بینی مەلایەکی گەنج بە خۆی و مێزەرێکی ڕەش لەبن شۆقی گڵۆپەکانی بەر شیپانەی دەرگاکە وەستاوە. مێزەرەی کابرا هەندێک بە لای نێوچاوانیدا لاربۆتەوە و بۆنێکی گوڵ و گوڵوکیشی لێدەهات. جبەی مەلایەتیەکەشی ڕەنگ تاریکبوو، سەرنجی واشی لێدەکەوتەوە، بۆ یەکەمین جار بێ لەبەری کردبێ.

- "ئێوارە باش"، مەلا گەنجەکە وا سڵاوی کرد.

- "ئێوارە باش"، شابالییش وا وەلامی دایەوە.

- "ناوم موحەممەد خالخالییە![21] مەلایەکە وای پێگوت.

- "بەخێربێیت! فەرموو لە خزمەتت دام؟"

- "ئەگەر بکرێ، دەمەوێ لەگەڵ مامۆستا ئەلسابری هەندێ قسە بکەم."

- "تکایە لێم مەگرە، بەڵام ئێستا کات درەنگە، ئەویش لەو کاتانەدا ئامادە نییە، پێشوازی لە هیچ سەردانیکەرێک بکا. تۆ دەتوانی بەیانی لە مزگەوتێ ببینی."

- "ئاخر، حەزم لێیە قسەی لەگەڵدا بکەم."

- "دەکرێ بزانم شتەکە پەیوەندی بە چییەوە هەیە، بەڵکو بتوانم زیاتر کۆمەکت بکەم؟"

- "من بۆ داوای دەستی سەدیقەی کچی هاتووم. دەمەوێ لەو بارەیەوە لەگەڵی بدوێم."

خولەکێکی ڕەبەق، شابال نەیزانی چۆن وەلامی بداتەوە، ئینجا بەسەرخۆیدا زاڵبووەوە و گوتی: - "کەواتە دەبێ لەگەڵ ئاغاجاندا قسە بکەی. من وادەچم پێیدەڵێم، کە ئێوە هاتوون."

"من لێرە چاوەڕێت دەکەم،" مەلایەکە وای پێگوتەوە.

---

[21] Mohammad Galgal

شـاباڵ دەرگـاکەکەی نیـوە کـردەوە و بەرەو ژووری نووسـینگەی ئاغاجـان ڕۆیشت، کە خەریکی شت نووسین بوو.

- "لە بەر شـیپانەی دەرگـا مەلایەکـی گەنـج وەسـتاوە. دەڵـێ گـوایە بـۆ داواکردنی دەستی کیژی مامۆستا ئەلسابری هاتووە."

- "ئەو لەدەرگا ڕاوەستاوە؟"

- "بەڵێ. ئەو دەیەوێ لەگەڵ مامۆستا قسە بکا."

- "ئایا دەیناسم؟"

- " نەخێر، پێموابێ نایناسی. ئەو مەلایەکی سەرنجڕاکێشە، ئاشکرا دیارە هی ئەو شارە نییە. بۆنی گوڵانیشی لێدێ."

- "دەی، فەرمــووی ژوورەوەی لێـبکە،" ئاغاجــان وایپێگــوت و خەریکــی کۆکردنەوەی کاغەزەکانی بەردەمیشی بوو، لەسەر مێزەکە هەڵیگرتن.

- "بەخێربێن!" شاباڵ بە مەلایەکەی گوت، "فەرموون وەرنە ژوورەوە."

شاباڵ مەلای مێوانی بردە هۆدەکەی ئاغاجان.

- " شـەوباش نـاوم مـوحەممەد خالـخالییە! خـۆ نـابمە مـایەی زەحمەتیتـان؟" مەلایەکە وای بە ئاغاجان گوت.

- "نەخێـر، بە هـیچ شـێوەیەک. بەخێربێـی! فەرمـوو دانیشــە،" ئاغاجـان وای پێگوت، لەکاتێک تۆقەی لەگەڵ خالخالیدا دەکرد.

ئاغاجان تێبینی ئەوەی کرد، بەڕاستی مەلایەکی جیاوازە. ئەو ئەوەی پێخـۆش بـوو، کە وەک مەلاکـانی خـانووەکە مێزەرێکـی ڕەشـی لەسـەر نـاوە. ئەوەش واتای ئەوە دەگەیەنێ، مەلایەکە سەیدە و لە وەچەی پێغەمبەریشە.

ئاغاجان داری بنەچەکە کۆنەکەی ماڵباتەکەی لابوو. ئەوەش لەسـەر تابلۆیەکی پێسـتینە نووسرابوو، نـاوی هەمـوو پیاوەکـانی بەرەبـابەکەی تێدابوو، لیسـتی ناوەکانیش دەگەیشتەوە سـەر پێغەمبەر موحەممەد.

داری ناوی خانەوادەکە و ئەنگوستیلەی ئیمامی عەلی لە باولۆکەیەکی تـایبەت لە ژووری خەزێنەی مزگەوتێ هەڵگیرابوون.

ئاغاجان پرسی، "چای دەفەرمووی؟"

کەمێـک دواتـر گوڵبـانو بە سـینییەک، کە چـا و خورمـای لەسـەر بـوو هێنـای ڕادەستی شاباڵی کرد.

ئەویش پیاڵەیەکی چا تێکرد و دەنکە خورمایەکی لەپێش خالخالی داناو ویستی بەجێیان بێڵێ.

- "دەکرێ تۆ بمێنیتەوە،" ئاغاجان به شاباڵی گوت.

ئەویش لە گۆشەیەک لەسەر کورسیەک دانیشت.

خالخالی دەنکە خورمایەکی خستە نێو دەم و قومێکی لە پیاڵە چایەکە دا. ئەوجا بەهێواشی گەروی پاککردەوە و بەبێ پێشەکیش گوتی: "هاتووم داوای دەستی کیژەکەی مامۆستا ئەلسابری بکەم."

ئاغاجانیش کە دەیەویست قومێک لە پیاڵە چاکەی بەردەمی بدا، پیاڵەکەی لەشوێنی خۆی دانایەوە و ئاورێکیشی لە شاباڵ دایەوە. ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرد، مەلایەکە وا ڕاستەوخۆ باسەکە بێنیتە گۆڕێ، وێڕای ئەوەش خۆ مەلایەک هەروا لەخۆڕا و بەتەنها نایەت داوای دەستی کچی خەڵکی بکا. بەگوێرەی دابونەریت بێ، ئەو داوایە لە دەمی باوکی زاوا دەبیسترێ. لێ ئاغاجان پیاوێکی دنیادیتە بوو. حەوسەڵەی خۆی لەدەست نەدا: "بەخێر بێیت، بەڵام دەکرێ بپرسم ئاخۆ تۆ لە کوێ دەژی و هەنووکەش چیدەکەی؟"

- "من لە قوم دەژیم و تازەش خوێندنی مەلایەتیم تەواو کردووە."

- "لە لای چ ئایەتوڵلایەک خوێندوتە؟"

- "لە لای ئایەتوڵلای گەورە ئەلمەککی."

- "ئەلمەککی؟" ئاغاجان بە سەرسوڕماویەوە پرسی. "شەرەفمەندم گەر بەخزمەتی خودی ئایەتوڵلا گەیشتبام."

کاتێک ناوی "ئەلمەککی" هاتەپێشەوە، دەمودەست ئاغاجان زانی، مەلا گەنجەکە سەر بە تەوژمی شۆڕشگێرانەی دژ بە شا یە. ئاخر ناوی ئەلمەککی وەک هاواتای بەرهەڵستێکی نهێنی ئۆلیيانە بوو دژی شا.

زۆر لەو مەلایانەی کە هەر هەندێ دەرسیان لای ئەلمەککی خوێندووە، خۆیان تێکەڵ کاروباری سیاسیی نەدەکرد، لێ ئەوانەی ئەو سەرپەرشتی دەکردن و لەبەردەستی ئەو دەردەچوون، سیاسەتیان لێچاوەڕوان دەکرا.

ئاغاجان گومانی لەو مەلا گەنجە، کە مێزەرەکەی هەندێک بۆ پێشەوە لارکردۆتەوە و زێدەش گوڵاوی لە خۆی داوە، هەبوو بەوەی بێ لایەن نییە. بەڵام هیچیشی نەگوت.

- "ئەرێ ئەم ڕۆژانە چیدەکەی؟ ئایا مزگەوتێکی جێگیرت هەیە خوتبەی تێدا بخوێنیتەوە؟"

- "نەخێر، هێشتا نا، بەڵام زۆر جار شوێنەکانی مزگەوتی جۆراوجۆر لە شاری جۆراجۆردا پڕدەکەمەوە. ئەگەر مامۆستایەک نەخۆش بکەوێ یان لەسەر سەفەر بێ، داوام لێدەکرێ جێگاکەی پڕبکەمەوە."

- "بەڵێ، تێگەیشتم. ئەوەش زۆر جار ڕوودەدا، بەڵام ئێمە جێگرەوەیەکی هەمیشەییمان هەیە،" ئاغاجان وایپێگوت، "ئەو مەلایەی لە گوندی جریا دەژی، پیاوێکە زۆر جێی متمانەیە، هەر کاتێک پێویستمان پێیهەبێ، دەمودەست دەگاتە جێ."

ئاغاجان ویستی لێبپرسی ئاخۆ دایبابی لە کوێ دەژین و ئاخۆ بۆچی هیچ کەسێکی خێزانەکەی لەگەڵدا نەهاتووە، کە داوای دەستی کیژێ مامۆستای بکا. بەڵام واشی نەکرد و لێینەپرسی، ئەو دەیزانی مەلا گەنجەکە دەڵێ: "من گەورەم، هەر بەخۆشم دەزانم کە کێ مارە دەکەم. ناوم موحەممەد خالخالییە. ئایەتوڵاکەشم ئەلمەککییە. ئایا لەوە پتر چیدیکەت دەوێ؟"

- "ئەرێ چۆن بە کچەکەی ئێمەتان زانی؟ ئایا هیچ جار ئەوت بینیوە؟" ئاغاجان وایلێپرسی.

- "نەخێر، بەڵام خوشکەکەم ئەوی دیوە. سەرباری ئەوەش ئایەتوڵا ئەلمەککی ئاماژەی ئەوەی بۆ کردووم. ئەو نامەیەکیشی لەوبارە داومەتێ."

ئیدی زەرفە نامەیەکی لە باخەڵی دەرهێناو ڕادەستی ئاغاجانی کرد.

کاتێک ئەو نامەیەکی ئایەتوڵا ئەلمەککی لەنێو دەست دابوو، ئاغاجان هیچی وای بۆ نەمابۆوە بیڵێ. خۆ ئەگەر ئایەتوڵا ئەلمەککی ئەوی بەباش زانیبێ، هیچ بوارێک بۆ قسەلەسەرکردنی زیاتر نامێنێتەوە. ئیدی ئیشەکە بڕایەوە.

ئاغاجان بە ڕێزەوە نامەکەی کردەوە. ئایەتوڵا ئەلمەککی ئەمەی خوارەوەی تێدا نوسیبوو:

***بەناوی خوا.***

***هەنووکە موحەممەد خالخالی دێتە سەردانت، سڵاوی منت لێبێ.***

***وەلسەلام و عەلەیکوم.***



ئاخر شتێک لە نامەکەدا هەبوو، بەڵام ئاغاجان نەیزانی چییە. لەنامەکەدا نە پەسەندنامەی تێدا بوو نە رەتکردنەوەش، نامەکە تەنها هاتنی مەلا گەنجەکەی سەلماندبوو. دیارە ئایەتوللاکە ئەوەندەی پێ گرنگ نەبووە، دەنا وایدەکرد لەنامەکەدا پێوەی دیاربێ. بەڵام خۆ مەلا گەنجەکە نامەیەکی ئەلمەککی پێبوو، ئەوەش هەر بە خۆی واتایەکی زۆری دەگەیاند. ئاغاجان نامەکەی خستە چەکمەجەی مێزەکەی و گوتی: "من دەبێ بیری لێبکەمەوە ئاخۆ چیبکەین. لێگەڕێ با قسە و وادەکەمان وابێ. من لەو بارەوە لەگەڵ مامۆستا ئەلسابری و کیژەکەی قسەدەکەم. پاشان وادەیەک دادەنێین، تۆ لەگەڵماڵباتەکەت، لەگەڵ باوکت دێیت. باشە رێککەوتین؟"
خالخالیش گوتی: "رێککەوتین!"



شاباڵ تا بەردەرگا یاوەری خالخالی کرد و گەڕایەوە.

- " شاباڵ، ئەرێ بیروڕات چییە؟" ئاغاجان وای لێپرسی.
- "پێموایە ئەوە شتێکی جیایە، ئەو کەسێکی تیژگۆیە. ئەوەم بەدڵە."
- "تۆ ڕاست دەکەی. تۆ شێوازی ئەوت بینی کە لەسەر کورسییەکەی دانیشت. ئەو لەگەڵ مەلاکانی دێهات بەراورد ناکرێ، بەڵام من بیرکردنەوەی خۆشم هەن."
- "چ جۆرە بیرکردنەوەیەک؟"
- "ئەو زۆر بەرزەفڕە. ئایەتوللا لە نامەکەی خۆیدا هیچ شتێکی کۆنکرێتی نەنووسیوە. ئەو ئامۆژگاری کردووە، لێ لە سەرەکەی دیکەشەوە هیچ وشەیەکی بۆ نەنووسیووە. من لە نامەکەیدا گومانێکم خوێندەوە. خالخالی کەسێکی خراپ نییە، بەڵام کەسێکی سەرچڵە. تۆ بڵێی ئەو بۆ مزگەوتەکەمان دەست بدا؟ ئەلسابری نەرمە، بەڵام ئەو مەلا گەنجە پێموایە، توندە."
- "تۆ مەبەستت لەمەدا چییە؟"
- "ئەرێ هێشتا ئەلسابری بێدارە؟"

شاباڵ لە پەردەکەوە سەیری دەرێی کرد.

- "هێشتا چرا لە کتێبخانەکەوە دادەگیرسێ." شاباڵ وای بە ئاغاجان گوتەوە.

،اشـە باجـاریَ ئەو شـتە هەر لەنێوانی ئێمەدا بێ، باجـاریَ ژنەکـان بەمە ،،ەزانن." ئاغاجان ژوورەکەی بەجێهێشت و بەرەو ژووری کتێبان ڕۆیشت.
،ە؛ لەدەرگاکەی داو لێوەژوورکەوت. ئەلسابری لەسەر مافوورەکە دانیشتبوو ،،،،،کی دەخوێندەوە.

"ئەری ڕۆژی ئەمڕۆت چۆن بوو؟" ئاغاجان وای لێپرسی.

"ئاسایی،" ئەلسابریش وا وەلامی دایەوە.

"ئەوە چیت دەخوێندەوە؟"

"کتێبێک دەربارەی کارە سیاسییەکانی ئایەتوللاکان لە مـاوەی سـەد سـالّی ڕابردوودا. وادەردەکەوێ هەرگیز ئارام دانەنیشتوون، هەمیشـە شـێوازێکیان دۆزیوەتەوە تا بە دەسەلات بگەن. ئەم کتێبە وەک ئاوێنەیەک وایە، تەماشـای دەکەم. من خۆم لەو جۆرە کارانەدا نـابینمەوە. هەر بۆیەشـە خـۆم بەخەتابار دەزانم."

ئەلسابری پیاوێکی دلّکراوە بوو. ئاغاجان هەستی کرد، لە ئانوسـاتێکی گرنگدا هاتوتە لای.

"مـن دەزانـم، قـوم لەمـن رازی نییە. دەترسـم خەلّکی بەدوای مزگەوتێکـی دیکەدا بگەڕێن و هی ئێمەش گەر من هەروا بێدەنگ بم، چۆلّ وهۆلّ بێ."

"پێویسـت ناکـا لەو شـتە بترسـی،" ئاغاجـان پێیگـوت، "بە پێچەوانەوە، هەر کـاتێ خەلّکی زانییـان، کە ئێمە دەسـت لەکاروبـاری سیاسـەتەوە وەرنـادەین، ئەوسـا زیاتر بـۆ مـزگەوتەکەی ئێمە دێـن. ئەو کەسـانەی دێنە مـزگەوتەکەی ئێمە، خەلّکانێکی ئاسایی سـەر جادەن. خۆ مزگەوت مالّی ئەوان نییە، ئەوان لە ژیانیانـدا هەر بـۆ ئێـرە هـاتوون، بەدەسـتێکی سـوکیش چـۆلّی نـاکەن. هەر بۆیەشە تۆ بەباش دەزانن و زۆر ڕێزیشت دەگرن."

- "بەلام بـازاڕەکە،" مامۆسـتا ئەمەی بـۆ سـەر قسـەکەی سـەرباركرد، "بـازاڕ هەمیشە چەقی بازنەی سیاسەت بووە. لەم کتێبەشدا وا نووسراوە. بازاڕەکان لە ماوەی ئەو دوو سەد سالّەی ڕابردوودا ڕۆلّێکی بڕیاردەرانەیان گێڕاوە و مەلاکانیشـــیان هەمیشـــە وەک چەک بەکارهێنـــاون. کاتێـــک بازرگانەکـــان بازاڕەکەیـان داخسـت، هەمـووان دەزانـن شـتێکی نائاسـایی، شـتێکی گرنـگ لەگۆڕێدا هەیە. من دەزانم بازاڕ لەمن قایل نییە."

ئاغاجان باش دەیزانی ئاخۆ مامۆستا لەگەڵ چیەتی. ئەویش بە خۆی لە ئەلسابری رازی نییە، بەڵام خۆ ناشکرێ بەتەواوی بەلاوەی بنێ، هەر لەبەر ئەوەی پیاوەکە کەسایەتییکی لاوازی هەیە. ئاخر ئەلسابری بەیەکجار بۆتە مەلای مزگەوتێ و تا مردنیشی هەروا دەمێنێتەوە. ئەو دەیزانی، خەڵک لەبازاڕ گلەیی هەیە، بازرگانەکان جموجۆڵێکی زیاتریان لە مزگەوتێ دەوێ، بەڵام ئاخۆ ئەو چیبکا، کە ئەلسابری کارامە نییە؟ لەم دواییانەدا ئایەتوڵلاکان خودی ئاغاجانیان بانگهێشتی قوم کردبوو. ئەوان بە ڕوون و ئاشکرا پێیانگوتبوو، پێویستە مزگەوت ڕەفتاری خۆی ڕاست بکاتەوە. ئەوان دەیانوسیت دەنگی نارەزایی دژی شا و بەتایبەتیش دژی ئەمریکاییەکان ببیستن. ئاغاجانیش بەڵێنی دابوونێ، مزگەوتێ کاراتر بکا، بەڵام دەشیزانی ئەلسابری ئەو مەلایە نییە، ئەو شتەی پێبکرێ.

قوم مەڵبەندی جیهانی شیعە بوو. گەورە ئایەتوڵلایەکان هەموویان لە قوم دەژیان، لەوێشەوە سەرپەرشتی مزگەوتەکانیان دەکرد. مزگەوتەکەی شاری زەنجانیش یەکێک بوو لە مزگەوتە گرنگەکانی وڵات. هەر بۆیەشە ئایەتوڵاکان دەستپێشخەریان لە مزگەوتەکە دەویست. قوم پرسیاری دەکردن، قوم داخوازی هەبوون، بەڵام ئاغاجان بە هۆی ئەلسابرییەوە نەیدەتوانی هیچ گۆڕانکارییێک لە مزگەوتەکەدا بکا. لەوانەشە ئەلمەککی هەر بۆ ئەوە، ئەو مەلا گەنجەی ناردبێتە ئەوێ.

ئاغاجان ڕووی باسوخواسەکەی گۆڕی و گوتی: "من شتێکی کتوپڕیانەم بۆت هەیە. شتەکە ڕێک لەگەڵ ئەو کتێبەی ئێستا دەیخوێنیتەوە، دێتەوە."

- "ئەوە چ شتێکی کتوپڕیانەیە؟"
- "یەکێک هاتووە داوای دەستی کیژەکەت دەکا."
- "ئەو کێیە؟"
- "مەلایەکی گەنج لە قومەوە! یەکێ لە شوێنکەوتووانی ئەلمەککی."
- "ئەلمەککی؟" مامۆستا ئەمەی بەسەرسامییەکەوە گوت و کتێبەکەی سەرکۆشیشی لەسەر مافوورەکە لە تەنیشت خۆی دانا.

- "ئەو کەسێکە لە سیاسەت ناترسێ، پۆشتەو پەداخە، متمانەی بە خۆیە و مێزەرێکی رەشیشی هەندێ بەلاریی بەستووە." ئاغاجانیش ئەمەی بە خەندەوە بە مامۆستا گوت.

- "باشە ئەو چۆن گەیشتۆتە لای ئێمە؟ مەبەستم، چۆن بە کچەکەی منی زانیوە؟"

- "هەموو ئەوانەی لە شارەکەن، دەزانن ئێوە کیژێکتان هەیە. هەموو کەسێکیش بۆی هەیە داوای دەستی بکا، بەلام پێموایە ئەو مەلا گەنجە هەر بەتەنها بۆ کیژەکەی تۆ نەهاتووە، بەلکو بۆ مزگەوتەکە و مینبەری دوانەکەش هاتووە."

"چی؟"

- "ئاخر بەخۆت دەزانی، هەرشتێک ئەلمەککی لەپشتەوە بێ، بۆنی سیاسەتی لێدەکرێ."

- "ئێمە دەبێ پێش وەلامدانەوەی باش بیری لێبکەینەوە. دەبێ ئەوە روونوئاشکرا بێ، ئاخۆ ئەو کچەکەی ئێمەی دەوێ یان مزگەوتەکە."

- "ئێمە بەدوای ئەوشتەدا دەرۆین و ساغی دەکەینەوە، بەلام من لەو گۆرانکارییانە ناترسم. من ئەوشتانەی دێنە بەردەم رێگام، بەلایانەوە نانێم. من بڕوام بە رێکەوت نییە. ئەو هەر لە ختوخۆرا لەدەرگەی مالی ئێمەی نەداوە، ئەو پڕ بەپێستی مالەکەیە، کالا بەقەد بالایە. مزگەوتەکە لەرابردوودا چەند مەلای جۆشهێنەری بە خۆیەوە بینیوە. من بەخۆم دەچمە قوم و بەتایبەت ئەلمەککی دەبینم و قسەی لەگەلدا دەکەم. خۆ ئەگەر ئەو بە خۆی مەلا گەنجەکەی وەک هاوسەر بۆ کیژەکەمان پەسەند کردبێ، منیش قایل دەبم. من دەرۆم زەنگ بۆ ئەحمەدی کوریشت لێدەدەم. هەرچەندە ئەو لەهەمان خوێندنگای پێشنوێژخوێنان ناخوێنێ، لێ لەوانەیە خالخالی بناسێ."

- "ئەوە بکە، کە بەنیازی بیکەی، بەلام وریاش بە. زۆرت ئاگا لەوەبێ هیچ مارەکردنێکی دینی-سیاسییانە لەگۆرێدا نەبێ. من هەروا لە گۆترەوە کچی خۆم نادەمە مەلایەک. دەبێ ئێمە تەواو لەوە خاترجەم بین، کە کورەکە کورێکی باش بێ. من هیوای مێردکردنێکی باش بۆ کچەکەم دەخوازم. من نامەوێ هەروا لە گۆترە بیدەمە ئایەتوللایەک."

- - "پێویست ناکا لەو شتە بترسی." ئاغاجان وای پێگوتەوە.
- "من لەو ڕۆژانەی دواییدا هەست دەکەم باش نیم، زۆر جاران خەمێک سەر و دڵم دەگری. تادێ ترسنۆکتر دەبم، ترس لە هەموو شتێک، نەخاسمە لە مزگەوتێ، هەندێکجار بەخۆشم نازانم، ئاخۆ لە کاتی خوتبەی ڕۆژانی هەینیدا چی بڵێم."
- "تۆ ماندووی، دەی، چەند ڕۆژێک بڕۆ گوندی جیرا. هەردوو دادەکانیش لەگەڵ خۆتدا بەرە و هەفتەیەک لەوێ بمێننەوە. ئەوە بۆ ئەوانیش باش دەبێ. ماوەیەکی درێژە ئەوانیش نەچوونەتە ئەوێ. هەربەوەی تازە ڕوونتکردەوە خۆت ئازار دەدەی. کەس ئەوەندە خۆی ناشوا، تۆ خۆت لاپەڕگە خستووە، ناشتوانی ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەم ڕەوشەت بەردەوام بی. بڕۆ بۆ گوندی جیریا، بەڵکو لەو ماوەی دادێ زاوایەکی باشت بۆپەیدا بێ و جارجاریش سەری بدەی." ئاغا ئەمەی بە خەندەوە پێگوت و ژوورەکەی کتێبانیشی جێهێشت.



ڕۆژی پاشتر ئاغاجان زەنگی تەلەفۆنی بۆ قوم لێدا و لەگەڵ ئەحمەد قسەی کردن.
- "ئەرێ موحەممەد خالخالی دەناسی؟"
- "باشە تۆ ئەوت لە کوێ ناسی؟"
- "ئەو هاتووە داوای دەستی خوشکی تۆی کردووە."
- "بەڕاستیتە!" ئەمەی بەسەرسوڕمانەوە گوت.
- "شتێکی وا بوو. ئەرێ ئەو چ جۆرە مەلایەکە؟"
- "ئەو مەلایەکی زۆر ناسراوە، من بە شێوەیەکی تایبەتی نایناسم. لەبلەبانێکە بۆ خۆی، لە هەموو شوێنێک رای خۆی دەربارەی شتەکان هەیە. هەر بەڕاستی لە مەلایەکانی دیکەدا جیاوازە. بەڵام زێدەتر ئەو چییە و چی نییە، نایزانم."
- "ئایا ڕای تۆ چییە؟ ئایا ئەو بۆ خوشکەکەت شیاوە؟"

"ئاخر من چی بڵێم، شتەکە زۆر زەحمەتە، ئەوەی من دەیزانم ئەو کەسێکی ڕەق و توندە. خوشکەکەشم تەنها باوکم وەک مەلا دەناسێ. ئەو پیاوانە هەموو پیاوانی ئایینی وەک باوکم وان."

"ئەوەی بۆ من گرنگە، ئەوەیە، خوشکەت لای ئەو بەختەوەر بێ." ئاغاجان وای پێگوت.

"من بە جەنابتم گوت، ئەو گەنجێکی باش و زیرەکە، بەڵام ئاخۆ مێردێکی باش دەبێ بۆ خوشکم ، ناوێرم ئەوە بڵێم."

- "ئەحمەد، پێموابێ بایی پێویستم زانی."

❖

دوای ئەوە زەنگی بۆ شوێنی ئایەتوڵا ئەلمەککی لێدا و وادەی دیدارێکی وەرگرت. ڕۆژی پێنجشەممە، سەرلەبەیانیەکی زوو، شوفێرەکەی ئاغاجان ئەوی گەیاندە وێستگەی شەمەندەفەر.

ئاغاجان کە عەبایەکی شۆڕی لە بەردابوو کلاوێکیشی لەسەر بوو، لە وێستگەکەی شەمەندەفەر لە تروومبێلەکە دابەزی پێی نایە هۆڵێکی گەورە. بەڕێوبەری وێستگەکە ئەوی بینی، جگەرەی دەستی کوژاندەوە و خێرا بەرەو لای ئاغاجان هات.

- "بەیانیت باش. گەشتێکی بە بەرەکەت!" کابرا بەڕێزەوە وای پێگوت.

ئاغاجانیش وەڵامیدایەوە، "ئینشا ئەڵلا."

ئاغاجان دەبوایە بە شەمەندەفەرێکی خۆڵەمێشی درێژ بڕوا، کە هەر نیو سعات دەبێ لە خوارووی وڵاتەوە، لە کەنداوی فارسەوە گەیشتووە و ڕێگاکەشی تا کۆتاییەکەی سەر سنوری ڕۆژهەڵات لەگەڵ ئەفغانستان دەڕوا. هەر ئەو شەمەندەفەرە لە دەیان وێستگە دەوەستێ خەڵک دادەبەزن و سواردەبنەوە. بۆ ئاغاجانیش بەو شەمەندەفەرە تا دەگاتە شاری قوم گەشتێکی سێ سەعاتی ڕەبەق دەخایەنێ.

لە وێستگەکەدا زۆر ڕێبوار وەستابوون، بێژمار خەڵکیش چاوەڕێی گەشتیارانیان دەکرد. سەدان پیاو بە کڵاو، ژنانیش بە عەبای درێژ و زۆریشیان بەرچاوبوون، بەبێ هیچ چارشێو بوون.

هەر جارێک ئەو بە شەمەندەفەر گەشتی دەکرد، دەیبینی، کە ڕووخساری وڵات زۆر گۆڕاوە. ئەوانەی لە باشووری وڵاتەوە دێن ئازادترن زۆریش جیاوازن لەگەڵ خەڵکی زەنجان. تۆ لە قەتاردا ژنان بە بێ چارشێو دەبینی، هەندێ جاریش بە قۆڵڕووتی دێن و دەڕۆن. ژنان بە کلاوێک، ژنان بە جانتایەک، ژنگەلێک پێدەکەنن، هەشیانە جگەرە دەکێشن. ئاغاجان دەیزانی هەموو ئەو گۆڕانکاریانە لەبن سەری شا وەیە، ئەو (شا)یەی بۆتە نۆکەری ئەمریکا. ئەمریکاییەکانیش خەریکی لاوازکردنی ئایینی وڵاتن و کەسیش نییە پێیان بڵێ بەری چاوت دوو بڕۆیە.
بەڕێوەبەری وێستگەکە بانگهێشتی ئاغاجانی بۆ نووسینگەکەی خۆی کرد پیاڵە چایەکی تازە دێمکراوی لەپێش دانا، کاتێکیش وادەی ڕۆیشتنی ئاغاجان هات، بەڕێوەبەرەکە یاوەری ئاغاجانی تا بەردەم واگۆنە تایبەتییەکە کرد، کە بۆ ڕێبوارە گرنگەکان تەرخانکرابوو.



دوای سێ سەعات سەری گومبەزی مزگەوتی فاتیمای زەهرا دەرکەوت.
شەمەندەفەرەکە گەیشتە نێو وێستگەی هێڵی ئاسنینی قوم. کاتێکیش مرۆ لە شەمەندەفەرەکە دادەبەزێ، هەروەک ئەوە وایە پێ بنێیتە جیهانێکی دیکەوە. ژنان هەموویان بە جلێکی ڕەش داپۆشراون و پیاوەکانیش هەموویان بە ردێنن. لە هەر لایەکیش بنواڕی هەر مەلا دەبینی.
ئاغاجان لە شەمەندەفەرەکە دابەزی. لە هەموو لایەکەوە گوێی لەبانگی بانگدەرەکان دەبوو، کە لەسەر بانی مزگەوتەکانەوە قورئانیان لە بڵندگۆدا دەخوێندەوە. لە هیچ شوێنێک وێنەیەکی شا نابینی، لە هەموولا هەر تابلۆی گەورە گەورە هەیە، دەقی ئایەتەکانی قورئانی لەسەر نووسراوە. هەرگیز شا ئەوەی لە کەللە نەداوە سەردانی شارەکە بکا. هیچ دیپلۆماتێکی ئەمریکیش زاتی ئەوە ناکا بە ترومبێل یان بە شەمەندەفەر بەناو شارەکەدا تێپەڕێ.
ئاغاجان تەکسییەکی بۆ مزگەوتەکەی ئایەتوڵلا ئەلمەککی گرت. کاتژمێر کتومت دوانزدەی نیوەڕۆ بوو، کە لەبەردەم مزگەوتەکە لە تەکسی دابەزی.
ئایەتوڵلاش لەگەڵ فەقێیەکانی، لەگەڵ مەلا گەنجەکان بەرەو شوێنی نوێژکردنەکە هات. کاتێکیش ئاغاجان ئەلمەککی بینی سەری بۆ نەوی کرد.

ئایەتوڵلاش دەستی تەوقەی بۆ درێژ کرد، ئاغاجانیش دەستی گوشی، ئیدی ڕەگەڵ ئەوان کەوت و لە ڕیزی نوێژکەراندا جێی خۆی گرت.
کاتێکیش نوێژەکە تەواو بوو، ئاغاجان لە تەنیشت ئایتوڵلا دانەویەوە.
- "بەخێر بێیت! بۆچی هاتویتە ئێرە؟" ئایەتوڵلا وای لە ئاغاجان پرسی.
- "یەکەمین شت ویستم بەدیداری ئەو ڕووخسارە نورانییەت شاد بم، دووەمین شتیش لەبەر موحەممەد خالخالی هاتووم."
- "ئەو باشترین فەقێی من بوو. ئەویش موبارەکبادی منی وەرگرتووە." ئایەتوڵلا وایگوت.
- "کەواتە بایی پێویستم زانی،" ئاغاجان وایپێگوتەوە و شانی ئایەتوڵلای ماچ کرد و لە دواییشدا هەڵسا بڕوا.
لەگەڵ هەڵسانەکەیدا ئایەتولا پێیگوت "بەلام...،"
جارێکی دیکە ئاغاجان دانیشتەوە.
- "ئەو هەمیشە بەدوای ڕێچکەی خۆیدا دەگەڕێ."
- "مەبەستی ئایەتولا چییە؟" ئاغاجان وای لێپرسی.
- "ئێستا، ئەو هەروا ڕەگەڵ مێگەل ناکەوێ."
- "لێتێگەیشتم." ئاغاجان وای گوتەوە.
- "هاوسەرگیرییەکی مومبارەک و گەشتە گەڕانەوەیەکی خۆش،" ئایەتوڵلا لەگەڵ ئەم قسەیەدا دەستی تۆقەی جارێکی دیکە بۆ ئاغاجان درێژکردەوە.



ئاغاجان دڵخۆش بوو بەو قسانەی ئایەتوڵلا دەربارەی خالخالی کردنی، ئاخر ئەو پەسەندنامەی خۆی بۆ دەربڕی. لێ لە ناخی دڵەوە هێشتا هەستی بە نائارامییەک دەکرد.



کاتێک گەیشتەوە ماڵ، بانگی شاباڵی کردە ژوورەکەی خۆی.
- "شاباڵ، دەکرێ بانگی سەدیقە بکەی؟"
کاتێکیش سەدیقە زانی، ئاغاجان دەیەوێ قسەی لەگەڵدا بکا، دەمودەست زانی شتێکی گرنگ لە ئارادایە.
- "فەرموو دانیشە. ئەرێ چۆنی باشی؟ " ئاغاجان وای لێپرسی.

- "بەڵێ، هەموو شتێک باشە."
- "کیژەکەم، گوێبگرە. مەلایەک هاتووە داوای تۆ دەکا."
ڕەنگی ڕووخساری سەدیقە گۆڕا. چەناگەی بەسەر سینگیدا داگرت.
- "ئەو مەلایە."
کچەکە ئاوڕێکی لە شاباڵ دایەوە، کە لەشوێنی خۆی بەخەندەوە گوتی: "مەلایەکی قیت و قۆز!"
سەدیقەش بزەیەکی هاتێ.
- "من چوومە قوم و لەگەڵ ئایەتوڵلاش قسەم کرد. ئەویش قسەی جوانی لەسەر کرد. برایەکەشت هەر پەسەندی کردووە. باشە ڕای تۆ چییە؟ ئایا دەتەوێ شوو بە مەلایەک بکەی؟"
سەدیقە بێدەنگ بوو.
- "بێدەنگی لە پرسی ژن و ژنخوازیدا ڕێپێدراو نییە." ئاغاجان وایپێگوتەوە، "وەڵامەکەتم پێبڵێ."
- "ئەو پیاوێکی کەشخەیە. ئەو جبەیەکی مەلایانەی ڕێکپۆشی لەبەردایە و پێڵاوێکی قاوەیی کاڵی بریقەداریشی لەپێدایە. لە ڕواڵەتدا هیچ خەوشێکی دیار نییە." شاباڵ ئەمەی بە پێکەنینەوە پێگوت.
ئاغاجان وا ڕەفتاری نواند وەک ئەوەی تێبینەکەی شاباڵی هەر نەبیستبێ، بەڵام سەدیقە باش گوێی لێبوو، مسکەش ببووەوە[22].
- "ئەری وەڵامەکەت چییە؟ ئایا لەگەڵ ماڵباتەکەی ئەو بکەوینە گفتوگۆ؟"
- "باشە با وابکەین،" سەدیقە ئەم قسەیەی دوای ساتە بێدەنگییەکی درێژ بە نەرمونیانییەوە دەربڕی.
- "من شتێکی دیکەش دەڵێم" ئاغاجان وایگوت، "ئەو شتێکی جیاوازە وەک باوکت نییە. ئەو شوێنکەوتووێکی ئایەتوڵلا ئەلمەککییە. ئایا ئەو ناوە شتێک لای تۆ دەگەیەنێ؟"
سەدیقە سەیرێکی شاباڵی کرد.
- "ئەو مەلای گوندێک نییە." شاباڵ وای پێگوت.

---

[22] مسکەببووەوە: بزەگرتن، خەندەگرتن.

- "ئەوەش بۆتۆ ژیانێکی بەجۆش و زەحمەت دەبێ." ئاغاجان وای پێگوتەوە، "وادابنێ، بەو جۆرە بژی."
سەدیقە بە دەنگێکی نەرمەوە گوتی: "رای جەنابتان چییە؟"
- "لەسەرێکەوە مایەی شەرەفمەندییە ژیانێکی وات هەبێ. لەسەرێکی دیکەشەوە ژیانەکە وەک دۆزەخی لێدێ ئەگەر لەگەڵیدا هەڵنەکەی." ئاغاجان وای وەڵام دایەوە.
- "دەکرێ یەکەمجار من قسەی لەگەڵدا بکەم؟"
- "بێ هیچ سێ و دوویێک!" ئاغاجان وایپێگوتەوە.



هەفتەیەک دواتر، شاباڵ یاوەری مەلا گەنجەکەی بۆ ژووری میوانان کرد، لەوێدا سەبەتەیەک میوە و چای تازە دێمکراویش ئامادەکرابوو.
دوای ئەوەش، شاباڵ سەدیقەی هێنا و بە خالخالی ناساند. کچەکەش سڵاوی لە خالخالی کرد و لە لای دیواری ئاوێنەبەندەکە وەستا. خالخالیش داوای لێکرد بەڵکو دابنیشێ. ئەویش چارشێوەکەی لادا، بۆ ئەوەی ڕووخسارەکەی باشتر ببیندرێ.
شاباڵیش ئەوانی بەتەنها جێهێشتن و دەرگەکەی بە هێواشی لەسەر پێوەدان. دادەکانیش لای حەوزەکە وەستان و هەموو شتێکیان خستە بن چاودێری خۆیانەوە. فەخری سادات، هاوسەرەکەی ئاغاجانیش لە پشت پەنجەرەی ژوورەکەی خۆی لە نهۆمی دووەمەوە خالخالی بینی. زینەت خانم، هاوسەری مەلا ئەلسابری، لە هۆدەکەی خۆی نوێژی بۆ ئەو هاوسەرگیرییەی کچەکەی کرد و دوعای خێری بۆ کرد. لەوە زیاتر شتێکی دیکەی لە مست نەدەهات، چونکە هەرگیز کەسێک بیروڕای ئەوی نەدەپرسی. رامانەکەی ئەو نەیدەخوارد. ئاخر هەر فەخری سادات بوو لەو ماڵەدا، قسەی سواربوو.
کچەکانی ئاغاجانیش لەپشت پەردەی پەنجەرەکان وەستابوون، بۆ ئەوەی هەرکاتێک خالخالی ژووری میوانانی جێهێشت، ببینن.
دیدارەکەی نێوان خالخالی و بووکەخانی ئایندە نیو سەعاتێکی خایاند، ئینجا دەرگای ژووری میوانان کرایەوە و سەدیقە هاتەدەر. ڕووخساری سەدیقە

بەختەوەرانە دیاربوو، سەیرێکی دادەکانی کرد و بەرەو و نهۆمی سەرەوە ڕۆیشت.
شاباڵیش لەگەڵ خالخالی دەورەیەکیان بەنێو خانووەکەدا کرد.
- "ئەوانە دادەکانی ماڵەکەمانن."
فەخری ساداتیش هاتە خوار.
- "هاوسەری ئاغاجان، شابانووی ماڵێ." شاباڵ ئەمەی بە خەندەیەکەوە پێگوت.
خالخالی بێ ئەوەی چاو لە خانمەکە بکا سڵاوێکی لێکرد. کچەکانیش هاتن و خۆیان بە خالخالی ناساند. کاتێکیش هەموانی دیتن، شاباڵ مەلاکەی بردە بازاڕ، بۆ ئەوەی ئاغاجان باقی قسەکانی لەگەڵدا بکا و شتەکەی لەگەڵدا ببڕێنێتەوە.
یەک دوو ڕۆژ دواتر، ئاغاجان لە ژووری کارکردنی خۆی لە ماڵ، پێشوازی لە خالخالی و باوکی کرد، لەو دانیشتنەدا مەلا ئەلسابریش ئامادەبوو. سروشتی گفتوگاکانی ئەوان لەگەڵ هی قسەباسی ژن و ژنخوازی دابونەریت جودا بوو، قسەی خۆیان بە پارە و ئاڵتونەوە خەسار نەکرد. کاکی زاوا دانەیەک لە قورئان بە بەرگێکی زێڕین پێشکەشی بووکەخان دەکا، ئەویش بە چارشێوێکی سپی و دیوانێکی شاعیری سەدەکانی ناوەڕاست، حافزی شیرازی ماڵە باوانی جێدێڵێ. بەڵام خۆ هەمووان دەیانزانی، ماڵباتە دەوڵەمەندەکانی شارەکە کچەکانیان بەدەستی بەتاڵ بۆ ماڵە نوێکەیان بەڕێناکەن. ئەوە هەر قسەی لەسەر نەبوو، کە هەموو شتێکی پێویست بە نۆ ماڵەکە دەدەن. لەوە زیاتر گفتوگۆیان دەربارەی مزگەوت، کتێبخانە، کتێبەکان و ژێرزەمینە کۆنەکە، بانگدەرە نابیناکە و هەڵبەت دەربارەی دارکاژە پیرەکە و دیارکردنی ڕۆژێکیش بۆ زەماوەندەکە.
"مومبارەکە ئینشاڵڵا." پیاوەکان وایان بەیەکدی گوت و دەستی یەکدیشیان گوشی.
کاتێکیش ئەو باسوخواسە بەسەرچوو، سەدیقە بە خۆی و سینیەکی زیوین کە پێنج پیاڵە زیوینی پڕ چای لەسەر بوو، چووە ژووری میوانان.

وادەی زەماوەندەکەشیان خستە ڕۆژی لەدایکبوونی فاتیمەی زەهرا. ئەوەش ڕۆژێکی خۆش بوو، هەوایەکەی مەیلە و گەرم دەبێ، لێ ئەو بایەی لە چیاکانەوە دەهات، وایدەکرد هەندێ فێنک بێتەوە. تۆ لەو کاتدا هەستێکی وات بۆ پەیدا دەبێ کە پیلی بووکەکەت بگری و خۆت لە بەتانی هاوینە تەنکەکاندا وەرپێچی. لەو ماوەیەدا خەڵک بە زۆری لەسەر بانان دەڕازا.[٢٢] ئیدی زۆر خێوەتی تەنکت لەسەر بانان دەبینین، هەڵدرابوون. ئەوانەش ئەو خێوەتانە بوون کە بووک و زاوای تێدا دەنووستن.

بۆ زەماوەندەکەش، هەر دەبێ ئاهەنگێکی خنجیلانەی شیاو ڕێکبخرێ، کە خانەوادە گرنگەکانی شار و بازاڕەکە بانگهێشت بکرێن. خۆ ئەوە هەر زەماوەندێکی گۆترە نییە، بەڵکو ئەوە زەماوەندی کیژەکەی مەلا ئەلسابرییە. زاواش هەروا مامۆستا (وانەبێژێک) یان فەرمانبەرێکی میریی نییە. تەنانەت ئەو بازرگانیش نییە، بەڵکو مەلایەکە بە مێزەرێکی ڕەشەوە، کە لە قومەوە هاتووە.

## زەماوەند

ڕۆژی زەماوەندی بووک گواستنەوەکە هات.

زینەت خانم، بانگی کچەکەی خۆی کرد، دەرگاکەی داخست و لای خۆی دانیشاند، ماچێکیش لێکرد، ئینجا لێیپرسی: "ئەرێ شادمانی بە شووکردن بە خالخالی؟"

- "چیبڵێم، نازانم..."

- "پێویستە شادمان بی، ئەو پیاوێکی کۆکە. باوکیشت دەڵێ ئەو پیاوێکی زۆر بەرزخوازە."

- "جا ئەزیش هەر بۆیە دەترسم."

"منیش کاتێ مێردم بە باوکت کرد، دەترسام. هەموو کیژێک کاتێک لە هیکەوە ڕووبەڕووی پیاوێکی نەناسراو دەبێ و لەگەڵیدا بڕوا، دەترسێ؛ بەڵام هەر کاتێ ئێوە بەیەک گەیشتن ترسەکە دەڕەوێتەوە. خۆ لە کۆتاییشدا دەبێ هەموو کیژێک شووبکا و ماڵە باوانی جێبێڵێ."

---

[٢٢] دەڕازا: دەخەوت.

زینەت خان وشەی ئارامهێنەرانەی چرپاندنە گوێی کچەکەی، بەلام لەناخی دڵی خۆشیدا گومانێکی هەبوو. نەشیدەزانی گومانەکەی لەچییەوە سەرچاوەی گرتووە. هەر زووش بیرەوەریەکانی سەردەمی بەرێی هاتنەوە یاد. لێ شتێکی وای نەکرد سەدیقە هەستی پێبکا.

- "من هێشتاش باوەڕ ناکەم." دایکەکە بە کچەکەی گوت.
- "باوەڕ بەچی ناکەی؟"
- "هەروا، کە تۆ گەورە بوویت، وادەی شوکردنت هاتووە و بەم زووانەش دەچییە ماڵە مێردی خۆت."
- "باشە بۆچی دەنگەکەت بۆنی خەمباریی لێدێ؟"

فرمێسک لە چاوەکانی زینەتخان قەتیس مابوون

- "بۆ بەختەوەریی تۆ." وای پێگوت و کیژەکەی خۆی راموسی.



زینەت هەر لەوکاتەی سەدیقەی ببوو، دەترسا لەدەستی بدا. لەوە دەترسا لەهیکەوە بمرێ، لەسەر جێگای رەق ببێتەوە، یان لە باخچەکە لە لای حەوزەکە بکەوێ و بمرێ.

تافی منداڵێتی سەدیقە بۆ زینەت ساڵانێکی ڕەش بوون. ترسەکە بە تێپەڕینی ڕۆژگاریش نەدەڕەویەوە. شەوانە لەترسی خەونی ناخۆش و مۆتەکەی شەو، نەیدەویرا بچێتە سەر جێگا و بخەوێ. زینەت خان دۆتمامی مەلا ئەلسابری بوو، لە تەمەنی شازدە ساڵیدا مێردی پێکردبوو. سەرەتا کچێکیان بوو بەناوی عەزرا[٢٤]. کیژەکە پێنج ساڵان لە سەدیقە هەراشتر بوو، لە تەمەنی هەژدە ساڵیشدا بوو کە مێردی بە پیاوێکی خانەوادەی زینەت خان کرد. هەنووکە عەزرا سێ منداڵی هەن و لە گەڵ پیاوەکەی لە شاری کاشان دەژی. دوای ئەو کچە، زینەت خان کوڕێکی بوو، ناوی (عەباس)یان لێنا. ئەو منداڵەش دەستبەجێ بووە جێهێوای خێزانەکە، دواتر ئەو جێگەی ئەلسابری دەگرتەوە. بەلام لە ڕۆژێکی گەرمی هاویندا، کاتێک منالەکە بەتەنیا لەگەڵ دایکی لە ماڵ بەجێهێڵرابوون، شتێکی سامناک قەوما.

---

[٢٤] Ozra

منداڵەکە تازە وەسەر پێیان کەوتبوو، بەلۆژە لۆژ و بە خۆشی و پێکەنینەوە بە دوای پشیلەکانی ماڵەکە دەکەوت. لەساتێکدا زینەت خان ئاگای لێبڕا، بە خۆی لێ وەسەر ژووری سەرێ کەوت و بەتەواوی ئاگای لە ڕۆڵەکەی نەما. دوای ماوەیەک لە خامۆشی، لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوەی کرد، بەڵام خۆ عەباس لە هیچ کونان دیارنەبوو. بە پەلەپڕوزێ لە پەیژەکان دابەزی، بینی پشیلەکان لە لای حەوزی ئاوەکەوە هەڵکوڕماون. تەرمی بچکۆلەکە سەرئاو کەوتبوو. بەقیژە و هاوارەوە منداڵەکەی لەنێو ئاوەکە ڕاکێشایە دەرێ. چەند پیاوێک، کە گوێیان لە هاتوهاواری زینەت ببوو، لەسەر بانی مزگەوتەکە دەرکەوتن و بە هەڵەداوان بە هاواری ژنەکەوە هاتن. ئەوان دەستیان لەسەر زگی منداڵەکە دانا، بەڵام بێ سوود بوو. زینەت قیژاندی. ئەوان منداڵەکەیان بە قاچەکانی گرت و لەهەوادا سەربەرەوخوار ڕایانتەکاند، لێ ئەمەش دادی نەدا. زینەت هەر شین و ڕۆڕۆی بوو. پیاوەکان ئاگرێکیان کردەوە، منداڵەکەیان لەبەر گوڕیە ئاگرەکە گەرمکردەوە. لێ کارلەکار ترازابوو. زینەت هەر شین و شەپۆری بوو. پاشان پیاوەکان منداڵەکەیان لەسەر زەوی درێژ کرد و چارشێوەکەی زینەتیان بەسەر دادا. عەباس، ئەو ئومێدەی ماڵ، ڕۆژی ئاوابوو، مرد.



کەس سەرکۆنەی زینەتی لەسەر ئەوەی ڕوویدا، نەکرد. لێ ئەو ئەوەندە تۆقابوو، ببووە سۆفی گۆشەگیری ژوورەکەی بوو.

ئاغاجان چووە لای و بە دووروودرێژی قسەی لەگەڵدا کرد: "زینەت، من ملکەچی ئیرادەی خوام. تۆش دەبێ هەر هەمان شت بکەی."

لەوکات بەدواوە ئیدی باسی عەباس لە ماڵەکەدا نەکرا. چەندان مانگ ئەوان ئاوا بە کڕوبێدەنگی مانەوە، هیچ وشەیەکی دەربارەوە نەگوترا. زینەت قڕوقەپییەکەی وەک سزایەک دەبینی، سزایەکی زۆر قورسیش.

ساڵێک دوای ئەوە، زینەت دیسان زگی پەیدا بووەوە، ئەمجارەیان سەدیقە لەدایک بوو. ئەوسا لە ژوورەکەی خۆی دەرچوو، لە کاروباری ناندینەکەدا یارمەتی دادەکانی دەدا. دوای تێپەڕینی دوو ساڵی دیکە، دوای لە دایکبوونی

ئەحمەد، زینەت پشتی لەڕابردوو کرد و گەڕایەوە سەر ژیانە ئاساییەکەی جاران.



ئاخۆ شتەکە پەیوەندی بە بەدبەختییەوە هەبوو یان نا، بەڵام هەرگیز زینەت وەک جاران ڕۆڵی خۆی لەنێو ماڵەکەدا نەبینیەوە. ئەو لەژێر سایەی فەخری ساداتدا دەژیا. هەستی دەکرد کەسی پلە دووە لەوێدا.
خۆ ئەگەر فەخری سادات شتێکی وای لێبقەومابایە، ئەوا ئاغاجان لەپاڵی دەوەستا، شتێکی وای دەکرد ژانوناسۆرەکەی لێکەم دەکردەوە.
لێ گەلۆ، ئەلسابری کەسێکی لاواز بوو، هەرگیز لۆمەی زینەتی نەکرد، بەڵام خۆ هەرگیزیش لەساڵە سەختەکانیدا پاڵپشتی نەکرد. ئەو هەرگیز ژنەکەی خۆی لە باوەش نەدەگرت، قسەی ئەڤینیانەی بە گوێدا نەدەچرپاند. ئەوسا خۆ ئەگەر پیاوەکەت فەرامۆشت بکا، ئەوا خەڵکانی دیکەش پشتگوێت دەخەن. خۆ گەر پیاوی خۆت نەتبینێ و بۆت ڕانەوەستێ، ئەوا لەچاوی ئەوانی دیکەشدا نابیندرێی. ڕەوشەکەش هەر وەک هەنووکە تێپەڕی. ئاخر کیژەکەی وا بەمێرد دەدرێ، کەچی هیچ کەسێک پرس و ڕای پێنەکرد.
"ئەوەش قەیناکا،" لەبەردەم ئاوێنەکەدا، زینەت چاوە فرمێسکاویەکانی دەسترینەوە گوتی، "بەڵام خۆ ڕۆژی خۆی هەر دادێ."



ماڵەکە زۆر جەنجاڵ بوو. لە دیوی ناوەوەی حەسارەکەدا، پیاوەکان پەردەیەکی درێژیان هەڵواسیبوو، ئەو پەردەیەی پیاوەکان لەمزگەوت بۆ جیاکردنەوەی پیاوان لە ژنانیان بەکاردەهێنا.
لەوێدا مافووری گرانبەها ڕاخرابوون، پیاوەکان دیوارەکانیان بە تابلۆ و لافیتە داپۆشیبوو، کە دەقی پیرۆزی لەسەر نەخشکرابوو.
پارچە قوماشی ساتانی ئاوریشمی بە قەدی دارەکانەوە هەڵواسرابوو، کە شیعری شاعرانی ناوداری لەسەر نوسرابوو. خەڵکەکە داوای ناسراوترین قورئانخوێنیان کرد، تا چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز بخوێنێ. کاتێکیش قورئانخوێنەکە، ئایەتە سەرواداراەکانی بە تەجوید دەخوێندنەوە، نەخش و کاریگەری لەسەر هەموو ئامادەبووان دانا.

ئاغاجانیش قاتە نوێکەی پۆشیبوو. سەری سەرتاشەکەشی دابوو. ئەو حەزی لە جلوبەرگی نوێ و خاوینوبـاوین دەکـرد و بەهـۆی فەخـری سـاداتی خێزانیشـیەوە یەکـێ بـوو لەو بازرگـانە کەمە پۆشـتەوپەرداخانەی بـازاڕ. پێشـخزمەتچیەی کە لە بـازاڕ هەیبـوو، هەمیشـە مشـووری بـۆیەکردن و بریقەدارکردنـی پێڵاوەکـانی دەخـوارد و دادەکـانیش کراسـەکانیان بـۆ ئوتـۆ دەکرد. فەخری سادات هەندێ جار بە گاڵتەوە پێیدەگوت: "تۆ قۆزترین پیاوی شارەکەی. کاتێکیش کە تازە ریشت تاشیبێ و کڵاوشاپۆ[25]شت لەسەرنابێ، کەس بڕواناکا کە قورئانیشت ئەزبەربێ!"



مامۆستا هێشتا هەر لە حوجرەکەی خۆی بوو. کاتێکیش بەم زووانە هەر هەموویـان بێـنە ژوور، ئەویـش دێـتە دەر، خـۆی نیشـان دەدا و دواتـر دەکشێتەوە ژووری کتێبەکانی خۆی.

ئاهەنگەکە دەستی پێکردبوو، بەرەباب و گرنگترین پیاوانی شارەکە وردەوردە پەیدادەبوون. کە پیاوەکـان دەهـاتنەژوور، دەچـوونە لای ڕاسـتی حەوشـەی نـاوەوە، لەوێ لە لای دارکـاژە پیـرەکە، لە دەورەی حەوزەکە لەسـەر کورسیەکان دادەنیشتن. ژنەکانیش هەندێ دوورتر دەڕۆیشتن، ئەوان لە پشت پەردە گەورەکەدا ئاودیودەبوون، لەوێ لەنێو باخچە جوان و قەشـەنگەکەدا، کە دەسـتکردی مـام ڕەمەزانـی بـاخەوانی مـاڵەکە بـوو، دادەنیشـتن؛ ئـاخر ئەو باش خزمەتی باخچەکەی دەکرد. هیچ کەس منداڵی لەگەڵ خۆیدا نەهێنابوو، ئەوەش شتێک بوو باوبوو. لە باری ئاساییدا منداڵ میوانی یەکەمین بوون، بەڵام لەو بۆنە تایبەتیانەدا جێیان نەدەبۆوە. میوانەکان بە چـا و شـیرنەمەنی بەتام خزمەت دەکران. هەروەهـا چ لە لای پیاوان و چ لە لای ژنان بە گوڵاو دەستیان دەڕشاندن.

هەموویان پەرۆش بوون خاڵخاڵی ببینن، نەخاسمە ژنەکان.

ئیـدی لەوکـاتەدا تڕومبێلـی سـەرۆکی شـارەوانی لەبەر دەرگەدا ڕایگـرت. ئاغاجان بەخێرهاتنی کرد. کاتێک ئەوهـات و لە لای حەوزەکە جێیگرت، پیاوە ئامادەبووەکانی ئەوێ لە بەری هەڵسان.

---

[25] نەو کڵاوەی پیاوان لە سەردەمی شا لەسەریان دەنا.

دوای ئەویش ترومبێلی دووەم لەبەر دەرگاکەدا وەستا، ئەوسا هەمووان زانیان کە هی زاواکەیە. ئاغاجان بەپێر خالخالیەوە چوو، هێنای و لەسەر کورسییێک لە تەنیشت سەرۆکی شارەوانی داینیشاند.
سەرۆکی شارەوانیش پیرۆزبایی لە خالخالی کرد، بەڵام ئەو مەلایە گەنجە ڕەفتارێکی واینواند وەک ئەوەی یارۆی شارەوانی هەر نەدیبێ و نەیناسیبێ.
ئاخر ئەو، سەرۆکی شارەوانی بە نۆکەرێکی شا دەبینی، نەدەبوایە هەرگیز لە تەنیشتیشی دانیشتبایە، چجای ئەوەی لەبەری هەڵسێ و تۆقەشی لەگەڵدا بکا.
سەرۆکی شارەوانیش لەشوێنی خۆی بێدەنگ دانیشتەوە و پاشتر هیچی نەگوت. ئاغاجانیش لەگەڵ یەکێکی دیکە سەرقاڵی گفتوگۆ بوو، ئیدی ئەوەی لەنێوان شارەوان و خالخالیدا ڕوویدا، نەیبینی.
لە سەروبەندی سەعات سێشدا پیاوێک لە دەزگای باری شارستنییەوە بە خۆی و دوو یاریدەدەری ڕیشدارەوە هات. هەریەکێک لە یاریدەدەرەکانی تۆمارنامەیەکیان لە بن هەنگڵدا بوو، ئەوان لەبەردەم مێزێکدا دانیشتن، زۆری نەدەبرد ڕێورەسمی واژۆکردنی بەڵگەنامەی هاوسەرایەتی جێبەجێ دەبوو.
بەگەیشتنیان دەستبەجێ تۆمارنامەکانیان کردنەوە و ڕێرەسمەکە بە فەرمی دەستپێکرد. لەو کاتەدا هەراوهەنگامەیەک لەدیوەکەی دیکەی پەردە گەورەکەدا پەیدا بوو، ژنان هاواریان دەکرد: "سەلام لە(بر) فاتیما، سەلام لە(بر) فاتیما!"
هەمووان تێگەیشتن، کە بووکەخان گەیشتووە و لەبەردەم ئەو مێزە لەسەر کورسییێک دانیشت، کە کاربەدەستانی باری شارستانی لەوێ سەرقاڵی نووسین بوون.
بووکەخان لەوە جوان و شەنگتر نەبوو. فستانێکی شیرڕەنگی لەبەردابوو، چارشێوێکی تەنکی گوڵگوڵی جوانیشی بەسەر سەر دادابوو. بە وریاییش مەسکارەی کردبوو، دەشبیندرا، کە موەکانی برۆی هەڵگیراون. بووکەخان زیاتر وەک ژنێکی گەنج دیاردەکرا وەک ئەوەی کیژۆڵەیەک بێ.
کاربەدەستەکەی باری شارستانی، پرسیاری بەڵگەنامەی لەدایکبوونی لە بووکەخان کرد. ئاغاجانیش چەند پارچە کاغەزێکی لە گیرفانی خۆی دەرهێنان و ڕادەستی پیاوەکەی کردن. پیاوەکەش لەسەرخۆ هەموو

زانیارییەکـانی لە دەفـتەرە گەورەکەی بەردەمـی تۆمـارکردن، ئینجـا هەمـان داواشی لە زاوا کرد.

خالخالی بەرکەکانی خۆی پشکنین، بەڵام هیچی لێدەرنەهێنا و بەنەرمی لەگەڵ باوکی دوا. ئەویش لەنێو گیرنافەکانی خۆیدا گەڕا. هەمووان تەماشایان کرد و چـاوەڕوانی کاغەزەکانیـان بـوون، بەڵام ئەویـش هـیچ کـاغەزی لەگەڵ خـۆی هەڵنەگرتبوو.

- "مـن کاغەزەکـانم لەبیرکـردوون." خالخـالی وای بە فەرمـانبەرەکەی بـاری شارستانی گوت.

لەپشـــت پەردەکەوە، دیـــاربوو ژنـــان زۆر بە ســـەرقاڵییەوە کاردانەوەیـــان پەیدابوو.

ئاخر ئەوە ڕەوشێکی نەخوازراوی ڕێپێنەدراو بوو.

پیـاوەکەی بـاری شارسـتانی هەنـدێ بیـری لێکـردەوە، پاشـان گـوتی: "بەڵکو شتێکی دیکەت پێبێ کە بتناسێنێ؟"

جـارێکی دیـکە خالخـالی بەرکەکـانی خـۆی گەڕا، بە نەرمـی لەگەڵ بـاوکی چرپەچرپێکی لێوەهات. نەخێر، ئەو هیچ ناسنامەیەکی پێ نەبوو.

دیسان بردەبرد لەپشت پەردەکە، لەدیوی ژنـان پەیـدابۆوە. ئاغاجـان چـاوێکی لە سەرۆکی شارەوانی کرد و بەدگومانی لەچاوەکانـدا خوێندەوە. چاوێکیشـی لە یەک دوو پیاوە بەرچاوەکانی بازاڕ کرد؛ نەخێر، هـیچ کەس ئەم ڕەفتـارەی پێ پەسەند نەبوو. ئاخر چۆن دەبێ، خالخـالی بیەوێ ژن بێنێ و بەڵگەنـامەی پێویستیشـی لە باخەڵـدا نەبـێ؟ هەمـووان چـاوەڕێی کـاردانەوەی ئاغاجانیـان دەکـرد. ئەویـش لەوە دەترسـا نەبـادا خالخـالی بە ئەنقەسـت بەڵگەنامەکـانی لەگەڵ خۆی نەهێنابێ. بەڵکو ویستبێتی بەمجۆرە ماڵباتەکە لە قوژبن بپەستێ و بەبێ تۆمارنامەی فەرمی، کچەکەیان بێنێ. ڕەنگبێ ئەوە لە دێهات روبدا و باوبێ، لەو کاتەدا مەلای گونـد سـوورەتی نیکاحی دەخوێنـد و بـووک دەیگوت بەڵێ و بەدوای ئەویشدا زاواکەش دەیگوت بەڵێ، ئیدی کـابرا سـەرجێیکردنی بووکەکەی بۆ واڵادەبوو. لەم جۆرە ژنهێنانەدا، پیاوەکە سـەربەست بوو چەند ژنێکی دیکەش بێنێ. لێ گەلۆ ئەم جـۆرە ژنهێنـانە لە شـاردا باویـان نەمابوو،

ئەوجۆرە ژنهێنانە بە هیچ شێوەیەک لە لای ماڵباتێکی گرنگی وەک ئاغاجاندا ڕێگەپێدراو نەبوو.

- "کێ ناڵێ کاغەزەکانت لە ماڵی باوکت دانەناون." ئاغاجان ئەمەی بە خالخالی گوت.

- "نەخێر، پێموانییە لەوێ بن، بەڵکو لە شاری (قوم)ن."

ئاغاجان چووە لای مەزنی شارەوانی شارەوانی دانیشت و یەک دوو قسەی لەگەڵ کرد.

- "تۆ ڕاست دەکەی." شارەوانیش وایپێگوتەوە، "تۆ نابێ ڕێگە بەم شتە بدەی!"

پاشان، ئاغاجان چووە لای ئەلسابری، کە تازە لە کتێبخانە هاتبووەدەر و لەگەڵ مجێورەکە لای دارکاژەکە وەستابوو. "ڕەوشەکە وابەڕێوە ناچێ،" ئاغاجان وایگوت، "ئەو هەر دەبێ بچێ کاغەزەکانی بهێنێ."

- "کەواتە ئەو دەبێ بچێتە قوم، کە دەشگەڕێتەوە دەبێتە نیوەی شەو. لەوانەیە واباشتر بێ سورەتی نیکاح پێشتر بخوێندرێ. ئەوسا لەسەرخۆ بڕواتە قوم و کاغەزەکانی بێنێ."

- "نەخێر، چونکە ئەگەر ئێمە هەر سورەتەکەمان خوێند، ئەوا هەموو شتێک تەواو دەبێ. ئەوسا ئەو ئەو کچەکەی ئێمەی لەباخەڵدا دەبێ، ئێمەش ناتوانین هیچ بکەین. ئەگەر ئەویش کچەکەی برد، ئەوا بە دەستبەتاڵی بە دوایدا دۆش دادەمێنین. خۆشت ئەمە لە من باشتر دەزانی."

- "بەڵێ ڕاست دەکەی. کەواتە بابڕوا کاغەزەکانی بهێنێ." ئەلسابری وای وەلامی ئاغاجان دایەوە و بە خۆیشی گەڕایەوە نێو ژووری کتێبان.



ئاغاجان چووە لای کاربەدەستەکەی باری شارستانیی و پێیگوت: "بەبێ بەڵگەنامەی پێویست مارەکردن دروست نابێ!"

ئیدی هەمووان لەگەڵ یەک قسەیان کرد.

ئەوسا ئاغاجان ڕووی لە خالخالی کرد و بە خۆگیرییەوە پێیگوت: "من چاوەڕێ دەکەم. ئێمە چاوەڕێ دەکەین. تۆ دەتوانی بچیتە قوم و کاغەزە پێویستەکان بێنی،"

خالخالی چاوەڕوانی ئەو کاردانەوەیەی نەدەکرد.

"بەلام خۆ ئەو شتە نابێ! هەنووکە هیچ شەمەندەفەرێک ناڕواتە قوم. منیش متمانەم بە پاسەکان نییە."

"من شتەکە رێکدەخەم." ئاغاجان وایپێگوتەوە.

دیسان بەرەو لای کابرای شارەوان ڕۆیشتەوە و قسەی لەگەڵدا کرد. ئەویش چەند جارێک سەری ڕەزامەندی بۆ قسەکانی لەقاند.

"شتەکە ڕێکخرا." ئاغاجان وای گوت، "پاش کەمێکی دیکە جیبێک دێ بۆ ئەوەی هەڵت بگرێ، شوفێری شارەوان دەتبا. ئێمە ئارام دەگرین، دەبێ تۆش دەستوبرد بکەی."

خالخالی دەمی گیرا. لەکۆتاییدا بەتوڕەیی بەرەو دەرگە ڕۆیشت و چاوەڕوانی جیبەکەی کرد. بۆ ساتەوەختێکی چاونوقاندن ئاغاجان بیری لەشتێکی بلّح کردەوە، کە لە چاوەکانی خالخالیدا خوێندبییەوە، وەک ئەوەی دەمامکەی لەسەر ڕووخسار لاکەوتبێ، ڕووە ڕاستەقینەکەی بەدیارکەوتبێ.



سەرەتا مەبەست نەبوو میوانەکان بۆ خواردنی شێوان بمێننەوە، بەلام ئاغاجان ڕووی لە ئامادەبووان کرد و گوتی: "تکایە لێمان مەگرن. ئەو شتانە هەر ڕوو دەدەن، من هەمووتان بۆ خواردنی شێوان بانگهێشت دەکەم." ئیدی دەستبەجێ شاباڵی ناردە چێشتخانەی بەرامبەر مزگەوتی، تا مشووری خورادنەکە بخۆن.

فەخری ساداتیش ئاغاجانی بانگی ژوورەکەی خۆی کرد، ویستی هەندێ قسەی لەگەڵدا بکا:

- "ئایا پێتوانییە کە دلڕەقانە لەگەڵی جوولایتەوە؟"

- "لەوانەیە پێویست نەکا وابڵێم، بەلام متمانەی پێناکەم."

- "تازە متمانەی پێناکەی؟"

- "ئاخر ئەو مەلایەکی ئاسایی نییە، ئەو زمان تیژە، من وام لێچاوەڕوان نەدەکرد، بە بێ بەڵگەنامەی پێویست لەپێشماندا قیتبێتەوە. ئەو نەخشەیەکی هەر هەیە، ئەمما نازانم چی لەبن سەردایە."

- "ئێوەی پیاوان هەمیشە هەر باسی نەخشە و نەخشەکاری دەکەن، ئاخر دەبێ چ پلانێکی هەبێ؟"

- "ئێستا ئیشەکە براوەتەوە، ئەویش بەرەو قوم بە ڕێگاوەیە. دەبێ حەوسەڵەمان هەبێ."

- "هەمیشە کار هەر وا دەڕوا. پیاوان بڕیاردەدەن و ژنانیش دەبێ ئارام بگرن."

- "ئاخر ئەوە ڕاست نییە. خۆ ناکرێ لێبگەڕێم هەروا لەمفت کچێکی ماڵەکە بیا و بڕوا. من پێموابوو تۆ لە مەبەستەکەم دەگەی."

- "من لێت تێدەگەم، بەڵام چی بەو ژنانە بڵێم؟" ئەمەی بە شێوەیەک گوت بێ ئەوەی تەماشای مێردەکەشی بکا.

- "خۆت دەزانی چی بەو ژنانە دەڵێی. بەخێریان بێنە، لەگەڵیاندا نان بخۆ، خەندەیان بۆبکە، وایان نیشان بدە کە تۆ لەو سەرەوە هاتویتەوە و حەوسەڵەت لەدەست نەداوە."



سەعات دە و نیو بوو، هێشتا سەروسەکوتی خالخالی پەیدا نەببووەوە. میوانەکان لە خواردنی شێوان ببوونەوە. پێشخزمەتچیەکان چەند جارێک بە خۆیان و سینی چای تازە دێمکراو خزمەتی مێوانەکانیان کرد. نێرگلەکانیش هەر ئەم دەست و ئەو دەستیان دەکرد. بەرپرسی شارەوانی کە یەک دوو سەعات بوو ڕۆیشتبوو، جارێکی دیکە گەڕابووەوە. پیاوەکانی بازاڕ دوای نانخواردن بە قەراخ ڕووبارەکەدا پیاسەیان دەکرد. ئەوان تێگەیشتنی خۆیان بۆ ئاغاجان نیشاندا: ئەوانیش بان هەر هەمان شتیان دەکرد.

شاباڵ چووبووە سەربانی مزگەوتێ، ڕێوبانەکانی خستبووە ژێر چاودێریەوە. لە دواییدا کە ترومبێلەکەی بینی، ئاماژەیەکی بۆ ئاغاجان کرد.

تاوێک دواتر جیبەکە لەبەر شیپانی دەرکێ ڕاوەستا. خالخالی لێیدابەزی و ڕاستەوڕاستیش کاغەزە پێویستیەکانی لەسەر مێزی بەردەمی کاربەدەستی باری شارستانی دانان.

یەکێک لەولاوە هاواری کرد: "سەڵەوات لەسەر موحەممەد..."

هەمووان بەدوایدا گوتیانەوە، "سەڵەوات لەسەر موحەممەد!"

ئاغاجان خەندە گرتی. پیاوەکانی بازاڕیش لە پیاسەکەیان هاتنەوە. قورئانخوێنەکەش دەستی پێکرد:

والشَّمْسِ وَضُحَاهَا (١)
والْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا (٢)
والنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا (٣)
واللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا (٤)
والسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا (٥)
والْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا (٦)
ونَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧)
{سوێند بە خۆر و تیشکی!
بەم هەیڤەش کە بەدوویدا دێ!
سوێند بەو ڕۆژەش کە تیفتیفەی هەتاو دەدا!
بەو شەوەش کە دایدەپۆشێ!
بەو ئاسمانە و بەوەی ئەوی وەدیهێنا!
بەو زەمینە و بەوەش کەوا پانی ڕاخست!
بە گیانی مرۆ و بەوەش کە ڕێکی خستووە!}

## ماسیەکان

خالخالی بووکەکەی لەگەڵ خۆ بردە قوم، لێ کەس نەیدەزانی لە کوێ دەژین. خانەوادەکەی چاوەڕوانی ئەوە نەبوون، کە ناوونیشانەکەی بە نهێنی بمێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان لەو پرسەدا هەڵنەقورتاند.

- "قەیناکا،" ئاغاجان وایگوت، "دەرگای ماڵەکەمان هەمیشە کراوەتەوە."

خالخالی خوێندنی مەلایەتییەکەی تەواوکرد، بەڵام هێشتا مزگەوتێکی دەستنەکەوت تا مەلایەتی خۆی تێدا بکا. خۆ ئەگەر خاوەنی مزگەوت بی و پێشنوێژ و وتارخوێنێکی جێگیر بێ، ئەوا بژێوی ژیانت مسۆگەرە، بەدەر لەوە ژیانت بەندە بەو باربووەی، کە لە لایەن ئایەتوڵلایەکەت پێتدەبەخشرێ. ئاغاجان خوازیار بوو کۆمەکی دارایی‌یان بکا، لێ خالخالی رەتیدەکردەوە. سەرباری ئەوەش هەر یارمەتی دان، لە ڕێی ئەو تۆڕە پەیوەندییە بەربڵاوەی هەیبوو، هەمیشە دەیزانی مزگەوتێک ببینێتەوە، کە خالخالی تێدا دابمەزرێنێ و مەلایەتیەکەی خۆی تێدا بکا.

سەدیقەش ناوبەبەناو دەهاتەوە ماڵە باوانی، بەڵام لەبەر خالخالی نەدەکرا پێیان بڵێ، ئاخۆ لە کوێ دەژین. هەندێ جار لای دایکی گلەیی لەو شوێنەی دەکرد، کە لێی دەژیا، بەوەی شوێنەکە بچکۆلانەیە و هەندێ ساردە و هێشتاش نەیتوانیوە لەگەڵ دەرودراوسێدا هاموشۆ پەیدابکا.

- "ئاخر لەوێ لە قوم، شتێکی دیکەیە." کچەکە وای بەدایکی گوت، "هەر کەسێ بە خۆی و خێزانەکەیەوە لە ماڵە بچکۆلانەکەی خۆی دەژیێ، دەرگاکان داخراون و هەمیشەش پەردەکان دادراونەتەوە."

- "هەنووکە ئەم شتانە بەیەکجار لەگەڵ ژیانی نوێدان، بەتایبەتیش کاتێ بۆ شارێکی نامۆ کۆچ بکەی، جا ئەوەش هەر لێگەڕێ کە لەشارێکی ئۆلییانەی وەک قوم بژیێ. خالخالی هێشتا گەنجە، ئەو تازە خوێندنی مەلایەتییەکەی تەواوکردووە، جارێ لە مزگەوتی خوی دانەمەزراوە."

- "من لەوە تێدەگەم، بەڵام خۆ خالخالی بە تەواوی لەو پیاوانەی دەیانناسم جیاوازە، ئەو جیاوازە لە باوکم، ئەو بە ئاغاجان و مام نوسرەتیش ناچێ. من نازانم چۆن خۆی لێنزیک بکەمەوە. ئاخر زۆر سەختە لەگەڵیدا بکەویە ئاخاوتن. زۆرجاران کە دێتەوە ماڵ، بێدەنگییەکی وا دووورودرێژ باڵی بەسەرماندا دەکێشێ، دەمترسێنێ. ئاخر ئەو هیچ ناڵێ و منیش نازانم چی لەگەڵدا باسبکەم."

- "خۆ تۆ نابێ ژیانی ماڵە باوان لەگەڵ ماڵ و مێردی تایبەتی خۆت بەراورد بکەی. ئەم ماڵە زۆر کۆنە، هەر لە دێرزەمانەوە لەسەر ئەو نەزمە ڕۆیشتووە و دەقی پێوەگرتووە. بەڵام ماڵوحاڵی تۆ، ماڵی مەلایەکی لاوی بێ پێشینەیە. تۆ دەبێ ماڵی خۆت ڕۆبنێی، گەرمی بێنێتە ماڵ و هاموشۆ لەگەڵ دراوسێکان پەیدابکەی و خۆشەویستی و مەیل بۆ پیاوەکەت بنوێنی."

- "ئاخر دایکە، ئەوە بەقسە ئاسانە، بەڵێ دەتوانم خۆشەویستی بدەمێ، بەڵام پرسەکە ئەوەیە ئاخۆ ئەو خۆشەویستی دەوێ."

- "باشە بۆچی ئەو خۆشەویستی ناوێ؟"

- "من ئەوە نازانم!"



کاتێکیش سەدیقە دەهاتەوە ماڵ، بەخۆشەویستیەوە پێشوازی لێدەکرا. هەمووان جل و پێڵاویان بۆدەکڕی، پارەیان دەدایێ و بە بوخچەی پڕەوە دەیاننادردەوە قوم.

هەرکاتێکیش خالخالی وەک مەلایەک بۆ مزگەوتی شارێک دەڕۆیشت، سەدیقەی دەناردەوە ماڵە باوانی تا دەگەڕایەوە و لەگەڵ خۆی دەیبردەوە. هەندێ جار ئەوان لەهەمان ڕۆژ دەگەڕانەوە هەندێ جاریش هەفتەیەک دەمانەوە. لە مانەوەشیاندا لە ژووری گومبەزەکە دەنووستن.

ئەم هۆدەیان قەپەنگۆکەیەکی هەبوو، قەپەنگەکە شوورەیەکی دارینی هەبوو، هەندێ جار سێبەری گومبەزەکەی لێدەردەکەوت کە هاتوچۆی پێدادەکرا. ئەویش هەر ئەو دیوارە بوو کە مێرووەکانی لێدەرچوون.

هەشتسەد ساڵ بەر لە ئەمڕۆ، کاتێک خانووەکە بنیاتنرا، وەستایەکە ئەم ژوورەی تایبەت بۆ مەلای مزگەوتێ دروست کردبوو. ڕۆژ تا ئاوابوونی گەمەی خۆی بە سێبەرەی گومبەزەکە دەکرد. سەرەتا تەنها سایەی گومبەزەکە لەسەر دیوارەکە دەردەچوو، کەمێک دوای ئەوە سیمای منارەکان، پاشان سێبەری گومبەزەکە بە تەواوی دەڕەوایەوە، ئیدی هەر هی منارەکان دەمایەوە. ناوبەناویش سێبەری کۆترێک، قەلەڕەشە پیرەکە و پشیلەکان لە کاتی پرشنگی ڕەنگینی ئێواران لەسەر دیوارەکەدا دەردەکەوتن. لە بەرەبەرەی بانگی شێوانیش پشیلەکانی مزگەوت لەسەر قەپەنگەکە خۆیان لە ڕەوە شەمشەمەکوێرەکان، کە بەسەر حەوزەکەدا دەفڕین، دادەنوساند.

خۆ ئەگەر ئاوهەواکە خۆش بووبایە، دەتتوانی لەسەر قەپەنگەکە مافوورێک ڕابخەی و چەند بالیفێکیش دابنێی، سا لەوێ بخوێنیتەوە یان چایە بخۆیتەوە. ئەو میوانەی لە ژووری گومبەزەکە دەمایەوە، هەموو ئازادییەکی هەبوو. بۆ خالخالیش هەرکاتێ بە میوانی دەهاتە ماڵی خەزوری، ئەوێ شوێنێکی نموونەیی بوو بۆی. ئەو هەر هەموو ڕۆژەکەی لە ژوورەکەدا بەسەردەبرد، دادەکانیش نان و خواردنیان بۆدادەنا، بەدەر لەوە کەس هەراسانی نەدەکرد.



خالخالی نێوانی تەنیا لەگەڵ شابالدا خۆش بوو، زۆر جاران داوای لێدەکرد لەگەڵیدا نان بخوا. شابالیش هەر لەسەرەتاوە بە کەسێکی سەرنجڕاکێشی

دەبینی. ئەو زۆر مەلای دیتبوون، بەلام خالخالی جۆرە مەلایەک بوو، وەک هاوپیشەکانی نەبوو. ئەو هزری نوێی هەبوون و باسی شتی ورووژێنەری دەکرد. شاباڵ بە خۆشییەوە گوێی بۆدەگرت و گەنگەشەی لەگەڵدا دەکرد.
خالخالی لە هەموو شتێکی دەزانی. ئەو دەربارەی ئەمریکا قسەی دەکرد هەروەک ئەوەی باسی ناولەپی خۆی بکا، ئەو روونیدەکردەوە، کە چۆن ئەمریکییەکان دەستیان بەسەر نیشتمانەکەیاندا داگرتووە و چۆن لەپشت پەردەی ئاسنینەوە جڵەوی وڵاتەکەیان گرتۆتەدەست و بەڕێوەی دەبەن.
خالخالی بە شاباڵی گوتبوو، کە چۆن سەرەتا ئەمریکییەکان هاتونەتە وڵاتەکەیان و لێیان داکوتا. "کارەکە بەم چەشنە ڕۆیشت. ئەمریکا زلهێزێکبوو، ویستی وڵاتەکەمان بکاتە بنکەیەکی سەربازی و لەدژی یەکێتی سۆڤیەتدا بەکاری بهێنێ. بەلام موسەدەق[٢٦]، ئەو سەروەزیرە هەڵبژێردراوە، پیاوێکی لیبرال، سەرۆکێکی نیشتمانپەروەر بوو، نەیدەویست کەلێن بداتە ئەمریکییەکان. ئەمریکییەکانیش نەدەکرا زۆر چاوەڕوان بن، ئەوان دەترسان یەکێتی سۆڤیەت بانگهێشتی موسەدەق بکا و هاوپەیمانیی دژە ئامریکایی لەگەڵدا بەهێز بکا. سی ئای ئەیش بیرۆکەی کودەتای داهێنا و (شا)ش پەسەندی کرد. ئیدی بڕیاردرا دژی موسەدەق بکەونەکار. یەکێتی سۆڤیەتیش بەم شتەی زانی و دەمودەست موسەدەقی لێئاگادار کردەوە. ئەویش دەستە ئەفسەرێکی لایەنگری ئەمریکای گرتن، کە بەتەمای کودەتا بوون، دەستی بەسەر کۆشکی شاشدا گرت. بەلام ئاژانەکانی سی ئا ئەی توانیان لە کاتی خۆی و لەدوا دەرفەتدا شا بە هەلیکۆپتەرێک دەرباز بکەن و لە کۆشکەکە بیهێننەدەر. ئەو بە فڕۆکەیەکی جەنگی بەرەو ئەمریکا هەلات."
- "شتێکی سەرنجڕاکێشە. من ئەو ڕووداوانەم نەدەزانین،" شاباڵ وای بە خالخالی گوتەوە.
- "ئاخر ئەوان ئەو جۆرە شتانە لە کتێبەکانی خوێندنی قوتابخانە نانووسنەوە. ئەوان مێژوێکی ساختەتان فێردەکەن." خالخالی وای پێگوت.
- "باشە پاشان چی ڕوویدا؟"

[٢٦] Mossadeq

- "ئەمریکا بۆ ئەوەی ببێتە زلهێزێکی جیهانی، پێویستی بە ئێران بوو. ئێران هەڵکەوتەیەکی ستراتیژی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هەبوو، پتر لە دووهەزار کیلۆمەتر سنووری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا هەبوو. ئیدی ئەوان بیریان لە کودەتای دووهەم کردەوە. سی ئای ئەی لەگەڵ ژەنەراڵەکانی سوپای ئێران کەوتە پەیوەندیکردن. دوو ڕۆژ دواتر، کاتێک هەمووان وایانزانی هیچ لەگۆڕێدا نەماوە، موسەدەق گیرا. تانکە ئەمریکییەکان لە هەموو دووڕیانە گرنگەکانی تاران وەستان و دەستیان بەسەر پەرلەمانیشدا گرت. دوای ئەوە بەسەدان لەچەتە و قەحپەکانی خۆیان ناردنە سەر جادە و وێنەکانی (شا)یان بەرزکردنەوە.

ڕۆژی دواتریش شا، کە بە پۆلە ئاژانێکی سی ئای ئەی دەورە درابوو، گەڕێندرایەوە کۆشک. شا بووکەڵەیەکە، ئەو دەبێ بە خۆی و ئەمریکییەکان نەمێنێ."



شاباڵ بەو نمایشە سۆز و بەهێزەی خالخالی موچڕکی پێداهاتن.

دواجار هەردووکیان لەسەر قەپەنگەکە نانیان بەیەکەوە خوارد، خالخالی باسی ئەو بەرگرییە بەهێزەی ئایەتوڵلاکانی دژی ڕژێم بۆکردبوو، باسی مێژوی خەباتی بەرەنگاریە بەهێزەکەی ئایتوڵڵا خومەینی بۆکرد کە چۆن شا و ئەمریکیەکانی لە قوللەی قاف هەڵکێشاوە. لەو ڕۆژەدا چەندان مەلای گەنج کوژران و چەندانی دیکەش ڕاپێچی زیندانەکان کران. خومەینیش ناچارکرا بچێتە تاراوگە.

شاباڵ زۆر جار لە ماڵ ناوی خومەینی بیستبوو، بەلام هیچی لەبارەوە نەدەزانی. ئاخر کاتێ ئەو بوویەرانە ڕوویاندابوو، ئەو منالێکی حەفت هەشت سالان بوو. خالخالی بەڵێنی پێدا، جاری دادێ کتێبێکی نهێنی بۆبێنێ کە وردەکاری مێژووی بەرگریی ئایەتوڵلاکانی تێدا تۆمارکراوە.

ئەو ئێوارەیە خالخالی شتێکی وای بە شاباڵ گوتبوو، پێشتر کەس بیریشی لێنەکردبووەوە. "کەس لە زیندان ناترسێ، زیندانیش وەک زانستگەیەکی لێهاتووە، نەخاسمە بۆ چالاکوانە گەنجەکان."

ئەمەش سەر لەبەری باسوخواسێکی نوێ بوو بۆ شاباڵ. ئاخر ئەو زیندانی وا دەبینی کە تەنیا جێگەی تاوانبارانە.

- "زیندانییە سیاسییەکان جیاوازن لەگەڵ زیندانییە ئاساییەکان،" خالخالی وای لەسەر ڕۆیشت، "لەوێدا کەسانێک هەن، دژی ڕژێم وەستاونەتەوە، کەسانێک شەرمیان بە خۆیە کە سی ئای ئەی ئەمریکایی لەوڵاتەکەیان باڵادەست بێ. ئەوانە کەسانێکی ڕۆشنبیرن، ئەوانە دەیانەوێ چارەنووسی وڵاتەکەیان بەدەستی خۆیانەوە بێ. ئەوانە کەسانێکن دەیانەوێ گۆڕانێکی ڕەگوریشەیی لە سیستمی سیاسیدا بخوڵقێنن. هەر بۆیە ڕژێم ئەوانە دەگرێ و لە کونجی زیندانیان دەئاخنێ. بەڵام ئەو جۆرە کەسانە لەنێو خۆیاندا پەیوەندیان هەیە. ئەوانە دە دە یان بیست بیست لە زیندانێک دەئاخنرێن. لە زیندانیشدا جۆرەها کەس هەن: خوێندکاران، هونەرمەندان، مەلایەکان، سیاسییەکان، سەرکردەکان، مامۆستاکان و ئەوانەی خاوەن بیرۆکەی نوێن. ئەوانەش لەگەڵ یەکدا دەدوێن، وتوویژ و گەنگەشە دەکەن، ئیدی بەمجۆرە کونجی زیندان دەبێتە زانکۆ، تیایدا زۆر شت فێردەبی. ئایا زەینت بۆئەوە دەچێ کە ئەو هەموو ڕۆشنبیرانە لە زیندانێکدا بەیەک بگەن، چی ڕوودەدا؟ خەڵکەکە ئەزموونەکانیان لەگەڵ یەک دەگۆڕنەوە و گوێ لەیەکدی دەگرن. هەر بۆیەشە لەخۆوە پێیەوە پەیوەست دەبی و کارادەبی. هەندێ جار مرۆ وەک کاوڕێک دەچێیە زیندان، بەڵام کە هاتەدەر، نموونەی شێرێک دێتەدەر. من زۆر لەوان دەناسم کە لە زیندانن، برادەر، مەلای نوێ و ئەندامانی بزوتنەوەی ژێرزەمینی بە باڵی چەپ و ڕاستیانەوە. ئەرێ قەتت شتت لەبارەیانەوە بیستووە؟"

- "نەخێر."
- "ئەدی تۆ لێرە چی دەکەی؟"
- "مەبەستت چییە؟"
- "مەبەستم لێرە لەوماڵەیە، لەو شارەیە."
- "شتێکی وا تایبەت نا. من دەچمە قوتابخانە و مزگەوت.

خالخالی سەری هەژاند و گوتی: "من دەمزانی، ئەم شارە هیچی وای تێدا نییە. ئەمە شارێکی لاوازە. لەسەرتاسەری وڵاتدا خەڵک بەهێواشی

بەرهەڵستی شا دەکەن، بەڵام لێرە لە (زەنجان)دا خەڵک لە خەوی قووڵ دان. ئاخر چی لە شارێک چاوەڕێ دەکەی، کە مەلای مزگەوتی گەورە[27] وا خەواڵوو بێ. ئەرێ ئەلسابری هەموو ڕۆژەکەی، کە خۆی لەکونجی حوجرەکەی پەستاوە، چی دەکا؟ هیچ! تەنها ئەوە دەکا کە دادەکان گونەکانی بشۆن! ئای لەو مزگەوتە مێژووییە جوانە، کە گوناحە! ئاخر مزگەوت مێژوویێکی پرشنگداری هەیە، کاتی ئەوە هاتووە وتاری ئاگرینی تێدا بخوێندرێتەوە. ئەرێ لەمەبەستەکەم تێدەگەی؟"

شاباڵ خۆشی بە قسەکانی خالخالی دەهات. ئەو پێی وابوو بەرامبەرەکەی گەورەیە و خۆشی بچووکە، ئەو حەزی لێبوو پرسیارانی بکا، بەڵام نەدەوێرا، دەترسا شتی گەوجانە بڵێ.

لەو نێوەیەدا ئەو هەموو کاتەکە هیچی نەگوت، لێ کە خەریکبوو بگەڕێتەوە ژوورەکەی خۆی، دەستبەجێ دەمی هەڵپچڕی: "من دەمەوێ شتێکت نیشان بدەم."

- "شتەکە چیە؟"
- "چیرۆکەکانم. من دەنووسم." ئەو ئەمەی بە دوودڵیەوە پێگوت.
- "ئای چەند سەرنجڕاکێشە! دەی نیشانم بدە. ئایا شتەکانت پێیە؟ دەی بۆم بخوێنەوە."
- "ئاخر نازانم ، شتەکان باشن یاخۆ نا."
- "لەوبارەیەوە ناتوانم هیچ بڵێم، بەڵام نووسین خۆی لەخۆیدا شتێکی باشە. دەی بڕۆ نووسینەکانت بێنە!

شاباڵ ڕۆیشت و بەلەزیش بە خۆی و سێ دەفتەر گەڕایەوە، بە شێوەیەکی خاکەڕایانە ڕادەستی خالخالی کردن.

- "من دەبینم، تۆ شتی زۆرت نووسیووە،" خالخالی بەسەرسوڕماوی وای پێگوت و لاپەڕەی دەفتەرەکانیشی هەڵدەدایەوە. "من هەر لە یەکەم دیدارمانەوە بۆم دەرکەوت، تۆ گەنجێکی زیرەکی. دەی، یەکێ لە چیرۆکەکانت هەڵبژێرە و بۆم بخوێنەوە."

---

[27] مەبەست لەو مزگەوتەیە کە نوێژو خوتبەی ڕۆژی هەینی تێدا دەکرێ.

- "ئاخر من تائێستا نیشانی کەسم نەداون." شاباڵ وای پێگوتەوە و لاپەڕەی دەفتەرەکانی خۆیشی هەڵدەدانەوە. کاتێکیش لاپەڕەیەکی لایەقی دۆزیەوە، گوتی: "من ناوێرم، بەڵام ئەوەی لەتوانامدا بێ دەیکەم." ئیدی دەستی بەخوێندنەوەی لاپەڕەکە کرد: "بەیانییکی زوو بوو، کاتیک من بەرەو حەوزەکە چووم تا دەستنوێژ هەڵبگرم، سەرەتا بینیم چرای ژووری باوکم هەڵنەکرابوو. ئەو هەمیشە زووتر لەمن بێداردەبووەوە و پێشی من دەگەیشتە سەر حەوزەکە، بەڵام ئەم سپێدەیە هەموو شتێکم بە جۆرێکی دیکە بینی. ماسییەکان کاتێ منیان لەسەر حەوزەکە دەبینی دەیانکردە غەڵبەغەڵب، کەچی ئێستا بە بێ جووڵە، بەبێ دەنگی سێرەیان لەمن گرتووە. پوولەکەی ڕەنگین سەرئاوکەو تبوون. خوێن بە بەبەردەکانی حەوزەکەوە بوو. دەستبەجێ زانیم شتێک قەوماوە، بە پەلە رامکردە ژووری باوکم، دەرگاکەم پاڵنا و گڵۆپەکانم داگیرساندن..."

- "زۆر باشە! پێویست ناکا زیاترم بۆ بخوێنیتەوە، من بەخۆم دەیخوێنمەوە. تۆ بەهرەت هەیە، دەی دەفتەرەکانت لێرە دانێ، من دەیانخوێنمەوە،" لەکۆتاییدا خالخالی وای پێگوت.

ئیجا ئەویش دابەزی و بەرەو حەوزەکە ڕۆیشت، لەبەر تیشکی گڵۆپەکاندا بینی ماسییەکان خەوتوون. گڵۆپی حوجرەکەش داگیرسابوو. سێبەری مەلا لەسەر پەردەکە دیاربوو. ئەو بە ئەسپایی دەرگای پێشەوەی کردەوە و بەرەو لای ڕووبارەکە بۆ پیاسەکردن چووەدەر.

**عەبا**

بەفرێکی زۆر باریبوو، ناوحەسارەکەشی گرتەوە، کاتیش سعات پێنجی ئێوارەی نیشان دەدا، خەریکبوو وردەوردە تاریک دادەهات و بایەکی سارد و تەزیش هەڵیکرد.

هەروەک جارانیش هەردوو دادەکان، خاولی و جلی خاوێنی مەلا ئەلسابرییان بردە گەرماوەکە، تا بیشۆن و بۆ نوێژ ئامادەی بکەن.

هەرچەندە لە بەرەبانێکی زووەوە زۆپایان داگیرساندبوو، لێ ژووری گەرماوەکە هەمیشە هەر سارد بوو.

"ئاخر ئەو کارە وانابێ، ئەوە بەرپرسیاریێتی نییە،" گوڵبانو دەستی بە سکاڵاکردن کرد، "ئەو دەبێ بچێتە گەرماوەکەی شار، دەنا نەخۆش دەکەوێ."
ئەو ئێوارەیە ئێوارەیەکی تایبەت و ناوازە بوو، ئاخر شەوەکە یادەوەری شەهیدکردنی ئیمام عەلی بوو. عەلی چوارەمین خەلیفە(جێنشین)ی ئیسلام بوو. ئەو بە خۆی و سەدان شوێنکەوتووی لە مزگەوت خەریکی نوێژکردن بوو. ئیبنول مەلجەم[٢٨] هات و شوێنی خۆی لە نوێژکردنەکەدا لە پشتی ئیمامەوە گرت. ئەو لەگەڵ عەلی نوێژی کرد و وەستا تا لە نوێژەکەی بووەوە. کاتێک عەلی لە نوێژەکە بووەوە، ئەوسا ئیبنول مەلجەم شمشێرەکەی ڕاکێشا و بە توندی و ڕێک لە نێوەڕاستی پشتەسەری ئیمامی عەلی دا. دەستبەجێ عەلی کەوت. ئیدی لەوساوە ئیسلامەتی بووە دوو لەت: شیعە و سوننە.
شیعەکان حەسەنی کوڕە گەورەی عەلیان وەک جێگرەوەی ئیمام هێنایە پێشەوە. سوننیەکانیش بەربژارێکی دیکەیان هەبوو. شیعەکان چەندان سەدە دژی سوننیەکان وەستانەوە. هەرچەندە عەلی کەوت و ڕۆیشت، بەڵام بووە مایەی خۆشەویستییەکی مەزن بۆ شیعەکان. چواردە سەدە دوای مەرگی ئەو، شیعەکان شین و شەپۆڕی وای بۆدەکەن هەروەک ئەوەی هەر ئەمڕۆ لێدرابێ و کوژرابێ.
ئەمشەویش مزگەوتەکە پڕ دەبێ. ئەلسابریش زۆر باش خۆی بۆ ئامادەکردووە، کە وتارێکی دوورودرێژ لەسەر عەلی بخوێنێتەوە. ئەو شتێکی نوێی بە مێشکدا هات؛ ئەو دەیەویست ئەمشەو، دوای چواردە سەدە لە دوژمنایەتی نێوان شیعە و سوننە، باسی ئاشتبوونەوە بکا.
- "ئیدی دوژمنایەتی بەسە! ئێمە برای یەکین!" ئەو هەموو ئێوارەیە لەبەردەم ئاوێنەدا مەشقی لەسەر ئەو وتانە دەکرد. "من دەست بۆ ئێوە درێژ دەکەم. من لەناخی دڵەوە دەستتان دەگوشم تۆقەی دۆستایەتی و یەکێتی ئیسلامیتان لەگەڵدا دەکەم."
ئەو سەبارەت بەم وتارەی، لەگەڵ ئاغاجان نەدوابوو، ئاخر حەزی لێبوو بۆ ئەویش کتوپڕ و سەرسامانە بێ. کاتێکیش دەستی بە وتاردانەکەی کردبا،

---
[٢٨] Ebne Molgam

ئاغاجـان لەبەر خـۆیەوە دەیگـوت: " ئەم قسـەیەی بـێکەڵکە. ئـاخر خـۆ هـیچ سوننەیەک لەم شارەدا ناژی."
بەڵام خۆ ئەگەر سوننە لەو شارەدا بژین یان نا، یان سـوننەکان گوێیان لێبێ یاخود نا، ئەمشەو مامۆستا دەیەوێ شتێکی نوێ بڵێ، شتێک تا ئێستا هیچ مەلایەکی دیکە نەیگوتبێ.



دادەکان مەنجەڵی گەورەی پڕ ئاوی گەرمیان لەسەر ئاگرێکی نەرم دانا و چاوەڕێی ئەلسابرییان دەکرد.
مامۆستاش لەنێـو دەریـای بیرکردنەوەکـانی خـۆی نقـوم ببـوو، بە دەسـتێ ئـاوەکەی تـاقیکردەوە و بە ئەسپایی خـۆی خسـتە نێـو کـۆلەکە[٢٩]. بەهەردوو دەستی قەراغی کۆلەکەی گرت و خۆی لەنێو ئاوەکەدا نقوم کرد. کاتێکیش سەرئاوکەوتەوە، هاواریکرد: "ئەی سوننەکان، من دەستی تەوقەتان بۆ درێژ دەکەم! ئێمە برای یەکین! براین! وای ساردە، ئای کە چەند ساردە!"
یەکێ لە دادەکـان هەنـدێ ئـاوی گەرمـی بەسـەر سـەردا کـرد، لەو کـاتەش دادەکەی دیکە بە لیفکە و سـابوون دەسـتی بەشوشـتنی کـرد. لەو نێوەشـدا ئەلسـابری مەشـقی لەسـەر وتـارەکەی دەکـرد و لە سـەرمانیش هەڵـدەلەرزی: "ئیسـلامەتی لە مەترسـیدایە! ئێمە دەبـێ کـۆنە شـەڕەکانمان لەپشـت خۆمـان جێبێڵین. دەبێ شان بەشان بەرەو پێشەوە دژی دوژمنان بجەنگین! ساردە!"
ئەو سەبارەت بە دوا وشەکانی هەندێ دوودڵ بوو، دەبووایە بیگۆڕێ، بیکاتە: "دژی دوژمنە هاوبەشەکەمان بجەنگین!"
ئەم ڕسـتەیەش دوو سـەرە بـوو، چـونکە تـۆ بڵێـی مەبەسـتی لە "دوژمنـی هـاوبەش" کـێ بـێ؟ شـا؟ ئەمریکییەکـان؟ خـۆئەگەر بوێرابـا، بـێ سـێو دوو ئاگراویترین وتار دەبوو، لێ دوودڵ بوو.
- "تەواو!" یەکێ لە دادەکان وای گوت.
لە کۆتاییـدا لەسـەر یەکـێ لە خاولییەکـان کە لەسـەر نـاوکەوەکە ڕاخرابـوو، ویستی ڕێک دابنیشێ، بەڵام لەبەر ئەوەی بە توندی دەستی لە ڕۆخی کۆلەکە

---

[٢٩] کۆلی ناو، وەک بانیۆ بۆ خۆتێداشوشتن بەکاردێ

گیـر نەبـوو، خلیسـکا و کەوت، هێشـتا قـاچی چەپەی هەر لەنێـو کـۆلەکەدا مابۆوە.

- "مردن!" ئەو بە ڕاچڵەکینەوە هاواری کرد.

دادەکانیش، کە حەپەسابوون، دەستبەجێ گرتیـان و ویستیان لەنێو کۆلەکەدا دەربێنن. هەنووکە ئەو لەسەر زەوی کەوت و جارێکی دیکە پیس بـووەوە، ئیـدی نـوێژی پێوەنەدەهـات. لەو کاتەشـدا پشـیلەیەک لە پشـت زۆپـاکەوە دەرکەوت. پشـیلەکە، کە لەبەر قیـژەی ئەلسـابری سڵەمیەوە، بـازی دایە نێـو کۆلەکە و بەر قـاچە ڕووت و تەڕەکەی مامۆسـتا کەوت، لەوێشـەوە بازیـدا و بـۆ دەرەوە هەڵات. ئـاخر پشـیلەیەک بەر قـاچە تەڕ و ڕووتەکەی مامۆسـتا کەوت. ئیـدی هزروبیـری پەرشـوبڵاو بـوو! کـێ نـاڵێ لەو نـاوەدا مشـکیش ناسـووڕێنەوە. ئەلسـابری بەم جـۆرە هـزرانە حەپەسـا و لەزرەی لێهـات. بەمجـۆرە گەرمـاوەکە گـڵاوە، ئـاوەکەش هەر گـڵاوە، خاولیەکـانیش بەهەمـان شـێوە گـڵاون و دادەکـانیش هەر گـڵاون، ئەمەش هەمـووی لەو شـەوەی ساڵیادی شەهیدبونی ئیمامی عەلیدا ڕوویدا. باشە هەنوکە دەبێ چی بکا؟ لە کوێ خۆی بۆ ئەو نوێژە، کە نزیکبۆتەوە خـاوێن بکاتەوە؟ خۆ خەڵکیش لە مزگەوتەکدا چاوەڕێی دەکەن.

- "خـودایە!" بە دەنگێـک کە لە گەرووی قەتـیس مـابوو، بە ڕووتـی لەو تاریکیەدا هەڵات و غاریدا دەرێ و خۆی گەیاندە لای حەوزەکە.

- "نەخێر. وانەکەی!" گوڵبانو بەسەریدا قیژاند. "ئاخر لە دەرێ بەفر دەبارێ. نەکەی وابکەی!"

ئەلسابری یەکجار خۆی فڕێدایە نێو حەوزەکە. ئیدی کەوتە نێو حەوزەکە و شڵپەی لەئاوەکە هێنا و لەناویدا نقوومبوو.

لەبەر تیشـکی گڵۆپەکانیشـدا ماسـیە سـوورەکان خۆیـان کشـاندەوە لایەکـی حەوزەکە، قەلەکەی مـزگەوتەکەش بە تونـدی قیغانـدی، دادەکـانیش بە پەلەپرووزێ چوونە ژێرزەمینەکە و بە خۆیان و خاولی نوێی خاوێنەوە هـاتنە لای حەوزەکە.

- "هەنووکە بە باشی وەرگەڕا!" گولبا وای هاوارکرد.

- "دەی تکایە وەرە دەر!" دادەکەی دیکەش وایپێگوت.

ئەلسابریش سەرئاوکەوتەوە و دیسان جارێکی دیکە بیسمیلێکی کرد و خۆی لەنێو ئاوەکەدا نقوم کردەوە.

- "دەی هەرئێستا وەرەدەر!"

ئەلسابری توانی هەڵسێتەوە.

بەلام ئەو هاوسەنگی خۆی لەدەستدا، لێ لەدوا ساتدا خۆی گرتەوە و بەرەو لای دادەکان هات. ئەوانیش خاولییەکانیان تێوەرگرت و گوڵبانوش پێشوەخت چووە حوجرەکەی و ئاگری زۆپاکەی زیاتر کرد. گوڵبێش چووە ژێرزەمینەکە تا خاولی زیاتری بۆ بێنێ.

زۆپاکە زۆر گەرم بوو، خاولییە زیادەکانیش گەرمکران، بەلام ئاخۆ ئەلسابری لە کوێ بوو؟

- "لەوانەیە ئەو چووبێتە ژووری نوستن."

- "ئەلسابری!" گوڵبانو وای بانگکرد. "ئای خودایە، لەژێر باڵی خۆتی بگرە! تۆ بڵێی بۆ کوێ چووبێ؟ ئەلسابری!"

ماسییە سوورەکان لە ناو حەوزەکەدا لە تەنیشت یەک بوون. قەلەکەش بێ پسانەوە هەر قیغەقیغی بوو، پشیلەکانی مزگەوتەکەش هاتن و لە قەراغ سەربانەکە خۆیان گرمۆڵەکرد، دادەکانیش بە هەڵەداوان بەرەو لای حەوزەکە ڕۆیشتن. هەرچی ئەلسابریش بوو لەوێ لە دەرەوە لەسەر بەفر ڕاکشابوو، تیشکی گڵۆپەکانیش لەسەر دەموچاوی دەدا. چاوەکانی داخرابوون. خەندەیەک لەسەر لێوەکانی سارد بووەوە.

- "ئەلسابری!" دادەکان هاواریان کرد.

بەلام خۆ کەس لە ماڵ نەبوو، هەموویان چووبوونە مزگەوت. دادەکانیش لە ڕێی پەیژەکانەوە بە پەلەپڕوزێ لێبەسەر کەوتن و خۆیان گەیاندە مزگەوتەکە. پشیلەکانیش لەبەر پێیان ڕاپەڕین. لە لای منارەی دەستەچەپ، لەو شوێنەی کە بانگدەرەکە هەمیشە دەوەستا، ئەوان بەهەموو هێزو تینێکەوە هاواریان کرد: "ئەلسابری فەوتا!"

پیاوەکانی نێو مزگەوتەکە گوێیان لەدەنگی هاتوهاوارەکە بوو. بانگدەرەکە هاتەسەربان، دوای ئەویش چەند پیاوێکی بازاڕ بەدوایدا سەرکەوتن. لە ڕێی

پەیژەکـــانەوە ئەوان بەخێرایـــی بەرەو لای حەوزەکەوە هـــاتن. کـــاتێکیش مجێورکە مەلا ئەلسابری بینی، کە لەو ناوە کەوتبوو، هاواری کرد: "انا لله!"
ئیدی هەمووان تێگەیشتن، کە بە ڕاستی مەلا ئەلسابری مردووە.
ئینجا پیاوەکان مامۆستایان هەڵگرتەوە هێنایانەوە حوجرەکەی و دادەکانیش بەدوایەوە دەگریـان، لەبەرئەوەی ئێسـتا مـردن لەئـارادایە، بـۆیە دەبـووایە حەوسـەڵەی خۆیـان بگرتبـایە. ئەوان بە ئەرکەکـانی خۆیـان دەزانـی و لەنێـو دولابـی کتێبەکـانی حـوجرەکەدا ونبـوون. لەوێـدا لەنێـو بـاولێکی کـۆنینە، پارچەخامێکی سپیان دەرهێنا و دایانە دەستی مجێورەکە. ئەو پارچە خامە مامۆستا بۆ خۆی لە مەککە هێنابووی. مجێورەکەش خامەکەی لێککردەوە لە تەرمی مامۆستای وەرپناو لەگەڵیشیدا ویردێکی دەخوێند.
ئینجا ئاغاجانیش هاتەژوورەوە.
- "انا لله!" پیاوەکان لە یەک کاتدا ئەم وتەیان لەزار دەچوو.
- "انا لله" ئاغاجانیش بە حەوسەڵەوە وایگوتەوە.
ئاغاجـــان دانەوەیەوە ســـەر تەرمەکە، کفـــنەکەی هەنـــدێ لادا و ســـەیری دەموچاوی مەلا ئەلسابری کرد، ماچێکی لە هەنیەی کرد و کفنەکەی بەسەردا دایەوە.
لە پرێکیشـەوە زینەت بەسـیمایەکی بزرکـاوەوە لەدەرگـاکەوە دەرکەوت. ئەو لەبن ڕووبەندەکەیدا دەگریا و لای تەرمی مامۆستا کەوت.
لە دوایشـدا دادەکـان خانمەکەیـان هەڵسـاندەوە و لەگەڵ خۆیـان بـرد. لەنێـو ماڵەکەشدا دەنگەدەنگ بیسترا. دەنگەکەش هی پیاوەکانی نێو مزگەوتەکە بوو.
ئاغاجان حوجرەکەی جێهێشت و بەرەو حەوشەی ماڵەکە ڕۆیشت. ئیدی هەر زوو هەواڵەکە لەنێو شـاردا بڵاوبـووەوە. پیاوەکـان بە خۆیـان و دارەبـازەکە ئامـادەبوون و هـاتنە لای حەوزەکە و تەرمەکەیـان هێنـا و لەسـەریان دانـا و بردیانە مزگەوت.
حەفت پیاو چوونە سەربانەکە و بەیەکەوە بانگیان دا: حي على الصلاة!"
ئەوەی گوێی لەو بانگە بووبێ، زانی مەلای مزگەوتەکە کۆچی دوایی کردووە. بەدەر لە نانەواکـان و دەرمانفرۆشـەکان، هەمـوو دوکانـدارەکانی شـارەکە

دەرگای دوکانەکانیان داخست و بەرەو مزگەوتەکە هاتن. ترومبێلێکی پۆلیس و هی سەرۆکی شارەوانیش لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکە وەستان.



سعات نۆی شەو سندوقی تەرمەکە لەسەر حەوزەکەی نزیک مزگەوتەکە داندرابوو. ئاخر بڕیاردرا، تا بەیانییەکەی بەخاک دەسپێردرێ، تەرمەکەی هەر لەوێ بمێنێتەوە، بۆئەوەی ئەو کەسانەی دەیناسن، هەروەها ئەندامانی بنەماڵەکەی، ئەوانەی لەشارە دوورەکانەوە دەهاتن، دوا ماڵئاوایی لێبکەن.
ئاغاجانیش بەرەو ماڵ گەڕایەوە، ئەو دەبێ بۆ بەیانییەکەی مەلایەک ئامادەبکا و نوێژی مردووی لەسەربکا. لە ڕاستیشدا دەبووایە ئەحمەد کوڕی مامۆستا شوێنی باوکی بگرێتەوە، بەڵام ئەو هێشتا خوێندنی مەلایەتی تەواونەکردبوو. مەلایەکی دیکە بۆئەوەی بە ئەرکەکە رابێ خالخالی بوو، خالخالیش زاوای مەلای کۆچکردوو بوو. بەڵام ئاغاجان ژمارە تەلەفۆنی خالخالی نەبوو، نەشیدەزانی لە کوێ دەژیێ، هەروەها ئەو پرسەش لەگۆڕێدا بوو، ئاخۆ لەوەختی خۆی دەگا یان نا.
- "ئێمە ئەومان لە بەرەبەیانێکی زوو پێویستە،" ئاغاجان وای بە شاباڵ گوت.
- "لەسەرووی ئەوەشەوە، ئێمە دەبێ سەدیقەش ببینینەوە. ئەویش دەبێ بزانێ، کە باوکی کۆچی دوایی کردووە." شاباڵیش وای بە ئاغاجان گوتەوە.
"ئەوەی لە توانامدا بێ دەیکەم. من زەنگ بۆ ئایەتوڵڵا ئەلمەککی لە قوم لێدەدەم. ئەوەش بۆنەیەکی نموونەییە کە خالخالی لایەنە باشیەکەی خۆی دەربخا، ئاخر هەموو شارەکە لێرە ئامادەیە و دەیانەوێ بیناسن. من زەنگ بۆ هەموو ئەوانەی لە قوم دەیانناسم، لێدەدەم."



بۆ بەیانییەکەی ئاغاجان چووە مزگەوت تا دوا شتەکان رێکبخات. چونکە زۆر نابا بە هەزاران بڕوادار لە گوندەکانی دەوروبەرەوە دێن، ئەویش مەلایەکی هاوسەنگراگری پێویستە. هەر بۆ دڵنیابوون پەیامێکی بۆ مەلای

گوندی جیریا[٢٠] ناردبوو، کە خۆی بۆ نوێژ ئامادە بکا. خۆ ئەگەر ئاساییانە بێ، ئەو مەلا جێگرەوەکەی ئەلسابرییە.
لە کاتێکدا ئاغاجان لەگەڵ مجێورەکە وەستابوو، قسەی دەکرد، تاکسیەک لە بەردەم مزگەوتەکە وەستا؛ دەستبەجێ مێزەرە رەشەکەی خالخالی ناسیەوە و سەدیقەشی بینی.
خالخالی لە تاکسیەکە هاتەدەر، بەرەو لای ئاغاجان هات، تازینامەی لێکرد، بۆ ساتێکیش سەری بۆ نوشتاندەوە.
ئاغاجانیش ئەمەی بە ئاماژەیەکی ئاشتبوونەوە و قایلبوو بە دڵسۆزێتی بەرامبەر خۆی و مزگەوتەکە دانا. چونکە لەو کاتەی خالخالی لە مارەکردنەکەدا کاغەز و ناسنامەکەی پێنەبوو، ئاغاجان وایکرد، گەڕاندیەوە قوم تا بیانهێنێ، لەوساوە خالخالی بەخۆشی قسەی لەگەڵ ئاغاجاندا نەدەکرد.
هەنووکەش کە هەندێ سەری بۆ نەویکرد؛ ئاغاجان ئەمەی بینی و قسەیەکی شایستانەشی پێگوت: "من شانازیت پێوەدەکەم و دەمەوێت ببیە مەلای مزگەوتەکەمان تا ئەو ڕۆژەی ئەحمەد خوێندنی مەلایەتی خۆی تەواودەکا. باشە رێککەوتین؟
خالخالیش گوتی: "رێککەوتین."
ئیدی ئاغاجان ماچێکی لە مێزەرەکەی کرد، خالخالیش لە لایەن خۆیەوە شانی ئاغاجانی راموسی.
"دەی هەنووکە برۆ ژوور و هەندێ پشوو بدە. ئاخر زۆری دی نابا پیاوەکانی بازاڕ دێن و هەڵتدەگرن. شابشاڵیش ئاگادارت دەبێ."



ماڵەکە جەنجاڵ بوو، زۆر لە پیاوەکان گەیشتبوون. دادەکان دیسان دەرکەوتنەوە. ئەوان لەو کاتەی بەخێرایی چوونە ناندینەکە، بینیان خالخالی لە ماڵەکەدا دەهاتەژوور. ئەوان ئاگر، سێوێکی سوور و ئاوێنەکیشیان بۆهێنا، ئەوەش نیشانەی ئەوەبوو، کە وەک مەلای خانووەکە بەخێرهاتنیان لێکرد.



---

[٢٠] Djira

لە سـعات دوازدەدا لەسـەر جـادەی بەردەم مـزگەوتەکە مـافوور بـۆ نوێژلەسەرکردن ڕاخران. سندوقی دارەبازی تەرمی ئەلسابریش هێنرایەدەر و لەسـەر مـافوورەکە دانـدرا. هەزاران کەس چـاوەڕوانی خالخـالی بـوون. ژمارەیەک لە پیاوانی بازاڕ یاوەری خالخالیان بۆلای دارەبازەکە کرد، تا نوێژی مردووی لەسەر بکا.
بانگدەرە نابیناکەش چووە سەر بانی مزگەوتەکە، و بانگی دا: "ألله اکبر!"
ئیدی هەمووان بەڕیز لەپشت خالخالییەوە وەستان.
لەکۆتاییشـدا مەلا خالخـالی مێـزەرە ڕەشـەکەی کـردەوە، وەک نیشـانەیەکی مـاتەمینی بەسـەر شـانەکانی خـۆی دادا، ئەوسـا ڕووی لە مەکـکە کـرد و ئایەتەکانی خوێندنەوە:

يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ (١)
قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا (٢)
نِصْفَهُ أَوِ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا (٣)
أَوْ زِدْ عَلَيْهِ ... (٤) المزمل

وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى (١) الليل

إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَى فِرْعَوْنَ رَسُولًا (١٥) المزمل
يَاأَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١)
قُمْ فَأَنْذِرْ (٢) المدثر

وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا (٢)
وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا (٣) الشمس

**{ئەی ئەوکەسەی خۆت بەجلکان داپۆشیوە!**
**شەو هەستەوە؛ مەگین کەمێ،**
**لە نیمەکەی یان کەمێکی لێدابڕە؛**
**یان کەمێکی دەسەر بخە!**
**سوێند بەو شەوە کاتێ هەر شت دادەپۆشێ،**
**ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ئێوە کێل کردەوە، شایەتی بێ بەسەرتانەوە؛ هەروەک بۆ ئالی فیرعەون پێغەمبەرێکمان بەڕێکرد.**

ئەی کەسێکی جلکت بەسەر خۆدا دادوە!
رابە! ترس وەبەربێنە،
سوێند بەو هەیڤەش کە بەدوویدا دێ،
سوێند بەو ڕۆژەش کە تیفتیفەی هەتاو دەدا.}

## خێزان

بەگـوێرەی دابونەریـت، ئەلسـابری دوای چـل ڕۆژ لە ڕێکەوتـی مردنیـدا، دەبووایە چلەی بۆ بگیڕدرابایە. هەمـوو ئەنـدامانی خـانەوادەکە، ئەوانەی لە شارە دوورەکـانیش دەژیـان و نەیانتوانیبوو لە ڕۆژی ناشـتنەکەیدا ئامـادەبن، هەنووکە هەموویـان هـاتن و هەمووشـیان بـۆ مـاوەی هەفتەیەک مـانەوە. ئەم جۆرە گردبوونەوانەش بێوێنە بوون.
ئەوانە بە کـۆمەڵ نانیـان دەخـوارد و تـا درەنگـانێکی شـەویش بەکـۆمەڵ لە ژوورەکانیان بەیەکەوە قسەیان دەکرد.
یەکێک لە مێوانەکانیش کازم خان[٣١] بوو، ئەو مامە پیرەیەکی ئاغاجان بوو، بە تەمەنترین ئەندامی ماڵباتەکە بـوو، لە لای هەمووشـیانەوە ڕێزی دەگیـرا و بە خۆشەویستییەوە ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرد.
ئەو هەرگیـز بە تەنهـا نەدەهـاتە شـار، هەمیشـە لە لایەن چەنـد هاوگونـدیێک یاوەری دەکرا. هەروەها هەرگیزیش بە پاسـی لادێ یـان بە تاکسـی نەدەهـات. پێشـتر بە ئەسـپ دەهـات، ئیدی لەگەڵ پـۆلێ سـوار بەیەکەوە دەهـاتن. دواتـر، کاتێک بەتەمەندا ڕۆیشت، بە جیبێک دەهێندرایە شـار.
کازم خـان هەمیشـە بە جیبەکەی لە بەردەم مزگەوتەکەدا دەهـاتەخوار، لەوێوە لێوەژوور دەکەوت، لەوێ جلەکانی خۆی دادەکوتان و دەموچاوی دەشوشت. ئینجـا بە پەیژەکـانی مـزگەوتەکە سـەردەکەوتە سـەر بـان. لەوێ کەمێـک دەوەستا، لەسـەر بان شـەپقەکەی دادەکەنـد سـڵاوی لە حـاجی لەقلەقەکـان، کە

---

[٣١] Kazem Khan

لە بەرزییەوە لەسەر منارەکان هێلانەی خۆیان چێکردبوو، هەروەها سڵاوی لە قەلەڕەشە پیرەکەش دەکرد.

- "سڵاوت لێبێ ئەی قەل" ئەو وایدەگوت و شەپقەکەی دەخستەوە سەر و لە پلیکانەکان دادەبەزی و دەهاتە نێو ماڵەکە.

کاتێ پیاوەکان کازم خانیان لەسەر بانەکە ببینایە، بۆ بەخێرهێنانی تا لای پەیژەکان بەپیرییەوە دەچوون. ئینجا وەک شایەکی دێرینە، کە بەو هەموو پیاوە دەورەدراوە، دەهاتە ژووری بەنگکێشانەکە، لەوێدا پێشخزمەتێک بە بەنگ و پشکۆی ئاگری تازەهەڵکراو لە خزمەتیدا دەبوو.

کازم خان لای ژن و منداڵەکانیش خۆشەویست بوو. ئەو هەمیشە هۆنراوەیەکی بۆ ژنەکان و پولوپارەشی بۆ منداڵەکان لە گیرفاندا بوو. ئەو شاعیرێکی بەناوبانگی لادێش بوو، کابرایەکی ناوازە بوو، لە شاخەکاندا دەژیا. کاتی خۆی ژنی هێنابوو، لێ دەمێکە ژنەکەی مردووە. هەر بەتەنیا دەژیا، بەڵام بایی ئەوەندە ژن هەبوون کە بە خۆشەویستییەوە لە باوەشی بگرن.

ئەو زۆر بەکەمی نانی دەخوارد، کەسێکی لەشساغ و تەندروست دیاربوو، دەیزانی چۆن بژێ و چێژی لێببینێ. ئەو هەموو شتێکی کردبوو، سەربردەی زۆری هەبوون، زۆر شتیشی لە دەستدابوو، بەڵام سێ شت لەژیانیدا بە نەگۆڕی لەگەڵیدا مابوونەوە: خۆشەویستی بۆ شیعر، تریاک و ژنیش.

هەر کاتێک لە ماڵەکە دەهاتە ژوور، دادەکان هەموو شتێکیان بۆ ئامادەدەکرد و نازیان دەکێشا. زۆرجاران هەستیان بە هاتنی دەکرد. یەکەمین شتیش کە دادەکان بۆ خزمەتکردنی مێوانەکە دەیانکرد، دەرگا و پەنجەرەکانی ژووری بەنگکێشانەکەیان دەکردەوە، تا هەوای تەڕوتازی بەنێو هۆدەکەدا بێ و بڕوا.

ئەوان چایەدان و پیاڵە تایبەتییەکانی ئەویان ئامادە دەکرد، چایەکەیان لەدێم دەنا، بۆئەوەی هەرکات پێی وەژوور نابا، چایەکەیان بۆتێکردبا. هەر کاتێکیش دەهاتە ژوور، قەلنە تایبەتییەکەی بەنگکێشانیان بە پشکۆی گەرمەوە لەبەردەم دادەنا. ئەوان لوولەکە بەنگەکەیان لە یەک دەکردنەوە و پارچەکانیان لەسەر قاپێکی چینی دادەنا. ئیدی قاپەکەیان لە تەنیشت سەرکە بزۆتە دارگێوژەکان دادەنا، کە بەهێواشی گڕێکی شینی لێهەڵدەستا.

هەر کاتێک کازم خان بەسەرداني دەهات، دادەکان جلی رازاوەیان لەبەردەکرد و بۆنی خۆشیان لەخۆیان دەدا. هەمووان دەیانزانی، ئەوان تایبەت بۆ ئەو وادەکەن، ئەویش بە دەستەواژەی شاعیرییانەی فارسیزمان بە "خانم" بانگی دەکردن.
هەر کاتێ ئەو بە "خانم" بانگی بکردبایە، هەردوو دادەکان دەچوونە ژوورەکەی، بەلام هەرگیز بەیەکەوە نەدەچوون، هەمیشە یەک بەدوای یەکدا دەرۆیشت. ئەگەر گوڵبانو لە ژوور بووایە، گوڵبێ ئێشکچی دەرگاکەی دەبوو. پێچەوانەکەشی هەر ڕاست بوو.
هەمیشەش کارەکە هەروابووە. ئەوان لە تافی لاوێتی کەنیشکایەتی خزمەتکارییەوە، کاتێ هێندرانە ماڵەکە، کازم خان دەناسن. ئیدی دەستبەجێ ئەوان ببوونە هی کازم خان، ئاخر چ ژنێکی گەنج ئەوێ دەمێ دەیتوانی کازم خان فەرامۆش بکا؟ کاتێک ئەو بۆ یەکەمجار، ئەو کەنیشکە خزمەتکارانەی بینین، بۆ شەوەکەی لەگەڵ هەردووکیان یەک لە دوای یەک نووست.
ئەو ڕۆژانەی لەگەڵ کازم خاندا بوون، ماڵەکە بۆ دادەکان بەختەوەرترین ڕۆژگار بوو. کاتێ ئەوان گەنج و جاحێڵ بوون، کە ئەو دەهات خۆیان دەڕازاندەوە و بەپیرییەوە دەچوون و کاتێکیش دەچوونە نانخانەکە نانیان ئامادەدەکرد لەبەرخۆیانەوە منگەمنگی گۆرانیان بوو.
لێ هەنووکە پیر بوون، ئەو دەنگ و سەدایەی جارانی نانخانیان نەماوە، بەلام ئەگەر بە باشی سەیریان بکەی، ئەوا خەندەیەک لەسەر لێویان دیارە و بۆنی خۆشی گوڵاڵەسوورە هەموو ماڵەکەی دەپنگاندەوە.



دوای ئەوەی پشووی دەدا، نانی دەخوارد و بەنگەکەی خۆی دەکێشا، لەکۆتاییدا لەهۆدەکەی دەهاتە دەر و دەچووە لای باقی خانەوادەکە تا سلاویان لێبکا. سەرەتا ئەو دەچووە لای دار کاژە پیرەکە، بە گۆچانەکەی لەقەدی دارەکەی دەدا، سەیری لقوپۆپەکانی دەکرد، دەستی لە پەلکەکانی دەدا، ئینجا دەچووە لای حەوزی ئاوەکەوە، لەوێوە نوێترین شیعری خۆی دەخوێندەوە:
"دلارای دلارای دلارا

سامان قەدی بلند بالا دلارا...

**هەر هەورە و فرمێسکی بەرەوخوارە**
**باخەکەش ئەڤینداریکی خەندەدارە**
**هەورەتریشقە میناى سکالآیە لەکارە**
**بەو بەیانییە زووە دەبیستم من ئەو هاوارە"**

کاتێ منداڵەکان ئەویان لای حەوزەکە بینی، بە غاردان بۆلای هاتن. ئەویش دەستێکی بەسەردا هێنان شیعریکی نوێی بۆخوێندنەوە، کە تایبەت بۆ ئەوانی نووسیبوو:

**"کەسێکی کەڕ:**
**من ناتوانم هێشتا بنووم**
**تا کاروانەکە نەگا**
**لێ کاروانیش**
**وەک هەوریک هات و تێپەڕی**
**بەلام ئەو هەر هەستیشی پێنەکرد"**

بۆ ئەوەی شیعرەکەی ئاسان بکا، کورتە روونکردنەوەیەکی بۆدان: "پیاوە کەڕەکە هێمایەکە بۆ ئەوانەی، هیچ بایەخ بۆ کات دانانێن. کاروانیش ئاماژەیە بۆ کاتەکە، کە بەخێرایی تێدەپەڕێ".

دوای شیعرەکە هەر منداڵێک پوولی خۆی وەردەگرت.

هەرچی دەربارەی کچەکانیش بوو، بایەخی زیاتری پێدەدان. دەکرا هەریەکێ ماچێکی بداتێ و لەبەرامبەردا پوولی زیاتری وەردەگرت.

ئینجا نۆرەی ژنەکان دەهات، هەڵبەتە فەخری سادات، خێزانی ئاغاجان بایەخی زیاتری لە ئەوانی دیکە هەبوو. ئەو هەمیشە شیعریکی بۆ هەبوو، بە شۆخەکەی ماڵێی دادەنا. ئەو پارچە شیعرەکەی دەخستە نێو مشتی فەخری سادات، ئەویش شیعرەکەی بە خەندەوە لەنێو جلەکانی دەشاردەوە.

**ئەو چاوانەت وەک قامچین بۆ گیان**
**تۆ مینای، سێویکی کەسک دەیانبینی**
**بەبێ تاوان**

**ئاخر، برژانگەکانت دڵیان بردم**
**دەمیشت راستی دەڵێ، لێ برژانگت دزن دز**
**تۆش پاداشتی دزیەکە دەخوازی**
**ئای چ سەیرە: منی دزراو دەبێ سارێژ ببمەوە؟**

پشیلەکانی مزگەوتەکە متووی تریاکی کازم خان ببوون. ئەوان هەمیشە بە ریز لەسەر لێواری بانی مزگەوتەکە گرمۆڵەدەبوون و چاویان لەسەر ئەو لانەدەکەوت. هەر کاتێکیش لێ وەژووری هۆدەی بەنگکێشانەکە کەوتبایە، لەسەر دیوارەکە بازیان دەدا و لەپشت دەرگاکە جێی خۆیان دەگرت. ئیدی ئەویش کە بەنگەکەی دەکێشا، دووکەڵەکەی بۆ لای پشیلەکان فوودەدا. پشیلەکانیش ئەو دووکەڵە خۆشەی تریاکیان لێخۆشدەهات.

دوای نیوەڕۆش، دوای سەرخەو شکاندن، هەر وەک پیشەی جاران کازم خان دەچووەوە ژێرزەمینەکە و سەردانی بانگدەرەکەی دەکرد، کە سەر قاڵی گۆزە دروستکردنەکەی خۆی بوو.

لەوێ چای لەگەڵ دەخواردەوە و بەیەکەوە دەدوان.

– "سڵاو لە بانگدەر!" هەرکاتێک لە بانگدەرەکە بە ژووردەکەوت وای بانگ دەکرد. بانگدەرەکەش لەبەری هەڵدەستا، لێ لەبەر ئەوەی دەستەکانی تا ئانیشک لەقوڕ دابوون، هەر لەشوێنی خۆی لەپشت کەرەستەکەی دەمایەوە.

– "ئەرێ چۆنی؟"

– "باش!"

– "ئەدی کوڕەکەت چۆنە؟"

– "ئەویش باشە."

– "ئەدی کیژەکەت؟"

– "ئەویش سەرقاڵی ژیانی خۆیەتی. هەنووکە ماڵ و مێردی خۆی هەیە."

بانگدەر لە ڕێی چاوە تیژ و لووتە سوکەکەی هەموو شتێکی وەردەگرتەوە. خەڵک وایدەزانی، نابینا نییە، پێیانوابوو لە پشت چاویلکە ڕەشەکانی هەموو شتێک دەبینێ، بەڵام ئەو لە زگماکەوە نابینا بوو. هەمیشەش چاویلکەی ڕەشی لەچاو دەکرد، ئەو چاویلکانەی نوسرەت لەتاران بۆی هێنابوون.

هەمیشـــەش لە پـــاڵ چاویلکەکـــانی شـــەپقەیەکی لەســـەر دەنـــا و بەقیتـــی بە داردەستەکەی ڕێک دەڕۆیشت.
– "ئەرێ ســەعاتەکەت چۆنە؟" کــازم خــان وایلێپرســی: "هێشــتاش هەر کــار دەکا؟"
– "بەڵێ، بەختم هەیە." بانگدەرەکە بە خەندەوە وەڵامی دایەوە.
بانگدەرەکە خەسڵەتێکی سەرنجڕاکێشـانەی هەبـوو، هەمیشـە دەیزانـی ئـاخۆ ســەعات چەنـدە. کـات بەهـرەی ئەو بـوو. کـاتژمێرێکی لەســەر ســەر بـوو کە بەدروستی کاری دەکرد. هەموو شارەکەش دەیزانی.
– "ئەرێ خـاڵۆی بانگدەر، ســەعات چەنـدە؟" خەڵکەکە کاتێ دەیـانبینی وایـان لێدەپرسی.
ئەویـش هەمیشـە ســەعاتی راستودروسـتی پێدەگوتن. بەتـایبەتیش کچـان و کوڕانی شار، هەر بۆ خۆشی کە تووشی دەهاتن پرسیاری کاتیان لێدەکرد.
– "مـامەی بانگدەر، ئەرێ هەنـووکە ســەعات چەنـدە؟" کـاتێکیش بە دروسـتی کاتەکەی پێدەگوتن، ئەوانیش پێدەکەنین.
ئەو هەستێکی وای هەبوو، کە بە هرەیەکی خودایی هەیە بیبەخشێتەوە.



بانگدەرەکە، بانگدەری فەرمی مزگەوتەکە بوو. بەڵام دوای ئەرکەکەی، بـاقی کـاتەکە، هەر لەژێر زەمینەکەدا وەک گۆزەدروسـتکەر بەسـەردەبرد. وەنەبـێ شتەکە پیشە یان ئارەزووی بێ، بەڵکو شـتەکە بەهـای ژیـانی بـوو. بەبـێ قـوڕ ئەو نەیدەزانی هەنگاوێک بهاوێژێ.
زۆرجاران شاباڵی کوڕی، بەرهەمەکانی دەبردنە بازاڕ، لای دوکانەکان سـاغی دەکردنەوە.
ئەو تاکە گۆزەدروستکەری کۆنینەی شـارەکەبوو مـابۆوە. لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەش بـــێ، ئەو گـــۆزە و ســـوراحی و گوڵـــدانانەی دروســـتی دەکـــردن، نەدەمانەوە و دەفرۆشران.
ئەو گوڵـدانە گەورانەی نێـو مـزگەوتەکەش، دەسـتکردی ئەو بـوون. هەروەک ئەو گوڵـدانە گەورەیەی نێـو گۆڕەپـانی بـازاڕەکە، کە لە بەهارانـدا پڕگـوڵی ساردۆنیا دەبوو.

گۆزەدروستکردن رەوینەری ژیانە رۆتینییەکەی بوو، بەڵام لەپاڵ ئەوەشدا شتێکی دیکەشی هەبوو، کە واتای جوانی بە ژیانی دەبەخشی، ئەویش ئەو رادیۆ بچووکەیە بوو، کە لەنێو بەرکیدا دایدەنا.
رادیۆ لە ماڵەکەدا قاچاخ بوو، چونکە بەشتێکی بۆگەن(ناپەسەند، حەرام)یان دەزانی. کابرایەک، بڕواداری راستەقینە، هەرگیز دەستی بۆ رادیۆ نەدەبرد، ئاخر رادیۆ بڵندگۆی شا بوو. بۆیە رادیۆ لەگەڵ خانووەکەی مزگەوتێ نەدەگونجا، بەڵام بانگدەرەکە رادیۆ بچکۆلانەکەی لەژێر جلەکانیدا دەشاردەوە، ئیدی ببووە بەشێک لە گیانی. نوسرەتیش رادیۆکەی بۆ هێنابوو.



نوسرەت کەسێکی جیاواز بوو، نموونەیەک بوو بۆ خۆی، کەس نەیدەزانی ئاخۆ ئەو لە تاران چیدەکا. هەندێک دەیانگوت، گوایە ئەو لە سینەمادا کار دەکا، سینەماش ئەو شتە بوو، کە کەس لەنێو ماڵەکەدا نەیدەویست هەر باسیشی بکا. ئەوانی دیکە دەیانگوت، داهاتەکەی ئەو لە کاروباری وێنەگرتنەوەیە. هەمووان کەیفیان بە نوسرەت دەهات، هەمیشەش شتی نوێی بۆ گوتن پێبوو، شتی نوێی دەهێنایەوە ماڵ، بە ژیانە سەیروسەمەرەکەی هەمووانی سەرسام دەکرد. ئەوبوو وای لە ئاکنجییەکانی حەسارەکە کرد، دیوەکەی دیکەی ژیان ببینن.
جارێکیان، لە وەرزی بەهاردا گەڕابووەوە ماڵ، بینی بانگدەرەکە لەبەرەبەیانێکی زوو بەرەو سەر رووبارەکە رۆیشت. ئەو لەخۆی پرسی تۆ بڵێی بەو زووە، لەسەر رووبار چیبکا. ئیدی نوسرەت بە دوایدا چوو، لە دوورەوە چاودێری بانگدەرەکەی کرد، بە شێوەیەک، کابرا هەستی پێنەکا.
بانگدەرەکە لە پردەکە پەڕیەوە و چووە ئەودیوی رووبارەکە، لە رەز و باخەکە و کێڵگەی گەنمەکەش رەت بوو. هێشتاش هەر تاریک بوو، دونیا رووناک نەببووەوە، بەڵام بەرەبەیان و دونیا رووناک بوونەوە لە ئانوساتدا بوو. ئەو هەر دەڕۆیشت تا گەیشتە باخی بادەم، لەوێ دارەکان لەبن گوڵەکانیاندا داشکابوونەوە. بۆساتێک نوسرەت، یارۆی بانگدەری لێ ونبوو.
ئەویش بە سپایی بەنێو دارەکاندا رۆیشت، بەڵام نەیدۆزیەوە. ئەو لای دارێک وەستا، کڕوبێدەنگ، لێ کاتێک دنیا روناک بووەوە، بە هەزاران باڵندە لەیەک

کاتدا خوێندیان. بە ڕاستی ساتەوەختێکی دڵهەژێنی بێوێنە بوو. دەستبەجێ نوسرەت، کابرای بانگدەری بینی لەنێو ئەو سەدان دار بادەمەدا نقەی لەخۆی بڕیبوو، بە ملێکی لارەوە گوێی لە دەنگی مەلەکان گرتبوو.
هەوا بە بۆنی بەهێزی گوڵی دارەکان دەماردەمار دەڕۆیشت، هاوکات لەگەڵ دەنگی بولبول و شالوور و مەلەکانی دیکەدا، دیمەنێکی ناوازە بوو، بانگدەرەکەش وەک پیاوێک لە بەرد دروستکرابێ وابوو، داردەستەکەی بە دەستەوە و گوێی رادەدێرا.
کاتێکیش یەکەمین گوژمە تیشکی ڕەنگاوڕەنگ بەر درەختەکانی بادەم کەوت، مەلەکان بێدەنگ بوون، لە پڕ بەیەکەوە کەوتنە جووڵە و بەرەوە بەرەو کێوەکان هەڵفڕین.
کاتێکیش مەلەکان فڕین، بانگدەرەکەش یاغر یاغر بەرەو ماڵ بووەوە.
بۆ شەوەکەی نوسرەت سەردانی بانگدەرەکەی لە هۆدەکەی خۆیدا کرد.
– "ئەرێ مامەی بانگدەر، کاتت هەیە بێمە لات؟"
– "فەرموو وەرە ژوور. بۆتۆ هەمیشە کات هەیە."
– "من دەمەوێ شتێکت نیشان بدەم، شتێک ببیستی."
ئیدی ڕادیۆیەکی لەنێو تورەگەیەک دەرهێنا، پلاکەکەی لە کارەبا خست و گلۆپێکی بچکۆلانەی سوور هەڵبوو. نوسرەت بە هێواشی میلەکەی سوڕاند بەدوای کەناڵێکی موزیک دەگەڕا. لە پڕێکدا دەنگی موزیک بەنێو ژوورەکەدا بڵاوبووەوە. نوسرەت دەرگای هۆدەکەی پێوەدا و بە نەرمی بە بانگدەرەکەی گوت: "بە باشی گوێی بۆ ڕادێرە."
بانگدەرەکە بە سەرنجەوە گوێیهەڵخست، تۆ دەتبینی گوێکانی وشت و قولاغ بوون، بە ئاراستەی دەنگەکەوە دەچوو. کاتێکیش موزیکەکە تەواو بوو، بە قووڵی هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: "ئەرێ ئەوە چی بوو؟"
-"سەمفۆنیایەک! ئەوەی ئەمڕۆ لە کازیوەی بەیاندا لەنێو دارەکاندا گوێت لێبوو، ئەویش سەمفۆنیایەک بوو، سەمفۆنیای باڵندەکان. ئەوەی هەنووکەش گوێت لێبوو، سەمفۆنیایەک بوو، مرۆڤ دایهێناوە. من ئەم بەرەبەیانە تۆم لەنێو دارەکاندا بینی، وەستابووی گوێت لە باڵندەکان دەگرت. پێموابێ تۆ پێویستت بەو موزیکە هەبێ."



کاتێکیش نوسرەت دوای ئەو جارە، جارێکی دیکە هاتەوە ماڵ، ڕادیۆیەکی بچکۆڵەی نێوگیرفانی لەگەڵ خۆی بۆ بانگدەرەکە هێنا. شەو درەنگانێک ڕادیۆکەی ڕادەستی بانگدەرەکە کرد.

– "ئیدی لەمڕۆوە دەتوانی بە شەو و ڕۆژ گوێ لە موزیک بگری، دەکرێ گوێ لە دەنگوباس و خەڵکی دیکەش بگری."

– "ڕادیۆ لەو ماڵە؟ ئاخر چی بە ئاغاجان بڵێم؟"

– "خۆتۆ پیاوێکی گەورەی، ڕادیۆکە بخەرە بەرکت و دەمیشت داخە، پێویست ناکا ئەوەی دەیکەی بۆ هیچ کەسی ڕوونبکەیتەوە! شتێکی دیکەشم بۆهێناوی، هێشتا هیچ کەسێک لەم شارەی زەنجانەدا نەیبینیوە." ئەمەی پێگوت و یەک دوو داویشی دانەدەست.

– "ئەمانە مایکەگوێن، ئەو دوو شتۆکەیە لەگوێچکەکانی خۆت رادەکەی و گوێ لە موزیک دەگری. دەی کەمێک هەڵستە، تا بیانخەمە گوێت."

بانگدەرەکە هەندێ دوودڵ بوو. نوسرەت ڕادیۆکەی لەنێو بەرکی ئەو ڕاکرد، وایەرەکانی لەژێر بلوزەکەی دەرهێنا و مایکەگوێکانی لەگوێ کرد و ڕادیۆکەی پێکرد.

– "گوێت لێیە؟"

– "بەڵێ، گوێم لێیە."

– "زۆر باشە! بەس ئاگاداربە، هەر کەسێک لێیپرسی، بێدەنگی لێبکە!"

ئیدی لەوکاتەوە، بانگدەرەکە بۆ هەرکوێیەک چووبا، شتۆکەکەی لەگوێدا بوو، کە لێشیان دەپرسی ئەوە چی لەگوێتدایە، هیچ وەلامی نەدەدانەوە. هەنووکە ماوەیەکە بەسەر ئەم کارەی تێپەڕیوە، خەڵکەکەش لە مایکەگوێچکەی ڕاهاتوون، پێیانوایە ئەمەش لەپاڵ چاویلکە ڕەشەکانی، نیشانەی بەختە.



هەنووکە ئەلسابری مردووە، هەموو پیاوەکانی بەرەبابەکە کۆبوونەتەوە، لە ژووری بەنگکێشانەکەی کازم خان دانیشتوون لەگەڵ ئەو جگەرە و تریاک دەکێشن.

دادەکانیش حەفت قەلنی بەنگیان لە باولەکەی ژێرزەمیندا بۆ ئەم مەبەستە هێناونەتەدەر. قەلنەکانیشیان سازو ئامادە کردووە.
پیاوەکان بەدەم بەنگکێشان و چایە خواردنەوە، پارچە قەنادیان دەخستە نێو دەم و قسەیان دەکرد و یادەوەری ئەلسابرییان دەگێڕایەوە، دووکەڵەکەش بە بازنەیی لە دەمیان دەردەچوو بەرەو پەنجەرەکە هەڵدەکشا و دەڕەوایەوە.
ژنەکانیش لە ژووری خواردنەکەدا بەخۆشی دانیشتبوون و نێرگلەیان دەکێشا. لەنێویاندا تەنها زینەت بوو دیارنەبوو. دوای مردنی مەلا ئەلسابری، ئەو بەردەوام دەچووە ژووری کتێبان. ئیدی بە چەندان سەعات لەوێ دەمایەوە. ئاغاجان بەمەی دەزانی، بەڵام بۆ ماوەیەک وازی لێهێنابوو.
بۆ ئێوارەکەی پیاوەکان بەیەکەوە پیاسەیەکیان بۆ لای ڕووبارەکە کرد، دواتر چوونە مزگەوت تا گوێ لە خالخالی بگرن.

❖

لە هەفتەکانی دواییدا، خالخالی هەموو ڕۆژە هەینییەک لە مزگەوتەکەدا وتاریکی دەدا، بەڵام ئەمانە هەموو هەر قسەی ئاسایی و خۆناساندن بوو. ئەو بەئەنقەست بابەتی ناوروژێنەر و بێلایەنانەی هەڵبژاردبوو. بە وریایی چاوەڕێی ساتەوەختی خۆی دەکرد، تا بۆ بازاڕەکەی نیشان بدا، کە ئەو کێیە و چ جۆرە وتاریک پێشکەش دەکا، بۆئەوەی وتەکانی لە کاتی پێویستدا وەک تۆپ بتەقنەوە. لێ گەلۆ، هێشتا وەختی نەهاتبوو، هەلومەرجەکە نەگەیبوو، ئەو دەبێ جارێ ئارام بگرێ تا سێبەری مەرگی مەلا ئەلسابری بەتەواوی لەو ناوە دەڕەوێتەوە و خەڵکەکەش بەرەبەرە متمانەیان بۆ دەگەڕێتەوە. ئەمشەو خالخالی باسی ئەلسابری دەکا، بەتایبەتیش باسی ئەو مێژووە دووردرێژەی کە لە خزمەتی مزگەوتەکەدا بەسەری بردبوو. ئەو پێشتر سیپارە و بەڵگەنامەی پێویستی لە ئاغاجان وەرگرتبوو، هەمووشیانی خوێندبوونەوە.

❖

دوای پیاسەکە پیاوەکان دەستنوێژیان لە لای حەوزەکە هەڵگرت و ڕوویان لەمزگەوتەکە کرد تا لەوەختی خۆیدا بەنوێژ و وتارەکە رابگەن. دابێکی خانەوادەکە بوو، پیاوەکانیان لە دەرگەی مزگەوت پێشوازی لە مێوانەکانیان بکەن.

هەرچەندە دادەکان، چەند جارێک ژنەکانیان ئاگاداركردبوونەوە کە لە کاتی خۆیدا بچنە مزگەوت، لێ هێشتا ژنەکان هەر لەژووری خواردنەکەدا دانیشتبوون و بازاڕی قسەوباسیان بەدەم چایە خواردنەوە، میوە خواردن و نێرگلەکێشان، گەرم بوو. دادەکان کە تازە دوا ئاگادارکردنەوەی ئاغاجانیان پێگەیشتبوو، چوونە نێو ژووری ژنان بە لێپرسراوێتیەوە گوتیان: "دەی خانمان، دیارە ئێرەتان لێخۆش هاتووە! ئاگادارن کە سەدان ژن لە نێو مزگەوتەکدا چاوەڕوانتانن، کەچی ئێوە هێشتا هەر سەرقاڵی نێرگلە کێشانن. دەی خێراکەن، دەنا ئاغاجان بە خۆی دێ و دەرتان دەکا."

ئیدی فەخری سادات چارشێوە ڕەشەکەی بەسەر خۆی دادا. بە دوایدا هەموو ژنان بەرەو مزگەوت بەڕێکەوتن. زینەت خانمیش لەحوجرەکە هاتەدەر و ڕەگەڵیان کەوت.

تاکەکەسێک کە هێشتا نەگەیشتبێ، نوسرەت بوو.

بەڵام خۆ ئەو هەر بەناوەخت دەهات. کە دەهات تەلەفۆنی نەدەکرد، زەنگی ماڵیی لێنەدەدا، هەروا خۆی بەژووردا دەکرد و لای حەوزەکە قیت دەبووەوە، یاخود بە خۆی و کامێراکەی بە بەردەم ژوورەکاندا دەڕۆیشت تا هەلێکی بۆدەستکەوی هەر کەسێک لەناکاو، بێ خۆئامادەکردن بکەوێتە بەر چاوی کامێراکەی و وێنەیەکی بگرێ.

ئەو لە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی مەلا ئەلسابریدا ئامادە نەبوو، بە تەلەفۆنیش دەستنەکەوت و بروسکەی مردنەکەی ئەلسابریشی بە درەنگەوە بەدەست گەیشتبوو. بەڵام دواتر بە ئاغاجانی گوتبوو کە بۆ شەوەکەی دوایین ڕێوڕەسمی بۆنەکە، خۆی دەگەیەنێتە ماڵ.

❖

هەنووکە هەمووان چوونەتە مزگەوت و ماڵەکەش کڕوبێدەنگە. دادەکان چوونە سەر تاتی حەوزەکە و دەستنوێژی خۆیان هەڵگرت.

– "من چیدی خولقی ئەوەم نەماوە سەر بەمزگەوتەکەدا بکەمەوە." ئەوە قسەی گوڵبانو بوو بە گوڵبینی گوت.

– "باجارێ کەمێک لێرە بمێنینەوە، بەر لەوەی هەمووان بگەڕێنەوە." گوڵبێش وا وەڵامی دایەوە.

دوای مەرگی مەلا ئەلسابری، چیدیکە دادەکان سەریان بە ژووری کتێباندا نەکرد، ئاخر ئەوان هێشتا سەروکاریان لەگەڵ خالخالی پەیدانەکردبوو، بۆیە کاتێک ئەو لەوێ ببوایە ئەوان سەریان بەشیپانەی دەرگەی حوجرەکەدا نەدەکرد. کاتێ هێشتا ئەلسابری مابوو، حوجرەکە وەک ژووره پاوانێکی ئەوان وابوو، بەڵام هەنووکە خالخالی ئەوێی گرتووە و دۆخەکە گۆڕاوە. هەر لەبەر ئەو هۆیەبوو، ئەوان خالخالیان خۆش نەدەویست، تامەزرۆی ئەو ڕۆژە بوون، ئەحمەد ئەلسابری خوێندنی مەلایەتیەکەی خۆی تەواوبکا و وەک مەلایەکی جێگیری مزگەوتەکە سوێند بخوا و دەستبەکار بێ.

– "ئەلسابری وەک دوڕ و گەوهەر بوو، لەدەستمان چوو." گوڵبانو بوو وایگوت: "خالخالی کەسێکی لەخۆباییە، ئەو بە شێوەیەک ڕێ دەکا و دەڕوا هەروەک ئەوەی سوڵتانی ماڵ بێ، خۆی لە هەموو پیاوەکان بەدوور دەگرێ، تەنانەت ناچێتە لاشیان دابنیشێ. هەرگیز ئەو جۆرە مەلا لەخۆرازییەمان لە ماڵەکەدا نەبینیوە. ئەو دەچێتە حوجرەکە دادەنیشێ، تەنانەت چاوەڕێی ئەوەش دەکا، کەسێکی وەک کازم خانیش بچێتە لای، سەریبدا و سڵاوی لێبکا. ئاغاجان هەر لەیەکەم ڕۆژەوە بەوەی زانیوە، کاتی خۆی ئیشێکی زیرەکانەشی کرد، بۆ هێنانی کاغەزە ناسنامەکانی ڕەوانەی قومی کردەوە."

لە ناخی دڵیانەوە دادەکان کۆستیان کەوتبوو، هەنووکەش کە مەلا ئەلسابری کۆچی دوایی کردووە، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئەو هەستەیان لاپەیدادەبوو، کە وادەی مردنی ئەوانیش نزیکبۆتەوە. ئەو ڕۆژانەش هێشتا هەر باشن، جارێ هەر بە مەرگی ئەلسابرییەوە سەرقاڵن، بەڵام کە میوانەکان دەڕۆنەوە، تۆ بڵێی چیبکەن؟

کاتێک خالخالی حوجرەکەی داگیرکرد و خۆی لەکونجەکەی ئاخنی، ناچارن دادەکان هەموو ڕۆژ و شەوەکەشی دووبەدوو لە ناندینەکەدا بەیەکەوە بەسەربەرن، ئاخر ئەوان حەزیان بەم شێوە ژیانە نەبوو. ئەوان نەیاندەتوانی هەر لە ناندینەدا بمێننەوە، ئەوێیان خۆشنەدەویست، بەبێ حوجرەکە، ماڵەکە وەک ماڵێکی مردوو بوو بۆیان.

چەند جارێک ویستیان بچنە لای ئاغاجان و گریی دڵیان بکەنەوە، لێ دەیانزانی شتەکە دادیان نادا، دەیانزانی مردنی مەلایەکە کۆتایی سەردەمی ئەوانیشە.

هەندێ جار دەچوونە گەرماوە چۆڵەکەی مەلا ئەلسابری و بەیەکەوە کوڵی دڵی خۆیان بە گریانێکی بێدەنگ هەڵدەڕشت.

کازم خان تاکە هیوای ماڵەکە بوو، لێ ئەویش پیر ببوو، ساتی مردنی نزیک بووەوە. خۆ ئەگەر ئەویش بڕۆیشتبا، ئەوا بەیەکجاری تروسکاییەکە دەکوژایەوە.



ماوەیەکی درێژ دادەکان لەسەر تەختەبەندەکە بێدەنگ دادەنیشتن. ئاسمانیش ساماڵ و ڕوون بوو، وردەوردە ئەستێرەکان هەڵدەهاتن، ئەوان گوێیان لە جیکەجیکی شەمشەمەکوێرەکان بوو. خۆ ئەگەر کەسێک شارەزای ماڵەکە نەبووبا و لەسەر بانی مزگەوتەکە سەیری ماڵەکە و حەوزەکەی بکردبایە، لەوانەبوو وای بیربکربایەوە، کە ئەو دوو ژنە، دوو پەیکەر بن لای حەوزەکەدا داندرابن.

خۆ ئەگەر یەکێ نەهاتبایە ئەو ناوە و بێداری نەکردبانایەوە، لەوانەیە لەخەو ڕاچووبان. گوڵبانو گوێی لە دەنگێک بوو، کە لەو تاریکییەدا لەپشت دارەکانەوە دەهات.

– "ئەرێ گوێت لێبوو؟" بە نەرمی لە گوڵبانوی پرسی.

پێیانوابوو کازم خان بێ و لە ژوورەکەی مابێتەوە و نەچووبێتە مزگەوت. بەهێواشی بەرەو ژووری بەنگکێشانەکە ڕۆیشتن، بەڵام خۆ دەرگاکەکەی کلۆم درابوو. لەژوورەوە دەنگی قرتەی ژنێک دەهات.

– "ئەی، ئەوە چییە؟"

ئەوان چوونە پشت دارکاژە پیرەکە، بە وریاییەوە گوێیان لە دەنگەکانی شەو گرت.

– "لەوانەیە ئەمە نوسرەت بێ!" گوڵبێ ئەم قسەیەی بە چرپەوە گوت.

– "ئای خوایە!"

ئینجا سیمایەکی دیاریکراویان لەبەر تیشکی چرای ژوورەکە بەدی کرد، بیچمی نوسرەتیان ناسیەوە.

– "باشە تۆ بڵێی کەی گەیشتبێ، ئاخر چۆن دەبێ ئێمە ئاگامان لێنەبووبێ؟ ئەدی ئەو ژنە کێیە لەگەڵیدایە؟" گوڵبێ بوو وایگوت.

ژنێک، لەژێر چارشێوێکی ڕەشدا، لەبن تیشکی سەوزی گڵۆپەکانی منارەکانی مزگەوتێ دەرکەوت و دیسان بزربووەوە.

– "لەوانەیە ژنە تارانییەکە بێ."

– "نەخێر، ئەو لۆتییە هەرگیز لای یەک ژن نامێنێتەوە. ژنە تارانییەکە بچکۆلانە بوو، لێ ئەمەیان بەژن درێژە و چارشێویشی بەخۆداداوە. ئەمەیان یەکێکی دیکەیە."

– -"باشە چیبکەین؟"

– "من هیچی لێتێناگەم."

نوسرەت بە خۆی و ژنەکە هاتە سەرپەیژەکان ، کە بۆ سەر بانی مزگەوتێ دەچوو.

– "دەی، نازدارەکەم، وەرە!" نوسرەت وا بانگی ژنەکەی کرد.

– - "نەخێر، لەگەڵت نایەم، من ناوێرم." ژنەکەش بە تریقەی پێکەنینەوە وا وەڵامی دایەوە.

– - "پێویست ناکا بترسی، هیچکەس نامانبینێ، هەر هەموویان بۆ مزگەوتەکە ڕۆیشتوون، بۆ نوێژ ئێرەیان چۆڵ کردووە." نوسرەتیش وای پێگوتەوە.

– "نەخێر، من نایەم، ئاخر ئەوێ زۆر بەرزە."

– - "باشە بۆچی ئەو دەیەوێ ژنەکە لەگەڵ خۆی ببا؟" گوڵبانو بەسرتەوە وایگوت.

– - "تەنانەت شەیتان بەشەیتانیێتی خۆی نازانێ ئەو لەبەر چ نەخەشەیەک دایە." گوڵبێش وا وەڵامی دایەوە.

ئیدی بێدەنگییێک باڵی بەسەردا کێشان، پاشان لەسەر بانەکە دەرکەوتن. دادەکانیش  بە نەرمی و هێواشی بەدوایاندا بەسەر پەیژەکان کەوتن، بە

ئەسپایی لێ وەسەر بانی گومبەزەکە کەوتن، لەوێدا خۆیان لەپشت گومبەزەکەدا حەشار دا.
نوسرەت یەکێ لە دەلاقەکانی منارەکانی کردەوە، مرۆ لە ڕێی دەلاقەکەوە دەیتوانی بگاتە تۆپکەی منارەکە.
- "من ناوێرم بێم." ژنەکە وا هاواری کرد.
- - "دەی، مەترسە. لێرە زۆر خۆش و دڵهەژێنە. تۆ بەڵێنت پێدام لەگەڵم بێی. من دەمەوێ تا ترۆپکی منارەکە بتبەم، دەمەوێ لەو بەرزییەوە ماچت بکەم. ئینجا دەمەوێ لەوێ لەژێر ئەو تیشکە سەوزەدا شتەکە بکەین."
نوسرەت ئەمەی بە هێواشیەوە گوت.
- "من نامەوێ بێم، ئاخر دوایی دەمانبینن."
- "پێویست ناکا بترسی، خۆ ئەگەر گەیشتینە ئەوێ، کەس نامان بینی."
ئەو یارمەتی ژنەکەی دا لەدەلاقەکەدا سەربکەوێ، ژنەکەش بە پێکەنینەوە ئەمەی دووبارە دەکردەوە: "من نامەوێ شتەکە بکەم، ناوێرم، ئاخر نامەوێ."
کاتێکیش بەیەکجار چوونە سەر یەکەمین دار، خۆی لەنێو منارەکە هەڵکێشا و دەرگای دەلاقەکەی دادایەوە.
دادەکان، کە خۆیان لە پشت گومبەزەکە مەڵاسدابوو، بە حەپەساوی سەیریان دەکرد.
- "ئای خودایە، رەحمێ!" ئەوان بەیەکەوە ئەمەیان لەسەر زار بوو.
نوسرەت و ژنەکە ئیدی بەیەکجار لەبەر تیشکە سەوزەکە لە سەر تۆقەڵی منارەکە دەرکەوتن. سێبەری ئەوان لەسەر دیوارەکەی دیکەی مزگەوتێ دەرچوو.
بایەکەش گەمەی بە چارشێوە ڕەشەکەی ژنەکە دەکرد، هەروەک ئەوەی ئاڵایەکی ڕەش بێ لەسەر منارەکە هەڵدرابێ.
- "نەکەی،" ژنەکە بەنەرمییەوە بە نوسرەتی گوت. چونکە ئەوان لەسەر تۆقەڵی منارەکە بوون، دەنگیان لەمزگەوتەکەدا سەدای دەدایەوە.
سایە گەورەکەی نوسرەت جووڵەکی ڕێکوپێکانەی لەسەر دیوارەکەدا نیشاندەدا. دادەکانیش دەستیان لەسەر دەمیان بوون، لەبەر ئەو دیمەنەی دەیان دی حەپەسابوون و هەڵدەلەزینەوە. بۆ ساتێکیش نوسرەت پالی

بەژنەکەی نا تا سەر لێواری مانارەکە، کە بەپێکەنینەوە هاواری کرد: "کوڕە نەکەی! خەریکە بکەوم!"
پێکەنینی ژنەکە لەنێو مزگەوتدا دەنگی دایەوە، بەڵام لەبەر وتاری خالخالی بزربوو، چونکە دەنگی مەلا لەنێو بڵنگۆکەدا دەهاتەدەر. ژنەکە هێشتا هەر نەرمە دەنگێکی لێوە دەهات. تا لەپڕ بێدەنگیان بەسەرداهات و سایەی بیچمیشیان لەسەر دیوارەکەدا لاکەوت.
دادەکان بە هێواشی و پێدزیلکەوە گەڕانەوە لای پلیکانەکان و دابەزینە خوارەوە بۆ نێو ماڵەکە. لە ژوورەکەی خۆیان دوگردەکەیان لێککردەوە، چارشێویان لەخۆیان دا، ئیدی بە پەلەپرووزێ ڕووەو مەککە نوێژەکەیان دابەست.

## وتار

مانگەکانی بەرایی، خالخالی ئارامی مزگەوتەکەی پاراست، ئەو دەیزانی کە ئاژانەکانی دەزگای هەواڵگری نهێنی لە کاتی نوێژ و ریتوێلەکاندا ئامادەن و هەموو شتێکی ئەوێیان خستۆتە بن چاوان.
ئەو لە ژیانی ڕۆژانەیدا لەبارێکدا نەبوو تا پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەر بەباشی ڕابگرێ، خەڵکەکە ئەویان بە مەلایەکی مڕومۆن و وشک و ڕەق دەناسی. بەڵام هەر کاتێ وەسەر سەکۆی دوانی مزگەوتەکە دەکەوت، دەبووە کەسێکی دیکە. ئەو لەدڵ و دەروونەوە دەدوا، بەدەم خەڵکەکە پێدەکەنی و قسە و ڕووی گەش و خۆش بوو، گاڵتەوگەپیشی دەکرد، هەمووشی بۆ ئەوە بوو خەڵکەکە بەتامەزرۆوە گوێی لێبگرن.
لە وتار و دوانە سەرەتاییەکانیدا خۆی لاپەڕگە دەگرت و خۆی لەباس و خواسی گەرم و وروژێنەر دەبوارد، زۆر جاران سورەتێکی لە قورئان دەهێنا و دەیخوێندەوە، ئینجا هەوڵی دەدا لایەنە مێژووە جۆربەجۆرەکانی لێکبداتەوە کە ڕاڤەی دەقەکەی پێکراوە.
هەندێ جار هەنگاوێک لەمە زیاتری دەهاویشت، باسی هێزی ڕەوانبێژی زمانەکەی دەکرد، کە چۆن سورەتەکان بە شێوەیەکی هۆنراوەئاسادا بەکێش

و سەروا نووسراونەتەوە. بۆ ئەمەش نموونەی دەهێنانەوە، ئایەتەکانی بە دەنگێکی خۆش و بە تەرتیل دەخوێندنەوە.
خەڵکەکەش خۆشیان بە لێکدانەوەکانی ئەو دەهات، ئاخر زۆربەی ئەوانەی هاموشۆی مزگەوتییان دەکرد، نەیاندەزانی قورئان بخوێننەوە، لەوەش هەر گەڕێ کە واتاکەی بزانن.
قورئان بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوە، زمانێک کە بۆ ولاتێکی وەک ئێران زۆر جیاواز بوو، ئاسمان و ڕێسمان لەیەک جیابوون. وێڕای ئەوەش قورئان بە زمانێکی چواردە سەدەی بەر لە ئێستا نووسراوەتەوە، سورەتەکانیش دەبێ بە ڕوداوی مێژوویی لێکبدرێنەوە، ئەگەر لێزان و شارەزای بوارەکە نەبێ، لە واتاکەی ناگا.
بەلام خالخالی زۆر باش ئاگای لە ناوەڕۆکی سورەتەکان بوو. دەیتوانی بە ئاسانی و بە شێوەیەکی سادە و سەسورهێنەر وشەکان شیتەڵبکا و دەقەکە ڕاڤە بکاتەوە بە شێوەیەک کەسێکی ئاسایی لێتێبگا.
ئاژانەکانی دەزگای هەواڵگری نهێنی، بینیان مەلا کابرایەکی ڕوحانییە و لارییان لەسەر نەبوو. ئەوان ڕاپۆرتی ئەرێنیانەیان بۆ نووسینگەکانی خۆیان لەسەر وتارەکانی مەلا خالخالی بەرزکردنەوە.
بازاڕیش لە وتارەکانی رازی بوو. خەڵک پەسنی زانیارییەکانی دەدا، پەسنی لێکدانەوە مێژووییەکان و لێزانینی ڕاڤەکردنەکەیان دەدا. هەندێکیان شتی زیاتریان لە خالخالی دەویست، هەربۆیە دەچوونە لای ئاغاجان بەڵکو پێیبڵێتەوە. "ئاخر ئەو هەر مەلایەکی جێپڕکەرەوەیە." ئاغاجان وایپێگوتن: "من ناتوانم لەوە زیاتری داوا لێبکەم، دوای ساڵێک یان دووان، هەر کاتێ کوڕەکەی مەلا ئەلسابری لە خوێندنەکەی بێتەوە، ئەوسا مەلایەکی جێگیر و تەواوعەیارمان دەبێ، ئینجا دەکرێ شتی زۆرتری لێچاوەڕێ بکەین."
بازاڕ سکالای خۆی کرد، خالخالی دەیزانی چۆن دڵی خەڵک بە بابەتە نوێ و سەرنجڕاکێشەکانی بڕفێنێ و بۆ خۆیان کێشبکا. هەندێ جار باسی شتگەلی وایدەکرد، کە خەڵکانی بازاڕ بۆ یەکەمین جار بوو گوێیان لێدەبوو.
ئاخرین جار باسی مەلە کۆچکردووەکانی کرد، بابەتێک کە لەباری ئاساییدا نەدەبووایە هەرگیز لە مزگەوتێدا لای لێکرابایەوە. ئەو باسی ئەوەی بۆکردن،

چۆن مەل و باڵندەکان هەمیشە دوای کۆچەکەیان دەگەڕێنەوە و هێلانەی خۆیان دەدۆزنەوە. تەنانەت بەچکە تازە لەهێلکە دەرچووەکانیش، کە بە ڕێگایەکی نەناسراودا دەڕۆن و دەفڕن، بەڵام لە دواییدا دەتوانن لەسەر هێلانەی باوانیان بنیشنەوە.

بە حەپەسان و کارتێکردنەوە ئیمانداران گوێیان لەو قسانەی دەگرت، کە باسوخواسی هەرەمی هێزو دەسەڵاتی لە جیهانی مێروومستاندا دەهێنایە گۆڕێ، کەوا چۆن ئەوان وا وردەکاریانە لەگەڵ یەک بە زبارە[32] کاردەکەن. ئەو لەویدا هێز و دەسەڵاتی پەروەردگاری دەبینی، بۆیە ئەو شتانەی هەر بەنموونە دەهێنانەوە.

ئاغاجان بەو گۆشە نیگا تازەگەرییەی مەلا گەنجەکە کارانگاز بوو، دڵخۆشبوو بەوەی خالخالی بابەتگەلی هاوچەرخانە باس دەکا، کە بۆتە مایەی دنەدانی گەنجان بۆئەوەی ڕایانبکێشێتە نێو مزگەوت.

خالخالی ئینگلیزی خوێندبوو، هەرچەندە نەیدەتوانی بەزمانەکەش بدوێ، لێ دەیتوانی لە دەقە ئینگلیزییەکان تێبگا. ئەو گۆڤارێکی زانستی بەریتانی کڕیبوو، لەنێو حوجرەکەیدا بە چەندان سەعات سەری بەسەردا دەگرت، لە ڕێی فەرهەنگەوە هەوڵی دەدا لێیتێبگا. پاشان لێکدانەوەی خۆی بۆی هەبوو، سەرەنجامیش کردییە بابەتێکی سەرنجڕاکێشی یەکێ لە وتارەکانی.

لە وتارێکی دیکەیدا، باسی فڕۆکە و مێژووی فڕۆکەوانی کرد. ئەو پەسنی دوو برایە ئەمریکیەکە ویلبەر و ئۆرڤیل رایتی[33] دا کە ئازایەتی ئەوەیان هەبوو وەک باڵندە بفڕن، بەڵام هەر زوو ئەوەشی بۆ سەر قسەکانی زیادکرد، کە هەر ئەمریکییەکان نەبوون دەستپێشخەری فڕین بوون، بەڵکو فارسەکان بوون.

ئەو بە شێوازێکی گاڵتەئامێزانە گوتی؛ ئەمریکییەکان بە خۆشحاڵییەوە دەیانەویست، هەموو شتێک لە وڵاتەکەی ئەوانەوە دەست پێبکا.

- "ئەمریکا هەر پەنجا، شەست ساڵێکە دەستی بەفڕین کردووە، بەڵام ڕەگوڕیشەی فڕین بۆ ئێرە بۆ قووڵایی خاکەکەمان دەگەڕێتەوە." ئەو

---

[32] زبارە: بەهەرەوەزی، بەکۆمەڵ

[33] Wilber and Orville Wright

بەمشێوەیە لەسەر وتارەکەی ڕۆیشت؛ "جارێکیان لە مێژووی دێرینماندا، پاشایەک بەناوی نەمرود[٣٤] ویستویەتی باڵبگرێ و بفڕێ. ئەو ئەوەندە هێز و دەسەڵاتی هەبوو، پێیوابوو دەتوانێ دەستی بەسەر هەموو شتێک ڕابگا. وایدانابوو کێبەرکێ لەگەڵ یەزدانیشدا بکا. بۆیە بڕیاریدا بچێتە ئاسمان و شەڕ لەگەڵ خودادا بکا. ئیدی فەرمانی بەسەر زاناکانی سەردەمی خۆیدا کرد، کە ئامرازێکی وای بۆ دروست بکەن، بتوانێ پێی بفڕێ. ئەوانیش بیری سەیرسەیریان بەمێشکداهات، فڕۆکەیەکی سەرەتایی، گالیسکەیەکی باڵدار و شتێکی ئاوا. دواتر هاتن و چوار هەڵۆی گەورە و بەهێزیان هێنان، لەچوار لاوە بەپەت بە کورسییە تایبەتەکەی پاشایەتیان توند قایمکرد. ئەوسا نەمرودیش دەستی دایە شمشێر و چووە سەر کورسیەکە. ئەوانیش چوار پارچە گۆشتی شەمشەمەکوێرەیان لەسەر سەری هەڵۆیەکان ڕاگرت. هەڵۆیەکانیش باڵەکانیان لەیەکدان و هەوڵیاندا بگەنە گۆشتەکە. بەم جۆرە ئەوان فڕین، ئیدی یەکەمین ئامرازی فڕۆکەوانی سەری هەڵدا."



جارێکیشیان خالخالی لە وتارەکەی ناو مزگەوتێ، باسی ئاینشتاین و بیردۆزی خێرایی تیشکی کرد. هیچ کەسی ناو مزگەوتەکە هەرگیز پێشتر شتێکی دەربارەی ئاینشتاین نەبیستبوو، کەسیش نەیدەزانی کەوا تیشک ئەوەندە خێرایە، چجای ئەوەی بزانن کە خێراییەکەی تیشک 300.000 کیلۆمەترە لە چرکەیەکدا.

خالخالی کە بە بێئاگایی و بێزانیاریی گوێگرەکانی دەزانی، لە وتارەکانی دا هەندێ کۆپلە و ڕستەی بە زمانی ئینگلیزیش دەهێنانەوە، بۆ ئەوەی باندۆری خۆی زیاتر بخاتە سەریان. لەوانەیە ئەو یەکەم مەلای ولات بێ، لە وتارەکانی ڕۆژی هەینیدا وشەی ئینگلیزی بەکاربهێنێ. ئەو لە وتارێکیدا گوتی: "ئاینشتاین گوتوویەتی: من لەو ژیانە دوورودرێژەدا یەک شت فێربووم؛ ئەویش ئەوەبوو، هەموو زانستەکەمان بەپێوەر لەگەڵ واقیعدا شتێکی بەراییانە و منداڵکارانەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتاش ئەوەی هەمانە بایەخدارترین شتە."

---

[٣٤] Namroed

ئەو لە وتارەکەیدا، ئەوەی روونەکردەوە، وتەکە واتای چی دەگەیەنێ، بەڵام ئەوەندەی شت لەبارەوە گوت، وەک ئەوەی خۆی لەواتای بیردۆزی ڕووناکی گەیشتبێ. "با وادابنێین کە فڕۆکەیەکمان هەیە و خێراییەکەشی 300.000 کیلۆمەترە لە چرکەیدا، واش دابنێ کە فڕۆکەکە بە خۆی و سەرنشینەکانی ڕێک لەسەر بانی مزگەوتێ سازو ئامادەی فڕینە، ئینجا هەر بە گریمانە، پۆلە کوڕێکمان هەن، تەمەنیان لەنێون دوازدە و پازدەساڵیدایە، لە بەرامبەریشدا کۆمەڵە کچێکمان هەرلەهەمان تەمەندان.
ئیمە کۆمەڵەی کیژەکان لێرە لە نێو مزگەوتدا دەهێڵینەوە و کوڕەکانیش دەبەینە سەربان تا سواری فڕۆکەکە ببن.
ئەوسا فڕۆکەوانەکە، سلفێکی لێدەدا و فڕۆکەکەی بەگەڕ دەخا، فڕۆکەکە دەجووڵێت، بە خۆی و سەرنشینەکانی بەرەو بۆشایی ئاسمان دەفڕێ. با ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە خێرایی فڕۆکەکە، بەقەد خێرای تیشکە. لێرەدا دەبێ زۆر بەئاگا بین و دیققەت بدەین. خۆ ئەگەر کوڕەکان بۆ ماوەی تەنها سێ سەعات بە فڕۆکەکە بفڕن، دواتر دیسان بێنەوە سەربانی مزگەوت و هەڵنیشنەوە. ئینجا کوڕەکان دابەزن و بە پەیژەکان بێنەخوارەوە و بێنەوە ناومزگەوت، ئاخۆ ئەوسا چی ڕوودەدا. کاتێک ئەوان پەردەکە لادەدەن و سەیری کچگەلەکە دەکەن، ئەوەی بەچاوی خۆیان دەیبینن، بڕوای ناکەن. ئاخر کچەکان هەموویان بە تەمەندا ڕۆیشتوون، بوونەتە پیرەژنی کەوڵۆسی بێ دەم و ددان."
کاتێک ئەو قسانەی دەکرد، خەڵکە گوێگرەکە بە واقوڕماوییی، بە دەمی بەشەوە سەیریان دەکرد، هیچیش لەوەی گوێیان لێبوو، حاڵی نەبوون. ئاخر چۆن دەبێ لە ماوەی تەنها سێ سەعاتدا، کە ئەوان ڕۆیشتوون، کیژەکان وا بەساڵدا چووبن و پیروخەرۆ بووبن؟
"ئاخر تیشک، خێرایی تیشکەکە، ئاخر لۆژیکێکی تەواوجیاواز سەبارەت بە خێرایی تیشک لە گۆڕێدایە. هەرلەبەر ئەوەیە ئایەتەکە بەنموونە دەهێنمەوە. هەمووی جێپەنجەی خودایە، هێز لەسەرووی هێز، ڕووناکی لەسەرووی ڕووناکی." خالخالی ئاوای بۆ ڕوون کردنەوە.



لە میانەی ئەو وتارانەیدا، مەلا خالخالی لەنێو شارەکەدا زیاتر ناسرا و ناووناوبانگی لەنێوان گەنجاندا پەرەیسەند. سەرباری ئەوەش بایەخی زیاتری لە لایەن ئافرەتانەوە پێدرا.

هەرچەندە خالخالی ژنی هەبوو، لێ لە ڕاڕەوە تاریکەکانی مزگەوتەکەدا بە ژنە چوارشێو بەسەردادراوەکاندا دەورەدەدرا، ئەوان نامەی دڵداریان پێدەدا. ئەویش سەیری نەدەکردن، بەڵام نامەکانیشی دەخستنە گیرفان.

- "تۆ مەلایەکی کەشخەی." ژنێک کە لە ماوەی چاونوقاندێکدا لە ڕاڕەوەکە چاوی بەخالخالی کەوت، وایپێگوت.

- "من دەمەوێ لەگەڵ تۆدا بە فڕۆکەکەی ئاینشتاین بەرەو ئاسمان بفڕم."

ئەمەش قسەی ژنێکی دیکەبوو کاتێ بەلایدا ڕەتبوو.

- "بۆنێکی زۆر خۆشت لێدێ، ئەرێ گوڵاوەکەت لە کوێ دەکڕی؟" کیژێکی گەنجیش لە ڕارەوە تاریکەکەدا بێئەوەی سەری هەڵبێنێ وایپێگوت.

- "کاتێ مێزەرەکەت بەلاری دادەنێی، زۆر کۆک دەردەکەوی." ژنێکی دیکەش ئەم قسەیەی چرپاندە گوێی.

نێو مزگەوتێ بە هۆی پەردەیەکەوە، ژنان لە پیاوان جیادەکرانەوە. سەکۆی دوانەکەش لە شوێنێکی بەرز لەنێوەڕاستی ژن و پیاوەکان داندرابوو. بە زۆریش وابوو، کچە گەنجەکان لە ریزی پێشەوە دادەنیشتن، بۆ ئەوەی مەلا خالخالی لە کاتی وتارداندا بەباشی ببینن. خالخالیش چێژی لەو سەرنجڕاکێشان و بایەخپێدانی ئەوانەوە وەردەگرت، ئیدی هەر چاوەڕێی ڕۆژی لەدایکبوون(مەولود)ی پێغەمبەری دەکرد، بۆئەوەی جارێکی دیکە ڕووی خۆیان نیشان بداتەوە. چونکە بەگوێرەی دابونەریت، لەو ڕۆژەدا باسوخواسی گرنگ و چارەنووسساز دەهێندرایە گۆڕێ. ئاخر بە ڕێکەوت نەبوو، زۆرینەی ڕووداوە مێژووینەکان لەشارە پیرۆزەکەی قومدا لەو ڕۆژەدا دەقەومان. هەمووانیش بە تاسەوە بوون ئاخۆ مەلا خالخالی لەو ڕۆژەدا چ جۆرە دوانێک دەدا.



بە یاوەری ئاغاجان و شابال مەلا خالخالی گەیشتە سەر مینبەری مزگەوتێ.
ئیدی لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشت، بۆ ساتێک بێدەنگ بوو، پاشان بە دەنگێکی ئاهەنگئامێزانە سورەتی (الزلزلة) ی خوێندەوە:

إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا (١)
وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا (٢) الزلزلة

يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ (٤)
وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنْفُوشِ (٥) القارعة

وَقَالَ الْإِنْسَانُ مَا لَهَا (٣)
يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا (٤) الزلزلة

**{هەرگا زەمین بە بوومەلەرزە توندەکەی هاتە لەرزین،**
**ئەم زەمینەش گرانباری خۆی وەدەرخست.**

**ئەو ڕۆژە گشت ئەو مەردمە وەک پەپوولەی پرژاو دەبن،**
**کێوەکانیش وەک خوری شیکراو دەبن.**

**مرۆش پرسی: چی قەوماوە بۆ وا دەکا؟**
**ئەوێ ڕۆژێ بەسەرهاتەکەی باس دەکا.}**

❖

لەرەی دەنگی خالخالی شتێکی زۆر لەوانی دیکە جیاواز بوو، هەرگیز وشەی وا سەنگین و بە هێزی لەدەم دەرنەپەڕیبوون.
مزگەوتەکەش پڕبوو، جمەی دەهات، هەمووشیان بە بایەخەوە گوێیان گرتبوو، ئەویش زیاتر لەسەری ڕۆیشت: "مامۆستا ئەلسابری ماوەیەکە لەنێوماندا نەماوە، بەڵام مزگەوت ماوەتەوە.
ڕۆژێک دادێ ئێمەش هەمووان دەڕۆین و کۆچی دوایی دەکەین، لێ مزگەوت هەر لەشوێنی خۆی دەمێنێتەوە.

ئەرێ ئەوە ڕاستە؟ تۆ بڵێی مزگەوت تا هەتایە هەر بەپێوە بمێنێتەوە؟ نەخێر، مزگەوتیش بە نەمری نامێنێتەوە. مەلایەکان دەڕۆن، مزگەوتیش دەڕوا، ئەوەی بمێنێتەوە هەر دەنگە."

پیاوەکانی ناو مزگەوتێ تەماشای یەکدییان کرد. ئاغاجانیش ئاوڕێکی لە شاباڵ دایەوە: "ئەرێ ئەوە چی دەڵێ؟ دەنگ دەمێنێتەوە؟ مەبەستی چییە؟"

بەڵام ئاغاجان بیریکردەوە، خۆ خالخالی ڕاست دەکا. دەمێکە مەلا ئەلسابری لەیادکراوە و هیچ وتەیەکیشی لێبەجێنەماوە، چونکە ئەو هیچی پێنەبوو، هیچی لەباردا نەبوو تابیڵێ. هەرچی باوکی ئەلسابری بوو، شتێکی دیکە بوو، ئەو مەلایەکی سەرنجڕاکێش بوو، دوان و وتاری ئاگرینی دەدان، ئاخر ئەو کابرایەکی بەرزەفڕ و بە خواست بوو، خوازیاری گۆڕانکاری بوو، پیاوێک بوو دەوێرا ناوێ شتەکان بهێنێ. لەو سەردەمەی ئەو مەلای مزگەوتێ بوو، شارەکەی هەموو لە نێو گولمەی دەستدا بوو، بە ئاماژەیەکی پەنجەی دەیتوانی بازاڕیش بجوڵێنێ. باوکی مەلا ئەلسابری دەیان ساڵە کۆچی دوایی کردووە، لێ دەنگ و سەدای هەرماوە، هێشتاش دەنگی ئەو لەیادەوەری شارەکەدا دەمێنێ.

جارێکیان مەلای ڕەحمەتی لە ساڵیای لەدایکبوونی پێغەمبەر موحەمەددا، وتارێکی ئاگراوی لەدژی ڕەزاخانی باوکی شادا خوێندەوە، دوای ئەوە شا چارشێوی لە ئافرەتان قەدەغەکرد، سەربازەکانی ناردنە سەر شەقامەکان، بۆئەوەی هەر ژنێکی چارشێوبەسەر بگرن و ڕاپێچی پۆلیسخانەکانیان بکەن. ئیدی باوکی مەلا ئەلسابریشیان گرت و بۆ شاری (کاشان)یان دوورخستەوە. دوای ئەوە ئاساییش هات و دەرگای مزگەوتەکەشی گاڵەدا.

ئاغاجان بوویەرەکانی ئەوێ ڕۆژێی، هەروەک دوێنێ قەومابێ، لەبیربوون. ئاخر هەینێ لەپڕ چەند ترومبێلێکی سەربازی لەبەردەم مزگەوتەکەیدا وەستان، چەند چەکدارێکی بە پەلەپڕوزێ لێدابەزین. دوای ئەوە جێبێکی دیکەش کە ئەفسەرێکی چەکداری تێدا بوو، هات. ئەویش لە جێبەکە دابەزی، دارێکی کورتی[35] لەبن هەنگڵدا بوو، ڕاستەوخۆش بە پێڵاوەوە لێوەژوور

---

[35] بەو دارە کە درێژییەکەی هەر 60 سانتیمەتر دەبێ، دەڵێن داری ئەفسەران. ئەمەش هێمایەکی کۆنینەیە بۆ دەسەڵات. وەرگێڕ

مزگەوتی کەوت، ویستی دەستبەجێ مەلا پیلبەست بکا، لەگەڵ خۆی بۆ گرتووخانەی ببا.
هەر ئەوێ ڕۆژێ، ئاغاجان هێشتا لاو بوو، تازە سەروکاری مزگەوتیی کەوتبووە دەست، ئەوسا بە حەوسەڵەوە بەرەو لای ئەفسەرەکە ڕۆیشت و پێیگوت: "ئەگەر تۆ لەمزگەوتێ بچیە دەرێ، ئەوا مامۆستا بە خۆی دێتەدەر و لەگەڵتدا دێ، دەنا، دەترسم شەڕێک بقەومێ. ئیدی ئۆباڵەکەش لەملی خۆت."
ئەو بە دەنگێکێ وا ڕۆشن و بیستراو و گردەبڕانە، هیچ بوارێکی بۆ دوودڵی و منگەمنگ نەهێشتبووەوە. ئەفسەرەکەش سەیرێکی باوەڕەدارە ئامادەبووەکانی ناو مزگەوتیی کرد، کە دەوروخولی مامۆستایان دابوو. ئیدی کابرا لە پەیامەکەی ئاغاجان گەیشت، پاشان دارەکەی دەستی لەسنگی ئاغاجاندا ڕاکرد و پێشیگوت: "تۆ مەلام بۆ دێنی. من لە دەرەوە چاوەڕێتان دەکەم!" بەم جۆرە لە نێو مزگەوت دەرچوو، لە دەروازەی دەرێ چاوەڕوان بوو.
ئاغاجانیش بە سەرێکی بەرزەوە یاوەری مامۆستای تا لای جێبەکە کرد، کە بەدەیان بڕواداری لەپشتیەوە ڕاوەستابوون.
ئەفسەرەکەش مامۆستای خستە نێو جێبەکە و هەر بە خۆیشی چووە پشت سووکانەکە و جێبەکەی لێخوڕی و لەوێ ڕۆیشتن.
لەهەمان کاتیشدا سەربازەکان هەموو ئەوانەی لەنێو مزگەوتەکە بوون، وەدەریان نان و دەروازەکانی مزگەوتەکەشیان داخستن و گاڵەدان.
سێ ساڵ دواتر، دوای ئەوەی ڕەزاشا لە لایەن بەریتانیەکان ناچارکرا وڵات بەرەو میسر جێبێڵێ، دەرگای مزگەوتەکە کرایەوە.



ئاغاجان لەبەر خۆیەوە مسکە بووەوە، بە تاسەوە چاوەڕوانبوو ئاخۆ خالخالی چی پێیە. خالخالیش بێدەنگ ما، لەو بێدەنگییەشدا سەیری ئاپۆرای ئامادەبووانی نێو مزگەوتیی دەکرد. لەهیکەوەش بێ ئەوەی هیچ پەیوەستێکیش لەگەڵ بابەتی قسەکانی پێشویدا هەبێ، وشەی "ئەمریکا!"ی لەدەم دەرپەڕی.

وشـەکەش وەک ئەوە وابـوو بەردێـک بگـریە نێـو ئەو حەشـاماتە قرِوقەپەکە، دەستبەجێ منگەمنگ لە هەردوو دیوی پەردەکە پەیدابوو، بوو بەغەڵبەغەڵب و مقۆمقۆ. ئاخر ناوهێنانی ئەمریکا یەکێ لەباسە قەدەغەکراو و بڤەکان بـوو، کە لە مزگەوتدا لای لێبکرێتەوە. وشەکە بارێکی قورسی سیاسییانە بوو، چونکە ئەمریکا ئەو ئەمریکایە نەبوو کە ئارامی جیهانی بوێ، ئەمریکا ناپەسـەند بـوو، ئەمریکا بەردەوام دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوو.
خەریکبـوو شـایە گەنـجەکەش لەوڵات رابکـا، ئیـدی کۆتـایی بە فەرمـانرەوایی دووهەزار و پێنجسەد ساڵەی پاشایەتی وڵات بێ، بەڵام ئاژانەکـانی سـی ئـای ئەی ئەویـان لە رێـی کودەتـایەکی ئەمریکییـانە گەرانـدەوە وڵات و لەسـەر تەختوبەختی پاشایەتی دایاننایەوە. ئیدی لەو کاتەوە لە لایەن ئایەتوڵلاکانەوە ئەمریکا بە شەیتان ناونرا و لە نێو مزگەوتاکانیشدا رەفتار و هەڵویستی دژە ئەمریکانەیان نیشاندەدا.
کـاتێکیش مەلایەک لەنێـو مزگەوتیـدا وشـەی "ئەمریکـا"ی لەدەم بێتەدەر، ئەوا بەدەر لەو واتایە هیچی دیکە ناگەیەنێ ئەویش ئەوەیە: "دەی با شـەیتان دەفن بێ! دەی با ئەمریکا دەفن بێ!"

"رۆژگـار گـۆراوە، رەزاخـان رۆیشـتووە، ونبـووە، بەڵام هەنـووکە ئەمریکـا لە هەموو شوێنێک حازرە. لە تارانە، لە قومیشە!" خالخالی بوو وایگوت.
ئەو شـتێکی گـوت، لـێ لەهەمـان کاتیشـدا هیچـی نەگـوت. لە راسـتیدا ئەو راستییەکی بێخەتایانەی جارِدا: "رۆژگارەکان گۆراون. کەچی ئەمریکا هێشتا هەرماوە!"
پیاوە ژیرەکانی شارەکە، وتەکانی مەلایان وەک زێرِ دەپێوا، تێبینی ئەوەیان کرد، کە ئەو رێوییەکی لەبلەبانە بۆخۆی. ئەو دەزانێ چۆن وشـەکانی بە دوای یەکدا هەڵبژێرێ تا باندۆری خۆیان لەسەر گوێگرانی ئامادەبوو دابنێ.
خالخالی سەیرێکی خەڵکەکەی کردەوە. خەڵکیش چاوەروانی وشەکانی دیکەی بـوون، کە بەدواییەکـدا دەهـاتن، هەموویـان سـێرەیان لە لێوەکـانی گرتبـوو. ئەویش بە دوو وشـەی "ئەڵلا، ئەڵلا" دری بەبێدەنگیەکە،دا.

ئیدی بەتەنها ئەو دوو وشـە لەدەم دەرپەڕیوانە زۆر واتایان دەگەیاند. خۆ ئەگەر بتەوێ لە شتێک نزیک ببیەوە و ناوی بهێنی، ئەوا دەڵێی: "ئەڵڵا ئەڵڵا."
ئەگەر کوێرەوریێکیشت بەسەردا هات، هەر هاوار دەکەی : "ئەڵڵا ئەڵڵا."
بەڵام هەنوکە خالخالی وشەکانی لە رامانێکی دیکەدا بەکارهێنان. لەبەر ئەوەی نـاوی (قـوم) و ئەمریکـای لەیەک رسـتەدا بە جەختکـراوی هێنـا، ئیـدی دەربڕینەکە واتایەکی بارگاوی هەبوو. قوم! ئەمریکا! ئەڵڵا ئەڵڵا! وەک ئەوە وابوو کە لەنێو مزگەوتەکدا تەقە بکرێ.
پاشـان مەلا خالخـالی ئاراسـتەی وتـارەکەی گـۆڕی و ڕوویکـردە سـوڕەتی (الفتح):

**■ ■ ■ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا (٢٩)**

**{لە کڕنۆش و سوژدە چاوت پێدەکەون. هەر بەهێڤی و ڕەزامەندی و چاکەی خودان. دروشمی سوژدەبردنیان بەناوچەوانەوە هەیە، وێنەشیان لە تەورات دایە و نموونەشیان لە ئینجیلدا. شێوێندراوە بە چنارێک تیشـەی بەرەوژوور هەڵچووبێ و وەچی فرەی دەرکردبێ ستوور بووبێ و لەسـەر لاسک خۆی گرتبێ و وەرزێران سـەیری بمێنن؛ تـا چاوچنۆکـانی سـپڵەی پێ قەڵس کـا. ئەوانەی خـاوەن بـاوەڕو ئاکارچـاکن، خـوا بەڵێنـی لێبـووردن و پاداشـتی گەورەی پێداون.}**

ئاغاجـان ئـاوڕێکی لە شـاباڵ دایەوە. مەلا خالخـالی هەر لە سـورەتی (الفـتح) نەوەسـتا، بـێ ئەوەی تێبینـی بکـرێ چەنـد ئایەتێکیشـی لە سـورەتی (الـروم) خوێندنەوە:

غُلِبَتِ الرُّومُ (٢)
فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣)
فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤)
بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (٥)

{ڕۆمی شکان،
لە نزیکتر کەوشەنی ئەم سەرزەمینە، لە دوای ئەم ژێرکەوتنەیان جارێ تر سەردەکەونەوە؛
لە ماوەی کەمتر لەدە ساڵ، پێش ئەو شکانە و دواییەش، هەموو کار، کاری خودایە و ئەوێ ڕۆژێ باوەڕداران کەیفی دەکەن،
بەیاریدە لە خوداوە، خودا حەز کایاریدە بەهەرکەس دەدا، هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتە و دلۆڤانە.}



بەم ئایەتە کۆتایی بە وتارەکەی هێنا.
دوانەکە، دوانێکی تەمومژهەڵگر و گومانـاوی بوو، هەریەکێک بە شێوازی خۆی دەکرا ڕاڤەی بکـا. ئەو وتـارەکەی بە شـێوەیەکی وادا، کە ئـاژانە نهێنییەکانی دەزگای هەواڵگری نەتوانن بیوەستێنن و بیگرن.
ئەو بە موحەمەد پێغەمبەر دەستیپێکرد، ناوی ئەمریکاشی لەنێو وتارەکەدا هێنا و ئایەتەکانی سورەتی ڕۆمییەکانیشی خوێندەوە. ئەوە ڕوون و ئاشکرا بوو، هێشتا ئەو نایەوێ ئەوەی مەبەستی بووە و لە دڵیدا پەنگی خواردۆتەوە بە تەواوی هەڵبڕێژێ.
ئاغاجـان تێبینـی ئەوەی کـرد، کە مـزگەوتەکە ڕووبەڕووی سـەردەمێکی وروژێـنەر دەبێـتەوە. ئەوەش ئەو شـتە بـوو، دەمـێکە بەپەرۆشـەوە چاوەڕوانیەتی.
لە کۆتاییدا خالخـالی لە ڕیتـوێلی نـوێژ بـووەوە سـەکۆی دووانەکەی جێهـێلا. لەوێ سـەدان لە بـڕواداران لەپێشـیدا وەسـتان. ئاغاجـانیش چـووە پێشـیان، دەستی مەلا خالخـالی گـرت، لاشـانی چەپەی مـاچکرد و بە شانازیشـەوە تـا ماڵێ یاوەریکرد.

**سینەما**

خدایا تو بوسیدەای هیچگاه

لب سرخ فام زنی مست را

بە پستان کالش زدی دست را؟

**خودایە، ئەرێ قەت ماچت کردووە**

**لێوی سووری ژنێکی مەست؟**

**هەرگیز مەمکی کاڵت بە دەست گرتوون ؟**[٣٦]

ئەم پارچە شیعرە لەسەر مێزی نووسینگەی خالخالی بوو. ئاغاجان هەر بە ڕێکەوت چووبووە ژوورەکەی، بینی پارچە کاغەزەکە لەوێ کەوتووە، ئیدی خستیە نێو گیرفانی. لەو بڕوایەشدا نەبوو مەلا خالخالی خوێندبێتیەوە.

"**خودایە، ئەرێ هیچ کات تۆ ماچت کردووە.**"

پارچە شیعرەکە وروژێنەر بوو. خودا، ماچ، ژنێکی مەست، مەمکی تازەفەریک، لە سەرووی هەمووشیان ، شتەکە لەسەر مێزەکەی خالخالی بوو.

ناوی شاعیرەکەش لە گۆشەی هەرە خوارەی شیعرەکە نووسرابوو: **نوسرەت ڕەحمانی**، بەڵام ئاغاجان هەرگیز گوێی لەو ناوە نەبیبوو.

تۆ بڵێ ئەوە کێبێ؟

ئاخر چۆن وێراوە ئەو کفرانە بخاتە سەر کاغەز؟

ئاغاجان لەبەر خۆیەوە گوتی: هەموو شتێک لە دەست دەرچووە. (شا)ش پشتگیری ئەو جۆرە شتانە دەکا، بەڵام تۆ بڵێی مەلا خالخالی ئەو شتە قۆڕەی بۆچی بێ؟ باشە بۆچی ئەو شتانە لە حوجرەکەی دادەنێ؟

---

[٣٦] بەهۆی ئەوەی وەرگێڕانی شیعر ئاسان نییە، بۆیە بۆ وەرگێڕانی ئەم پارچە شیعرەی نوسرەتی ڕەحمانی کە لە ڕۆمانەکەدا هاتووە، هەر بە لێکدانەوە هۆڵەندییەکە وازم نەهێنا، بەڵکو پەنام بردە بەر کاک ڕێباز مستەفای نووسەر و وەرگێر، ئەو بە سوپاسەوە ڕاستەوخۆ لە فارسییە کردوویەتیە کوردی. وەرگێر

هێشتاش هەندێ پارچە شیعری دیکە لەسەر مێزەکە کەوتبوون، ئاغاجانیشی لێکیانی کردنەوە مژولی خوێندنەوی یەکێکیان بوو. پێدەچوو شیعرەکە لە لایەن ئافرەتێکەوە نووسرابێ:

**لێوە تێنووەکانم**

**بەدواتدا دەگەڕێن**

**دەی جلەکانم داکەنە**

**باوەشم پێداکە**

**ئەوەتا لێوەکانم**

**ئەوەتا گەردن و مەمکە گڕتێبەربووەکانم**

**ئەوەیە جەستە نەرمونۆڵەکەم!**



ئاغاجان گوێی لە ترپەی پێی خالخالی بوون دەهاتەوە ژوور، بۆیە نەیتوانی تەواوی شعرەکە بخوێنێتەوە؛ دەستبەجێ پارچە کاغەزەکەی لە شوێنی خۆی دانایەوە، بەرەو لای دۆلابی کتێبەکان ڕۆیشت، وەک ئەوەی بە دوای شتێکدا بگەڕێ.

کاتێکیش خالخالی هاتەوە ژوور، ئاغاجان کتێبێکی لەسەر رەفەی ناو دۆلابەکە دەرهێنا. بە پەلەش لە حوجرەکە دەرچوو، بە بیرکردنەوە بەرەو لای هۆدەکەی خۆی ڕۆیشت.

شیعرەکە وازی لە ئاغاجان نەدەهێنا، هزرو بیری هەر پێوە سەرقاڵبوو، لەبەر شیعرەکە نەیدەتوانی تیشکۆی هزری خۆی بخاتە سەر کارەکەی.

**ئەوە لێوەکانمن**

**ئەوە گەردن و مەمکە گڕگرتووەکانمن**

**ئەوە جەستە ناسک و نۆڵەکەمە!**

تۆ بڵێی شاعیرەکەی کێ بێ؟

ئاخر وڵاتەکە وا گۆڕاوە، تا ژنان ئازادانە بتوانن دەربارەی خۆیان بدوێن؟

تۆ بڵێی وڵات واگۆڕابێ، ژنان بێ پەردە باسی جەستەی خۆیان بکەن و ناوی خاڵە وروژێنەرەکانیش بێنن؟

ئاخر چۆن ده‌بێ، ئه‌و تائێستا ئاگای له‌و جۆره‌ شتانه‌ نه‌بووه‌؟
تۆ بڵێی ئه‌و جۆره‌ ئافره‌تانه‌ له‌ كوێ بن؟ بۆچی جارێک تووشیان نه‌بووه‌؟
تۆبڵێی ڕووخساریان چۆن بێ؟ ئه‌رێ ده‌بێ له‌ كوێ بژین؟ ده‌بێ هه‌ر هه‌موویان له‌ تاران بن؟
ئای شا، هه‌مووی هه‌ر له‌بن سه‌ری شا و ئه‌مریكاییه‌كانه‌وه‌یه‌. كلتووری ئه‌مریكی به‌نێو ڕادیۆ، ته‌له‌فزیۆن و فیلمه‌كانه‌وه‌ هورمژن دێنێ و ده‌چێته‌ هه‌موو نێو ماڵێک.
ڕژێم هه‌موو كارێک ده‌كا تا گه‌نجان له‌ مزگه‌وت بكاته‌وه‌ و بیانخاته‌ سه‌ر ڕێبازی شا و بیرۆكه‌كانی.
(شا)ش "شۆرشێكی سپی" ده‌ستپێكردووه‌. ئه‌و نامیلكه‌یه‌كی بڵاوكردۆته‌وه‌، تیایدا هه‌زره‌ نموونه‌ییه‌كانی بۆ نیشتمان نووسیوه‌ته‌وه‌. ئه‌و ده‌یه‌وێ نه‌خوێنده‌واری نه‌هێڵێ، هه‌ر بۆیه‌ كچان وه‌ک مامۆستای فێركردنی خوێنده‌واری ده‌نێرێته‌ لادێكان. ئه‌وان سه‌رپۆشه‌كه‌یان فڕێده‌ده‌ن، شه‌پقه‌ له‌سه‌ر ده‌كه‌ن، وه‌ک سه‌ربازێكی شا به‌سه‌ر شاخه‌كاندا سه‌رده‌كه‌ون بۆ ئه‌وه‌ی له‌ كه‌ره‌گونده‌كانی پشت چیاكان قوتابخانه‌ بكه‌نه‌وه‌.
به‌ڵێ، هه‌موو شتێک گۆڕاوه‌ و ئاغاجانیش نه‌یبینیبوو یان نه‌یده‌ویست ببینێ.
شا به‌ گه‌رمی سه‌رگه‌رمی به‌ پێشه‌سازكردنی وڵاته‌، هه‌ربۆیه‌شه‌ ڕێگا به‌ سه‌رمایه‌گوزاری و وه‌به‌رهێنانی بێگانه‌ ده‌درێ، تا له‌ تاران و شاره‌ گه‌وره‌كانی دیكه‌ فابریكه‌ و كارخانه‌ دابمه‌زرێنن. ڕه‌وتی په‌ره‌سه‌ندنه‌كان شارێكی وه‌ک زه‌نجانیشی گرتۆته‌وه‌.
ده‌یان به‌ڵێنده‌ری ژاپۆنی و ئه‌وروپایی ئه‌و ده‌رفه‌ته‌یان قۆستۆته‌وه‌. زۆر نابێ له‌ ده‌ره‌وه‌ی شاره‌كه‌دا كارخانه‌یه‌كی تراكتۆر كراوه‌ته‌وه‌، به‌مزووانه‌ به‌ سه‌دان گه‌نج و لاوی شاره‌كه‌ و ده‌وروبه‌ری كاریان تێدا ده‌ستده‌كه‌وێ.
جڵه‌وی سه‌رپه‌رشتی كارخانه‌كه‌ له‌ ده‌ستی كۆمپانیای ناوداری به‌رهه‌مهێنانی تراكتۆر، میتسیوبوشی دایه‌. مه‌به‌ستیش له‌كارخانه‌كه‌ ئه‌وه‌یه‌، تراكتۆری بچووک دروست بكه‌ن، بۆ ئه‌وه‌ی جوتیارانی ده‌ڤه‌ره‌كه‌ بتوانن به‌كاری بێنن.
زۆری پێناچێ حكوومه‌ت كۆمه‌كی هه‌ر جوتیارێک به‌ تراكته‌رێک ده‌كا، به‌م جۆره‌ش كۆمپانیای میتسوبوشی جوتیارێكی ئاسایی به‌ شا ده‌به‌ستێته‌وه‌.

نەخێر، ئاغاجان ئاگای لە هەموو شتەکان نەبوو، ئەو لەپاش بەجێمابوو، هەرگیز گوێی لە ڕادیۆ نەدەگرت و قەتیش تەلەفزیۆنی نەبوو. ئەو دەبووایە فەرەح دیبای هاوسەری شای لە تەفزیۆندا بدیتبایە، بۆئەوەی لەوە تێبگا ئاخۆ لەوڵاتدا چی دەگوزەرێ.

شابانۆ بە مەحکەمی لەگەڵ ژنەکان لەسەر خەت بوو، تا ڕووخسارێکی نوێیان نیشان بدا. ئاغاجان بەوەی نەدەزانی، کە شابانو زۆر لە لای ژنان خۆشەویستە، تەنانەت لای ئەو ژنانەش کە ڕۆژانە دەچنە مزگەتێ.

فەرەح دیبا سێهەمین ژنی شا بوو، لەو ژنەشی کوڕێکی هەبوو، کە جێگرەوەی بوو. ئەو دوو ژنەی پێشتری نەیانتوانی بوو کوڕێکی پێببەخشن. شا لە پاریس چاوی بە فەرەح دیبا کەوتبوو. ژنەکەش لەوێ دەیخوێند، لەوێ جارێکیان لە ئاهەنگ یەکدییان بینیبوو.

هەنووکەش فەرەح دیبا بوتە شابانوی وڵات و خوازیاریش بوو پێگەی ئافرەتانی وڵات بگۆڕێ. شتێکی وا بکا ژنان لە ناندین دەربێنێ.

تا ئێستا هەموو شتێک بەپێی داخواز بەڕێوەچووە، واپێدەچێ شا لەوەدا سەرکەوتووبێ، کە ئایەتوڵلایەکان هەر لە چوارچێوەی مزگەوتدا بهێڵێتەوە.

ئیدی فەرح دیبا هەموو مانگێ بە دڵێکی ئاسوودەوە دەچووە پاریس تا لە کۆگا ئەستێرە ناودارەکانی هۆلیوددا جلوبەرگ و شمەکەکانی بکڕێ.

لەکاتێکدا ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز[٣٧] وڵاتەکەی لە ژێر دەسەڵاتی شادا وەک مێرگێکی ئارام ناودەبرد، فەرەح دیبا لە نۆڕینگەیەکی فەرەنسی داوای ئەوەی دەکرد، لووتە فارسیەکەی بە شێوەی لووتێکی فەرەنسی بگۆڕێ و نەشتەگەرییەکی جوانکاری بۆ بکا. ئەوسا بە تەسریحە پرچێکی نوێیەوە گەڕایەوە نیشتمان.

هیچ ڕۆژنامەیەکیش نەیوێرا دەربارەی جوانکاری لووتەکەی شت بنووسێ، بەڵام تەسریحەی پرچی دەمودەست بووە نموونە پێشەنگێک و ئافرەتانی وڵاتەکە بە سالۆنی ئارایشت وەربوون، تا پرچیان بە شێوەی شابانو دابهێنن. سەری زمان و بنی زمانی هەمووان هەر دەربارەی کودەتاکەی فەرەح دیبا

---

[٣٧] New York Times

بوو؛ تەنانەت فەخری سادات، هاوسەری ئاغاجانیش، پرچی خۆی بە شێوازی فەرەحیانە(شێوازی فەرەنسییانە) لێکردبوو، لێ ئاغاجان هەستی پێنەکردبوو.



خەڵک لە شاری زەنجان سەرقاڵی دامەزراندنی نۆڕینگەیەکی ژنان بوون. بەگوێرەی دوا ئامارەکان دەرکەوتبوو، لە شار و لادێ بەدیینەکاندا لەچاو ئافرەتانی شوێنانی دیکەدا زۆرتریان بەدەست دەردوبەلاوە دەناڵاند، بەڵام بۆ پشکنین و چارەسەر نەدەچوونە لای پزیشکی پیاو. هەربۆیە دەسەڵاتداران لە شارە دیندارەکاندا، بڕیاری کردنەوەی نۆڕینگەی پزیشکیان دا، کە تایبەت بێ بە ئافرەتان. نۆڕینگەی زەنجانیش دەبووە یەکێ لە گەورەترین نۆڕینگەکانی وڵات.

نووسینگەی شاهانەی فەرەح دیباش پشتگیری نەخشەکەیان کرد، بڕیاریش وابوو فەرەح دیبا بە خۆی سەردانی زەنجان بکا و نۆڕینگەکە بکاتەوە.

خالخالیش چاودێری سەرجەم پەرەسەندنەکانی وڵاتی دەکرد و ئاگای لێبوو، ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی شاریشی لە وتارەکانیدا ڕەنگی دەدایەوە. لە دوایین جاریشدا، سەرۆکی شارەوانی خستە بەر نەشتەری ڕەخنەکان بەوەی کە هێشتا شارەکە کتێبخانەیەکی شایستەی بۆ دروستنەکراوە و لە دوکانۆچکەکانی سەر جادەدا ڕۆمانۆکە ئەمریکییە وەرگێڕاوەکان بەنرخێکی هەرزان دەفرۆشرێنە گەنجان.[38]

جارێکی دیکەش مەلا خالخالی ڕەخنەی لە تیاترۆخانەی شارەکە گرت، چونکە شانۆنامەیەکیان تێدا نمایش کردبوو، مەلای مزگەوتیی کردبووە گەپجاڕ. شانۆنامەکەش بۆ قوتابیان تەرخانکرابوو، ڕۆژانە قوتابخانەیەک بە خۆی و قوتابیەکانییەوە دەچووە تیاترۆخانەکە و شانۆنامەیەکان بۆ نمایش دەکرا. ئیدی خالخالی دەهەری بوو: "ئەم شتە بۆ شارێکی بەڕێزی وەک زەنجان مایەی عەیب و شورەییە. ئاخر چۆن کەسێک دەوێری گاڵتەی وا بکا و مەلایەک بخاتە سەر سەکۆی شانۆکە و جاحێڵەکانیش لەبەردەمیدا بێنێتە پێکەنین؟ من بازاڕ ئاگادار دەکەمەوە: لەم شارەدا هێرشێکی مەکربازانە دژی

---

[38] ڕۆمانووس ناوی ڕۆمانی هەر بە واژە بچووکراوەکە ronannetje ڕۆمانۆکە بەکار هێناوە. وەرگێڕ.

ئیسلام دەستپێکردووە. ئایا ئێوە هەگبەی قوتابییەکانی خۆتان پشکنیوە و سەیرتان کردووە، ئاخۆ چ هزرێکی کفرئاسای تێدایە کە منداڵەکانیانی پێ فێر و پەروەردە دەکرێن؟ کاتێ هەندێ لەو شیعرانەم لێککردنەوە و تەماشام کردن، دەستەکانم کەوتنە لەرزە. لەبەر خاتر و بۆ ڕێزگرتن لە ئافرەتانی لەپشت ئەو پەردەوە دانیشتوون، نامەوێ زیاتر باسی ناوەڕۆکی شیعرەکان بکەم. کەسانێک هەن جاڕی شەڕیان دژی ئایین ڕاگەیاندووە. دەی یاری بە ئاگر مەکەن. من هەمووتان ئاگادار دەکەمەوە! نەکەن بکەن ئەم کارە بکەن!'

سەرۆکی شارەوانیش گوێی لەو قسە توندانەبوو، کە لە نێو مزگەوتێدا کران. بۆ ئەوەی ڕێ لە تەشەنەسەندنی بارە گرژەکەدا بگرێ، ڕێنمایی دایە تیاترۆخانەکە، چیدیکە دیمەنی مەلایەکە لە شانۆنامەکەدا نمایش نەکا.

هێشتا ئەو ڕووداوە بەتەواوی نەڕەوابۆوە، بەندوباوی ئەوە پەیدابوو، کەسانێک لە نەخشەیاندا هەیە سینەمایەک لەشارەکەدا دابمەزرێنن.

بەڵێندەری دروستکردنی سینەماکەش، لە تاران یەک دوو سینەمای گەورەی چێکردبوون، گەرماوە کۆنەکەی شاریشی کە چیدی بۆ مەبەستەکەی جاران بەکارنەدەهات، کڕی، بەڵکو سینەمایەکی لەسەر بنیات بنێ. تەلارەکە تەلارێکی مێنومێنتی بوو، خاڵێکی بێوێنەی چالاکییە کلتوورییەکان بوو، بەڕاستیش شوێنێکی دروست بوو بۆ سینەما لێدانان.

دوای هەواڵەکە، خالخالی دەستبەجێ سەرۆکی شارەوانی لەوە ئاگادارکردەوە، کە لە شارێکی دینداری وەک زەنجاندا، ئەم کارە مایەی قبووڵکردن نییە، بەڵام سەرۆکی شارەوانی بە خالخالی ڕاگەیاند کە ئەویش بە پرۆژەکە خۆشحاڵ نییە و لەدەستی ئەویشدا نییە، چونکە بڕیارەکە لە تاراندا دراوە. نووسینگەی کلتووری شاهانە نەخشەی ئەم پرۆژە ناوازەیەی داناوە و فەرەح دیباش بە خۆی پشتگیری دەکا.

کاتێکیش خاوەنی سینەما دامەزراوەکە بیستی، کەوا فەرەح دیبا بۆ کردنەوەی نۆڕینگەی ئافرەتان دەیەوێ بێتە شاری زەنجان، بڕیاریدا هەموو کارێک بکا تا سینەماکە بۆ ئەو کات ئامادە بکا، بەڵکو بەدەستی شابانو بکرێتەوە.

خاوەنی سینەماکە پەیوەندی بە تاراندا کرد، هەموو ئامادەکارییێک کرا، کە بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژەی فەرەح دیبا سەردانی زەنجان دەکا، شریتی کردنەوی

سـینەماکەش بپچڕێنـێ. بەڵام لە سـۆنگەی ئەوەی، شـارەکە شـارێکی دیندار بوو، بڕیاریاندا هەواڵەکە تا دوا ساتی خۆی بە نهێنی بهێڵنەوە.



لە چوارشـەممەیەکی خۆرەتـاودا، هەلیکـۆپتەرێکی گەورە لەسـەر ئاسـمانی شـارەکە پەیدابوو، جارێک بەسـەر بازاڕەکەیدا سـووڕایەوە. هەمـوو قوتـابی قوتابخانەکـانیش سـاز و ئامـادەبوون لەمـبەر و ئەوبەری شـەقامەکان بـۆ بەخێرهێنـانی فەرەح دیبـا وەسـتان، چـونکە زۆری نەدەبـرد شـابانو بە ترومبێلێکی سەرکراوە بەلایاندا بەرە و نۆرینگەکەوە دەڕوا.

قوتابیەکان بەخۆشی هاواریان دەکرد و چەپڵەیەیان لێدەدا دەیانگوت: "***جاوید*** شـا، بژی شـا!" لەهەمـان کاتیشـدا سـێ فـڕۆکەی جەنگی بەسـەر سـەریاندا دەسووڕانەوە. فڕۆکەکان سێ هێڵی دووکەڵی ڕەنگاوڕەنگی ئالای نیشتمانیان بەدوای خۆیدا بەسەر ئاسمانی شارەکەدا جێهێشت. بە دەیان ئاژانی دەزگای هەواڵگـری نهێنـیش بە بەرگـی مەدەنیـیەوە بە نێـو ئـاپۆرای گردبـووەوەی خەڵکیـدا دەسـووڕانەوە، هەمـوو سـەرە شـەقامەکانیش بە ترومبێلـی پـڕ لەسەرباز گیرابوون، ئامادەی هەموو بارێکی ناکاو بوون.

فەرەح دیباش بە خەندەوە دەستی بۆ حەشاماتەکە ڕادەوەشاند. نەرمابەیەک گەمەی بە پرچی دەکرد، ئەمەش وای کرد نازدارانە دەربکەوێ.

لەکاتێکدا ئەو بەلایاندا هات، مامۆستایان و کارمەندانی نۆرینگەکە سەرپۆشی خۆیـان فڕێدا تـاکو نیشانی بدەن، هەمـان تەسریحەی پرچی ئەویـان هەیە و هاواریان دەکرد و سەرپۆشەکانیشیان بەدەستیان ڕادەوەشاند.

کامێراکـانیش لە هەمـوو گۆشـەیەکەوە دیمەنەکانیـان دەگـرت، تـا دواتـر لە تەلەفزیۆندا لێبدرێتەوە، بۆئەوەی ببیندرێ چۆن ئافرەتانی شارێکی دینداری وەک زەنجـانیش گوێڕایەڵی فەرەح دیبان، ئەویـان وەک پێشـەنگە نموونەیەک داناوە.

ئەوەش یەکەمین گەشتی فەرەح دیبا بوو بۆ شـارێکی ئایندار. سـەردانەکە بۆ ڕژێـم پێوەرێـک بـوو، ئـاخۆ لەوەدا سـەرکەوتوو دەبـن دڵـی شـارە ئۆلـدارە دژەکانیشیان بەدەست بێنن. دیـاربوو ڕەوشـەکە بە باشـی بەڕێوە دەچوو، بە شێوەیەکی باش ئارام بوو، تەلەفزیـۆن تـا سەعات هەشـتی شـەو نەوەسـتا تـا

کەشتەکەی شابانو پەخش بکا، بەڵکو دەمودەست لە سەعات شەشی ئێوارەدا لەمیانەی بڵاوکردنەوەی دەنگوباسدا، ڕاپۆرتەکەی لەسەر گەشتەکەی شابانو پەخشکرد. ڕووداوەکەش وەک سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەی ڕژێم بەسەر ئایەتوڵلاکان هەژمارکرا. بەڵام ئەوان شتێکیان بەلاوە نابوو، شتێک لە نیگای یەکەمەوە ئەوەندە گرنگ دەرنەدەکەوت.



یەک دوو ئافرەتی زەنجان کە وەک پەرستار لە نۆرینگە نوێکەدا دەستبەکار دەبوون، لەبن سەدریە سپییەکەی پەرستارییدا و بە قۆڵ کورتییەوە لەبەردەم دەرگای نەخۆشخانەکە وەستابوون. کاتێکیش فەرەح دیبا لە ترومبێلە شاهانەییەکەی دابەزی، وێنەگرەگان لێیچوونە پێشەوە. چاوی کامێراکان خرایە سەر ئافرەتەکان. ئەوانیش دەسکە گوڵێکی ڕەنگینیان پێشکەش بە شابانو کرد و سەری ڕێزیشیان بۆ دانەواند. لێ لەبەرئەوەی سەدریە پەرستارییەکەیان ڕۆشن (شەفاف) بوو، مایۆ شینەکەیان لە ژێرەوە دیاربوو. بەم شتە بازاڕ هێدمە گرتی و هەژا، خالخالیش کە هەواڵەکەی بیست، لەتاوان نانی پێنەخورا.

ئەو دەهری و کەللەیی بوو، ئەم شتەی بەوە زانی، کەوا زللەیەک لە ڕوومەتی ئایەتوڵلاکان دراوە و بە ئەنقەستیش وایانکردووە تا بازاڕ و خەڵکەکەی ڕووشکێن و شەرمەزار بکەن. ئاخر ڕووداوەکە لە شارێکدا قەوما، کە ئەو (خالخالی) ئیمام جومعەی مزگەوتەکەیەتی. دەبوایە ئەو هەر زوو لە وتارەکەیدا وەڵامێکیان بداتەوە.

بەرەو ئێوارە زەنگێکی تەلەفۆن بۆ ئاغاجان لێدرا؛ یەکێک لە قومەوە لەسەر هێڵ بوو، دەیەویست قسە لەگەڵ خالخالیدا بکا. تەلەفۆنەکەش زۆر کورت و پوخت بوو، لە ڕاستیدا قسەیەکی تاکلایەنە بوو، چونکە خۆ خالخالی لە تەلەفۆنەکەدا هیچی نەگوت، تەنها گوێیگرتبوو، کۆتاییەکەشی بەو وشانە بوو، "نەخێر، من نەمزانیوە. بەڵێ تێگەیشتم. باشە، بایی پێویستم زانی. تۆش هەروەها."

ئاغاجان هیچی لەو دەمەتەقێ کورتەی تەلەفۆنەکەدا هەڵنەکراند، هەروەها نەشیپرسی ئاخۆ خالخالی لەگەڵ کێدا قسەی کرد. دواتر کاتێک لە جامی

پەنجەرەکەی حوجرەکەوە سەیری ناوەوەی کرد، بینی خالخالی بێ هەدادان هەر بەناو ژوورەکەدا دێت و دەچێ.[٣٩]



لە تەفزیۆندا هەواڵەکە وا خوێندرایەوە، گوایە فەرەح دیبا دوای کردنەوەی نۆرینگەکە شارەکەی بەجێهێشتووە و بەرەو تاران گەڕاوەتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا هێشتا شابانو لە شارەکەدا دەرنەچووبوو. خانمی شاهانە بەرەو دامەزراوە کۆنین و مێژووینەکەی دەرەوەی شار فڕیبوو.
دامەزراوەکە لە قەراغی بیابانەکەدا کرابووە خانێک(مەنزڵگایەک)ی گەورە. ئەوێ وەک جۆرە کاروانسەرایەکی سەر لێواری ڕێگا لاوەکییەکەی لێهاتبوو، کە لە کۆندا ڕێبوار و بازرگانەکان بۆ حەسانەوەی شەو لەوێ دەمانەوە.
لە سۆنگەی ئەوەی فەرەح دیبا لە پاریس ئەندازیاری تەلارسازی خوێندبوو، سەرپەرشتی نۆژەنکردنەوەی چەند تەلار و باڵەخانەیەکی وڵاتی کردبوو. هەر بۆیە زۆر بایەخی بە نۆژەنکردنەوەی قەڵاکە دەدا.
دواتر دەبووایە بۆ کردنەوەی سینەماکەش گەڕابایەوە نێو شاری زەنجان.
خاوەنی سینەماکە بۆ ئەو بۆنەیە، بەتایبەت فیلمێکی ئەڤینی ئەمریکی تازەی لە تارانەوە هێنابوو، هێشتا فیلمەکە لە هیچ شوێنێک لێنەدرابوو. پێشتریش هیچ کەسی لە هاتنی سەردانکەرە شاهانەییەکە ئاگادار نەکردبۆوە، بەڵام ئەوەی گوتبوو، گوایە چەند مێوانێکی گرنگ لەتارانەوە دێن و لە ڕێورەسمی کردنەوەی سینەماکەدا ئامادە دەبن.



کاتێکیش فەرەح دیبا لە قەڵا دێرینەکەدا لەسەر مێزێک دانیشتبوو، خەریکی شێوخواردن و پشودانی خۆی بوو، خالخالی تەلەفۆنێکی نهێنی لە ژوورەکەی ئاغاجاندا کرد. ئەو بە سرتەوە کورتە تەلەفۆنێکی لەگەڵ کەسێک لە قومدا کرد.

---

[٣٩] مایەی تێبینییە لێرە ئاماژە بەشتێک بکەم، لەزمانی هۆڵەندییدا وشەیەکی زۆر جوان بۆ ئەو هاتنوچوونە هەیە، واتە یەکێک لە ڕووبەرێکی تەسکدا چەند مەترێک قەدەم بە هەر دوو ئاراستەکەیەوە لێیدا، هۆڵەندییەکان دەڵێن ijsberen کە دەقاودەق واتای ورچی سەهۆڵ ئاسا، واتە وەک ورچەکە بێتو بڕوا. دیارە لە کوردییدا هەر هاتن و چوون، جرتوفرت، یان پیاسە، جێگەی دەگرێتەوە. وەرگێڕ.

لە سەعات حەفتی شێوانیشدا، بۆ چوونە مزگەوتێ ساز و ئامادە بوو. شابالێش هاتبوو یاوەری بکا، بینی مامۆستا نائارامە.

"ئەرێ شتێک لە گۆڕێدا هەیە؟" وای لێپرسی.

- "نەخێر، بۆچی؟" لە کاتێکدا خالخالی لە حوجرەکەیدا دەردەچوو، وا وەڵامی شابالی دایەوە.

- " ئەمجارەیان باسی چی دەکەی؟"

- "من هێشتا بە تەواوی لێنەبوومەتەوە، هاتن و ئامادەبوونی ئەو قەحپەیە سەرقالی کردووم."

شابال خوازیاربوو بپرسێ: کامە قەحپە؟ لێ واشینەگوت، نەیتوانی وشەی "قەحپە" بێتە سەر زمان.

- "ئەرێ ئاغاجان لە کوێیە؟" خالخالی وای لە شابال پرسی.

- "ئەو لە مزگەوتییە."



پاشان ئەوان چوونە نێو مزگەوتێ، شوێنی نوێژکردنەکە پڕی خەڵک بوو، زیاتر لە جارانی ئاسایی ئامادەببوون. پێدەچوو ئەوانیش تامەزرۆی ئەوەبن، ئاخۆ خالخالی لە بەرامبەر سەردانی فەرەح دیبادا چ کاردانەوەیەکی دەبێ.

خالخالی بە حەوسەڵەوە چووە سەر سەکۆی دوان، لەوێ لەسەر کورسیەکەی دانیشت، بە لەرەی دەنگێکی ئاسوودە و ئارامەوە باسی مزگەوت و ڕۆڵی مەلای مزگەوتیی کرد. مزگەوتی وەک دڵی شارەکە و مەلای مزگەوتیشی وەک پاسەوانی ویژدانی دیندارەکانی شارەکەی شوبهاند. ئەو لە دوانەکەیدا هیچ سەرنجی لەسەر کردنەوەی نۆرینگەکەدا نەدا، هەروەها باسی سەردانەکەی فەرەح دیبا و ئەوەی لە تەلەفزیۆن دەرکەوت، نەکرد. ئەو تیرەکانی خۆی گرتنە سینەماکە.

- "ئاگادار بن!" لەهیکەوە وای هاوارکرد و پەنجەی شایەتمانیشی هەڕەشەئامێزانە ڕاوەشاند. "ئاگات لەوەبێ کە خەریکی چی بکەی!"

بێدەنگییەک باڵی بەسەردا کێشا.

- "بەناوی مزگەوتێ،" ئیدی بەمجۆرە مەلا خالخالی تێهەڵچۆوە؛ "بەناوی شارەکە، بەناوی بازاڕەکە، من دەیڵێم، دەپرسم، هۆشداریيان دەدەمێ، کارەکە

نەکەن. نەخشە شەیتانییەکانیان بوەستێنن. ئاخر زەنجان شوێنی ئەو باندە کلتوورییە بەرەڵایەی ئەمریکییەکان نییە. شارەکە جێگەی گومڕایی و گوناحکردن نییە. دەی بیوەستێنن! دەنا ئێمە دەیوەستێنین!"

- "ئەڵلاهو ئەکبەر!" یەکێ لە ئامادەبووان وا هاواری کرد.

ئەمجارەیان هەموو نوێژکەران بەیەکەوە هاواریان کرد: "ئەڵلاهو ئەکبەر!"

کەسیش نەیدەزانی مەبەستی مامۆستا لە دوانەکەی چییە، بەڵام هەمووشیان لەوە حاڵیبوون، هەبێ و نەبێ ئەم تووڕەبوونەی دەربارەی نۆڕینگەکەی ئافرەتانە.

پیاوەکانی بازاڕ بە دڵپەسەندییەوە ئاوڕێکیان لە ئاغاجان دایەوە، ئەوان کاردانەوەی مەلا خالخالیان بەرزنرخاند.

ئاغاجانیش بە شانازی بە مەلایەکەی خۆی کرد، بەڵام درکیشی بەوەکرد، کە خالخانی ناتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ لە زەنجاندا بمێنێتەوە. ئەو بەرزەفڕێکە بۆ ئەوەی ببێتە مەلایەکی بەردەوامی مزگەوت، ئەو مەودای پێویستە، ئاخر زۆرنابا لەچوارچێوەی دیوارەکانی مزگەوتێدا تەنگەتاو دەبێ. بەڵام خۆ ئەم مزگەوتە دەستپێکێکی باشە بۆ ئەو.



ماخۆی[40] سینەماکە لەوە دڵنیابوو، کە خالخالی لە دوانەکەیدا دژی دەوەستێتەوە، بەڵام ئەو لە قسەکانی نەدەترسا. ئەو دەیزانی سەرجەم ئاژانەکانی دەزگای هەواڵگری نهێنی و پۆلیسی شارەکە دەیپارێزن. کاتەکەش بانگی شێوانی چوارشەممە بوو، دڵخۆشیش بوو کە ئیمانداران لە کاتی کردنەوەی سینەمایەکە لەمزگەوتێن و گوێ لە دوانەکەی مەلا خالخالی رادەگرن.

بەڵام خۆ دیاربوو خاوەنی سینەماکە، نەیارەکەی باش نەدەناسی، وەک پێویست هەڵینەسەنگاندبوو، چونکە مەلا خالخالی زۆر باش ئاگای لە رێورەسمەکە بوو، ئەو دەیزانی کتومت چ سەعاتێک شوێنەکە دەکەنەوە.

خالخالی لەسەر مینبەر سەیرێکی سەعاتەکەی دەستی خۆی کرد، خەریکە وادەکەی نزیک دەبێتەوە، بەڵام خۆی خاوکردەوە، دەستێکی بە ڕیشەکەی

---

[40] ماخۆ : خاوەن.

داهێنا و مسکە بووەوە. ئاغاجان وایزانی ئەو لە قسەکانی لەسەر سینەماکە بوتەوە و سەرباسی شتێکی دیکە دەهێنێتە گۆڕێ. ئیدی هەر بەو گەفوهەڕەشانەی کردنی، وازدەهێنی. لێ خالخالی بەخوێندنەوەی سورەتی ناگرینی **ئەبی لەهەب** سەرسامی کردن، سورەتێک دەربارەی ئەو ژنەی کە خوا بە تووڕەییەوە باسی کردووە. ئەوسا بە ئارامی سورەتەکەی خوێندەوە بە شێوەیەک وشەکانی بە هێورەیی دەردان:

**تَبَتْ يَدَا ابي لهَبٍ وَتَبَّ (١)**
**ما اغنى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ (٢)**
**سيصلى نارًا ذَاتَ لهَبٍ (٣)**
**وامْرَاتُهُ حَمَّالَةَ الحَطَبِ (٤)**
**في جيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ (٥)**
**لهَبِ تَبَّتْ يَدَا ابي لهَبٍ وَتَبَّ (١)**

**{ئەبولەهەب هەردوو دەستی شەلە بێ و عومری نەمێنێ.**
**نە سامانی و نەئەوەی پەیدای کردووە بەهرەی بۆ دا.**
**هەربینا ئاگری بەگڕ دەیسوزێنێ.**
**ژنەکەشی دەستەچیلە بەکۆڵ دێنێ.**
**گورزەهۆنی سیرمەی دووبادی دە ملدا.**
**ئەبولەهەب هەردوو دەستی شەلە بێ و عومری نەمێنێ.}**

ئاغاجان بۆ چاوتروکانێک هەناسەی گیرا، دەمودەستیش پەی بەوەبرد، کە خالخالی لەوە زیاتر پلانی هەیە و هەر بە هەڕەشەوگوڕەشە وازبێنێ.
ئەبی لەهەب مامی موحەمەد بوو، برای باوکی بوو. ئەو دوژمنێکی سوێندخۆری موحەمەد و قورئانەکەی بوو.
لە کاتی جاڕدانی ئیسلامەتیدا، لەو شەوەی کە موحەمەد لە لایەن دەسەڵاتدارانی مەککەوە قسەی بۆکراو داوای لێکرا واز لە پەیامەکەی بێنێ، ئەبی لەهەب لە دانیشتنەکەدا جوێنی بە موحەمەد داو لە کۆبوونەوەکەش هاتەدەر. ژنەکەی ئەبولەهەبیش هەمان شتی کرد، جوێنی بە موحەمەد داو قسەی زۆر ناشیرینیشی بە قورئان گوتن. ئەوان هەر بەوە نەوەستان، بەڵکو لەنێو بازاڕیشدا لەسەر دوژمنایەتی خۆیان بەردەوام بوون و جوێنیان بە

قورئـان و ئەلـلایەکەی دەدا. مـوحەمەدیش کە لەبـن ئەوبـارەوە دەینالانـد، نەیدەتوانی بیانوەستێنێ. ئیدی لەشەودا سروشی سورەتی ئەبی لەهەبی بۆ هات.

**تَبَّتْ يَدَا أبي لَهَبٍ وَتَبَّ (١)**
**تَبَّتْ يَدَا أبي لَهَبٍ وَتَبَّ سَيَصْلَى نارًا ذاتَ لَهَبٍ (٣)**
**وَامْرَأتُهُ حَمَّالَةَ الحَطَبِ (٤)**

**{ئەبولەهەب هەردوو دەستی شەلە بێ و عومری نەمێنێ.**
**هەربینا ئاگری بەگڕ دەیسوزێنێ.**
**ژنەکەشی دەستەچیلە بەکۆڵ دێنێ.}**

کاتێـک مەلا سـورەتی ئەبـی لەهەبـی دەخوێنـدەوە، هەمووپـان هەسـتیان بە دژواریێتی پرسەکە کرد. خالخالی زیاتر لەسەری ڕۆیشت:

- "بشکێ دەستەکانی ئەو پیاوەی کە گەرماوە دێرینەکەی شاری کڕی.
- بشکێ دەستی ئەو پیاوەی کە دەیەوێ گەرماوە کۆنینەکە بکاتە سینەما.
- بشکێ دەرگای گەرماوەکە.
- بشکێ قاچی ئەو پیاوانەی هەنووکە لەوێ خڕبوونەتەوە.
- تۆقە پەتێـک لەملـی ئەو ئافرەتـانەی هەنـووکە لەوێ، لە گەرمـاوە کـۆنەکە ئامادەن."

❖

ئاغاجـان نەیـدەتوانی سـەری خۆشـی بەرز بکـاتەوە و سـەیری مەلا خالخـالی بکـا. ئەو سـەیری بچمە نیگـارێکی بچکۆلانەی سـەر ئەو مـافوورەی لەسـەری دانیشـتبوو، دەکـرد و هەسـتێکی وای لاپەیـدابوو وەک ئەوەی خالخـالی لە پشـتیەوە وەسـتابێ و تونـد و مەحـکەم کەللەسـەری گرتبـێ و زیـاتر بـۆ خوارێی شۆڕبکاتەوە.

خالخـالی ئەوی سـەرسـام کـرد، وێـڕای ئەوەش لە ڕاسـتیدا دەبـوا خۆشـحاڵ بوایە، بەلام هەستێکی تێکەلاویانەشی بۆ پەیدابوو. باشـە بـۆچی خالخالی لەو پرسە ئاگاداری نەکردبۆوە کەوا ئەو لە دوانەکەیدا باسی سینەماکە دەهێنێتە ناوناوانەوە؟ ئەرێ بۆچی لە پڕێکەوە ئەو تۆنە دەنگە توندە؟ تۆ بڵێی ئەوەی ئەو کردی بۆ مزگەوتێ باش بکەوێتەوە؟ تۆ بڵێی لێکەوتەی چی بـۆ شـارەکە

بەدوای خۆیدا بێنێ؟ بەڵام خۆ هەنووکە وەختێ ئەو جۆرە بیرکردنەوانە نەماوە، کارلەکار ترازاوە، ئەو هەناسەیەکی بەقووڵی دایەوە، سەری خۆی قیتکردەوە و ئاوڕێکی لە دەوروبەری خۆی دایەوە.
مزگەوت کە لە ئامادەبوون جمەی دەهات، کەس خۆی لەگوورە نەبرد، کڕ، کشومات ببوو، هەموویان بە سەرنج و بایەخەوە سەیری خالخالیان کردبوو:
"من دەمێکە سەرۆکی شارەوانیم لەم شتە ئاگادارکردۆتەوە، هەروەها هۆشداریم دابووە خاوەنە نوێکەی گەرماوەکە، بەڵام لای ئەوان نەبا بوو نەباران. ئەوان زۆر پێیان لێهەڵبڕی، تا ئەم ئێوارەیە فیلمێکی گوناحکاریانەی ئەمریکییان لە گەرماوە کۆنەکە لێدا. دەقاودەق ئەم ئێوارەیە! ئەرێ ئێوە دەزانن کە ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟
ئەمڕۆ ڕۆژی کۆچی دوایی فاتیمەی زەهرایە.
ئەز خالخالی، مەلای ئەم مزگەوتە ئەو شتە قەدەغەدەکەم.
من، خالخالی، مەلاو وتارخوێنی هەینی مزگەوت، چوونە نێو سینەماکە قەدەغە دەکەم.
من، خالخالی، لەو دەرگایە دەردەچم و قورئانێکیش بەدەستەوە دەگرم و دەرگای ئەو شوێنە گوناحکارییە دادەخەم و بزمارڕێژی دەکەم." ئەو بەدەم گوتنی ئەم قسانەوە، قورئانەکەی لە گیرفان دەرهێنا نیشانی ئامادەبووانی دا.
ئاپۆرای خەڵکەکەش هاواریان کرد: "ئەڵلاهو ئەکبەر! ئەڵلاهو ئەکبەر! ئەڵلاهو ئەکبەر!"
خالخالیش هاواریکرد: "بەرەو گەرماوە دێرینەکە!"
لە کۆتاییدا خۆی کۆکردەوە لەسەکۆکەدا دابەزی و بەرەو دەرگای مزگەوتێ ڕۆیشت.
حەشاماتەکەش بە دوایدا ڕۆیشت.
ئاغاجان کە ئەو وەرچەرخانە کتوپڕەی ڕەچاو نەکردبوو، لەسەر زەویەکە توند چەقیبوو. هەستی بە خۆی کرد خالخالی لە خشتەی بردووە، سەرنجیدا کەوا مەلا جڵەوی کارەکانی گرتۆتە دەست. بەڵام خۆ هێشتا کارلەکار نەترازابوو. ئەزموونی ئاغاجان لەهی خالخالی زیاتر بوو. ئەو دەبێ هەوڵبدا دیسان جڵەوی کارەکانی بکەوێتەوە دەست و ناووڕوومەتی مزگەوتە

هەنووکەییەکەی بپارێزێ. ئاخر حیساب بۆ خالخالی نەدەکرا، گرنگ مزگەوتەکە بوو، تەنها مزگەوت دەیخوارد. لە کۆتاییدا ئەویش هاتەوە سەرخۆی، ئیدی بە دوای خالخالیدا غاریدا و بانگی شابالی کرد: "غاردە! لێنەگەڕێی بەتەنیا بێ! دەی لەگەڵیدا بڕۆ!"



باری شڵەژان و وروژانەکە ئەوەندە بالادەست بوو، کەس جڵەوی لەدەست نەمابوو.

- "من دەتوانم ئەمکارە بکەم،" ئاغاجان لەبەر خۆیەوە وایگوت، "من تاکەکەسم، ئەو پاشاگەردانییە بوەستێنم."

خالخالی لەکاتێکدا قورئانەکەی لەسەر سەری خۆی ڕاگرتبوو بە ئاراستەی سینەماکە هەنگاوی دەنا. بڕوادارانیش بەدوایدا دەڕۆیشتن و هەر هاواریان دەکرد: " ئەللاهو ئەکبەر."

ئاژانەکانی دەزگای هەواڵگری نهێنیش، کە ئەم حەشاماتەیان بینی لە پڕ بەسەریاندادراوە، بە تۆقاوی و هەڵەداوانەوە لەتاریکییدا غاریاندەدا و لەبێتەلەکانیشیاندا بە توندی هۆشداریان دەدا: "یاخیبوون! بگەنێ سینەماکە لە مەترسیدایە!"

بەهەندێک وەخرانەوە دوو ترومبێلی پۆلیس دەرکەوتن، بەلام پۆلیسەکان هێشتا لەوە تێنەگەیشتبوون، کە چی لە گۆڕێدایە و ئەو هەموو خەڵکە بەرەو کوێ دەڕوا.

یەک دوو ترومبێلی سەربازی پڕ چەکداریش ڕێگەی بەرەو سینەمایان داخستبوو. سەربازە چەک لەشانەکان لە ترومبێلەکان بازیاندا و دیوارێکی بەربەستیان لە بەرامبەر حەشاماتی هاتوو دروستکرد.

هەروەها هەلیکۆتەرێکیش بەئاراستەی سینەماکە کەوتە فرەفڕ. فڕۆکەکە لە نێوەڕاستی گۆڕەپانی گەرماوەکە هەڵنیشت تا فەرەح دیبا باربکا و قوتاری بکا.

ترومبێلەکەی سەرۆکی شارەوانیش لەسەر شۆستەکە وەستا. دەستبەجێ سەرۆکی شارەوانی لێدابەزی و بەرەو لای خۆپیشاندەران غاریدا، لەکاتێکدا دەستەکانی لەسەر سەری خۆی گرتبوو. ئەو لەنێو ئەو جەنجاڵییەدا بەدوای

ئاغاجاندا دەگەڕا، کاتێکیش ناوبراوی بینی، بانگی کرد: "بۆخاتری خوا ئەوە تۆ خەریکی چی؟ تۆ کەوتوویتە نێو داوەکە! دەی ئەم خەڵکە بوەستێنە، بەرلەوەی قەسابخانە ڕووبدا."

- "ئەوە تۆ باسی چی دەکەی؟ شارەوانی چیدیکە گوێ لە مزگەوتێ ناگری! شارەوانی هەمـوو ئەوانەی لە شـاردا دەژیـن بە هێنـانی ئەو سـینەمایەی تووشی شورەیی کرد و هەنووکەش هەڕەشەی خوێنڕشتن دەکەی؟"

- "نەخێر، وانییە، تۆ بە هەڵە تێگەیشتووی، من هەڕەشە ناکەم. من داوای یارمەتیت لێدەکەم، ئاخر زۆرنابا ڕەوشـەکە لەدەست دەردەچێ. من ناتوانم شتەکە بەهاوارکردن بڵێم." ئینجا بەسرتەیەکەوە بە ئاغاجانی گوت: "فەرەح دیبا لەنێو سینەماکەدایە. بڕوام پێبکە، ئەگەر ئەو خەڵکە لە سینەماکە نزیکتر بکەونەوە، سوپا تەقەیان لێدەکا. دەی شتێک بکە! ئەوانە ڕاگرە!"



سـەربازە چەکبەدەسـتەکان خۆپیشـەندەرانیان ڕاگـرت و ئەفسـەرێکیش بە بلندگۆیەکەی دەستی هاواریکرد: "دەی بگەڕێنەوە! نزیکتر نەکەونەوە!"

مەلا خالخالی گوێی پێنەدا، قورئانەکەی دەستی بۆ سەر سەر بەرزکردەوە و لە ئەفسەرەکە ڕەتبوو، هەوڵیدا ڕێگەیەک بەنێو سەربازەکاندا بکاتەوە، بەڵام ئەفسەرەکە ڕووی تێکرد و ڕایگرت.

- "پێت دەڵێم، بگەڕێوە!" ئەو وای بەسەردا قیژاند. "دەنا تەقە دەکرێ."

- "دەی تەقە بـکە!" خالخـالیش وای بەسـەردا هـاوار کـردەوە و لەسـەر ڕێڕۆیشتنی خۆشی بەردەوام بوو.

ئەفسەرەکە توند یەخەی گرت و بۆدواوەی کێشایەوە، سەری بردە بن گوێی و پێیگوت: "ئەگەر نەگەڕێیتە دواوە، مێزەرەکەت لەمل دەکەم، بەدوای خۆمت ڕادەکێشم و دەتبەم!"

قسەکانی کاری خۆیان لە خالخالی کرد، پاڵێکی بەهێزی بە ئەفسەرەکەوە نا، کـابرا سـەرپەلۆ[41] چـوو، خەریکبـوو بـکەوێ. ئەفسـەرەکەش دەسـتی بـۆ دەمـانچەکەی بەر کەلەکـی بـرد. ئیـدی دەسـتبەجێ ئاغاجـان گەیشـتێ. ئەو خالخالی کێشایەوە دواو بانگی شاباڵی کرد: "دەی بیبەوە!"

---

[41] سەرپەلۆچوون: ساتمەبردن، هەڵنگووتن، بەلاداهاتن.

بەڵام خـۆ خالخـالی نەیدەویسـت وازبێنـێ، ئەو خـۆی لەدەسـت ئاغاجـان ڕاپسکاند و بەرەو لای ئەفسەرەکە رایکرد.
ئاغاجان لە وەختی خۆیدا ڕایگرت و پێیگوت: "ئیدی بەسیەتی! هەر ئێستا بوەستە!"
خالخالی پاڵیکی بە ئاغاجانەوە نا، خۆیشی بۆ پێشەوە ملی لێنا، بەڵام دیسان ئاغاجان گرتییەوە، ئەمجارەیان یەخەی گرت و بەسەریدا هاواریکرد: "لەبیرت نەچێ، من لێرە بڕیاردەرم!"
ئینجا بڵندگۆکەی لەدەست ئەفسەرەکە وەرگرت هـاواری کـرد: "بەڕێزان! هێورببنەوە! گوێ بگرن! من هەواڵی نوێم پێیە!"
ساتێکی بێدەنگی.
- "من تـازە لەگەڵ سـەرۆکی شـارەوانی دوام. شـارەوانی پـلانەکەی خـۆی دەکێشـێتەوە. هـیچ سـینەمایەک لە شـارەکەدا دانانـدرێ! دەی بگەڕێنـەوە مزگەوتێ!"
حەشاماتەکەش هاواریان کرد: " ئەللاهو ئەکبەر!"



ڕووداوەکە کاریگەرییەکی زۆری پەیداکرد. هێشتا خەڵکەکە لە بەردەم مزگەوت وەستابوون، ئاغاجانیش بەم حاڵەتە دڵخۆش بوو.
مزگەوتەکە کردەوەیەکی توندی نواند، ئەویش لە بارێکدا بوو ببێتە مەیدانی شـەڕ و بقەومـێ. ئەوەش هەڵمەتێکـی ڕاسـتەوخۆیانەبوو، بەڵام لە سـوچێکی چاوەڕواننەکراودا دژی پلانەکانی شـا و زللەیەکی توندیش بـوو لە ڕومەتـی سـەرۆوەزیرەکەی. ئاخر سـەرۆوەزیرەکە دەیەویست شـارە دیندارەکان بخـاتە ژێـر جـڵەوی خـۆی و سـیمای کلتـورێکی سـاختەیان پێببەخشـێ. بەیـانیش ڕاپـۆرتی ڕووداوەکە لەسـەر ڕووپەڕی هەمـوو ڕۆژنامەکـان دەردەکەوێ: یاخیبوونێک لە شاری زەنجان!
جـارێکی دیـکە مزگەوتـی ڕۆژی هەینـی زەنجـان ڕووی خـۆی نیشـاندا. ئایەتوڵلاکـانی قـومیش ئەم دۆزە بەرز دەنـرخێنن و مەلاکـانی سـەرجەم مزگەوتەکانی وڵات باسوخواسەکەی دەهێننە گۆڕێ.



ئێستاش نیوەی شەوە، هەمووان بەرەو ماڵەکانی خۆیان ببوونەوە، مزگەوتەکەش چۆڵوهۆڵ بوو، مجێورەکەش دەرگای مزگەوتیی گاڵەدابوو. ئاغاجانیش لە ژووری کارکردنی خۆی دانیشتبوو، خەریکی نووسینی شتێک بوو: "دوای ماوەیەک لە بێدەنگی، دیسان مزگەوتەکەمان هەڵسایەوە سەر پێیان. لەوانەیە ئێمە گەڕابینەوە سەر ڕێچکەی دێرین."

ئەو هێشتا هەر سەرقاڵی نووسینەکە بوو، کاتێک دوو ترومبێلی پۆلیس لەبەردەم مزگەوتێ وەستان. یەکێ لە ترومبێلەکان لەبەردەم مزگەوت و لەبن دارەکان وەستا و ئەوی دیکەشیان گڵۆپەکانی کوژاندنەوە بە نەرمی هاتە لای ڕاڕەوی دەروازەی ماڵەکە.

سێ ئاژان بەجلی مەدەنیەوە لە ترومبێلەکە دابەزین. لێخوڕەکەش هەر لەنێو ترومبێلەکەدا مایەوە. بەرپرسەکەیان رووی لە قاپیەکە کرد و زەنگەکەی لێدا، دووەکانی دیکەش لە لای ترومبێلەکەدا مانەوە.

ئاغاجان گوێی لەزەنگی دەرگاکە بوو، دەستبەجێش هەستی بە مەترسی کرد. ئەو حیسابی ئەوەی کردبوو کە پۆلیس بەدوایدا بێنە بازاڕ، بەڵام وای دانەنابوو لەنیوەشەودا دەرگەی ماڵی لێبگرن.

دادەکانیش گوێیان لە زەنگەکە بوو، دەیانزانی شتێکی نائاسایی لە گۆڕێدایە و نەدەبووایە چووبانە دەرێ، بەڵام ئەوان چاوەڕێی کاردانەوەی ئاغاجان بوون.

شاباڵیش کە گوێی لە زەنگەکە بوو، دەستبەجێ چووە ژوورەکەی ئاغاجان.

"پێدەچێ پۆلیس بن،" ئاغاجان بە نەرمییەوە وای بە شاباڵ گوت، "برۆ خالخالی ئاگادار بکەرەوە! ئەو دەبێ هەر ئێستا لێرە بڕوا! برۆ لەگەڵ خۆتی ببە، لە ڕێی سەربانەوە بڕۆن!"

خالخالی چاوەڕێ پۆلیسەکانی دەکرد، ئەو هێشتا لە حوجرەکە بوو کاتێ زەنگی دەرگا لێدرا. دەستبەجێش چرای ژوورەکەی کوژاندەوە و لە حوجرەکە هاتەدەر و بە سەری پەنجەی پێ بەرەو پەیژەکان ڕۆیشت.

ئاغاجانیش پاڵتۆکەی لەبەرکرد و کڵاوشاپۆکەی لەسەر نا، بەرەو حەوشەکە ڕۆیشت. ئەو بیچمی خالخالی لای پلیکانەکان بەدیکرد. ئەو کەمێکی دیکە وەستا، تا بە تەواوی لە تاریکیدا بزربوو.

دیسان زەنگی دەرگاکە لێدرایەوە.

- "من واهاتم!" ئاغاجان بەدەم ئەم وەڵامە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت.
ژنەکان لەو دیوی پەردەکانەوە چاودێری هەموو شتێکیان دەکرد.
- "ئەوە کێیە؟" ئاغاجان بەرلەوەی دەرگاکە بکاتەوە، وای هاوارکرد.
- "دەی بیکەرەوە!"
ئەویش دەرگاکەی کردەوە. لەبەر تیشکی گڵۆپی سەرجادەکە ئەو ئاژانەکەی بەر دەرگای بینی، هەروەها ئەوانەی لای ترومبێلەکەشی بینین.
ئیدی دەمودەست زانی، ئەمانە ئاژانەکانی دەزگای نهێنین. ئاخر ئاژانێک نەیدەوێرا بەو نیوە شەوە بێتە بەردەرگایان. لەوانەیە ئەمانە ئاژانی نوێ بن، یان هی شوێنێکی دیکە بن. ئاغاجان ئەمەی لە ڕەفتارەکانیان بەدیکرد. ئەوان ئاغاجانیان نەدەناسی، تەنانەت هەر سڵاویشیان لێنەکرد.
- "ئەرێ ئێوە بەم نیوە شەوە لەبەردەم قاپیماڵەکەمدا چیدەکەن؟"
- "ئێمە بەدوای مەلایەکەدا دەگەڕێین! ئەو دەبێ لەگەڵمان بێ!" ئاژانەکە لە کاتێک ناسنامەی پۆلیسیانەی نیشانی ئاغاجاندا، وای وەڵامدایەوە.
بەهۆی ئەو وشە ڕەقانەی ئاژانەکە پێیگوتن، ئاغاجان لە دژواری ڕەوشەکە تێگەیشت. بۆ ئەوەی هەندێ کات بەدەست بێنێ، ئاغاجان چووە دەرەوە لە لای ئاژانەکە وەستا و دەرگاکەشی پێوەدایەوە.
- "مامۆستا لە ماڵ نییە،" ئاغاجان وای بە ئاژانەکە گوتەوە؛ "ئەگەر ئیشەکەتان زۆر پێویستە، ئەوا بەیانی ئێوارە دەتوانن لە مزگەوت بیبینن."
ئاژانە بەرپرسەکە، ئەمەی لە ئاغاجان ڕەچاونەدەکرد دەرگاکە لە دوای خۆی دابخا، بە توندییەوە تێیخوڕی: "دەی دەرگاکە بکەرەوە!"
- "جەنابی پۆلیس، دەنگ واهەڵمەبڕە، هەمووان نوستوون." ئاغاجان وایپێگوتەوە.
- "دەی قاپیەکە بکەرەوە." ئاژانەکەش وای گوت، لەکاتێکدا بە مست لە دەرگەکەی دا.
- "جەنابی پۆلیس، ڕەفتاری جوان بنوێنە! من تازە پێمگوتی، مامۆستا لە ماڵەوە نییە. ئەو ڕۆیشتووە! ڕۆیشتنیش ڕۆیشتنە! ئەو بەیانی ئێوارە لەمزگەوت دەبێ. لێم تێدەگەی؟ یاخود لێم تێناگەی؟" ئاغاجان ئەمەی بە دەنگهەڵبڕینەوە گوت، تا خالخالی گوێی لێبێ.

- "دەی قاپییەکە بکەرەوە، دەنا بەگوللە دەیکەمەوە." ئاژانەکە وای گوت و قۆپچەی قایشبەندی دەمانچە رەشەکەشی ترازاند.
لە پڕێکەوە یەکێ لە ئاژانەکان غاریدایە سەر پاردەکە و هاواریکرد: "ئەو لەسەر بانی مزگەوتییە! دەی بیگرن!"
دەستبەجێ ئاژانەکان لە ڕێی دەرگای دیوارەکە چونە ژوور، دوای چەند چرکەیەک چوونە سەربان و بەرەو ئاراستەی منارەکان غاریان دا.
ئاغاجان دەرگاکەی کردەوە ویستی بچێتە لای پەیژەکان تا وەسەربان بکەوێ، لێ ئاژانەکە بانگی کرد: "تۆ دەبێ لێرە بمێنیتەوە!"
ئیدی ئاغاجان چووە بەردەم ژووری میوانان، لەوێ لەژێر دارێکدا، لە تاریکدا وەستا و چاودێری ڕەوشەکەی دەکرد.
- "من سێبەرێکم لەپشت گومبەزەکەوە بینی!" یەکێ لە ئاژانەکانی سەر شەقامەکە وای بە بەرپرسەکە گوت.
- "دەی دەستەکانت بۆ سەر سەرت بەرز بکەرەوە!" بەرپرسەکەش لەسەر بانەکە وای هاوارکرد.
ئاغاجان وایزانی خالخالی گیرا، ئیدی چووە لای دار کاژە پیرەکە بۆ ئەوەی سەربانەکەی باشتر لێدیار بێ. لەبەر تیشکی کەسکی گڵۆپەکانی منارەکاندا، بینی کەوا بەرپرسی ئاژانەکان لوولەی دەمانچەکەی بۆ پێشەوە ڕاهێشتووە، بەڵام ئەو خالخالی نەبینی.
- "خۆ لێرە کەسی لێ نییە!" بەرپرسەکە وا بانگی ئاژانەکەی سەر جادەی دایەوە.
- "ئاخر من تازە سێبەرێکم بینی، نابێ دوور کەوتبێتەوە!" ئەویش وای وەڵام دایەوە.
ئەمەش ئۆخژنێک بوو بۆ ئاغاجان و ئاهێکی هاتەوەبەر. ئیدی هاتە بەر ڕووناکایی گڵۆپەکانی لای حەوزەکە وەستا و بانگیکرد: "جەنابی پۆلیس! ئەو سێبەرەی لەسەر بانەکە بینیتان، ئەوە سایەی مجێوری مزگەوتێ بوو. خۆت وا شێلو مەکە و پرسەکەش زیاتر مەئاڵۆزێنە. مجێورەکە تازە لای من ڕۆیشتبوو کاتێ ئێوە هاتن. کەس ناتوانی بەسەر بانەکەدا هەڵبێ، نەخاسمە

کە پۆلیس لەسەر جادەکە بێ. من دەمەوێ نیشانی تۆی بدەم." ئیدی بەرەو لای پەیژەکان ڕۆیشت تا لێ وەسەر بانەکە بکەوێ.

- "ئاخر من پێمگوتی، مامۆستا ڕۆیشتووە، لێرە نەماوە." کاتێک وەسەربان کەوت وای بە بەرپرسی پۆلیسەکان گوت. "ئەو بۆ وتوویژێک بەرەو قوم ڕۆیشتووە، بە قەتاری شەو سەفەری کرد. تۆ دەتوانی زەنگ بۆ نووسینگەی ویستگەی قەتارەکە لێبدەی، ئەگەر بتەوێ زانیاری زیاترت دەستکەوێ. هەڵبەت ئەوان لەوێ بینیویانە. بەدەر لە گومبەز و منارەکان هیچی دیکە لەوسەربانەی مزگەوتێ نییە. دەی سەیرێکی دیکەی ئەو ناوە بکە ئەوجا خواحافیزت بێ! لێم تێگەیشتی؟"

بەرپرسی پۆلیسەکان وەڵامی نەدایەوە، بەڵام بە خۆی و لایتەکەی دەستی لەچەند پنتێکی سەربانەکە گەڕا.

- "دەی بەخۆو پێڵاوە پیسەکانت لەسەر بانی مزگەوتێ وەرە خوار و لە ماڵی من بڕۆدەر!" بەم جۆرە ئاغاجان بانگی کابرای پۆلیسی کرد و ئاماژەشی بۆ پەیژەکان بۆکرد.

پۆلیسەکانیش بە منگەمنگەوە لە پلیکانەکان دابەزین و گەیشتنەوە ناو حەوشەی خانووەکە.

- "هێشتا هیچ لایدەیەک نەیوێراوە وا بەسەر ماڵی من دابدا، هەنووکە چوار خوێڕی لە ماڵێ لێوەژوور کەوتوون. دەی جامەکە پڕبوو، هەمووتان دەفن بن."

بەڵام پۆلیسەکە نەکەوتبووە ژێر باندۆری ئەو قسە توندانەی ئاغاجان، فەرمانی بەسەر ئاژانەکانیدا کرد: "دەی هەر ئێستا هەموو ژوورەکان بپشکنن!"

ئاژانەکانیش چەتوونانە لێوەژوور هۆدەکان کەوتن.

- "شاباڵ!" ئاغاجان وای بانگ کرد.

هیچ وەڵامێک نەبوو.

- "دەی زەنگ بۆ سەرۆکی شارەوانی لێبدە!" جارێکی دیکە ئاغاجان بانگی کردەوە، هەرچەندە دەشیزانی، کە شاباڵ لەگەڵ خالخالی دەرچووە.

ئینجا بە خۆی چووەوە ژوورەکەی خۆی، لەنێو کاغەزەکانیدا لە ژمارە تەلەفۆنی ماڵی سەرۆکی شارەوانی گەڕا و ژمارەکەی لێدا. "ئەو خوێڕیانە لە ماڵی من دەربکە، دەنا بەخۆم تفەنگەکەم لەژێر زەمین دەردێنم و هەرمەموویان لێرە سارد دەکەمەوە!"

ئاژانەکان بەسەر ژووری بانگدەرە نابیناکەیان دادا و شوێنەکەیان پشکنی.

"هەی بیژمۆتینە!"[42] بانگدەرەکە وای هاوار بەسەرداکردن؛ "ئێوە چ جۆرە بیژمۆتێکن! دەی لە ژوورەکەم دەرکەون! بڕۆ نەدەر لەو ماڵە!"

دەرگای ژووری کتێبانیش قفڵ درابوو.

- "کلیلەکە!" بەرپرسی پۆلیسەکان بانگی کرد.
- "هیچ کلیلی نییە!" ئاغاجان لە دیوەکەی دیکەی ژووریَ وای بانگکرد.
- "کلیلەکەم بدەریَ دەنا دەزانم چۆن دەیکەمەوە!"

دادەکان لەنێو تاریکاییەکە دەرکەوتن، دەرگای ژووری کتێبخانەکەیان کردەوە و گڵۆپەکەشیان پێکرد.

گوڵبانووش بانگیلێکردن: "پێڵاوەکانتان داکەنن!"

پۆلیسەکەش هەر گوێی پێنەدا.

- "پێڵاوەکانت داکەنە، خوێڕی!" گوڵبێش وای بەسەردا هاوارکرد.

ئاژانەکەش کە بە کۆنێتی کتێبخانەکە کارانگاز بوو، زیاتر نەچۆ پێش، بەڵکو هەر لە قاپییەکەوە وەستا، سەیری دۆلابە کۆنینەی کتێبەکان و شتە ئەنتیکەکانی مەلای کرد و دوایی هاتەدەر.

ئاژانەکانی دیکە لێ وەژووری مافوورڕستن کەوتن. لەوێدا مافوورێکی نیوەچڵ بەجێهێڵراو، هەڵواسرابوو. ئەوان سەیری ئەودیو مافوورە لوولدراوەکانی هەڵواسراو بەدیوارەکەیان کرد. ئەوان سەیری پشت مافوورە گەورەکە و سەری سندوق و دۆلابە کۆنینەکانی ئەوییان هەڵدایەوە و هەندیَ گڵۆڵە بەنی مافوورەکانیشیان بەو ناوە وەرکرد. ئینجا لەویَ دەرچوون و سەریان بە ژووری بەنگکێشانیشدا کرد.

---

[42] بیژموت: بیژی، زۆل.

زەنگی تەلەفۆنی بەرپشتی بەرپرسی ئاژانەکان لێدرا، ئەویش چووە لای حەوزەکە بەبێ سیم لەگەڵ یەکێک دەدوا. دوای خولەکێک گەڕایەوە لای ئاژانەکانی دیکە و بانگیکردن: "دەی کوڕینە، بابڕۆینەوە!"

ئیدی پۆلیسەکان خۆیان کۆکردەوە و هاتنە ناو حەوشەکە، ئینجا دەرگەکەکەیان لەپشت خۆیان داخست و ڕۆیشتن.

ئاغاجانیش دەرگاکەی بەکلیل گاڵەدا و گڵۆپەکانیشی کوژاندنەوە.

- "ئەرێ شتێکتان هەیە بیخۆم؟ برسی و تینوومە." ئەمەی بە دادەکان گوت.

ئەو تازە لە سەر کورسیەکەی دانیشتبوو، کە شاباڵ وەژوور کەوت.

ئاغاجان لێپرسی: "دەی، ئەو لە کوێیە؟"

- "لە مزگەوتییە."

- "لە کوێ لە مزگەوتێ؟"

- لە گۆڕە ژێرزەمینە کۆنینەکە. مجێورەکە هەموو شتێکی بۆ ڕێکخست."

شاباڵ وا وەڵامی دایەوە.

- "هەنووکە ئەو لەناو مزگەوتێ سەلامەتە، بەڵام پۆلیسەکان دێنەوە. ئەم بایەی هەڵیکردوە بە ئاسانی نانیشێتەوە. ئەوان مزگەوت دەخەنە ژێر چاودێری خۆیانەوە. ئێمە دەبێ بینێرینە قوم. دوایێ، کاتێ مجێورەکە دەرگای مزگەوتێی بۆ نوێژی بەیانی کردەوە، دەکرێ ئەوان بێنە ژوور و هیچیشت پێ لەگەڵدا ناکرێ. ئێمە دەبێ ڕێگایەک ببینینەوە تا هەڵیبێنین و دەربازی بکەین."

لەو ساتەدا دادەکان بە خۆیان و سینییێکی زیوینی پڕ خواردن هاتنە ژوور. سفرەیەکی بچکۆڵانەی کەتانی خاوێنیان لەسەر مێزەکەی بەردەم ئاغاجان ڕاخست و یەک دوو قاپی فەخفووری رازاوەی بەنەخشونیگاریشیان لەسەر دانا کە نانی گەرم و پەنیریان تێدابوو. پاشان بە ئەسپایی چایەدانە کۆنینەکەیان لەسەر دانا کە تۆقێکی ئاڵتونی لەدەورە هەبوو، چایەکی بۆنداری تێدابوو، دادەکان چایەدانەکە و پیاڵەکانیان دانا و خۆیان لە ژوورەکە دەرچوون. ئاغاجان بە خەندەوە تەماشایەکی شاباڵی کرد.

- "وەک دەبینی ئەوان کردەوەکەی تۆیان باش هەڵسەنگاندووە." لەکاتێکدا چایەی بۆ ئاغاجان تێدەکرد وایگوت.

- - دەی کورسییێک بێنەو نانم لەگەڵدا بخۆ. ئێمە هێشتا زۆر شتمان لەپێشدا ماوە بیکەین، ئێمە نابێ ئەمشەو بخەوین."

کاتێکیش ئەوان لە خواردنەکە بوونەوە، ئاغاجان چووە کەلێنە پەناگەی نوسینگەکەی و بە خۆی و یەک دوو شت گەڕایەوە. ئەو مقەسێک، شەپقەیەک و قاتێکی لەسەر مێزەکەی بەردەم شاباڵدا دانا و پێیگوت: "نەخشەیەکم هەیە. کەمێکی دیکە دەچمە مزگەوت لەسەر شۆستەکە دەوەستم، وەک ئەوەی چاوەڕێی یەکێک بکەم. من دەزانم پۆلیسەکانی نێو ترومبێلەکە هەموو شتێکیان خستۆتە بن چاودێری، بۆیە دەمەوێ سەرنجی ئەوان بۆلای خۆم رابکێشم. ئەوسا تۆش مقەسەکە هەڵدەگری و قاتەکەش لەگەڵ خۆت دەبەیتە مزگەوت، لە ڕێی سەربانەکەوە بۆی دەچی. یارمەتی خالخالی دەدەی تا ڕیشەکەی کورت بکات و داوای لێدەکەی ئەم قاتە لەبەربکا، ئەم شەقپەیەش بنێتەسەر. هەر کاتێکیش ڕۆژ هەڵات، ئەوا خەڵک بۆ نوێژ روو لە مزگەوتێ دەکەن؛ دوای ئەو ڕووداوانەی دوێنێ شەو، پێشبینیی هاتنی خەڵکێکی زۆرتر لە ڕۆژەکانی دیکە دەکەم. کاتێکیش دوای نوێژکردن، خەڵکەکە بەرەو ماڵی خۆیان دەبنەوە، ئێوەش هەر دووکتان لەگەڵ خەڵکەکە بچنە دەرێ. باقیەکەی دیکەش من ڕێکی دەخەم. نەخشەکەت لێ ڕوونە؟"

- "بەڵێ، ڕوونە."



ڕۆژەکە سارد نەبوو، بەڵام لەو بەرەبەیانەدا، لە چیاکانەوە نەرمە بایەکی تەڕوتازی بەسەر شارەکەدا هەڵدەکرد. هەروەک باسی لێوەکرا، ئاغاجان چوو لەبەردەم مزگەوتێ وەستا، بینی ئەو گڵۆپەی سەر کۆڵانەکەی بەردەم مزگەوتێ، کە دەمێک بوو سوتابوو، هەنووکە داگیرساوە. مجێورەکە چەند جارێک چووبووە دەزگای کاروباری کارەبا و داوای چاکردنەوەی لێکردبوون، لێ هەرگیز هیچ کارمەندێک بەپیر دەنگییەوە نەهاتبوو. ئاغاجان بەخۆشی چەند جارێک زەنگی بۆ بەڕێوەبەری نووسینەگەی دەزگای کارەبای لێدابوو، بەڵام دەستی نەکەوتبوو قسەی لەگەڵدا بکا.

هیچ کەسیش لەسەر شەقامەکە نەبوو، هەندێکیش لەولاوە دوورتر، دوو پیاو دیاربوون جگەرەیان دەکێشا. کاتێکیش ئەو دوو پیاوانە سەرنجیان دا، کەوا ئاغاجان سەیریان دەکا، هەندێک کشانەوە و لەنێو تاریکیدا بزربوون.
ترومبێلێک کە چوار سەرنشینی تێدابوون بەبەردەم مزگەوتێدا هات، لەوێ جارێک بایدایەوە، لێ نەوەستا و ڕۆیشت.
ئەو پیاوانەی لە تاریکییدا وەستابوون، دیسان لەبەر تیشکی گڵۆپی سەر جادەکە دەرکەوتنەوە. ئەوان بە جگەرەی لالێویانەوە بەرەو لای ئاغاجانەوە هاتن و بە بەردەمیدا تێپەڕین بێئەوەی قولماتیان لەدەم بێتەدەر. ئەوان پیاوگەلێک بوون، هی دەرەوەی شار بوون، دەنا لە تاریکیش بووایە ئاغاجانیان دەناسییەوە و دەنگیان دەدا.
هەنووکە ئەو لەوێ وەستاوە، هەستی بەوە کرد، شارەکە لە ماوەی ئەو ساڵانەی دواییدا بەتەواوی گۆڕاوە. جڵەوی شارەکە لەبەردەستی خەڵکی غەوارەدایە. تا یەک دوو ساڵی ڕابردووش، هەموو بەرپرس و کاربەدەستانی شارەکە ناسراوبوون، کەسانێک بوون سەر ماڵباتەکانی نێو شار، ڕۆڵەی بازرگانەکانی بازاڕەکە بوون. جاران کاتێ ئاغاجان بە خۆی سەری بە دامودەزگایەکی میرییدا دەکرد، دەستبەجێ لای بەڕێوەبەرەکەیەوە پێشوازی لێدەکرا. بەڵام هەنووکە ئەو بەڕێوەبەرە تازەکان ناناسێ. ئەو بەڕێوەبەرە نوێیانە نەیانویستوە تاکە پەیوەندییکیش لەگەڵ مزگەوتێ ببەستن. ئەوان قاتی تەسکوتار لەبەر دەکەن، بۆینباخ دەبەستن و جگەرەی ئەستور ئەستوریش دەکێشن. شارەکە وەک ئەوەی لە نێوەڕاستدا دابەشبووبێ وایە، لە لایەک خەڵک و باڵەخانە و بازاڕە کۆنینەکەیە، لە لایەکەی دیکەشەوە بەڕێوەبەری نوێ، ئاژان و پۆلیسی نوێ، باڵەخانەی نوێ، تیاترۆ و خولیادارانی سینەمای نوێن. پێشتر دەکرا بە ئاماژەی پەنجەیەکی هەموو شتێک ڕێکبخا، لێ ئێستا ناتوانی تەنانەت گڵۆپێکی سەر جادەش بە کاربەدەستان چاک بکاتەوە.
هەنووکە ئاغاجان لە هۆشدارییەکەی سەرۆکی شارەوانی حاڵی بوو، کە پێی گوتبوو: "ئاغاجان، بیری لێبکەوە! من هەروەک پێشانم پێناکرێ."
ئەو هەستی بە ترسێک کرد، هەرچەندە ئەو پێشتر نەدەترسا. تا یەک دوو سەعاتی پێشتر، کە هەموو شتێک باش دەبێ و ڕێک دێتەوە، تەنانەت ئەگەر

ئاژانەکان خالخالیش قۆڵبەست بکەن. ئەو دڵنیابوو دەیتوانی خالخالی ئازاد بکاتەوە و بینێریتەوە ماڵ، چونکە دەیتوانی زەنگ بۆ بەڕێوەبەری پۆلیسخانەکە لێبدا، لێ هەنووکە زانی، سەرچیخ چووە.

شتەکە بە شێوەیەک بوو، کە ئەو نەرمە بایە تەڕوتازەیەی لە چیاکانەوە هەڵیدەکرد، زۆری پێویست پێبێ، تا بتوانێ باشتر بیربکاتەوە و شتەکانی لە بەرچاودا ڕۆشنتر ببنەوە. ئەو هەستیکرد، تەنانەت خودی خالخالیش لایدە بوو، وێڕای ئەوەش کەسێکە هی متمانەپێکردن نییە. بەڕاست تۆ بڵێی ئەو کێ بێ؟ مەلایەکی تەواو نەناسراو کە لە شاری (قوم)ەوە هاتووە و داوای دەستی کچەکەیانی کردووە. باشە ئەدی دواتر؟ لەوە بەولاوە هیچی دیکەی لە بارەوە نەدەزانی.

بایە تەڕوتازە هەڵکردووەکەی شاخەکان کاری خۆی کرد. هەنووکە ئەو لەبەر چاوی لاکەوت و هەموو شتێکی بەجۆرێکی دیکە بینی. خالخالی پلانێکی دژوارانەی دەستپێکردبوو، ئاخر ئەو بە هاتنی فەرەح دیبای بۆ تەلاری سینەماکە دەزانی، بەڵام هەواڵەکەی لەم شاردبووەوە. ئەو خوازیاربوو کارەساتێک لەشارەکەدا بنێتەوە، ئەو خەڵکە نەشارەزاکەی ناو مزگەوتێی بە هەڵەدا برد، بەرەو تەلاری سینەمای بردن تا فەرەح دیبا بخاتە نێو تەڵەوە، بۆ ئەوەی وڵات سەروابن بکا و دونیاش هەموو باسی ڕووادوەکە بکا. ئاغاجانیش ئاگای لە مەحمودی بێ زەواڵ نەبوو. ئای چ بەختێکی هەبوو، کە لە دوا ساتدا فریا کەوت پلانەکەی خالخالی لەگۆڕبنێ. خالخالی کڵاوی لەسەر ناو هەنووکەش لە ژێرزەمینە کۆنەکەدایە. چارەنووسی لە بەردەستی ئاغاجان دایە. هەر ئەویش داوای لە شاباڵ کرد بچێ ڕیشی خاڵخالی کورت بکا.

هەرچەندە کەشەکە ساردیش بوو، لێ هەستی بە ئارەقەی نێوچاوان کرد. بۆ ئەوەی بەسەر تووڕەییەکەیدا زاڵ بێ، خەریکی خوێندنەوەی ئەم ئایەتانە بوو:

**وَالضُّحَى (١)**
**وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى (٢)**
**مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى (٣)**
**أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَى (٦)**
**وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَى (٨)**

أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ (١)
وَوَضَعْنَا عَنْكَ وِزْرَكَ (٢)
الَّذِي أَنْقَضَ ظَهْرَكَ (٣)
وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ (٤)
فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا (٥)

{سوندێ دەخۆم بە چێشتەنگاو،
بە جەنگەی هەدادانی شەو،
پەروەندەت نە وازی لەتۆ هێناوە و نەلێت قەڵسە،
چما نە سێوییەک بووی، ئەو پەنای پێدای؟
دی هەژاری و لە ئاتاجی دەریخستی؟

ئەدی ئێمە تۆمان سینە فرە نەکرد؟
قورسایشمان لەسەر شانت لانەبرد؟
ئەوەی پشتی چەماندبووی؟
ناوبانگیشتمان بەرزەوەکرد،
لەپاش تەنگانە فەرەحانین.}

ئەو ئاورێکی دایەوە، بینی دونیا ڕووناک بۆتەوە. وردەوردە خەڵک وا بەرەو مزگەوتێ دێن. هەستی بە دڵسوکێیک کرد، پشتی ڕاستکردوە هاتە مزگەوتێ.
هەرگیز پێشتر لەنوێژی بەیانیان، مزگەوت وا پڕ نەبووە، هێشتاش خەڵکی وا هەر دێن. ئاخر ئاغاجان گوێی لێنەببوو، دەنا خەڵک لە ڕادیۆوە گوێیان لێببوو، کە زەنجانیش پشێوی تێکەوتووە و خەڵک یاخیبووە، گوایە مەلایەکی توندڕۆ شارەکەی سەروابن هەڵگێڕاوەتەوە.
هەمــوو ڕۆژنامەکــانی دەمەوبەیــانیش دەربــارەی ســەردانە شــاهانەیەکی شــابانۆیان بــۆ کــردنەوەی نــۆڕینگەی ژنانــان و تەلاری ســینەما نــوییەکە نوسیبوو. لێرەو لەوێ مەزندەی ئەوە کرابوو، مەلای مزگەوتێ نوێژکەرەکانی بۆ مەبەستێکی گوماناوی جۆش و هاندابوو.

بۆیە ئەم بەیانییە، هەموویان هاتوونەتە مزگەوتێ، تا لەباقی پشێوییەکەدا بەشدار بن.

مجێورەکەش لەوێ پەیدا بوو، بەرەو لای ئاغاجان ڕۆیشت و سڵاوی لێکرد. ئاغاجانیش کورتە قەدەمێکی لێدا و مجێورەکەی لەگەڵ خۆدا برد تا شتەکەی لەگەڵدا باس بکا. کاتێکیش ئەوان بۆ ناو مزگەوتێ گەڕانەوە، ئاغاجان بە دزییەوە چووە نێو ژێرزەمینە کۆنینەکە. شاباڵ لە تاریکاییەکەدا دەرکەوت.

- ئاغاجان پرسی، "ئەو لە کوێیە؟"
- "لەژێر زەمینەکە."
- "برۆ سەرێ و بەباوکت بڵێ تا بانگ بدا."

ئەویش زیاتر بەرەو قووڵایی ژێرزەمینەکە ڕۆیشت، لەوێدا خالخالی نەدەناسرایەوە. قاتێکی لەبەرکردبوو، شەپقەی لەسەرنابوو، ڕدێنەکەشی کورت کردبوو.

- "پۆلیس هەموو شتێکی کردووە تا بتگرێ. تۆش هۆیەکەی لەمن باشتر دەزانی. منیش هەموو هەوڵێک دەدەم تا رزگارت بکەم، بەڵام دەمەوێ شتێکت پێبڵێم، من بەو کردەوەیەت شادمان نیم. هەستێکی وام هەیە، کڵاوت لەسەرنابم. دەبوایە پێشتر لەپلانەکەت، ئاگادارکردبامەوە، بەڵام هەر بەئەنقەست پێتنەگوتم. هەنووکەش کاتی ئەوە نییە لە بارەی ئەو شتانەوە قسان بکەین. کەمێکی دیکە، دوای ئەوەی لە نوێژ دەبینەوە، شاباڵ دێت و دەتبا. بەیەکەوە لەگەڵ خەڵکەکە لە مزگەوتێ دەردەچن. برازای مجێورەکە بە خۆی و ماتۆڕەکەی لە گۆڕەپانی بازاڕەکە چاوەڕێت دەکا. کاتێک هەموومان گەیشتینە ئەوێ، دەچی و لەپشتی ئەو لەسەر ماتۆڕەکە سواردەبی، ئەویش هەندێ دوورت دەخاتەوە و دەتگەیەنێتە گوندی (وارچێ). مەلای وارچێش ڕەوانەی (کاشان)ت دەکا، لەوێش مەلای کاشان دەتگەیەنێتە قوم. ئەوەش هەندێ پارەیە. من ئێستا دەڕۆم." ئاغاجان وای پێگوت، ڕاستەوخۆش لەوێ دەرچوو بێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ وەڵامێکی خالخالی بکا.

ئەو مەبەستی بوو بەتوندی قسەی لەگەڵدا بکا و پێیبڵێ: "تۆ مەبەستت بوو سەری شارەکە، مزگەوتەکە، ماڵ و خانەوادەکەش لە قوڕێ بنێی. تۆ متمانەی منت شکاند، خۆ دەبووایە هەر لە بەراییەوە بمزانیبایە، کە تۆ بەکەڵکی متمانە

پێکــردن نــایەی، مــایەی خۆشــبەختییە، کە ڕەوشــەکە بە جــۆرێکی دیــکە وەرسووڕایەوە. هەنووکەش بڕۆ و دەفن بە، نامەوێ جارێ بتبینمەوە." بەڵام ئەوەی لەنێو مێشکیدا بوو پێینەگوت، شـادمانیش بـوو، کە تـوانی تـوڕەییەکەی خۆی جڵەوبکا، هەرچی ناودڵی هەبوو پێیهەڵنەڕێژێ.

لەوکاتەش، ئاغاجان پێینایە نێو مزگەوتێ، خەڵکەکە لەپشتی بـوون، هەموویـان دەیانزانی، دوێنێ شەو بەسـەر ماڵەکەیان داداوە و خالخالیش رایکردووە.

کۆمەڵێک لە پیاوە دیارەکانی بازاڕ، یاوەری ئاغاجانیـان بـۆ ئەو شـوێنە کرد، کە جاران مەلای مزگەوتێی لێدەوەستا و پێشنوێژی بۆدەکردن.

- "کەمێکی دیـکە پێویسـتیم بە یـارمەتی ئێـوە دەبـێ،" کـاتێ پێیهاوێشـتە نـاو مـزگەوت ئەمەی بەسـەر لێـوان و بەچـرپە بە پیاوەکـان گـوت: "خالخـالی لە مەترسی دایە. من پێشنوێژەکەتان بۆ دەکەم. هەرچەنـدە ئەم کـارەش ئاسـایی نییە، بەڵام بـارێکی ناچـارییە. پاشـان دەمەوێ ئێـوە بمێننەوە، ئینجـا بەیەکەوە دەچینە بازاڕ."

دوای ئەم قسـانە، ئاغاجـان چـووە نـاو میحـراب، لەوێـوە ڕووی لە نـوێژکەران کرد و پێیگوتن: "خەڵکینە، ئەمڕۆ مامۆستا لێرە نییە پێشـنوێژتان بـۆ بکـا. مەلا خالخـالی دەبوایە دەسـتبەجێ بگاتەوە قـوم. مـن دەزانـم ئەمە شـتێکی ئاسـایی نییە، بەڵام ئەمڕۆ من جێگەی مامۆستا دەگرمەوە و پێشنوێژتان بۆدەکەم. خۆ نوێژی بەیانیانیش کورتە، دەی دوام کەون و ڕێک ڕاوەستن!"

ئیدی مقۆمقۆیەک پەیدابوو، لێ کاتێ بانگدەرەکە تێیهەڵکرد "حی علی الصـلاة،" هەموویان کڕبوون و تێکرا ڕوویان لە مەککە کرد.

نوێژی بەیانی کورتترین نوێژی ڕۆژە و لە دوو وەستان، دوو ڕکعـات و دوو کڕنوش و نێوچاوان گەیاندنە سەر زەوی پێکدێ.

دوای ئەوەی لە نوێژەکەیان بوونەوە، پیاوەکان بە ڕیز دەورەی ئاغاجانیان دا و بەیەکەوە لەمزگەوتــێ چــوونەدەر. کــاتێ گەیشــتنە حەوشــەی مزگەوتــێ، ئاغاجـان، شــاباڵ و خالخـالی بینـین کە لە ژێـرزەمینەکە هـاتنەدەر و تێکەڵـی ئاپۆرای دەرچوو بوون. ئاغاجان بۆ کۆمەڵە کەسانێکی کەمی گوتبوو تا بازاڕ لەگەڵیدا بـڕۆن، بەڵام دیـاربوو لەبەر بـاری ناچـاری و پێویسـت زۆر کەسـی ڕەگەڵ کەوتبوو، ئیدی بە بێدەنگی هەمووان بەدوای ئاغاجان کەوتن.

لە هەموو لایەکیش پۆلیس وەستابوون، نەشیان دەزانی کە چی لەگۆڕێدایە، بۆ خەڵکەکە وا بەئارامی بەسەر شۆستەکاندا بەرەو بازاڕ بە ڕێکەوتوون.
برازای مجێورەکەش ماتۆڕەکەی سازوتەیار بوو، لە گۆشەیەکەی گورەپانی بازاڕەکە لەژێر گلۆپەکەدا چاوەڕێبوو. ئیدی هەر زوو خالخالی خۆی لە ئاپۆرای خەڵکەکە دزیەوە و سواری ماتۆڕەکە بوو. ئینجا ماتۆڕچییەکە پێی لە پەیدانی بەنزینەکە نا، بێ ئەوەی ئاوڕیش بداتەوە ماتۆڕەکەی لێخوڕی و بۆی دەرچوو. شاباڵیش کەمێک وەستا، تا بەتەواوی ماتۆڕەکە لەبەرچاوان ونبوو. پاشان هەستی بە خۆی کرد چۆتە نێو حەشاماتەکە و لە تەنیشت ئاغاجان وەستا و چرپاندییە گوێی: "ئەو لێیدا و ڕۆیشت."

## باڵندەکان

**هاء، میم.** تازە وەرزی پایز بەسەرچوو بوو. سەدیقە گواستبوویەوە قوم تا زستانەکەی لەوێ لەگەڵ مێردەکەی بەسەر ببا. بەفری یەکەمینی وەرزەکە سەری شاخەکانی داگرتبوو. سەیری هەر شوێنێکت دەکرد، هەر ترۆپک و تۆقەڵی سپی بوون لە سەرووی گوندەکانەوە سەریان هەڵکێشابوو. لە ماڵەکەشدا چیدی ئەوەندە باسوخواسی خالخالی نەدەهاتە گۆڕێ. هەمووان بە شتی دیکەوە خەریکبوون؛ ئاخر زۆری دی نابا ڕەوی باڵندەی سەیروسەمەرەکان دەگەنەجێ. بەڵکو ئەمجارەیان مەلێکی ناوازەیان لەگەڵدا هەڵفڕیبێ.
کاتێکیش ئاغاجان بێداربووەوە، بە ژنەکەی خۆی گوت: "فەخری، دیسانەوە خەونێکی خۆشم بینی. بەردەوام من لە پەیوەندیدام لەگەڵ مردووەکانم، تۆش ئەوە باوەڕناکەی، ئەم شەو باوکم لە خەونمدا بینی. من بیرم ناکەوێتەوە، ئاخۆ ئەو کەی کۆچی دواییکرد، بەڵام هەموو دەمێ دێتە خەونم. ئەوانەش ئەو خەونانەن، ناتوانم لێکیانبدەمەوە. هەمووشی لە کەشوهەوایەکی دیاریکراو و ژینگەیەکی لەبار ڕوودەدەن. لە خەونی ئەمشەومدا، باوکم مردبوو، ئێمەش ئەومان گەیاندە گۆڕستان و بەخاکمان سپارد، لێ کاتێ گەڕاینەوە ماڵێ، ئەو هێشتا لە ماڵ لەسەر پێخەفەکەی خۆی بوو، پەتۆی سپی بەسەرخۆی دادابوو. هەر زوو زانیم کابرای پاڵکەوتوو باوکمە، هەرچەندە

تازەش ناشتبوومان. ئیدی لە تەنیشت پێخەفەکەی نوشتامەوە و هەستم کرد، نەمردووە و لەکۆتاییدا هەڵدەستێتەوە. لەساتە وەختێکیشدا خۆی جوڵاند و سەری لەبن پەتۆکە دەرهێنا. هەوڵێکی دا هەڵبستێتەوە و دابنیشێ، منیش چوومە بن هەنگڵی کۆمەکی بکەم، لەکۆتاییشدا یارمەتیم دا، گۆچانەکە و کڵاوشاپۆکەم دایەدەست. ئەویش هۆدەکەی جێهێڵا، بە هێواشی بەرەو لای حەوزەکە ڕۆیشت، لەوێ لەسەر تەختەبەندێک دانیشت و تەماشای ماسییەکانی کرد."

- "تۆ بیری لێدەکەیتەوە، تۆ بەردەوام بیر لە مردووەکان دەکەیتەوە،" فەخری سادات وایپێگوت؛ "هەر بۆیەشە ئەوەندە جارە خەونیان پێوە دەبینی."

- "من بیریان لێناکەمەوە، بەڵێ، هەندێ جار بیر لە باوکم دەکەمەوە، بەڵام خۆ من خەون هەر بە ئەو نابینم، تا ڕاددەیەک بە هەموویانەوە دەبینم، تەنانەت خەون بە کەسانێک دەبینم کە نەشمدەناسین، هەر بۆنموونە خەون بە باوکی باوکم دەبینم، خەون بە باوکی باوکی باوکمەوە دەبینم. ئەوەش شتێکی زۆر سەیر و نامۆیە. بە ڕۆژ من لە جیهانی زیندووواندام و شەوانیش لە جیهانی مردووان."

- "لەوانەیە خەونەکە بەهۆی ئەو هەواڵنامەی مزگەوتەوە بێ کە دەیاننووسی."

لە دواییدا هەڵسا و تا لای پەنجەرەکە هات.

ئیدی لە پڕێکەوە بانگی کرد "فەخری سادات!"

- "چییە؟"

- "ڕۆژی تەمووز هەڵهاتووە!"

فەخری ساداتیش سەیرێکی ڕۆژی کرد، بینی هەروەک تۆپەڵە سورێکی بە سەر زەردکوە[43] شاخە زەردەکەوە هەڵواسراوە.

- هەموو ڕۆژێ سەیری تۆقەڵی شاخی زەردکێو دەکەم، بەڵام ئەو دەرناکەوێ. وامزانی ئەمساڵ هەر نایبینین." فەخری سادات وایگوت.

- "لە ماوەی ڕابردوودا من ئەوەندە بە خاڵخاڵییەوە سەرقاڵ بووم، بە شێوەیەک تەمووزم بە تەواوی لەبیر چووبووەوە."

---

[43] Zaardkoeh



وەرزی زستان داهات. زۆر کەم وایە لەپڕ و لەدوا ڕۆژی پایز و یەکەمین ڕۆژی زستاندا ، ڕۆژ بەو تین و تاوەی خۆی لە پشت شاخی زەردەکێو سەردەربێنێ. ڕۆژەکەش ڕۆژی تەمموز بێ و تەممووزیش واتای هاوین دەگەیەنێ.
لە زەنجاندا هەمیشە خەڵک چاوەڕوانی ڕۆژێکی وا گەرم و نەرمیان دەکرد. مەلە کۆچبەرەکان بەر لە خەڵکەکە بە ڕۆژەکەیان دەزانی. ئەوان ئەم ڕۆژەیان دەقۆستەوە تا بەسەر شاخە بە بەفرداپۆشراوەکاندا بفڕن. ڕەوی ئەو مەلانە لە ناوچە ساردوسڕەکانی ڕووسی- ئاسیباوە دەهاتن، هەر لە کۆنەوە ڕێگەی ئاوریشمیان دەگرتەبەر، هەوای ڕۆژەکە گەرمترین هەوای هەبوو، ئیدی ئەوان بەیەک هەناسە بەسەر بەشێکی بەرفروانی بیابان دەفڕین. کاتێکیش دەگەیشتنە زەنجان، بەشی هەرە قورسی کۆچەکەیان بڕیبوو. لەوێشەوە بە ئاراستەی ناوچە گەرمەکان دەکشان تا لە کۆتاییدا دەگەیشتنە هێلانەکانیان لەسەر دارخورماکانی کەنداوی فارسی.
ئەو ڕۆژەی تەمموزە، ڕۆژێکی گرنگی خانەوادەکەش بوو. ڕۆژەکە بۆ بازاڕ و بازرگانی نیشتمانیی مافووریش بایەخداربوو. فەخری سادات و دادەکان لەم ڕۆژەدا لە ماڵ دەرنەدەچوون و خەریکی ڕاوکردنی مەلەکان بوون.
ماڵەکە سرووشی ڕەنگەکانی مافوور و بیچمە نەخشینەکانی لە پەڕەکانی ئەو باڵندانە دەدۆزیەوە.
ڕۆژگار ئەزموونێکی وای بە ئاکنجیانی خانووی مزگەوتێ داوە، لەوە فێربوون کە هەمیشە لەو ڕەوە باڵندانەدا یەک دوو مەلی کۆچبەریان هەر تێدایە کە نەناسراو و ناوازە بن.
کەسیش نەیدەزانی، ئاخۆ ئاغاجان ئەو بیچم و نەخشونیگارەی شێوەی باڵندان، بەو چەشنە ڕەنگینە لەسەر مافوورەکانی دەنەخشێنێ، لە کوێوە دێنێ. شتەکە ببووە نهێنی پیشەی ماڵ. ئەوەش هەر ژنانی ماڵەکە بوون، کە چەند سەدەیەکە خاوەنی ئەو داهێنانەن.



ئەمڕۆ دادەکان هەروەک ساڵەکانی ڕابردوو دەستبەکاربوون. ئەوان سەلە و تریانی کۆنینەیان لە ژێرزەمینەکە و شوێنە حەشاردراوکانی دیکەی لای حوجرە و ژووری بەنگکێشان دەرهێنان.

هەرکاتێکیش ڕەوی باڵندە کۆچبەرەکان، بیابان ڕووەو زەنجان جێدێڵن، بەزۆری وایە بە ئاراستەی منارەکانی مزگەوتێ دەفرن کە هێلانەی چوار حاجی لەقلەقی لەسەرە. لەسەر هەر منارەیەکیان دوو لەقلەق دەژین. کەسیش نازانێ ئاخۆ کەی پیرە حاجی لەقلەقەکان دەمردن کەیش بێچوەکانیان جێیان دەگرتنەوە. بەڵام ئەوان هەمیشە هەر لەوێن. ئەوان سەر بە ڕۆحیانەتی زەنجانن و مەلە کۆچبەرەکانیش هەر لە دوورەوە هێلانەی ئەو حاجی لەقلەقانە دەبینن و ئەمەش بۆ ئەوان یەکەمین هێمای شارەکەیە.
کاتێکیش ڕەوە باڵندەکان دەگەنە شارەکە، ئەوان بە جریوە و قاژو قیغەوە یەک دوو خول بەسەر ئەوناوە لێدەدەن، ئینجا لەسەر بانی مزگەوتێ هەڵدەنیشنەوە. قەلەباچکە پیرەکەش لەسەر گومبەزەکە هەموو شتێکی خستۆتە بن چاوانی خۆی.
مجێورەکەش پێشوەختە هەندێ گەنم بەسەر بانی مزگەوتێ وەردەکا، لە چەند لایەک جامی ئاو بۆ مەلەکان دادەنێ. هەمووانیش دەزانن، باڵندەکان دان و ئاویان لەسەر بانی مزگەوتێ وەدەست دەکەوێ، بەڵام کەسیش نازانێ ، فەخری سادات دانە و داویان بۆ دادەنێتەوە.



خانمەکە لە پال حەوزەکە دانیشت و پەتی تریانەکەشی بە دەستەوەیە. دادەکانیش خۆیان لەپشت پەردەی ژووری کتێبان حەشارداوە و بە ئەسپایی سەیری دەرەوە دەکەن.
پۆلە مەلێک دێن و لە تەنیشت تریانەکان دەنیشنەوە، لەوێدا و لەبن تریانەکەدا دانیان بۆ فڕێداون، لەوێ دانی ڕەنگ سوور داندراوە.
هەر کاتێکیش مەلەکان بچنە بن تریانەکان، یەکسەر فەخری سادات داوەکە ڕادەکێشێ و باڵندەکان دەگیرێن. ئینجا دادەکانیش لە حەشارگەکەیان دێنەدەر.

هەردووکیان بۆ یەکەمین داو دێنە سەرچۆک. گوڵێ سەری یەکێ لە تریانەکان هەڵدەداتەوە، مەلێک دەردێنێ و ڕادەستی فەخری ساداتی دەکا. ئەویش بەوردی سەیری پەڕەکانی مەلەکە دەکا.
تەڵەکە حەفت جۆری نوێی پێوە بوو. ئەوانیش هەر حەفت مەلەکانیان لە حەفت قەفەسی جیاجیا کرد و بردنیانە ژووری کارکردنی ئاغاجان.

کاتێکیش تاریک داهات و ئاغاجانیش بەرەو ماڵ بووەوە، یەکسەر چووە ژووری کارکردنی خۆی، لەوێدا فەخری سادات و دادەکان چاوەڕێیان دەکرد.
- "ئەرێ ڕۆژەکەی ئێوە چۆن بوو؟ هیچ باڵندەیەکی ناوازەتان گرتووە؟"
- "مەلەکان زۆر قەشەنگن. ئەمڕۆ لەنزیکەوە زۆریانمان بینین." فەخری سادات وا وەڵامی مێردەکەی دایەوە.
- "دەی من زۆر موشتاقم، ئەرێ دادەکان لە کوێن؟" ئەو وای لەژنەکەی پرسی.
- "وا ئەوانیش دێن." وای وەڵام دایەوە. ئیدی ئەوان هەر چواریان تا کازیوەی بەیان لە ژوورەکەدا مانەوە کاریان دەکرد.
گوڵبانو یەکێ لە مەلەکانی لە قەفەزەکە دەرهێنا و پەڕۆکێکی بەسەر سەر دادا، بۆئەوەی مەلی بەستەزمان لە ترسان لەبەر تیشکی گڵۆپە بە هێزەکەی سەر مێزەکە نەسڵەمێتەوە و نەفڕکێنێ، باڵندەکەی لەسەر مێزەکە دانا و هەر چواریشیان لەبەردەمی بەئارامی دانیشتن و لێوردبوونەوە.
ئاغاجان جوان و بەسەرنجەوە لە باڵندەکە و پەڕەکەکانی ڕاما.
- "ئەمەیان پەڕی جوان و قەشەنگی هەن، بەڵام بەداخەوە هێشتا جۆرێکی دەگمەن نییە." ئەو بەدەم ئەم قسانەوە قەڵەمەکەی بەدەستەوە بوو، لەسەر کاغەزەکەی بەردەمی نەخشەی پەڕوباڵی باڵندەکەی کێشابوو، نیشانی فەخری ساداتی دا.
- "دەی ئێوەش سەیری کەن؟" ئاغاجان بەدەم ئەم پرسیارەوە ڕووی لە دادەکان بوو.
ئەوانیش چاویلکەیان لەچاوکرد، نزیکتربوونەوە و تەماشای پەڕی مەلەکەیان کرد. "ڕەنگەکانی ئەم پەڕانە جیاوازن، بەڵام بیچمەکە بەگشتی ناسراوە." ئەمە

قسەی گوڵبانو بوو. ئەوان مەلەکەیان لە ئاغاجان وەرگرتەوە، خستیانەوە نێو قەفەزەکە، مەلێکی دیکەیان دەرهێنا و دایانەوە دەستی ئاغاجان.
"وای، ئەم پەڕانە چەند دڵگیرن، ئەرێ ئێوە ئەو نەخشەی سەر خاڵی ئەم پەڕەیە دەبینن؟ هێڵی سوور و کەسک لەسەر پەڕەکە یەکتر دەبڕن. پێموایە دەکرێ وەستاکانمان شتێکی جوان لەو وێنانە هەڵبکرێنن و نموونەیەکی نایابی لێدروست بکەن."
فەخری سادات لە ڕێی شوشەیەکی گەورەکردنەوە(وردبین)ەوە سەیری پەڕوباڵەکانی کرد و گوتی : "هەر بەڕاستی ئەمەیان نموونەیەکی تایبەتە، بریسکەی سەر پەڕەکانی دیمەنەکە جوانتر دەردەخا. ئەرێ ئەوە چۆنە، کە ئەو باڵندەیە پەڕی تەواو جیاواز لەوانی دیکەی هەیە؟ خاڵ بەخاڵی ئەو پەڕانە نەخشێکی بێوێنەن."
ئاغاجانیش لە ڕێی وردبینەکەی فەخری ساداتەوە سەیرێکی کردەوە و سەری بۆ لەقاند: "ئەمەیان بەجیا دابنێ."
ئەوان لە دوو باڵندەی دیکەش رامان، بەڵام سەرنجیان دان کە پەڕەکانی ئەوان هیچ شتێکی سەرنجڕاکێشی وایان تێدا نەبوو. دادەکان مەلێکی دیکەیان لەقەفەس دەرهێنا. هەر زوو، دەستبەجێ دەرکەوت، مەلەکە جۆرێکی تایبەت وجیاوازە. مەلەکە شەڕی ئەوەی دەکرد خۆی ڕابپسکێنێ و ئازاد بێ. "ئای ئەمەیان چەند بەهێزە! پەڕەکانی لە مەلێکی ئاسایی ئەستوورترن. دەی سەیریکە،" ئەمە قسەی گوڵبێ بوو.
گوڵبانوو بە پەسەندکردنەوە گوتی: "بەڕاستیش هەر وایە، ئەم مەلەیان جیاوازە، ئەو پەلانەی سەر پەڕەکانی هەروەک گەوهەرێکی شینباو دڵگرن."
- "من ئەمەیانم بە ڕۆژی ڕووناکیش بینی،" فەخری ساداتیش وای گوت و لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو: "لێ هەنووکە، کە لێرە و لەسەر مێزەکە داندراوە، لە ژێر تیشکی چراکەدا ، زۆر جوانتر و ڕەنگینتر دیارە."
- "کارێکی شاکارانەیە!" ئاغاجانیش وای پێگوتنەوە، "ئەرێ ئەو هەموو جوانییەی لە کوێ هاتووە؟"
فەخری سادات دەستی دایە قەڵەمەکەی، بە وردبینەکە سەیرێکی کرد ئینجا دەستی بە نیگارکێشانی بیچمۆکەکانی سەر پەڕی باڵندەکە کرد. کاتێکش لە

وێنەکێشـانەکە بـووەوە، دادەکـان تـابلۆیەکی کۆنینەیـان لەگەڵ خـامەیەک لەبەردەم دانـا. ئەوان نەیانـدەزانی کە هونەرمەنـدن. ئەوان ئیشـەکەیان وەک درێژەپێـدانی ڕێورەسـمێکی نەریتیـانەی مـاڵ دادەدنـا، شـتێک کە لەگەڵ مافوورەکان و شوێنەکەیان دەگونجا. ئەوان خوازیاربوون جوانترین رایەخ و مـافووری وڵات دروسـت بـکەن، بەڵکـو جـوانترین مـافووری ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاستیش. ئەوان ئیشەکەیان وەک ئەرکێک دەبینی، هەرگیز نەکردە و لە بەرامبەریـدا دەستەوەسـتان نەدەبـوون. فەخـری سـادات ویـنەی بـیچم و سیماکانی دەکێشا، هەوڵیدەدا تەلیسمانە لاسایی نەخشونیگارەکانی سەر پەڕ و بـاڵی مەلەکـان بکـاتەوە و بیانخـاتە سـەر کـاغەز. ئەو ڕەنگینـانە بە خـامە زراوەکەی، بە پەنجە ناسکەکانی و بە ڕاوێژی دادەکان نیگارەکانی دەکێشا.

- "فەخری، ئەم ڕەنگەیان تاقیبکەوە، ئەم شینە تۆخە لە پاڵ ئەو کەسکە کاڵە دابنێ، لێ تێکەڵیـان مەکە، هێڵێکی زراو بەسـەر شـینەکەدا بێنە." ئەمە قسـەی گوڵبێ بوو بە فەخری ساداتی گوت.

فەخریش کتومت بە گوێی دادەکانی کرد.

- "بەلام مـن دەمەوێ ئەو دڕەوشـانەوە بنەوشـەییەی تێـدابێ. باشـە چـۆن بتـوانین ئەو بریسـکەدانەوە وەنەوشـەییە لەسـەر داوە خوریەکـانی سـەر مافوورەکە ڕەنگبداتەوە؟" ئەو وایپرسی.

- "لەسـەر خـامەکە نـاتوانی ذەقـاودەق لاسـایی ڕەنگینییەکە بکەیتەوە،" ئەمە تێبینی ئاغجان بوو، زیـاتریش لەسـەری ڕۆیشـت: "دیـارە ڕەنگی سـەر کـاغەز کاری خۆی لە خوری جیاوازترە."

- "دە تۆپەڵە خورییێک بێنن" فەخری سادات وای بە دادەکان گوت.

ئەوانـیش دەسـتبەجێ چـوونە ژووری مافووردروسـتکردنەکە و تـۆپەڵە خورییێکیان هێنا و لەسەر مێزەکە دایاننا.

- "ئادەی چەند داوێکم لەو خورییە شینە بدەنێ؟"

- "بە پـارچە خـورییێکی بچکۆلانە نـاکرێ سـەرکەوتوو نـابی." ئاغاجـان وای تێبینی دا؛ "تۆ دەبێ تۆپەڵە خورییە شینەکە بەتەواوی بەکـاربێنی، ئینجـا لەگەڵ هێڵە باریکە سوورەکان بیگونجێنی."

ئەو تۆپە خورییە شینەکەی لەسەر مێزەکە دانا و هەوڵیدا هێڵە سوورەکانی لەگەڵ شینەکان بسازێنێ."

- "دەیبینی؟"

- "نەخێر." فەخری سادات وا وەڵامی دایەوە.

- "کەمێک بوەستە." گوڵبانو وای پێگوت و هەندێ هێڵی سووری زیاتری لەگەڵ شینەکە لەسەر تۆپەڵە داوە خورییە شینەکان دانا.

- "ئەدی هەنووکە؟"

- "خەریکە وەک ئەوی لێدێ." فەخری سادات وا وەڵامی دایەوە.

- "ئێمە ناتوانین کاریگەرییەکە لێرە بەتەواوی لەسەر مێزەکە تاقی بکەینەوە و ببینین، تۆ دواتر لەسەر مافوورەکە دەیگونجێنی و دەیبینی. دواتر کاتێ ئەو هەزاران داوە خورییە سوورانە لەگەڵ شینەکان دەچنرێن و دەڕسترێن، ئەوسا بریسکەدانەوە وەنەوشەییەکە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانە لەسەر مافوورە دروستکراوەکە دەردەکەوێ. هەمیشەش کارەکە هەروابووە. دەی جارێکی دیکە بە وردبینەکە سەیری پەڕ و باڵی باڵندەکە بکەوە. خۆ ئەگەر زۆر لەنزیکەوە تەماشای بکەی، هیچ نابینی بەدەر لە شەپۆلە توکێکی شینباو و دەیان هێڵی سوور و بنەوشەیی و کەسک، لەوە زیاتر هیچ نییە، بەڵام دواتر هەموو شتێک بە خۆی ساز دەبێ." ئاغاجان بوو وای پێگوتن.

ئەوانیش بەبێدەنگی ئاوڕیان لەیەک دایەوە.

- "من هێشتا ناوێرم شادمانییەکەم دەرببڕم، بەڵام پێموایە بە مەبەستی خۆمان گەیشتین." دیسان ئاغاجان بوو واپێیگوتن.

فەخری سادات نیگارەکەی تەواوکرد، ئاغاجانیش ئەو سەرنج و تێبینییەی هەیبوو تۆماری کردن. دادەکانیش کەلوپەلیان هەڵگرتەوە ئەو ناوەیان خاوێن کردەوە.



لەکاتێکدا ئەوانی دیکە وا سەرقاڵی کاربوون، زینەت لە ناندیکەدا کاری دەکرد. ئەو لەوێ لەپشت دەرگاوە خواردنی دایە دەست دادەکان. باقی ئەندامانی خانەوادەکەش لە ژووری خواردن ئامادەبوون. بۆ ئەوەی بێدەنگی ماڵەکەش بپارێزن، چیرۆکێکی بۆ گێڕانەوە. هەمووان سەیری لێوەکانیان کرد و

زینەتیش ئەو گوێڕایەڵبوون و سەرنجدانەی پێخۆش بوو. ئیدی زۆرجاران داوای لێدەکرا چیرۆکێکیان بۆ بگێڕێتەوە. هەموو جارێکیشی لە جاری پێشوو باشتری دەگێڕایەوە.



لە بەرەبەیانێکی زووش، کاتێ یەکەم تیشکی خۆری بەیانی دەرکەوت، دادەکان دوای ئەوەی ناو حەوشەکەیان ڕادەماڵی، باڵندەکانیان هێنانە لای حەوزەکە. دانیان دانێ و لەحەوزەکەش ئاویان لەبەدەم دانان. ئەوسا ماچێکیان لە سەری باڵندەکان کرد و بەرەڵای ئاسمانیان کردن.
مەلەکانیش جارێک بەسەر مزگەوتەکەدا سووڕانەوە، پاشان بەرەو باشوور تیانتەقاند. ئەوان لەسەر فڕینەکەیان بەردەوامبوون تاکو بگەنەوە ڕەوەکەیان.
ئەگەر باڵندەکان لەسەر یەک فڕین بفڕن، ئەوا بۆ ئێوارەکەی دەگەنە کەنداوی فارس، لەوێ کەشەکە زۆر گەرمە و قرشە گەورەکانیش وەک بەلەمی نامۆ لەنێو ئاوەکەدا جرتوفرتیانە.

## جێنشین[44]

**لێوە تینووەکانم**
**بە دواتدا دەگەڕێن**
**دەی جلەکانم داکەنە**
**لە ئامێزم بگرە**
**ئەوەتە لێوەکانم**
**ئەوەتە گەردن و مەمکە گڕتێبەربووەکانم**
**ئەوەتە جەستە نەرمونۆڵەکەم**



دوای ئەوەی ئاغاجان ئەم پارچە شیعرەی هەندێ لە باخەڵ هەڵگرتبوو، پاشان لە چەکمەجەی مێزی نووسینگەکەی دانابوو. یەک دوو جار ویستی

[44] هەندێ لە ناونیشانی بەندەکان هەر وشەی فارسین و بە پیت و ڕێنووسی هۆڵەندی نوسراونەتەوە، ئەمەشیان بە جانشینی Djaneshinنووسراوە.

پارچە کاغەزەکە لوول بدا و فڕێی بداتە نێو سەلەی زبڵ، بەڵام دڵی بەرایی نەدا وابکا. هەرچەندە شیعرەکە لە شیعرە گوناحدارەکانیش بوو، کەچی شتێکی وا لەناخیدا چەکەرەی کرد، ناچاریکرد چەندین جار دووبارە و سێبارە بیخوێنێتەوە. بە پێچەوانەی ویستیش، شیعرەکەی دەرخ کردبوو، بەڵکو بتوانێ سەرلەبەری بەبێ کاغەز لەبەر بڵێتەوە.
ئەو دەیان پارچە شیعری کلاسیکی دەزانین و لەبەریشی بوون، بەڵام ئەم پارچە شیعرەیان جیاواز بوو، شیعرەکە کارێکی وایلێکرد، لێیجیانەدەبووەوە، وشەکانی نێو شیعرەکەی چەندین جار لەسەر لێوان دووپات دەکردنەوە. تۆ بڵێی چ ژنێک وێرابێتی ئەو شتانە بخاتە سەر کاغەز؟ تۆ بڵێی ناوی چی بێ؟



شاعیرەکەش ژن بوو، ناوی فەروخ فەروخزاد[٤٥] بوو. بەهۆی ئەمەوە لە تاران زۆر ناودار ببوو. ئەو ژنە گەنجێکی جوان بوو، بەهۆی ئەو کارە یەکەمینەی تووی چەند شتێکی ڕواند. یەکێ لە شیعرەکانی هەروەک بومەلەرزەیەک بوو لە دنیای دابونەریتی پیاوسالارییدا:

**سەیری چاوەکانم کرد**
**رازێکی تێدا شاردراوە**
**دڵم بەهۆی چاوە پرسنەکانی**
**کەوتە ترپەترپ**
**ئەڵلا ئەڵلا**
**لێوەکانی تاسەوپەرۆشی گرڕدا**
**بۆ لێوەکانم**
**منیش گوتم:**
**من دەمەوێیت**
**ئای خودایە، خۆ کەوتمە گوناح**
**جەستە ڕووتەکەم**
**لەنێو پێخەفە نەرمەکەدا کشا**
**کشا بەسەر سنگی ئەودا و**

---

[٤٥] Faroug Faroghzad

**لەیەکخشا**

هەنـدێک کەس شـاعیرەکەیان وەک ئەسـتێرەیەکی درەوشـاوەی ئاسـمانی شیعری فارسی دەزانی، ئەوانی دیکە بە قەحپەیەکیان دادەنا، کە جەستەکەی چۆن لەسەر پێخەف ئاواش لەسەر کاغەز دەفرۆشێ.

لە شاری قومیش یەکێ لە ئایەتوڵلاکان بە قورسی دابەزییە سەر ئەو دەزگای چاپ و پەخشـەی دیـوانە شـیعرە کفرییەکەی بـۆ چـاپکردووە. لە یەکـێ لە وتارەکانیدا، کە وەک بەڵگەیەک بەکاریهێنا، ئەوەبوو گوایە ڕژێم دەیەوێ لە ڕێی ئەم شێوازەوە ئیسلام لاواز بکا.

- "ئەوان ئافرەتـانی ئـێمە سـووک دەکەن،" ئـایەتوڵلاکە لە وتارەکەیـدا وای لەسـەر ڕۆیشـت: "بەمشـێوەیە چیـدیکە کیژەکانمـان لەم وڵاتە پـڕ گونـاحەدا پارێزراو نابن."

تاران سەبارەت بەو جۆرە وتار و دوانانە هەستیار نەبوو، چونکە ئەجێندای تایبەتی خۆی هەبوو. ڕۆژنامەکان پڕبوون لەو جۆرە شتە کفرئاسایانە، لە سینەماکانیشدا ئافرەتان بە خۆیان و مەمکی گەورە و قوت و جلی ژێرەوەی تەسکوتار دەردەکەوتن.

فەرەح دیباش ڕۆژانە مەڵبەندێکی کلتووری دەکردەوە، تیایدا کچان بە قاچی ڕووتەوە لە بەردەمیدا سـەمایان دەکـرد و ژنە گەنجەکـانیش لەسـەر سـەکۆ شیعریان دەربارەی جەستەیان بۆ دەخوێندنەوە.



ئاغاجـان کە تـازە پـارچە شـیعرەکەی فەروخـی خزانـدبووە ژێـر کاغەزەکـانی چەکمەجەی مێزەکەی، دیسان دەریهێنایەوە و لەبەرخۆیەوە گوتی: لەڕاسـتیدا ئەم پـارچە شـیعرە دەچێـتە ریـزی هەواڵنامەکـانی مزگەوتـێ، دەیـخەمە نێـو فایلەکەم.

لەوکاتەدا زەنگی دەرگاکەی لێدرا و پێشخزمەتچییێک هاتەژوور.

- "مەلایەکە لێرەیە، دەکرێ بێتە ژوور؟" کوڕەکە وای لێپرسی.

ئاغاجـان بیـریکەوتەوە، دیـدارێکی لەگەڵ جێنشـینێک، لەگەڵ مەلایەک کە هەمیشە پەنای بۆدەبرد تا بە شێوەیەکی کاتی جێگەی مەلای مزگەوتێی بۆ

پڕبکاتەوە. هەر زوو پارچە هۆنراوەکەی خستە نێو فایلەکەی، وەڵامی دایەوە:
"با بفەرموێ."
ئەوەش یەکەمین جار بوو، ئاغاجان لە دوکانەکەی نێو بازاڕدا پێشوازی لەم مەلایە بکا.
تەمەنی مەلایەکەش پەنجا ساڵێک دەبوو، لاجانگ و ڕیشەکەشی بۆز ببوو. لە ڕەفتارە لەسەرخۆیەکەی دیاربوو کە بەمەلای گوندان دەچوو.
"فەرموو دانیشە." ئاغاجان وایپێگوت، لەکاتێکدا ئاماژەی بۆ یەکێ لە کورسییەکانی بەردەم مێزەکەی کرد.
مامۆستا بە شێوەیەکی خاکیانە دانیشت و باسکەکانی خۆی خستە بن جبەکەی. پێشخزمەتەکەش لەسەر سینییەکی زیوین چایە و هەندێ چوکلاتی بۆ هێنان کە لە پاکەتێکی جوان و ڕەنگین دابوون.
مەلایەکە چوکلاتێکی هەڵگرت، دەمودەستیش خستیە دەمی و جویی.
مەلایەکە لە ژێر کاریگەری ئەو نووسینگە پاشایانەی ئاغاجان دابوو کە قەنەفەیەکی چەرمین، کورسی و مێزێکی کۆنینەی ئەنتیک و ئەو چلچرا کریستاڵەی بە نێوەڕاستی نووسینگە گەورەکەدا شۆڕبۆتەوە، هەمووی هی ئاغاجان بوو، ئەوەی بەگەورەی ماڵە مافوورچنەکانی شار و گوند دادەندرا.
هەرچی ئەوبوو، مەلای بنەڕەتی مزگەوتی گوندێکی شاخاوی، گوندی جیریا[٤٦] بوو.
دیاربوو ئاغاجان متمانەی بە مامۆستا هەبوو.
پێشتر، کە مەلا ئەلسابری نەخۆش دەکەوت یان دەچووە سەفەر، ئەو دەبووە جێنشینی، بەڵام هەڵبەت ئەوێ دەمێ هەر بۆ ماوەیەکی کورت جێگەی مەلا بنەڕەتییەکەی دەگرتەوە. لێ هەنووکە، کە مەلا خالخالی هەڵاتووە. پێدەچێ بۆ ماوەیەکی درێژتر بمێنێتەوە. ئاغاجانیش ڕاستەوخۆ دوای ڕاکردنی خالخالی جێبێکی بەدوادا ناردبوو، ئەویش دەمودەست لەگەڵ گەیشتنی پێشنوێژی عەسری بۆکردبوون.
لە کاتی مانەوەی دا، شەوی لە ژووری مێوانانی مزگەوتی بەسەر برد، بەڵام بەهۆی ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ وەک مەلای مزگەوتی دەمێنێتەوە،

---

[٤٦] Djirja

پێویستی بە جێوڕێ و پێداویستییەکانی دیکە هەبوو. هەر بۆیە ئاغاجان داوایلێکرد بێتە لای تا لەو بارەیەوە هەندێ گفتوگۆ بکەن.

- ئاغاجان لێیپرسی: "ئەرێ کاروبارت چۆنە؟"
- "باشم، ئەلحەمدولیلا."
- "ئەدی خێزانەکەت، ژن و منداڵەکانت، ئەوان پێیان ناخۆش نییە، کە ماوەیەکی زۆر لێیان دادەبڕیی و دووردەکەویەوە؟"
- "ژنان هەمیشە گلەیی و گازاندەیان هەیە، بەلام دەتوانم ئەوە ڕێکبخەم کە بەردەوام لەهەفتەدا ڕۆژێک سەریان بدەم."
- "تۆ لە مزگەوتەکە ڕازی؟"
- "بەڵێ، ئەگەر تۆ ڕازی بی، من ڕازیم."
- "من بەخۆم ڕازیم."

لەو کاتەدا لەدەرگاکە درا.

"فەرمو وەرە ژوور."

لەو کاتەدا حەفت پیاو بە خۆیان و چاویلکە و جلی کارەوە لێوەژوور کەوتن. دیاربوو دەستەکانیان بە بۆیە ڕەنگین ببوون. پیاوە هەرە بەتەمەنەکەیان کاغەزێکی لوولدراوی کردەوە، لەسەر مێزەکە داینا، شتەکەش نەخشەی مافوورێکی لەسەر کێشرابوو، ئینجا گوتی: "ئەمە بەرەنجامی یەکەمە؛ دەبینی ڕەنگە بنەوشەییەکە وەک هێڵێکی تەماوی لەسەر تابلۆکە شەوقی داوەتەوە، بەلام پێمان وایە کاتێ دەچێتە سەر مافوورەکە و دەچنرێ جوانتر و ڕازاوەتر دەردەکەوێ."

ئاغاجان لە نیگارەکە وردبووەوە، لەکاتێکدا هەر حەفت پیاوەکە وەک ئەو سەریان بەسەر نیگارەکەدا کێشابوو، لێیەوە ڕامابوون.

- "مایەی سەرسوڕمانە، من ئەمەم ڕەچاونەکردبوو!" ئاغاجان وای پێگوتن. "کتومت وەک ئەوشتەی لێهاتووە کە دەمەویست. من نامەوێ زیاتر چاوەڕوان بم، ئەگەر ئێوە لێبوونەوە ئەوا هەر دوای نیوەڕۆ دەمەوێ تۆماریبکەن و دەستپێبکەن. ئایا دەتوانن؟"
- "ئێمە هەموو توانای خۆمان بەکاردێنین." پیاوەکان وایانگوت و لە نووسینگەکەش چوونەدەر.

- "تکایە لێم مەگرە،" ئاغاجان رویکردەوە مەلای مێوان: "من چەندین هەفتەیە بە تامەزرۆوە چاوەڕێی ئەو نەخشەیە دەکەم. ئەو حەفت پیاوە نیگار کێشەکانی منن. ئەوانە نەخشە داڕێژەری مافوورە ڕەسەنەکانن. ئەوانەوە جادوبازن. ئەوانە لە هەموو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا ناسراون. ئەو مافوورانەی بەدەستی ئەوانە نەخشەونیگاری بۆ دەکێشرێ، بەزێڕ دەقەبلێندرێ. زۆر باشە، بابگەڕێینەوە سەر باسەکەمان. کەواتە تۆ دەتەوێ ماوەیەکی زۆرتر لەلامان بمێنیتەوە؟"

- "بەڵێ."

- خۆت دەزانی لەوانەیە ساڵێک یان دوو ساڵی پێبچێ، چونکە کوڕەکەی مەلا ئەلسابری هێشتا لە خوێندنی مەلایەتی تەواو نەبووە."

- "ئەمە دەزانم، من ئەمە بە دەرفەتێکی جوان دادەنێم. هەمیشە ویستوومە ببمە مەلایەکی جێگیری مزگەوتێکی شار، بەلام تا ئێستا ئەمەم بۆ نەچۆتەسەر تا سەرپەرشتی مزگەوتێکی شار بکەم. هەربۆیە بەم دەرفەت و بۆنەیە زۆر خۆشحاڵم، بەلام خۆ ئەم کارەشم بەبێ کۆمەکی ئێوە پێناکرێ."

- "لەو بارەیەوە هیچ خەمت نەبێ، من یارمەتیت دەدەم."

- "بەخۆشییەوە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم، وتار و دوانی گوند زۆر جیاوازترە لە وتار و دوانی مزگەوتی شار. لە گوندا باسی شتی بچکۆلانە، باسی چێڵ و مانگا، بارەبەر و ئەو جۆرە شتانە دەکرێ. کەچی لەشاردا دەبێ باسی شتی گەورە و قەبە بکرێ، بۆنموونە دەبێ باسی کاروباری سیاسییانە بکرێ. منیش تاسەمەندم تا دەربارەی ئەو باسوخواسانە بدوێم، بۆنەوەی لە بەرامبەر خەڵکی گرنگی مزگەوتێ، قسەی بەهێز و مەحکەم بکەم. من بەخۆشحاڵییەوە دەمەوێ هەندێ توندتر لەجاران بدوێم، من دەمەوێ گوێگرەکانم بە پەرۆش و سەرنجەوە گوێم لێڕابگرن."

ئاغاجان خەندە دایگرت، ئەو لەمەبەستەکەی مامۆستا تێگەیشت، بەلام ڕاستییەکەی ئەو، ئەو شتەی تێدا نەدەدی. ئەو هەڵسوکەوتێکی لەبار و گونجاوانەی نەبوو، نە ڕستە و برگەی ڕێکوپێک و ڕەوانبێژیانە و نە ئەو کاریزما پێویستە و شایستەیشی هەبوو. ئەو مەلایەکی گوند، خاوەن دوو

لەپی پان و گەورە و تەویلێکی دریژ بوو. تۆ هەردەبێ خالخالیت ناوبێ تا پیرە پیاو ژنە گەنجەکان لەدەوری خۆتدا کۆبکەیتەوە و بۆ خۆتیان رابکێشی.
- "ئەمشێوەیە بە خۆی جێبەجێ دەبێ." ئاغاجان وای پێگوتەوە؛ "بەلام من وا بە سەغلەتی نابینم، لەو رۆژگارە شێواوەدا و دوای مردنی مەلا ئەلسابری و هەلاتنی خالخالی ئارامی بۆ مزگەوتێ بگەرێتەوە. ئێوە بە ئاسوودەییەوە دەتوانن لێرەش لە شاردا دەربارەی دارودرەخت، دەربارەی چاندن و ئەزموونی لادێ بدوێن، لێرە، لە شار زۆریان حەز بەو جۆررە بابەتانە هەیە. خۆت ئاسایی بنوێنە، ئینجا دەبینی هەموو شتێک بە رێکی دێتەوە."
مەلایەکەش بزەیەکی کرد و سەری بەسەر سینگدا شۆرکردەوە.
- "بە راستی من ئەوەی گوتم مەبەستمە." ئاغاجان وایپێگوتەوە؛ "من بەتاسەوەم ئاخۆ تۆ بۆ شەوی پێنجشەممە باسی چی دەکەی. بۆنموونە باسی گوندی جیریا بکە، باسی کێوەکان، باسی داری بادام بکە، باسی بزنە کێوی و زەعفەران بکە. گەر هەر پرسیاریکیشت هەبوو، هەمیشە لە رێی مجێورەکەوە دەتوانی بمبینیەوە. وێرای ئەوەش، داوام لێکردووە کەلوپەلی پێویستی مانەوەت بۆ دابینبکا. باشە لەوە زیاتر، شتێ دیکەت هەیە، پێویست بکا بیزانی؟"
- "نەخێر، لە راستیدا هیچی دیکە نییە."
پێشخزمەتەکە هات و یاوەری مامۆستای کرد و لە وێی بردەدەر.



بۆ شەوەکەی، کاتێ ئاغاجان لە گەل فەخری سادات چووە ناو پێخەفەکەی، هەر لەخۆیەوە بە دەنگێکی بەرز لە قاقای پێکەنینی دا.
- "ئەوە چییە؟" فەخری سادات وایلێپرسی.
- "هیچ نییە، نەخێر هیچ. بیرم لە مەلا جێگرەوەکە دەکردەوە. ئەو کەسێکی سادەیە، کەچی مجێزبەرز و بالافرە، بەلام ئەوەندە هەیە نازانێ چۆن خەونەکانی بەدیبێنێ."
- "سا تۆ لەبەر ئەوە پێدەکەنێ؟"
- "نەخێر، بەرەهایی نا، من ئەوەی بەرز دەنرخێنم کە شتی زیاتری بوێ. هەر ئەوەیە دەست و ماسوولکەکانی قەبەو زبرن."

- "تۆ نابێ ئەو قسەیە بکەی!" فەخری سادات بە پێکەنینەوە وایپێگوت.
- "بەڵێ ڕاست دەکەی، لێ من لە ئەزموونی ژیانی خۆمەوە وادەڵێم، تۆ دەبێ شتێکت لەناخدا هەبێ، بەتەنها قاڵب بەس نییە، دەبێ گیانێک ئەو قاڵبە ببزوێنێ. لەوە زیاتر شتێکی دیکە ناڵێم، بەڵام ئاخۆ دەزانی، ئەو مێزەرەکەی هەندێ لار بەستبوو و گوتی: "من دەمەوێ هەندێ وتاری توندتر بدەم." ئاغاجان ئەمەی بە پێکەنینێکی توندەوە گوت.
- "پەککو، تۆ پێی پێدەکەنی." فەخری ساداتیش وا وەڵامی دایەوە.
- "نەخێر، من هەرگیز بەو پێناکەنم، من هەست دەکەم هەندێ بەختەوەرم، هەموو شتێک بەگوێرەی مراز و داخواز دەڕوا. مزگەوت حاڵی باشە، مەلایەکەش شیاوە، هەرچی کارخانەو بازاڕیشە باشە و هەواڵی نوێش لە نەخشەکێشانی مافوورەوە هەیە، بەڕاستی نیگارەکان نایاب دەرچوون. من کۆمەڵە گرێبەستێکی نوێم دەستکەوتن و بازاڕیش بە تاسەوە چاوەڕێی مافوورە نوێکانە. هەمووان دەیانەوێ ئەو مافوورانەیان هەبێ، ساڵەکە ساڵێکی خۆش دەبێ. لەوەش زیاتر هەموویان ساغ و سەلامەتن، لەوە زیاتر چیدیکەت دەوێ؟"
ئاغاجان خۆی وەرسووڕاندەوە و دەستێکی لەسەر سینگ و مەمکەکانی فەخری سادات دانا و گوتی: "منیش تۆم هەیە، ئێستاش حەزم لێتە، ئەوسا من وەک پیاوێک لەوە زیاتر چیم بوێ؟"
فەخری ساداتیش بە نەرمی دەستی مێردەکەی لەسەر سنگی خۆی لابرد، ئینجا ئەویش خۆی وەسووڕاندەوە و لەسەرلا پشتی لە ئاغاجان کرد. لێ ئەو وازی نەهێنا، دەستی بەبن ئاوەڵکراسەکەیدا برد و سمتی گرت و بە نەرمونیانیەوە پێیگوت: هەموو جلەکانت داکەنە، دەمەوێ ڕووت ڕووت ببیەوە."
فەخری ساداتیش پەتۆکەی بەسەر سەر دادا و گوتی: "ئەرێ ئەوە تۆ شێت بووی، تۆ بڵێی پیاوەکەم چی خواردبێ، ئاوا بیەوێ بە ڕووتی بمبینێ؟"
ئەویش دەستەکانی بۆ نێو ڕانە گەرمەکانی برد و بەسرتەوە پێیگوت:
**"لێوە تینووەکانم**
**بە دواتدا دەگەڕێن**

دەی جلەکانم داکەنە
لە ئامێزم بگرە
ئەوەتا لێوەکانم
ئەوەتە گەردن و مەمکە گرگرتووەکانم
ئەوەتە جەستە نەرمونۆڵەکەم."

- "ئەوە چی دەڵێی؟" فەخری سادات ئەمەی بە واقورماوییەوە گوت و پەتۆکەی لەسەر خۆی لادا و لەسەر پێخەفەکە قنج دانیشت.
- "ئەوە شیعری نوێیە،" مێردەکەی وای وەڵام دایەوە، ئەوسا کەوتە ماچوموچ، گەردنی راموسی و بە هێواشی جلەکانی لەبەر داکەندن و یارمەتیدا تا لەسەر پشت پاڵ بکەوێ و ئەوەشی چرپاندە گوێ: "من ئەو شیعرەت بۆ دەڵێم، دەی تۆش بۆم دووبارە دەکەیتەوە؟"
- "من ئەوە ناکەم، تۆ دەمترسێنی، ئەرێ تۆ چیت دەوێ؟"
- "من تۆم دەوێ."

ئیدی فەخری سادات چاوەکانی نوقاندن.

**زینەت**

"خودا ئەوەی ئافەریدی کردووە، خۆشویست. ئەو ئەستێرەکان، ڕێگای کاکێشان، ڕۆژ و مانگ و بەتایبەتی زەمینە جوانەکەی خۆی خۆشویست.
ئەو زۆر شانازی بە زەوی دەکرد، بە شێوەیەک حەزی لێبوو هەر لەوێدا بژی، بەڵام چۆن، ئاخر چۆن دەبێ ئەو لەسەر خاکی سەر زەویدا بژی؟
لە شەوێکدا  شتێکی زۆر جوانی بۆهات.
داوای لە جوبرائیلی تەتەر کرد، دابەزێتە سەر زەوی و هەندێ قوڕی بۆ بێنێ.
جوبرائیلیش بەرئەمرانە قوڕەکەی هێنا.
خودا مرۆڤی ئافەریدەکرد. کتومت وەک ئەو شێوەیەی خۆی دەیەویست.
ئینجا هەر خودا داوای لە گیان کرد بچێتە نێو قالبی مرۆڤەکە. گیانیش داواکەی ڕەت کردەوە. ئاخر گیان پێگەی خۆی بە بالاتر دەزانی، حەزی لێنەبوو بچێتە نێو جەستەی شتێک، کە لە قوڕ دروستکرابێ.

خودا جوبرائیلی وەک ناوبژیکار دەستنیشان کرد.
جوبرائیلیش گوتی: "دەی برۆ نێو ئەم جەستەیە!"
گیان دیسان ڕەتی کردەوە.
"بەناوی ئەوەوە برۆ نێو ئەم جەستەیە!" جوبرائیل وای پێگوتەوە.
"ئیدی کە ناوی ئەوت هێنا، دەچمە نێو جەستەکە." گیانەکەش وای وەلام دایەوە.
بەنابەدڵی گیان چووە نێو جەستەی شتە ئافەریدەکراوەکە. کاتێکیش گیانەکە لە سنگی مرۆڤەکە ڕەت بوو، ئیدی لە ناکاوەوە مرۆڤ پەیدابوو. بەلام ئەو هێشتا هاوسەنگی خۆی پێڕانەدەگیرا و کەوت.
"ئاخر ئەو هەدادان ناناسێ." خودا بە بزەیەکەوە وای بە جوبرائیل گوت.
ئیدی مرۆڤەکە ناوی لێنرا: ئادەم!
ئادەمیش حەفت ڕۆژی ڕەبەق لەو شوێنەی لێیدروستکرا لە چاوەڕوانیدا مایەوە. پاشان خوا کورسییەکی ئالتوونی ڕەنگ سووری کە بە دوڕ و گەوهەر ڕازابووەوە، بۆ نارد. بۆ ئادەم بەرگێکی ئاوریشم و تاجێکیش داندرا.
ئادەم جلەکانی پۆشین و تاجەکەشی لەسەر ناو، قیت لەسەر کورسیەکەش دانیشت.
ئینجا فریشتەکان ئادەمیان بە کورسییەکەوە بەسەر شان هەلگرت و بردیان بردیان تا گەیاندیانە سەر زەوی.
تا ئەوێ دەمێ هەزار و دووسەد و چل سال بەسەر ئافەریدەکردنی بوونەوەرەکە تێپەڕیبوو."



ئەوەش ئەو هەقایەتە بوو، زینەت لە شەوانی چوارشەمەدا بە شێوەیەکی جادووبازانە بۆ هەموو ئەندامە گردبووەکانی خانەوادەکەی دەگێڕایەوە.

هەموو شەوانی چوارشەمموان شەوی گێڕانەوەی چیرۆک و هەقایەتەکان بوو. ئیدی ئاکنجییەکانی مال هەموویان لە ژووری خواردن کۆدەبوونەوە و گوێیان لە هەقایەتەکانی زینەت دەگرت.

دادەکانیش لەو شەوانەدا گوێز و بادەمیان دابەش دەکرد و گلۆپەکانیان دەکوژاندەوە و چەند مۆمێکیان لەبری پێدەکرد.
زینەت خانم دیاربوو وەک هەقایەتخوانێک لە دایک ببوو. دەنگە گەرم و بەسۆزەکەی کە لە گەرووی دەهاتەدەر، بەرامبەرەکەی ناچار دەکرد دانیشێ و گوێی لێبگرێ. ئەویش هەقایەت و چیرۆکی کتێبە دێرینەکانی دەگێڕانەوە، نەخاسمە ئەو جۆرە کتێبانەی بە دووروودرێژی ڕاڤەی دەقەکانی قورئانیان کردبوو. ئاخر قورئان کتێبێکی سەنگین و هێماداره، لە چیرۆکەکانیدا هەرگیز وردەکارییەکان باسنەکراون. هەر بۆیەشە زۆر کتێب دەربارەی ئەو چیرۆکە ئاماژە و هێماداره بە وردەکاری و دووروودرێژییەوە نووسراون، زینەتیش گێڕانەوەکانی خۆی لەو جۆرە کتێبانەوە هەڵدەهێنجا.

خۆ ئەگەر بە شێوەیەکی ئاسایی قسە لەسەر زینەت بکەین، ئەو ژنێکی ئارام و گۆشەگیر بوو. کەس نەیدەزانی ئاخۆ ئەو، ئەو هەموو چیرۆکانە دەزانی وا جوان بیانگێڕێتەوە. تا لەپڕ و لە خۆیەوە، لەبەر کورتە چیرۆکێکی بۆ یەک دوو منداڵ گێڕابووەوە.
دوای ئەوەی عەباسی کوڕی لە حەوزەکەدا خنکا، زینەت وەک لە خەڵوەت بێ خۆی کێشایە کونجی ژوورەکەی. دوای ئەوەی بە سەدیقە دووگیان بوو، ئینجا هاتەدەر و لەنێو حەوشەکەدا دەبیندرا. ئەوسا دەچووە ناندینەکە و کۆمەکی دادەکانی دەکرد.
دوای لە دایکبوونی سەدیقەش، دەترسا نەبادا چیدیکە بتوانێ خەوی لێبکەوێ. دادەکانیش ئەوێ دەمێ هەمیشە لە لای بوون یان لەدەوروبەری نزیک بوون. ئەوان پشتوپەنای ڕاستەقینەی زینەت بوون. ئەوان لە ژوورسەری دەمانەوە تا خەوی لێدەکەوت.
کاتێکیش ئەحمەدی بوو، دیسان ترسەکەی بۆگەڕایەوە. ڕۆژێکیان زینەت ئەحمەدی ساوای لە کۆشی گوڵبانو دانابوو، پێشی گوت: "ئاگاداربە! من دەترسم ئەمەشیانم لە دەست بچێ. من وا دەچمە مزگەوتێ، پێویستم بە نوێژکردن و پاڕانەوەیە."
لەو کاتەوە زینەت هەموو ڕۆژێ بە بڕواوە دەچووە مزگەوتێ.



کاتێ هێشتا مەلا ئەلسابری لە ژیاندا مابوو، خۆی کێشابووە کونجی حوجرەکەی و هیچ خۆی لە کاروباری ژیانی ژنەکەی و منداڵەکانی هەڵنەدەقورتاند.

منداڵەکانی زینەت ئاغاجانیان وەک پیاوی ماڵێ دەبینی، هەر بۆیەشە هەرهەموویان بە باوکی خۆیان دادەنا.

دوای مەرگی ئەلسابریش، هەمیشە زینەت کاتی خۆی لەمزگەوتێدا بەسەر دەبرد. هەموویان وایان دەزانی، زینەت لە حوجرەی مزگەوتێ لە لای کتێبەکان لەخەڵوەتدابوو تا قەرەبووی لە دەستدانی مێردەکەی بکاتەوە، وەلێ لە ڕاستیدا ئەو بۆیە دەچووە ئەوێ، تا قۆناخێکی نوێی لەژیان دەستپێبکا.

سەرەتا زۆر جاران ئەو بە تەنیا لەمزگەوتێی بەسەردەبرد، بەڵام دواتر پەیوەندی لەگەڵ چەند ئافرەتێکی دیندار پەیداکرد و گردبوونەوەی ئۆلییانەیان دەبەست.



شتەکە وا پێدەچوو، دوای مردنی مێردەکەی، ڕەوشێکی نامۆ بەسەر زینەت خانمدا هاتبێ. ئیدی ئەو لەپڕ لەشتێک ئازاد ببوو، بەڵام ئەو شتە چیبوو، کەس لەو بارەوە هیچی لێهەڵنەدەکڕاند.

پێشتر هەستی بە خۆی دەکرد وەک مێزڵدانێک وایە کە داوەکەی ڕابکێشرێ و لە چڵەدارێک بەستراببێتەوە، بەڵام ئێستا هەستی دەکرد، لە پڕێکەوە لە چڵەدارەکە بەربووە و خەریکە بەرەو بۆشایی ئاسمان هەڵدەکشێ. ئەمەش هەستێکی خۆش بوو بۆی، لێ لەهەمان کاتیشدا لێیدەترسا. کاتێکیش پشووی هاوین دادەهات، پەلی منداڵەکانی دەگرت، بە ئاسوودەیی و ئارامی خۆی لە ماڵە گەورەکەی دایبابی لە شاخەکان دەبینییەوە.



زینەت هەرگیز سەیری مەلا ئەلسابری وەک پیاوێکی ڕاستەقینە نەدەکرد، وەک مێردێکشی نەدەبینی. ئەو زیاتر مەلای مزگەوتێ بوو لەوەی باوکی ئەندامانی خێزانەکەی بێ.

کاتێکیش زینەت هاوسەرایەتی خۆی لەگەڵ یەکێکی وەک فەخری ساداتدا بەراورد دەکرد، زینەت هیچ ژیانێکی خێزانی و هاوسەرایەتی نەبوو. ئەو زیاتر ژنێک بوو کە کوڕێک، جێگرەوەیەکی بۆ ماڵەکە هێنابێتە بوون.
فەخری ساداتیش ئاغاجانی هەبوو، ئیدی ئەو ژیانی ڕاستەقینەی هەبوو. زینەت لە نهۆمی سەرەوەی خانووەکەدا دەژیا. درەنگانی شەو، کاتێ بەلای ژوورەکەی فەخری ساداتدا تێدەپەڕی، لەبەر تیشکە زەردەکەی گڵۆپی شەوان دەیبینی هەمیشە ئاغاجان لە تەنیشت فەخریەوەیە. هەندێ جارانیش بەشەو گوێی لە قرتەقرتی پێکەنینی فەخری سادات دەبوو.
بەڵام خۆ مەلا ئەلسابری هەرگیز لە پاڵ زینەت پاڵی نەدەدایەوە. ئەو تەنها ئەوکاتە لەگەڵ زینەتدا دەخەوت، کە پێویستی پێبووایە. خۆ ئەلسابری لەو سەرجێیەشدا زۆر جاران پێویستی پێ نەبوو.
دوای لە دایکبوونی ئەحمەدی کوڕیشیان، ئیدی مەلا ئەلسابری هەرگیز تخونی زینەت نەکەوتەوە.



زینەت ئەوەی قبووڵ بوو کە فەخری سادات سەرەژنی ماڵەوەیە. ئاخر فەخری لە هەموو لایەکەوە بە ژنە دەوڵەمەند و بازرگان و دوکاندارەکان دەورەدرابوو، هەروەک بڵێی شازادە خاتوونێک بێ وابوو، لەو نێوەشدا کەس بایەخی بە زینەت نەدەدا و لایی لێنەکردەوە.
فەخری ئەو خانمە بوو کە باڵندەکانی دەگرتن. ئاخر ئەو خێزانی ئەو پیاوەبوو کە بەیەکەوە نهێنی نەخشونیگارەکانی سەر مافوورەکانیان دەزانی. بەڵام خۆ دەبووایە زینەت هەر لە نانەدین بێ و ئیشوکارەکانی ئەوێ بەڕێ بکا.



ئیدی ڕەوش بەمچەشنە ڕۆیشت و هەموو شتێکیش لە دەرەوەی خواستی زینەتدا بەڕێوە دەچوو. زینەتیش ملکەچ بوو، سەلوا و دڵنەوایی خۆی لە نێو مزگەوت و لە نوێژەکاندا دەبینیەوە. لێ ئەوەشی دەزانی، ژیان بۆ هەمیشە و هەتاهەتایە وا بەڕێوە ناڕوا. ئەو دەیزانی دەبێ ڕۆژێک بێ ئەویش نمایش و

کاری خۆی هەبێ و لەنێو ناوان دەربکەوێ. ئەوسا هەمووان پەنجەی بۆ ڕادێرن و بڵێن: "تەماشا تەماشا، ئەوە زینەت لەوێیە."
کاتێکیش زینەت دەچووە کۆبوونەوە دینییەکان، سەرەتا هەروەک قوتابییێک بەشدار دەبوو، پاشان وردە وردە توانی ئەڵقەیەک لە ئافرەتان لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە. ئەویش زیاتر و زیاتر بایەخی بەو ئافرەتانەی لە دەورەیدا بوون، دەدا و دەقە ئۆلییەکانی بۆ شیتەڵ دەکردنەوە.
بەم کارەشی بووە جێمتمانەی ژنەکان. ژنان گوێیان لێدەگرت و ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانیشیان پەیڕەودەکرد.

زینەتیش بەو پێگە نوێیەی دڵشاد بوو، بەڵام هێشتا ئاسوودەییە ڕەها و تەواوعەیاریەکەی نەدۆزیبووەوە. ئەو هێشتا بە دوای شتێکدا دەگەڕا.
لە دوای نیوەڕۆیەکدا، دوای ئەوەی لە گەرماو بۆ ماڵ دەگەڕایەوە، یەکسەر سەری بە مزگەوتێدا کرد. کاتەکە درەنگ بوو، لەو ساتەوەختەشدا کەسی لێنەبوو. ئیدی ئەویش بەنێو نوێژگا چۆڵەکەدا ڕۆیشت دواتر گەڕایەوە ماڵێ. لەسەر حەوزەکە دەستەکانی شوشتن و یەک دوو شەقە ئاویشی بە دەموچاوی خۆیدا کردن.
باشە تۆ بڵێی ئەو بەو دوا نیوەڕۆیە درەنگە لە مزگەوتێ چیدەکرد، ئاخر خۆ هێشتا زۆری بۆ کاتی نوێژی مەغریب مابوو؟ باشە بۆچی دەست و دەموچاوی لە لای حەوزەکەدا شوشت؟ خۆ پێشتر شتی وای نەکردبوو، لە ڕۆژگارێکیشدا مێردەکەی مەلای مزگەوتێ بوو، ئەم ڕەفتارەی نەنواندبوو. سەرباری ئەوەش، ئەو تازە لە حەمام گەڕاوەتەوە و دەست و دەموچاو شوشتن هەر پێویست نەبوو.
مەلا جێگرەوەکەش کە لە مزگەوتێ مابۆوە، هاتەدەر. زینەت گوێی لێبوو لەپشتیەوە دەرکەوت. زینەت هێدمەی گرت.
- "سەلامون عەلەیکوم، زینەت خانم!" مەلاکە وای سڵاو لێکرد.
زینەتیش بەبێ ئەوەی ئاوڕی لێبداتەوە وەڵامی سەلامەکەی دایەوە. ئیدی ڕووبەندی بەسەر دەموچاو دادایەوە تێیتەقاند و لەوێ ڕۆیشت، ئەو ویستی لە هەستی گوناحکردن ڕابکا، چووەدەر و کەوتە سەر شەقامە جەنجاڵەکە.



دوێنێ شەو کاتێ زینەت چووە ناو پێخەفەکەی و لێی ڕاکشا، بەبێ نیاز بیری لە مەلا جێگرەوەکە کردەوە.

زۆر جار بیری لە مەلاکە دەکردەوە، بەلام ئەم جارەیان بیرکردنەوە شتێکی دیکە بوو، هەستێکی بەهێز بوو، هەرگیز پێشتر شتێکی وای بە خۆیەوە نەبینیبوو. ئەوە یەکەمین جارە بەم چەشنە بیر لە پیاوێکی دیکە بکاتەوە. لە تەمەنی شانزە سالّیەوە ئەلسابری تاکە پیاو بوو لە ژیانی ئەودا. هەموو ژیانیشی هەر بۆ ئەو تەرخانکردبوو، هەر بیریشی لە پیاوەکانی دیکە نەدەکردەوە. بۆ ئەوەی ئەو بیرکردنەوەی خۆی لە مێشکی دەربکا، پەتۆکەی بەسەر سەر دادا، لەسەر زمانیش منگەمنگێکی لێوەهات:

قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ النَّاس (١)
مَلِكِ النَّاس (٢)
إلهِ النَّاس (٣)
بێژە من خۆم دەپارێزم بەخودانی ئەم مەردمە،
فەرمانڕەوای ئەم مەردمە،
خودا(گەورە)ی ئەم مەردمە
بمپارێزە
بمپارێزە
بمپارێزە
مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاس الْخَنَّاس (٤)
الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُور النَّاس (٥)

لەبەلای وازوازی هێنی خۆپەنادەر
ئەوەی دلّی ئەم مەردمە کرمێ دەکا
ئەو جنۆکەیەکە
ئەو جنۆکەیەکە
ئەو جنۆکەیەکە
ئەی گەورەی ئەم مەردمە

**بمپارێزە، بمپارێزە.**



بەلام کاتێکیش بە بێدەنگی لێراکشا، دیسان مەلا جێگرەوەکە بە خەیاڵ هاتەوە لای و لە تەنیشتی دانیشت. مەلایەکە سەیرێکی زینەتی کرد. سێرەی چاوەکانی مامۆستا لەسەر ڕووخساری زینەت هاتەخوار و گواسترایەوە سەر سینگ و مەمکەکانی.

بە شێوەیەک سەیری کرد، پێشتر هەرگیز مەلا ئەلسابریش بەوجۆرە تەماشای نەکردبوو.

زینەت بە باسکەکانی هەدوو مەمکەکانی داپۆشین. منگەمنگێکیشی لەسەر زمانەوە هات، منگەمنگەکە پێدەچوو خوێندنەوەی پارچە شیعرێک بێ، شتێک ڕاستەوخۆ لەناخی دڵەوە هەلقولابێ. هەرچەندە ئەو هیچی لەبارەی شیعر و هۆنراوەی ئافرەتان، کە تازە بە هۆیەوە تارانی سەراوبن کردبوو، نەدەزانی؛ لێ ئەوانە شیعرگەلێک بوون لە هەستەکانی جەستەدا چەکەرەیان کردبوو، سەریان دەرهێنا. دەنا دەبووایە ڕاستەوخۆ غاری دابایە لای مێزەکە، دەستی بۆ خامە بردبا و لەسەر کاغەز دەقنووسی کردبووایە:

**یەکێک بەڕێوەیە**

**یەکێک سەیرم دەکا**

**ئەو دەپرسێ:**

**ئەرێ دەکرێ سەرپۆشەکەت**

**بۆمن فڕێ دەی؟**

**ئەرێ دەکرێ لێبگەڕێی**

**ڕووخسارت ببینم؟**

زینەت کتومت نەیدەزانی ئاخۆ لە کەیەوە مەلا جێگرەوەکە پەڕیوەتەوە نێو هزر و خەیاڵەکانی. ئاخر خۆ زینەت پەیوەندی بە مەلاکەوە هەبوو، دەربارەی دەقە دینییەکان قسەی لەگەڵ کردبوو، داوای پرس و ڕای سەبارەت بە پرسیاری ئەو ژنانە لێکردبوو، کە پێشتر لە زینەتیان کردبوو. ئەویش ئەوکات هیچ وەلامێکی بۆ پێنەبوو، بۆیە، بۆ وەلامەکان دەهاتە لای مامۆستا. مەلاش

دوای نوێژکردن پێشوازی لە زینەت کرد، قسەی لەگەڵدا کرد و ئامۆژگاری کرد و وەلامی  پرسە بێ وەلامەکانیشی دابۆوە.
زۆر جارانیش لە دەرەوە تووشی یەکدی دەهاتن، هەر کاتێکیش مەلایەکە بە تەنها بهاتبایە نێو مزگەوتێ، لەو نێوەدا پیاسەیەکی دەکرد و جگەرەیەکی دەکێشا.
وەنەبێ زینەتیش بەخواست لەمەلایەکە بگەڕێ، بەڵکو هەر بەرێکەوت تووشی دەبوو، ئەوەش وەک ئەوە وابوو، کە مەلا بزانێ ئاخۆ کەی زینەت دەچێتە مزگەوتێ. چونکە هەرکاتێ زینەت بەیەکێ لە ڕاڕەوە تاریکەکانی بەرەو نێو مزگەوتێ دەڕۆیشت، ڕاستەوخۆ زینەت مەلای لە بەردەمدا قیت دەبووەوە.



هەندێک جاریش، کاتێ زینەت بە بەردەم ژووری مەلایەکە تێدەپەڕی، دەیبینی دەرگاکە دانەخراوە، ئیدی لە درزی قاپیەکەوە دەیبینی، مامۆستا بە سەرکۆتی لەسەر کورسیەکە دانیشتووە و خەریکی خوێندنەوەی قورئانە. زینەت نەیدەویست سەیری نێو هۆدەکەی مەلا بکا، بەلام دەرەقەتی هەستەکانیشی نەدەهات کە سەیری نەکا، ئیدی نیگایەکی هەر تێدەبڕێ و لە پڕیش چاویان بەیەک هەڵدەنگووت. زینەت هەستێکی وای هەبوو، کە مامۆستا هەر لەبەر خاتری ئەو، دەرگاکەکەی تەواو پێوەنەداوە.
هەڵبەتە، دەکرا زینەت لەگەڵیدا بکەوێتە قسە، چونکە ئەو هەنووکە مەلای مزگەوتییە و جێنشینی مەلا ئەلسابری و چاوەڕێی تەواوبوونی خوێندنی مەلایەتی ئەحمەدی کوڕیشی دەکا. بۆیە هیچ ناستەنگیێکی لەو بوارەدا لەپێشدا نەبوو.
هەر بەتەنها زینەتیش نەبوو کە بچێتە ژوورەکەی مەلای نوێ، ئافرەتانی دیکەش هاموشۆیان دەکرد.
ئەوەش ئەرکێکی مەلای مزگەوتێ بوو، لە حوجرەکەیدا پێشوازی لە ژنان بکا، گوێیان لێبگرێ و ئامۆژگارییان بکا.
بەلام لە دیداری دووهەمی نێوانیاندا، زینەت سەرنجی ئەوەی دا، کە مامۆستا بۆنێکی تایبەتی  لەخۆی داوە، بۆنەکەش بە بۆنی مەککە دەناسرا. زینەت بۆنەکەی ناسییەوە، چونکە مەلا خوالێخۆشبووی مێردیشی، شوشە گوڵاوێکی

وای لە مەککە لەگەڵ خۆی هێنابووەوە. ئەوەش ئەو جۆرە بۆنە بوو، مرۆ تەنها بۆ بۆنە تایبەتیەکان لەخۆی دەدا.
مەلایەکە لەسەر کورسی و مێزی خۆی دانیشتبوو. زینەتیش لەبەردەمیدا دانیشت و دەرگاکەش به تەواوی دانەخرابوو، لەسەر درزبوو. ئەوەش دابێک بوو کە دەرکاگە هێندێکی بکرێتەوە تا بۆ ئەوانەی دەرەوە بزانرێ، کە ئافرەتێک لە لای مامۆستا دانیشتووە.
ژنەکانیش هەمیشە هەر باسی کێشە و ئاریشە تایبەتییەکانی خۆیان لەگەڵ مەلای مزگەوتێدا دەکرد، ئەوان شتگەلێکی وایان بۆ مەلا باس دەکرد، تەنانەت ئەو جۆرە باسانەیان نە لەگەڵ مێردەکانییان و نە لەگەڵ پزیشکەکانیشیان نەدەهێنانە گۆڕێ، بەلام خۆ زینەت بۆ ئەوە نەهاتبوو، بەڵکو بۆ ئەوە هاتبوو چەند دەقێکی قورئان، کە لێیان تێنەدەگەیشت، مامۆستا بۆی ڕاڤەبکا.



لە ئێوارەیەکی دیکەدا و دوای لە نوێژبوونەوە، زینەت سەردانی مەلای لە حوجرەکەی خۆیدا کرد، تا لەبارەی چەند ئایەتێکی سورەتی "العادیات"ەوە بدوێن. ئاخر زینەت لەو سورەتە نەدەگەیشت. بەلام بڕوای وابوو، هەستی دەکرد شتێکی قووڵ، شتێکی رازپارێز لەبن سەری ئەو دەقەوە هەیە کە لێی تێنەدەگەیشت و پەی بە واتای نێو ئایەتەکان نەدەبرد.
کاتێکیش مامۆستا هەر وەک جاران، ئاساییانە جێگەی خۆی لە بەرامبەر زینەتدا گرت، زینەت قورئانەکەی لەسەر مێزەکە دانا و لێکیکردەوە و بەدوای سورەتەکەدا گەڕا، شوێنە دەستنیشانکراوەکەی نیشانی مامۆستا دا.
مەلایەکەش چاویلکەکانی کردنە چاو، بە سەری بەپەنجەش لەگەڵ ئایەتەکاندا ڕۆیشت.
- "دەتەوێ ئایەتەکان بخوێنیتەوە؟ من دەمەوێ گوێم لەدەنگی خوێندنەوەی تۆ بێ." مەلایەکە وای بە زینەت گوت. ئیدی بە هێورەیی قورئانەکەی وەپێش زینەت نایەوە.
زینەتیش بە دوودڵی کەوتە خوێندنەوەی سورەتەکە:

وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحًا (١)
فَالْمُورِيَاتِ قَدْحًا (٢)

فَالْمُغِيرَاتِ صُبْحًا (٣)
فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعًا (٤)
فَوَسَطْنَ بِهِ جَمْعًا (٥)

{بەو چارەوای بە لینگدانێ دەنرکێنن،
بەوانەش کە ژێری پایان ئاورینگ دێنن،
سوێند بەوانەش بەری بەیان هێرش دەبەن،
جا لەوێ تۆز هەڵدەستێنن.}

- "تۆ ڕاست دەکەی،" مامۆستا وای پێگوت؛ "ئەم ئایەتانە واتایەکی شاراوەیان هەیە. ئێستاش کە خوێندتەوە، لە مەبەستەکەت دەگەم. دەنگەکەت وایلێکردم بە بایەخەوە گوێت لێرابگرم، تا قووڵ بیربکەمەوە؛ تۆ ژنێکی ناوازەی، کەم وایە تووشی ژنانی وەک تۆ هاتبم. من گوێم لە ئێوە دەگرت و لە گەڵ سمکۆڵانی ئەسپ و غاردانێشیاندا دەڕۆیشتم، بە سمەکانیان ئاگریان لە بەردەکانی بەدەرمیانەوە هەڵدەستاند. من سورەتەکەم چەند جارێک خوێندۆتەوە، بەڵام ئەوە یەکەمین جارە وا بە قووڵی کارم تێبکا و بمهەژێنێ. ئەمەش هەمووی لەبن سەری ئێوەوەیە!"
زینەت دەستبەجێ لە وشەکانی گەیشت، وەک ئەوەی لمی بیابان لە ناوەختدا و لەپڕ بارانی بە سەردا بڕژێ. دوا ڕستەکەشی کاریگەری خۆی نواند.
شەوان، کاتێ زینەت دەچووە سەر جێیوبالینگانی خۆی، بیری لە مامۆستا دەکردەوە: "ئەمەش هەموو هەر بە هۆی تۆوە بوو!"
زینەت هەستی بەگەرمیێک کرد، شتێک لەنێو وشەکانیدا هەبوو: "تۆ منت لەگەڵ ئەو ئەسپە بەغارانەدا نارد، ئەوانەی سمکۆڵیان دەکرد و بە سمەکانیان ئاگریان لەبەردەکانی بەردەمی ڕێگەکەوە هەڵدەستاند."
زینەت چرای ژووری خۆی هەڵکردەوە، چووە بەردەم ئاوێنە و تەماشای قژەکەی خۆی کرد، پرچی چیدیکە ڕەشەکەی جاران نەمابوو، بەڵام بۆزیش نەببوو. سەیرێکی برۆکانی کردن، هەمیشە هەر ڕەش بوون، چاوە قاوەییەکانی ماندوو شەکەت بوون، بەڵام ئەوێ شەوێ شەوقێکی نائاساییان تێداگەڕابوو. سەری پەنجەکانی لە دەموچاوی دا، قامکەکانی هێنانەخوار تا

سەر لێوەکانی. خۆ لەوانەشە پیر بووبێ، بەڵام ئەو دەیەویست سەرلەنوێ تێهەڵچێتەوە.
دەکرێ ئەو بەشێک لەو ساڵە لەدەستچووانەی رابردوو لێرە و لەو ماڵەدا تێهەڵبێنێتەوە.



لەگەڵ ئەوەشدا زینەت بۆ ماوەیەک سەردانی مەلای نەکرد و لەو شوێنانەی دەکرا تووشی ببێ خۆی لێ دەدزیەوە. تا جارێکیان مامۆستا لە تاریکیدا رووبەرووی بۆوە و پێیگوت: "زینەت خانم! ئەرێ بۆچی سەرێکم لێنادەی؟ من هەمیشە بیر لە پرسیارەکانت دەکەمەوە."
سێ رۆژ دواتر، زینەت چووە لای و لە بەرامبەری دانیشت، مەلاش بە بێدەنگی گوێی لە راڤەی زینەت بۆ هەندێ لەئایەتەکان گرتبوو، کرو مات دانیشتبوو هەر سەیری دەکرد تا لەپڕ قسەی بە زینەت بڕی و بە هێواشییەوە پێیگوت: "زینەت خانم، چاوەکانت دەڵێی دوو مۆمن لەشەودا دەبریسکێنەوە، وەک ئەوەی قسەم لەگەڵدا بکەن وان؛ مەبەستم ئەوەیە کاتێ تۆ دەقەکان دەخوێنیتەوە، من وایدەبینم."
زینەت شتێکی وایکرد وەک ئەوەی هەر گوێی لێنەبووبێ و لەسەر خوێندنەوەی خۆی بەردەوام بوو، هەر چەندە نەشیدەتوانی بە تەواوی تیشکۆی زەینی بخاتە سەر خوێندنەوەی ئایەتەکان. مەلایەکە زێدەتر هیچی نەگوت، وەک هەر پیاوێک کە ئافرەتێکی لە بەردەمدایە و سەبارەت بە کێشەکانی دەدوا، رەفتاری نواند. ئاخر مەلایەکە دەیزانی، دەبێ هێشتا هەندێکی دیکەی لەسەر بوەستێ تا ژنەکە بەتەواوی لەباقی قسەکانی دەگا و هەستی پێدەکا.
بەڵام خۆ پێویست نەبوو مامۆستا زۆر بوەستێ، چونکە دوو شەو دواتر، دیسان زینەت سەردانی مەلای کردەوە.
- "فەرموو وەرە پێش، هەر بە رێکەوتیش ئەم مەغریبەیە دەستبەتاڵم. هەست بە هەراسانی خۆم دەکەم. ئەرێ دیسان دەقێکی دیکەت بۆ خوێندنەوە پێیە؟"
زینەتیش دانیشت و ئەو دەقەی لەگەڵ خۆی هێنابووی، بۆی خوێندەوە.

- "تۆ زۆر جوان دەیخوێنیتەوە،" مامۆستا وایپێگوت، "تۆ بەو دەنگەت مردووش زیندوو دەکەیتەوە، من گوێم لێیە، هەستی پێدەکەم، من ئەمە لەسەر لێوەکانت دەبینم." ئیدی مەلا ئاماژەی بۆ لێوەکانی زینەت کرد، بەو ئاماژەپێکردنە خەریکبوو پەنجەی مامۆستا بەر بنلێوی زینەت بکەوێ.



بۆ ڕۆژی دوایی زینەت هەگبەی خۆی ڕێکخست و بەرەو گوندی جیریا بەرێکەوت، تا هەفتەیەک لە ماڵی باوانی بەسەر ببا، بەڵکو لەوێ خەیاڵی مەلای جێگرەکە لە مێشکی بباتەدەر.
لەوێ باش بیریکردەوە. ئەو نەیدەویست داوی لە داوی مەلا بئاڵێ. ئاخر ئەو ژنی هەبوو، منداڵیشی هەبوون، وێڕای ئەوەش ئەو لە مزگەوتێک ئیمامە و وتار دەدا، کە هەر یەک دوو ساڵی دیکەیە، ئەحمەدی کوڕی تێدا دەبێتە مەلا. بەڵام کاتێ زینەت گەڕایەوە ماڵ، شتەکان بە شێوەیەکی دیکە وەرچەرخان.



زینەت چووە بازاڕ، لەوێ لە دوکانی زێڕینگرەکان سەیری نمایشی خشڵ و ئاڵتونەکانی دەکرد، لەوێ لەپڕ ڕەنگدانەوەی بیچمی مەلای جێگرەوەی لەسەر شووشەی بلورینی خشڵەکان بینی، ئاخر مەلا لەپشتی ڕاوەستابوو، بەسرتەیەکیشەوە پێیگوت: "زینەت خانم، غەریبیت دەکەم. ئەو کورسییەی لە حوجرەکەم لەسەری دانیشتبووی، بەتاڵە."
زینەتیش هیچی نەگوت، تەنانەت ئاوڕیشی لێنەدایەوە، هەر بە پشتتێکراوی وەستا و گوێی لێگرتبوو.
لە دەنگی مەلاکەدا هێزێکی توندی ڕاکێشان هەبوو. ئیدی زینەت بۆ ماوەی دوو ڕۆژ نە بۆ نوێژەکانی بەیانی و نە بۆ هی مەغریب نەچووە مزگەوتێ. بەڵام لەوە زیاتر خۆی پێڕانەگیرا. ئینجا ئەوێ ڕۆژێ، دوای ئەوەی مجێورەکە دوای نوێژی مەغریب دەرگای مزگەوتێی گاڵەدا و ڕۆیشت، زینەت چارشێوی لەخۆی وەرپێچا، بەسەر بانەکەدا خۆی ئاودیوی مزگەوتێ کرد.
ئەو بە بەردەم ژووری مەلادا تێپەڕی و چووە شوێنی نوێژکردن.
- "ئەرێ زینەت، ئەوە تۆی؟" مەلا لە ژوورەکەی خۆیەوە بە هێواشی وای بانگکرد.

- "بەڵێ، ئەوە منم، هاتووم کتێبێک ببەم."
- "تۆ هەموو کات دەتوانی بێیتە ژوور، چاپەکی تازە دێمکراویشم هەیە."

زینەتیش زیاتر لە مزگەوتی چووە ژوور و کتێبەکەی دیتەوە، ئەوسا کتێبەکەی دەستداین و گەڕایەوە.

- "من هەمیشە بە شەو گوێم لە دەنگی پێی تۆیە." مەلا هەر لە ژوورەکەی خۆیەوە وای بە زینەت گوت.
- ئیدی زینەت لێ وەژوور هۆدەکەی مامۆستا کەوت، شوێنی خۆی لەسەر کورسییەکە گرت و کتێبەکەشی لەسەر مێزەکە دانا.
- لە کۆتاییشدا مەلا جێگرەوەکە هاتە لای. بە نەرمی دەرگاکەی پێوەدا، لە دیوی ژوورەوەش گاڵەی دا.

ئەوسا مۆمێکی پێکرد و لەسەر مێزەکەی دانا و گڵۆپی ژوورەکەشی کوژاندەوە.

زینەتیش لەسەر کورسیەکەی بەبێ دەنگ دانیشتبوو چاوەڕێی دەکرد.

پاشان مەلا قورئانی هێنا بەدوای سورەتی "ئەنکەحتو (انکحت)"[٤٧]دا گەڕا، ئەمەش سورەتێکە ئەگەر بتەوێ بە حەلاڵی لەگەڵ ژنێک سەرجێی بکەی، دەیخوێنیتەوە. خۆ ئەگەر ئەو سورەتە بخوێنیتەوە و زینەتیش بڵێ "قبلت"[٤٨] (من قایلم)، ئەوا بەگوێرەی ڕاسپارەی کتێبەکە، دەکرێ یەکسەر سەرجێی یەکدی بکەن.

مەلایەکە بە هێواشی و بەنەرمی سورەتەکەی خوێندەوە.

زینەتیش چاوەکانی خۆی نوقاندن.

- "انکحت و زوجت"[٤٩] ، مەلا ئەمەی بە بردەبردیکەوە خوێندەوە.

زینەت بێدەنگ بوو.

- "انکحت و زوجت" بۆ جاری دووهەم مەلا وای دووپاتکردەوە.

زینەت هەر بێدەنگ بوو.

- "انکحت و زوجت" بۆ جاری سێهەم مەلا خوێندییەوە.

---

[٤٧] Soera Ankahto ڕۆماننووس لێرەدا باسی شتێک دەکا، لە قورئاندا نییە. وەرگێڕ
[٤٨] gabelto
[٤٩] Enkahto wa zawadjto

- "قبلت"[50] زینەت بە هێواشی وای وەلام دایەوە و چارشێوەکەشی لەسەر ملان هێنایە خوار.
ئینجا مەلا قورئانەکەی لەسەر مێزەکە دانا. دەمی خۆی گەیاندە سەر لێوەکانی، دەستەکانیشی گەیاندنە لاملە نەرمونۆڵەکەی و لێی کەوتەکار.

## کەعبە

دادەکان، بەو بەیانییە کە تازە لەخەو هەڵسابوون، دەستیان دایە مەسینە و گەسکەکان و بە ئەسپایی لە ژوورەکەیان هاتنەدەر. دەستیان بە ئاوپێداکردنی ناوکەوەکە کرد، ئینجا کەوتنە ماشتنی(ماڵینی) ئەو ناوە. کاتێ پێیان خستە سەر ڕاڕەوی دەرگای دەرەوە، گەسک و فڵچە بەدەستەوە خەریکی شۆستەی بەردەم دەرگاکە بوون، ئەوەیان لە بیریان چووبۆوە ئاخۆ تەمەنیان چەندە، بەلام ئەم کارەیان بۆیە دەکرد چونکە دەیانەویست بچنە مەککە و ببنە حاجی. ئەو کارەشیان هەر بە نهێنی دەکرد.
گەشتی حەجکردن بۆ مەککە خەونی ملیۆنان موسڵمانە، بەلام خۆ حەجەکە بۆ هەمووان هەر نەدەگونجا، تەنها ئیماندارە خواپێداوەکان دەیانتوانی بچنە مەککە.
دادەکانیش قرۆشێکیان نەبوو، هەرگیز ئەوان بیریان لە پارەوپوول نەدەکردەوە، ئاخر خۆ ئەوان پارەشیان هەر پێویست نەبوو، چونکە لە ماڵەکەدا هەمووشتیان بۆ مەیسەر بوو. بەلام خۆ ئەوان هەر لەتەمەنی منداڵییەوە دەیانزانی، گەر کەسێک دەوڵەمەند نەبێ و نیازیشی هەبێ هەر بچێتە مەککە، ئەوا تەنها دەتوانێ لە ڕێی گەسکدانی ڕێگای ڕێبواران بەو مەرامە بگا. بەلام بۆ ئەمەشیان سێ مەرج هەبوون، یەکەمەکەیان دەبووایە بۆ ماوەی بیست ساڵی ڕەبەق لەگەڵ خۆر دەرچوون ڕێگەی ڕێبواران بماڵێ، دووهەمین مەرجیشیان، نەدەبوایە لە کاتی گەسک دانەکەدا کەس بتبینێ، هی سێیەم و کۆتاییشیان، نەدەبووا کەس بەدوای ڕازەکەتدا بێ و پێی بزانێ.

---

[50] Gabelto

ئینجا، لە دوایین ڕۆژدا، پێغەمبەر خدری[٥١] زیندە دەهات و پاداشتی کارەکەی دەدایەوە. خدری زیندە یەکێکە لە پێغەمبەرە یەکەمینەکان، زۆر پێش ڕۆژگاری موحەمەد، عیسا، موسا، ئیبراهیم، یەعقوب و داود کەوتووە.
بەڵام ئاخۆ چۆن خدری زیندە گەشتەکەی تۆ بەرەو مەککە ڕێکدەخا، ئەمەیان ڕازێک بوو لەنێوان پێغەمبەرە دێرینەکە و ئەو کەسەی گەسکی لێدەدا و ڕێگاکەی ڕادەماڵی.



کاتێکیش دادەکان بیست ساڵی ڕەبەق ڕێگەکەیان گەسک دا، هێشتا پێغەمبەر خدری زیندەیان لێوەدیارنەکەوت. لەوانەیە ئەوان هەڵەیەکیان کردبێ، ڕەنگبێ ئەوان ژمارەی ساڵەکانیان دەقاودەق وەک خۆی نەژماردبێ. لەوانەشە ئەوان جارێک بەرەبەیان لەخەو ڕاچوبووون و کارەکەیان نەکردبێ، یان بە درەنگانێکەوە دەستیان بە گەسکدان کردبێ، یان کێ نالێ یەکێ بە دزییەوە ئەوانی نەدیبێ و بە ڕازەکەی زانیبێ.
کەواتە ئەوان دیسانەوە لە نۆژەنەوە تێهەڵچوونەوە و تا بیست ساڵی دیکە بژمێرنەوە.
لەوانەیە ئەم کارەیان سوودی نەبێ، بەڵام ئەگەر واش نەکەن چیدیکەیان لەدەست دێ؟ ئەو هیوایە، ڕۆژێ لەڕۆژان سەردانی مەککە بکەن و ببنە حاجی، خوێنی ژیانیان بوو. وایلێکردن تا هەنووکە هەر بەو ئاواتەوە بژین. ئومێدیان وابوو بەیانییک لەخەو ڕابن و ئیدی هەر ڕۆژێکیان بمێنێ، ئەوسا حەزرەتی خدری زیندە بە سەریان بکاتەوە.



بە گوێرەی مەزندەی ئەوان، هەنووکە خولی دووەمیشیان تەواوکردووە، لێ هێشتا هیچ سەروسۆراغێک لە پێغەمبەر خدری زیندە پەیدا نەبوو.
کاتێک ئەوان لە خولی جاری یەکەمدا، بیست ساڵی ڕەبەقیان ختم کرد، هێشتا هێزوگوڕی چوونە مەککەیان تێدا مابوو. بەڵام کاتێ خولی دووهەمی بیست ساڵەکەی دیکەیان دەستپێکردەوە، زانیان کەوتوونەتە تەمەن، کاتێکیش بیست ساڵەکەی دووهەمین جار تەواو دەکەن، ئەو شەنگ و تاقەتە پێویستەی

---

[٥١] Gezr

جارانیان نامینێ تا سەردانی شوێنە پیرۆزەکان بکەن. لێ لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوان لەسەر خولیا و کارەکەی خۆیان هەر بەردەوام بوون.



یەک دوو ڕۆژ دواتر، هەردووکیان بە خەمباری لە تاریکییدا لە ژووری مافوورچنینەکەدا لەسەر زەوی دانیشتبوون.

- "خۆ ئەگەر یەکێ گەسکەکانمان لێوەرگرێتەوە، ئەوا ئێمە دەکەوین و دەمرین،" گوڵبانو بوو وای بە دادەکەی دیکە گوت؛ "ئێمە هەنووکە ناتوانین واز لە گەسکدان بێنین. ئێمە دەبێ لەسەری بەردەوام بین. خۆ ئەگەر تاقەتیشمان نەبوو، ئەوا دەکشێینەوە لای دەرگاکە."

- "پێموایە دیسان ئێمە هەمان هەڵە دووبارە دەکەینەوە،" گوڵبێش وا وەڵامی دایەوە؛ "لەوانەیە سەرلەنوێ لە ژماردنەکەدا سەرچێخ چووبین."

- "ئەمەی تۆ دەڵێی ڕێگای تێناچێ. خۆ ئێمە هەموو ساڵێک نیشانەی جارانێکمان لێرە لەسەر دیوارەکە هەڵکەندووە. ئیدی دەی نیشانەکان بژمێرەوە. ئێمە هەر بیست ساڵەکەمان تەواوکردووە."

- "ڕەنگبێ لەوماوەیەدا یەکێ لە ڕێساکانمان جێبەجێنەکردبێ."

- "کامە ڕێسا؟ خۆ لەوەدا هیچ ڕێسا نین. زوو لەخەوهەڵسان، گەسکدان و دەمداخستن."

- "پێموابێ من هۆیەکەی دەزانم."

- "تۆ هەمیشە هەر خەیاڵ لێدەدەی، دەی بزانم ئاخۆ چی دەزانی؟"

- "ئێمە هەڵەیەکی گەورەمان کردووە. ئێمە هەردووکمان." گوڵبانو بەم شێوەیە دوا.

- "چ جۆرە هەڵەیەک؟"

- "ئێمە دەبووایە نهێنییەکەمان بۆ هیچ کەسێک نەدرکاندبایە." ئەویش وای پێگوتەوە.

- "ئێ خۆ هەرواشمان کردووە، ڕازەکەمان لای هیچ کەس نەدرکاندووە."

- "بەڵێ درکاندوومانە. ئێمە نهێنییەکەمان لای یەکدی درکاندووە. تۆ بە ڕازی من دەزانی ومنیش بەهی تۆ. ئەوەش ڕێگاپێدراو نییە، نەدەبوا وابوایە!

تۆ نابێ نهێنییەکەی من بزانی منیش هی تۆ، هەموو شتێک دەبوایە بە شێوەیەکی بێوێنەیانە تێپەڕیبووایە.

- "تکایە تۆ بێدەنگ بە."



هەر دوو دادەکان بەیەکەوە بڕیاریاندابوو کە سەر ڕێگاکە بمالن، بە یەکەوە پێغەمبەر خدری زیندە ببین و هەر بە یەکەوەش بچنە حەجێ و گەشت بەرەو مەککە بکەن، لێ هەنووکە هەموو شتێک بە شێوەیەکی دیکەی لێهات.
ئیدی بە دڵبەخەمی لە ژووری مافوورچنینەکەدا دانیشتبوون، ئەوان لە تاریکاییەکە وەک یەک کەسیان لێهاتبوو، وا کەساس ببوون وەک ئەوەی هیچ کەس بۆ بەهاناوەچوون شک نەبەن. هەر لەخەموخەفەت و داڵغەلێداندا گەسکەکانیش لەدەستیاندا بەربوونەوە.
ئەوان وادیاربوون چیدیکە وەک مرۆڤ دیارنەدەکران، بەڵکو دوو تارمایی نێو ژوورە تاریکەکەی مافوورچنین بوون. قەلەباچکەکەش لەو ناوە هەر قیغەقیغی بوو، بە تەنها دڕی بە بێدەنگییەکە دەدا. پاشان لەپڕ (قودسی)[52]یە شێتۆکە پەیدابوو. قودسی سەیرێکی ناو ژووری مافوورچنینەکەی کردو گوتی: "من گوێم لە دادەکان بوو، ئەرێ ئەوان لە کوێن؟ یان تۆ بڵێی من باش گوێم لێنەبووبن؟ هەڵبەت من گوێم لێبوون!"
دادەکان لەبەر دەنگەکەی هێدمەیان گرت و لە کۆتاییشیدا لە بەردەمی دەرکەوتن. خۆ ئەگەر قودسییە شێتۆکە گوێی لە دادەکان بووبێ، ئەوا ڕازەکەیان بۆ هەموو کەسێک دەگێڕێتەوە، چونکە ئەو هیچی لە زگ ڕانەدەوەستا، هەر ئەمەش کاری قودسییە شێتۆکەکە بوو: نهێنییەکان بگێڕێتەوە.

- "ئەرێ قودسی، چۆنی؟" دادەکان بە ئەسپاییەوە وایان لێپرسی.
- "باش!"
- "ئەدی حاڵی دایکت چۆنە؟"
- "باشە!"
- "ئەدی خوشکەکەت؟"

[52] Qodsi

- "خوشکەکەم؟ ئەو شێتە. خوشکەکەم شێت بووە."
- "قودسی دەتەوێ شتێک بخۆی؟" گوڵبانو وای لێپرسی، ئیدی دا ‌ەکان کیژۆڵەکەیان لەگەڵ خۆیان بردە ناندینەکە، بۆ ئەوەی لێبپرسنەوە ئاخۆ گوێی لە ڕازەکانیان بووە یان نا. بەڵام هەر کاتێ گەیشتنە لای ناندینەکە، قودسی تێیتەقاند و لەبن دەستیان دەرچوو، ڕۆیشتە دەر.
- "قودسی، قودسی؟" دادەکان وا بانگیان کرد، لێ ئەو ڕۆیشتبوو.



ئەرێ تۆ بڵێی تەمەنی قودسی چەند بێ؟

سی ساڵ؟ چل؟ پیرتر، گەنجتر؟ هیچ کەس نەیدەزانی.

هەرچۆنێک بێ قودسی بە سەروسیمایدا گەنج دیاربوو بوو. بەڵام شێتوکە بوو.

قودسی لە ماڵباتێکی سوننەتیانە لەدایک بوو، باوکی کیژەکە خزمێکی دووری ئاغاجان بوو. پیاوەکە دەوڵەمەند بوو، خانەدانێک بوو، یەک دوو گوندی لە شاخەکان هەبوون. بەڵام شتێکی بەسەر خانەوادەکەی هاتبوو، هەموویان شێت ببوون.

خێزانەکەی لە کاتی هێنانە دنیای یەکەمین کۆرپەلەی دا کێشەی دەروونی بۆ پەیدابوو، چیدیکە چانەبۆوە. کوڕەکەشی بە گێلی لەدایکبوو، کچە هەرە گەورەکەشی ئاسایی نەبوو، هەرچی قودسیش بوو وەک بێلانەیەک بە کووچە و کۆڵانەکانی شاردا دەسووڕایەوە.

کاتێکیش پیاوەکە مرد، کەس نەبوو ئەندامانی خێزانەکەی بگرێتە خۆ و سەرپەرشتییان بکا. تەنها ئاغاجان بوو، کە چاوێکی هەر لەسەربوون، شێوە ژیانێکی دیکەی بۆ ڕێکخستن و بەردەوامیش سەری دەدان.

ئەوان هێشتا لەنێو خانووە کۆنەکەیاندا دەژیان. کاتێکیش دایکەکە هەموو جارێک بۆ کڕینی پێداویستییەکان دەچووە بازاڕ، وەک شازادەیەکی کۆنینە لەقاپی ماڵ دەچووەدەر. مرۆ لە ڕەوتی ڕۆیشتنی ژنەکە دەیبینی، کە سەر بە خانەوادەیەکی دەوڵەمەندن، بەڵام گەر هاتبا و بەوردی سەرنجی لێدابووایە، دەیبینی ڕادەی تێگەیشتن و لێحاڵیبوونی لەشتەکان کارا نییە. هەر کاتێک چووبایە بازاڕ، قودسی و خوشکە گەورەکەی یاوەری دایکیان دەبوون.

کاتێکیش لە شەقامێک دەپەڕینەوە، هەردوو خوشکەکان لە بەرایییەوە غاریان دەدا، ڕێگاکەیان دەگرت، لێنەدەگەڕان هیچ ترومبێلێک، گالیسکە و ماتۆڕ و باربەرێک بجوولێ تا دایکیان لە جادەکەدا دەپەڕێتەوە.
براکەی قودسی ناوی هاشم[٥٣] بوو. برایەکەی لە خۆی هەراشتر بوو، هەمیشەش بە جلی سەربازی کۆلۆنێلی لەبەردەکرد و دارێکیشی لە بن هەنگڵ دەنا، ئیدی ئاوا لە ماڵ دەردەچوو.
هەمیشەش جلە یەکپۆشییە سەربازییەکەی خاوێن و بژوون بوون و شێرە برۆنزییە نیشتمانییە ئێرانییەکەشی لەسەر شەپقە سەربازیەکەی دەدرەوشایەوە. لە ئێوارەیەکی زووە تا درەنگانیش لەبەردەم دەروازەی بازاڕەکە، ئێشکگرانە دەوەستا. کاتێکیش پۆلیسێک بە وێدا ڕەتبووبا، یەکسەر سڵاوی سەربازییانەی بۆدەکرد. باقی کاتەکەش هەر بێدەنگ دەوەستا. کەسیش هەقی بەسەرییەوە نەبوو، هیچ منداڵێکیش گێچەڵی پێنەدەکرد. ئیدی خەڵک ئەویان وەک مۆنومێنتێکی نێو بازاڕەکە پەسەند بوو. هەرکاتێکیش هاشم چاوی بە ئاغاجان کەوتبا، کە بۆ بازاڕ دەهات، سڵاوی لێدەکرد و بە شێوەیەکی سەربازییانە بانگی دەکرد:
- "سڵاوووووووو!"
کاتێکیش ئاغاجان لەبازاڕ بەرەو ماڵ دەبۆوە، کابرا هەمان شتی دووبارە دەکردەوە. هەمیشەش دوای سڵاوەکە ئاغاجان دەچووە لای، تۆقەی لەگەڵ دەکرد و گفتوگۆیەکی لەگەڵ سازدەدا:
- "ئەرێ هاشم، چۆنی؟"
- "باشم!"
- "دایکت چۆنە؟"
- "باشە!"
- ئەدی خوشکت؟"
- "باشە."
- "دەی سڵاوم بە دایکت رابگەیەنە. ئەگەر ئێوە هەر پێویستییێکتان بە من هەبێ، دەستبەجێ قودسیم بەدوادا بنێرن."

[٥٣] Hashem

- "باشە وادەکەم."
- زۆر باشە!" ئاغاجان وای پێدەگوتەوە.



تا ڕادەیەک قودسی بە هەموو شتێکی دەزانی.

"ئەرێ قودسی، شتێکی نوێ هەیە؟" هەمووان کاتێ قودسیان دەبینی ئەو پرسیارەیان لێدەکرد.

مرۆ دەبووایە سەرەتا بە ڕێکوپێکی پرسیاری لێکردبایە، ئاخۆ دایکی چۆنە، خوشکەکەی چ حاڵە، دەنا وەڵامی نەدەدایەوە.

قودسی ئەوەی لە لای هەبوو بەبێ بەرامبەر هەڵێنەدەڕشت. دەبووایە سەرەتا چەند قرۆشێکت دابایێ، ئەویش قرۆشەکانی دەخستنە نێو دەم، ئەوسا هەواڵەکانی پێدەگوتی: "قاسمە[٥٤] پیرەکە مرد، مریەم[٥٥] کیژێکی پەیدابوو، مریشکەکەی سوڵتانیش حەفت جوجکەی هەڵهێنان."

بەیانیان سەر لەزوو قودسی بە دەمی بەتاڵەوە لە ماڵ دەهاتەدەر. ئەوسا لە ماڵێکەوە سەری بەماڵێکی دیکەدا دەکرد و هەواڵەکانی دەگێڕانەوە. ئەو ئەوەندە دەگەڕا تا دەمی پڕ لە قرۆش دەبوو، وای لێدەهات چیدیکە دەمی نەجوڵێ و قسەی پێنەکرێ.



بەڵام ئاخۆ چی لەو پارەیەی بە دەستیدەهێنا، دەکرد؛ کەس شتێکی لە بارەوە نەدەزانی. خەڵک دەیگوت، پارەکە دەخاتە نێو دەخیلەیەک و لە ژێر زەمینی ماڵەکەیان دەشارێتەوە، چونکە هەر دایکی پێیزانیبووایە، کە کچەکەی دەرۆزە دەکا، ئەوا سەرباری پەشێویە دەروونیەکەی لە هەژمەتان شێت و هار دەبوو ، لەخۆدەچوو.

"قودسی،" هەمیشە کاتێ ئاغاجان تووشی دەبوو، وایپێدەگوت؛ "تۆ سەر بە خانەوادەیەکی نەجیبی، تۆ خانمێکی، نابێ هەروا سەر بەماڵاندا بکەی."

بەڵام خۆ قودسی گوێی بەو قسانە نەدەدا، هەر دەرگایەک کرابایەوە سەری پێدادەکرد، لەم قاپی بۆ ئەو قاپی.

---

[٥٤] Gasm

[٥٥] Mirjam

ئەو هەرگیز لە جێیەک بنگرتی[٥٦] نەدەبوو، سەربەخۆ لێوەوژوور ماڵەکان دەکەوت، گوێی لەخەڵک ڕادەگرت و ئیدی لەوێوە دەردەچوو سەری بەماڵێکی دیکەدا دەکرد. بەم شێوەیە هەواڵ و دەنگوباسی کۆدەکردنەوە.

هەندێ جار دەڕۆیشت و لە کێوەکە ئاودیو دەبوو، لە ڕووبارەکەش دەپەڕیەوە، دەچووە نێو ڕەز و باخی ترێ.

- "تۆ نابێ ئەم کارە بکەی!" ئاغاجان زۆر بە ڕوونی پێیگوت؛ "ئاخر کچێکی گەنج بۆ دەچێتە نێو ڕەزەکان، هیچ شتێکی لێ نییە بەدواییدا بگەڕێ."

- "باشە جارێکی دیکە ناچمەوە ئەوێ." گوێڕایەڵانە وای پێدەگوتەوە، لێ هەر دەشچوو.



قودسی لە ڕووبارەکە پەڕیەوە، ڕاست و ڕەوان چووە نێو ڕەزی دارمێوەکان، لەوێ زەلامە گومانلێکراوەکان دەهاتن و دەچوون، پیاوگەلێک کە دەمی قودسیان پڕ لە قرۆشی زەردباو کرد.

کاتێکیش پیاوێک دەیبینی، کە قودسی بۆ ئەوێ بە ڕێوەیە، بردیە پەنا دارێک. یەک دوو قرۆشی خستنە نێو دەم و یەک دوو ماچی لێکردن، قودسیش هیچی نەگوت. پیاوەکە هەستی بە مەمکە پڕەکانی کرد، لێ قودسی هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو. کابرا دەستی بۆ بن جلەکانی برد، دەستی بە جەستەکەی کەوت، قودسیش هیچ خۆی لەگوورە نەبرد[٥٧]، بەڵام کاتێک کابرا ویستی دەرپێیەکەی لەپێ دابکەنێ، خۆی ڕاپسکاند و بەغار بەرەو لای پردەکە گەڕایەوە.



قودسی بەردەوام سەری ئاغاجانی لەناو بازاڕەکە دەدا. مام ڕەمەزانی[٥٨] پێشخزمەتچیش کاتێک کە ئاغاجان هیچ میوانی لەلا نەدەبوون، ڕێی پێنەدەگرت. ئیدی دەچوو لە تەنیشت ئاغاجان و لەسەر کورسییەک قیت دادەنیشت.

---

[٥٦] بنگرتی: لەجێییەک مانەوە، داسەکنین، نوقرەگرتن.
[٥٧] خۆی تێکنەدا، خۆی نەجووڵاند.
[٥٨] Ramazan

- "چایەک بۆ قودسی خانم!" هەمیشە ئاغاجان وای بانگ دەکرد.
پێشخزمەتەکەش پیاڵە چایەکی بۆ دەهێنا و چەند چوکلاتێکیشی لەسەر سینییەکی زیوین لە بەردەم دادەنا.
- "ئەرێ هیچ هەواڵت بۆ من پێیە؟" ئاغاجان وای لێپرسی.
قودسی خۆی بۆ پێشەوە شۆڕدەکردەوە، بەهێواشی ئەوەی دەیەویست بۆی هەڵڕێژێ، قسوری نەکرد.
- "من لەپەردەکە پەڕیمەوە و بەرەو ناو ڕەزەکە ڕۆیشتم." وای بە ئاغاجان گوت.
- "چیە، جارێکی دیکە؟"
- "دوو کەس لەوێ بوون. ئەوان منیان توند گرت. من قیژاندم هەر قیژاندم، بە توندی قیژاندم، ئینجا پیاوەکان بەرەو شاخەکان هەڵاتن."
- "ئاخر ئەدی پێمنەگوتی جارێکی دیکە نەچییە نێو ئەو ڕەزانە؟ خۆ ئەگەر جارێکی دیکە زاتی ئەو بکەی بچیە ئەوێ، دێمە لای دایکت و هەموو شتێکی پێدەڵێم. نابێ جارێکی دیکە وابکەیتەوە، گوێت لێمە؟"
- "بەڵێ، جارێکی دیکە واناکەمەوە."
- "زۆر باشە! باشە چ هەواڵێکی دیکەت بۆ من پێیە؟"
- "بەڵێ،" وای وەڵام دایەوە، ئینجا یەکجێ باقی هەواڵەکانی بۆ هەڵڕشت: "ڕۆجانی[59] پۆلیس هەموو شەوێ لە ژنەکەی خۆی دەدا، بەو شتە پیسانەش جگەرە دەکێشی و فەڕاشەکەش دایکی خۆی لە کۆڵێتی مریشکان پەستاوە و هەر دەگریێ چونکە دەیەوێ بێتەدەر، عەزام عەزامیش[60] هەر کاتێ لەگەڵ مێردەکەی بچێتە بن جێ، چەقۆیەک لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ و کەرەکەی مام ڕەمەزان نەخۆشە و دادەکانیش پێیانوابوو ئەم ساڵ دەچنە مەککە، بەڵام ئەو سۆراخێکی پەیدانەبوو، ئەوە دوومین جارە پەیدانابێ و دادەکانیش بە هۆیەوە دەگرییێن."
- "باشە چیت دەربارەی دادەکان گوت؟ کێ بوو لێیان پەیدانەبوو؟" ئاغاجان وای لێپرسی.

---

Rogani [59]
Azam Azam [60]

ئاغاجان لە شوێنی خۆی هێدمە گرتی.

- "باشە ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ باسی چی دەکەی؟"

- "من دەبێ بڕۆم." قودسیش وایپێگوتەوە.

لە کۆتاییدا قودسی هەڵستا، چوکلاتێکی خستە دەم، قومە چایەکی بەسەردا کرد، بە خێراییش لە دوکانەکە دەرپەڕی.

ئاغاجانیش بە دوایدا بانگی کرد، "دەی کەمێک بوەستە!"



بۆ شەوەکەی ئاغاجان لەناو جێگەدا ئەوەی لە قودسی گوێی لێبوو، بۆ ژنەکەی گێڕایەوە.

- "باشە ئەو چی گوت؟"

- "هەمووی هەر شتی بێ مانا، قسەی مەتەڵئاسا، هەموو شتێک تێکەڵیەک دەکا و دەیگێڕێتەوە."

- "من دەزانم، ئەو زۆر شت لەخۆوە دەڵێ، گێڕانەوەکانی وەک هی زینەت خانمەکەی لەمەڕ ئێمەیە."

- "ئاخ، تۆ نابێ ئەو بە زینەت بەراورد بکەی، قودسی شێتۆکەیە."

- "تۆ بەهەڵە لێم تێگەیشتی، من ئەو دووانە لەگەڵ یەک بەراورد ناکەم، بەڵام مەبەستمە بڵێم زینەتیش لە شوێنی خۆی دانانیشێ و تکنادا[61] سەری پڕە لە خەیاڵپڵاوی."

- "ڕاست دەکەی، بەڵام چیرۆکەکانی قودسی هەموویان هەر وڕێنەن."

- "ئەگەر وڕێنەبن یان نا، ئەو جوانیان دەگێڕێتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە بە تەواوی نایانگێڕێتەوە. تۆ لە هەموو چیرۆکەکە هەر گوێت لە بەشێکی دەبێ، ئەو هەمووی لەبارێەک دەپەستێ و تێکەڵیان دەکا، بۆیە سەرسوڕهێنەرانە نیشانیان دەدا. باشە ئەمڕۆ چی بۆگێڕایتەوە؟"

ئاغاجان هەندێ بیری لێکردەوە، ئاخر دادەکان هەموو ڕۆژەکە هەر مایەی سەرقاڵکردنی بوون، بەڵام نەیدەویست شتەکە بە فەخری سادات بڵێ.

- "قودسی منی تووڕە کرد، دیسان چووبووە ئەودیو ڕووبارەکە." ئەو وای بە ژنەکەی گوت؛ "قودسی پێیگوتم، کە دوو پیاو توند گرتبوویان، بەڵام

---

[61] تکنادا: ناوەستێ

لەبەرئەوەی قیژانــدبووی، هەر قیژانــدبووی، بەتونــدی هــاواری کردبــوو، پیاوەکان بەرەو نێو شاخەکان رایانکردووە."

- "ئای خودای گەورە، دیسان ئەو پیاوانە. من دەترسم شتێکی بەسەر بێنن، خۆ ئەگەر شتێکیشی لێقەوما، ئەوا هەمووی هەر دەکەوێتە سەرشانی تۆ، خۆشت باش دەزانی. بەڵکو من خۆشم جارێک لەگەڵیدا ئەو باسە بکەمەوە و هەندێکی بترسێنم، تا تخونی ئەو جۆرە کەسانە نەکەوێتەوە."

- "قودسی باسی گوێدرێژەکەی مام ڕەمەزانیشی بۆکردم کە نەخۆشە، هەروەها کە عەزام هەر کاتێک لەگەڵ مێردەکەی بچێتە بن جێ، چەقۆیەک لەگەڵ خۆیدا دەبا."

- فەخری سادات پێکەنی: "باشە مەبەستی لەمەدا چییە؟"

- "من چووزانم. ئەو هەموو ئەو چیرۆکانە دادەهێنێ، ئەو لە هەموو شوێنێک لێوەژوور دەکەوێ، شتێک دەبینێ و چیرۆکێکی لێدروست دەکا. لەوانەیە چەقۆیەک یان شتێکی لەو بابەتەی لەسەر جێی عەزام دیتبێ. هەروەها ئەوەشی بۆ باسکردم، کە ڕۆجانی پۆلیس هەموو شەوێک لە ژنەکەی خۆی دەدا.

- "دەکرێ ئەوە زۆر ڕاست بێ، تۆ دەبێ شتێک بۆ ئەو ژنە بەستەزمانە بکەی. ئەو پیاوە ئالودەبووە و پۆلیسێکی پیسە. ئەمەیان بە زینەت بڵێ. زینەت پەیوەندی بەو پیاوانەی هامۆشۆی مزگەوتێ دەکەن، هەیە. لەوانەیە ئەو، ئەم جۆرە شتانە باش ڕێکبخا. دەکرێ زینەت سەرێکی ژنەکە بدا، بزانێ ئاخۆ چی لە گۆڕێدا هەیە. بە دڵنیاییەوە دەبێ تۆ ئەم شتە لە زینەت داوابکەی. باشە بەدەر لەوە شتێکی دیکە هەیە؟"

- "فەڕاشەکەش دایکی خۆی خستۆتە کوڵێتی مریشکان."

- "ئەمە هەر نابێ. ئاخر کێ دایکە پیرەکەی خۆی داوێتە نێو کوڵێتی مریشکان؟"

- هەندێ جار خەڵک وا سەیروسەمەرە دەردەچێ، کە هەموو شتێکی ناشیاوی لێبوەشێتەوە."

- "داوا لە زینەت بکە، بچێتە ئەوێش، بەڵکو ڕاستی ڕووداوەکەی بۆ دەربکەوێ."

- "قودسی ئەو شتانەی کاری تێدەکەن لە بەریان دەکا، ئینجا بەشێوازی خۆی دەیانگێڕێتەوە، بەڵام کە من هەنووکە بۆ تۆیان دەگێڕمەوە، شتێکی دیکە دەبینم. پێموایە هەرکاتێ ئەو دێتە لای من، شتە گرنگەکان دەگێڕێتەوە، ئەو شتانەش بۆ کەسی دیکەیان باس ناکا. بەڵام تۆ ڕاست دەکەی، ئەویش وەک زینەت شت بەخەیاڵ دادەهێنێ، بەڵام بەجیاوازییەکەوە: زینەت هەقایەتە کۆنەکان دەگێڕێتەوە، هەرچی قودسییە شتێک لەڕاستی هەڵدەهێنجێ ئەوسا هەمووی بە یەکەوە دەچنێ. هەروەک گوتم، شتێکی ڕاستی لە چیرۆکەکانی قودسیدا هەیە."

فەخری سادات سەری خۆی خستە سەر سینگی مێردەکەی، چاوەکانی نوقاندن ئەوسا پێیگوت: "من نامەوێ لەسەر جێ چیدیکە گوێم لەباسوخواسی قودسی بێ، شتێکی دیکەم پێبڵێ، شتێکی جوان، شتێکی خۆش... من دادەداد[٦٢] ناکەم، بەڵام خۆ تۆ هیچ کات بۆ من تەرخان ناکەی. جاران ئێمە بەیەکەوە دەردەچووین، ئەوسا منت لەگەڵ خۆ دەبردە مەشهەد[٦٣]، لەوێ هەفتەیەک لە لای ژوورە ڕاخراوەکانی[٦٤] لای گومبەزی ئیمام ڕەزا[٦٥] دەمماینەوە. ئەوکات منت لەگەڵ خۆ دەبردە ئیسفەهان[٦٦]، بەڵام خۆ لەمێژ ساڵە شتێکی وامان نەکردووە، تۆ هەر بەخۆت، بەتاقی تەنیا گەشت دەکەیت و منیش لە کونجیماڵێ بەجێ دێڵی. هەندێ جار بیردەکەمەوە، کە پیر بوومە، ئەدی تۆ..."

- "قودسی شتێکی دیکەشی گوت."

- "گوێ لەمن بگرە؟ باشە تۆ هەمیشە هەر بە قودسییەوە سەرقاڵی؟"

- "ئەو شتێکی دەربارەی پێغەمبەر خدری زیندەوە گوت، گوایە دەستبەرداری دادەکان بووە."

- "کێ دەستبەرداری دادەکان بووە؟" فەخری سادات بەدەم ئەم پرسیارەوە هەڵسا و قیت لەسەر پێخەفەکە دانیشت.

---

[٦٢] دادەداد: منگمنگ، سکاڵا.
[٦٣] Mashad
[٦٤] ژووری ڕاخراو، ژووری مجهز
[٦٥] Imam Reza
[٦٦] Isfahan

- "پێغەمبەر خدر! ئەمە ئەو قسانە بوون، کە لە دەمی قودسییەوە دەرچوون. ئەمانەش هەر وشەی پچڕپچڕ نین، پێموایە ئەو گوێی لە دەمەتەقێی نێوان دادەکان بووە. وا بیردەکەمەوە نهێنییکیان هەبێ."
- "باشە بۆ وا بیردەکەیتەوە؟"
- "من هەروا ئاساییانە هەستی پێدەکەم. قودسی گوتی: "خدری زیندە نەهات، ئەوە دووهەمین جارە ئەو نایەت و دادەکانیش گریان."
ئەو تازە پەی بەوەبرد، لە ماوەی ساڵەکانی ڕابردوودا زۆر جاران بەرەبەیانێکی زوو گەسکی لە دەستی دادەکان بینیوە، بەڵام هەرگیز لەسەریان نەوەستاوە ئاخۆ بە چییەوە خەریکن.



بۆ بەیانییەکەی، ڕۆژهەڵات، ئاغاجان لەنێو جێگاکەی هاتەدەر، چووە لای پەنجەرەکە و چاودێری ژووری دادەکانی کرد.
چاوەڕوانییەکەی زۆری نەکێشا، دەرگەی ژووری دادەکان کرایەوە، ئیدی ئەوان وەک دوو تارمایی بە گەسکی دەستیانەوە لەو نێوەدا دەرکەوتن.



ئەو هەموو شەوەکەی هەر بیریکردەوە، لێ هەنووکە زانی، دەبێ چیبکا. ئیدی بە خەندەیەکەوە گەڕایەوە ناو پێخەفەکەی خۆی.
چاوی بە قاچە ڕووتەکانی فەخری سادات کەوت، بەشێک لە دەرپێی گوڵنارییەکەی لەبەر تیشکی چرای شەوانە دیاربوو. خۆ فەخری سادات ڕاستی دەکرد، ئەو کاتی کەمتری بۆ تەرخانکردبوو، لە مێژیشیە بە یەکەوە هیچ گەشتێکیان نەکردووە. ئەو چیدیکە لە گەڕانەوەی گەشتە بەتەنیاکانیدا دیاری بۆ نەهێناوەتەوە. شتەکە واپێدەچوو چەندان سەدەی بەسەردا تێپەڕیبێ کاتێ لە دیمەشق[١٧] گەڕایەوە، پاکەتێکی حەفت ڕەنگی ستیان و مایۆی بۆ لەگەڵ خۆ بەدیاری بۆ هێنابوو. ئیدی بەهێواشی خۆی خزاندە ژێر پەتۆکە، توند سمتی فەخری ساداتی گرت و بەهێورەیی دەرپێیەکەی لەپێ داکەند.
- "نەکەی!" فەخری سادات بە خەواڵویەوە وایپێگوت.

[١٧] Damascus

هەروەک جاران، گوێی نەدایێ و لەسەر دەرپێ لەپێکردن بەردەوام بوو.

- "نەکەی!" جارێکی دیکە نەرمتر وایپێگوتەوە.

پاشان هیچی دیکەی نەگوت.

## إقرا[٦٨]!

ماوەیەک دواتر، کاتێک دادەکان دیسان خەریکی ماشتنی سەر ڕێگاوبانەکە بوون، گوێیان لە دەنگێکی نامۆبوو، لە کۆڵانەکەوە هات. هەردووکیان لە تاریکییەکەدا ئاوڕیان دایەوە، بەڵام هیچیان نەدی. پاشان لەسەر گەسکدانەکەیان بەردەوام بوون. دواتر لەپڕ ئەسپێک لە کوڕژنی دا. دیسان ئاوڕیان لەو لایەی دەنگەکەی لێوەهات، دایەوە، لێ چاوە پیرەکانیان هیچی بەدینەکرد.

- "ئەرێ گوێت لە کوڕژنی ئەسپێک بوو؟" گوڵبانو وای بە دادەکەی دیکە گوت.

- "بەڵێ، گوێم لە دەنگی پێی ئەسپێک بوو" گوڵبێش وای پێگووتەوە.

تا دەهات دەنگەکە زیاتر دەهاتە پێش. ئیدی دادەکان دەستی یەکدییان توند گرت، بە کشوماتی سەیری سەری کۆڵانەکەیان کرد. ئەوسا لەبەر تیشکی گڵۆپی سەر جادەکە، سەری ئەسپێکی ڕەش بە دیارکەوت. عەرەبێک، دژداشەیەکی سپی لەخۆی وەرێنابوو، قیت لەسەر زینی ئەسپەکە وەستابوو. دادەکان بە بێدەنگی سەری ڕێزیان بۆ دانەواند.

سوارچاکەکە بە زمانی عەرەبی بانگیکردن: "کاتەکەی وا هات، سڵاوی پێغەمبەر خدر و مەککەتان لێبێ!"

هەرچەندە دادەکان هیچ لە زمانی عەرەبی نەدەگەیشتن، لێ دەستبەجێ زانیان، سوارەکە باسی چی دەکا، ئاخر خۆ وشەکانی خدر و مەککە بەس بوون.

---

[٦٨] ڕۆماننوس ناونیشانەکەی هەر بەو وشەی دەستپێکی یەکەمین نایەتی سروش بە ڕێنووسی هۆڵەندی Eqra نووسیوە، منیش تەنها هێناومەتە سەر ڕێنووسی خۆمان. وەرگێر

دیسان ئەوان بۆ عەرەبەکەی سەر ئەسپەکە نوشتانەوە.

- "ئیدی وەختیەتی،" سوارەکە لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو؛ "ئێمە بۆ گوڵبانو، بۆ گوڵبێش هاتووین!"

دادەکان لە خۆشیان لەرزین. ئاخر سوارەکە هەر بەناوە کچایەتیەکەی خۆیانی بانگکرد. تۆ بڵێی ئەوان باش گوێیان لێبووبێ؟

- "پێغەمبەر هات. هۆ گوڵبانو، ناوەکەم بخوێنەوە!" سوارەکە وای پێگوت.

نەخێر ئەوان هەڵەنەبوون. سوارچاکەکە بە ڕوونوئاشکرا ناوی "گوڵبانو!"ی هێنا.

باشە ئەدی ئێستا چیبکەن؟

گوڵبانو هەنگاوێک لە سوارەکە چووە پێشەوە و سەری ڕێزی بۆ دانەواند. سوارەکەش نامەیەکی لە پاشکۆی سەرزینی ئەسپەکە دەرهێنا و ڕادەستی کرد.

گوبانوش بە ئەسپایی لە سوارەکە چووەپێش و زەرفە نامەکەی لێوەرگرت.

ئینجا سوارەکە بانگیکرد: "گوڵبێ!"

دادەکەی دیکەش لەسوارەکە چووە پێش و زەرفە نامەکەی خۆی لێوەرگرت.

- "وانا للە، واللە الصمد." سوارەکە دوایی وایپێگوتن، ئینجا ئاوزینگێکی لە ئەسپەکەیدا و لەبەرچاوان ونبوو.



ڕۆژ هەڵات و دنیا ڕووناک بووەوە. دادەکانیش بە واقوڕماوی، زەرفی نامە بەدەستەوە وەستابوون.

نەیاندەوێرا لەشوێنی خۆیان بجووڵێن، دەترسان نەوەک ئەوەی بەسەریان داهات، خەون بووبێ. بەڵام خۆ شتەکە خەون نەبوو، چونکە قەلەباچکەکە چووبووە سەر دارتێلی گڵۆپەکە هەڵنیشت، لەوێ تاهێزی تێدابوو قیغاندی.

ئینجا دادەکان گەڕانەوە ژوورەکەی خۆیان و دەرگایان لەسەر خۆیان کلۆم دا، گڵۆپەکەیان هەڵکرد و زەرفی نامەکەیان لێککردەوە. هەردووکیان نامەی هاوچەشنیان پێدرابوو، بەڵام خۆ ئەوان نەیاندەتوانی دەستخەتی پێغەمبەرەکە بخوێننەوە، دیاربوو نامەکە بە زمانێکی ڕازدار نووسرابوو. دەبووایە

نامەکەیان نیشانی یەکێک دابووایە، بەڵام نیشانی کێیان دابووایە؟ نیشانی ئاغاجان؟ فەخری سادات؟ زینەت خانم؟ نەخێر.
"دەی با داوا لە شاباڵ بکەین بۆمان بخوێنێتەوە و واتاکەیشمان بۆلێکبداتەوە."
گوڵبێ وای بە گوڵبانو گوت. ئیدی هەردووکیان بە یەکەوە چونە ژووری شاباڵ.
"دەی تەمبەڵ لە خەو هەڵسە! هێشتا هەر لەناو جێداماوی؟ چۆن تا ئا ئێستا نوێژەکەشت نەکردووە؟ شەرم لەخۆت ناکەیتەوە. من دەچم بە ئاغاجان دەڵێم کە گوناحکارێک هێشتا هەر لەناو جێدا ماوەتەوە. هەڵسە، دەی ئەمەمان بۆ بخوێنەوە! ئەم نامەیە بخوێنەوە، دەی هەر ئێستا ئەم نامانە بخوێنەوە."
گوڵبانوو بوو وای پێگوت.
شاباڵیش بە چاوی خەواڵووەوە لە نامەکان وردبووەوە: "بەڵێ من دەزانم بیخوێنمەوە، بەڵام تێیناگەم چی تێدا نووسراوە. نامەکە بە زمانی عەرەبی نووسراوە."
لەوانەیە وا پێویست بکا نامەکان نیشانی ئاغاجان بدەن، لێ بەداخەوە، ئەویش لە ماڵ نەبوو، ئەو چووبووە گوندی جیریا، ئۆقرەشیان نەدەگرت تا ئەو لە گەشتەکەی خۆی دەگەڕێتەوە. ئیدی چارشێویان لە خۆیاندا و بەرەو مزگەوتێ تێکشان، تا نامەکە نیشانی مامۆستا بدەن.
مەلا جێگرەوەکەش نوێژی بەیانی کردبوو، گەڕابووەوە ژوورەکەی خۆی بەڵکو سەعاتە وەختێکی دیکە بخەوێ. ئیدی ئەوێ دەمێ دادەکان لە قاپییەکەیان دا، مەلاش وایزانی زینەت خانمە، بۆیە بە خەواڵووی بانگی کرد: "فەرموو وەرە ژووری!"
دادەکانیش دوای بانگکردنەکە چوونە ژووری. مەلا بە دیتنی ئەوان سەری سوڕما: "خانمەکان، پێمناڵێن چی قەوماوە؟ دەتوانم چیتان بۆ بکەم؟"
- "ئێمە نامەیەکمان، لە ڕاستیدا دوو نامەی پڕلەمتمانەمان بەدەستگەیشتووە، دەکرێ بۆمانی بخوێنیتەوە؟"
- "بەخۆشحاڵییەوە، فەرموون دانیشن."
دادەکان، نامەکانیان ڕادەستی مامۆستا کرد.

ئەویش دەستی دایە مێزەرەکەی کە لەسەر مێزی شەوانەی دانابوو، مێزەرەکەی خستەوەسەر، بەو کراسە لۆکە سەردەستە درێژانە، چووە سەر کورسی و لێیدانیشت و گوتی: "فەرموون خانمەکان تاوێک دانیشن تا چاویلکەکانم دەکەمە چاو."

مامۆستا چاویلکەکەی کردنە چاو، کەوتە خوێندنەوەی نامەکان: "نامەیەکی عەرەبی؟"

گوڵبانو لێیپرسی: "دەتوانی بیخوێنیتەوە؟"

- "من هەردەبێ بزانم بیخوێنمەوە، ئەمما ئەوەندە هەیە شتێکی ئاسایی نییە ڕۆژانە نامەی عەرەبیزمان بخوێنمەوە. هەڵبەتە من قورئان دەخوێنمەوە، بەڵام زمانەکەی قورئان جیاوازە، زمانەکەی زمانی خودایە. من قورئان دەخوێنمەوە و لە واتاکەشی دەگەم، لێ گەر تۆ ڕۆژنامەیەکی عەرەبیم بدەیتێ، نازانم بڵێم ئاخۆ لێی تێدەگەم یان نا. لێیگەڕێ وایدابنێین، ئەگەر من ئەمڕۆ بچمە مەککە، لە خۆم دەپرسم تۆ بڵێی بتوانم لەگەڵ خەڵکی سەر جادە قسە بکەم. دەی هەندێک ئارام بگرن، لە ژێرەوەی نامەکە ناونیشانێک هەیە. باشە ئێوە دەبێ بچنە شوێنێک؟ باشە چۆن ئێوە ئەو نامانەتان بەدەست گەیشتن؟ وەک دیارە، ئەمانە بەڵگەنامەی فەرمیین. لەسەر بەڵگەنامەکان ناوێکیشی لەسەرە: حاجی ئاغا موستەفا موهاجیر[٦٩]."

- "هەر دەشکرێ وابێ. حاجی ئاغا موستەفا موهاجیر، ئێمە دەیناسین،"

گوڵبێ وای بە مامۆستا گوت، "ئەو لەبازاڕ ئیشی هەیە."

- "شتەکە ڕوون و ئاشکرایە. دیارە ئێوە دەبێ بچنە لای ئەو حاجییە. وەلسەلام!"

دادەکان کە لە خۆشیان هەدادانیان نەمابوو، نامەکانیان لە دەستی مامۆستا ڕاپسکاند.

هەر لەوێ هاتنە دەر ویستیان بەپەلەپڕوزێ بەرەو بازاڕ بکەونەڕێ، بەڵام گوڵبانو گوتی: "بەڕای من هێشتا زووە بۆ بازاڕ، با ڕۆژ هەندێکی دیکە رابکشێ. وێڕای ئەوەش، واباشە هەنووکە ئێمە بەهۆی ئەو نامانەی نێو دەستمان جلی لایەقتر لەبەر بکەین، ئەوسا بچینە بازاڕ."

---

[٦٩] Hadji Aga Mustafa Mohadjeir



لە ماڵیشدا لەپڕ هەموو شتێک بەجۆرێکی دیکە دەبیندرا. ماڵ لەبن تیشکی خۆردا روون و گەشاوە بوو. وەک ئەوە بوو، هەموو شتەکان دەم بەخەندە بن و هەمووانیش بە رازەکەیان بزانن. پێدەچوو پیرەدارەکەش دەنگی پێی یەکسمەکەی[٧٠] بیستبێ و حەوزەکەش دەنگی خدری زیندە.
گوڵەکانی باخچەکە بەوپەڕی کرانەوە و پرشنگەوە لە دادەکانیان دەڕوانی و ڕۆژیش بەوپەڕی شەوقی خۆییەوە لەسەر جامەکانی پەنجەرەی ژووری کتێبان پرشنگی دەدایەوە، قەلەباچکەکەش خولێک بەسەر سەریاندا سوڕایەوە و بە شادییەوە قیغاندی. "سوپاست دەکەم، سوپاس قەلەکە." دادەکان بەسەری زمانەوە وایان گوت. ماسیە پیرە سوورەکانیش بۆقژی هەواییان لەنێو ئاوی حەوزەکەدا بەرەو سەروو هەڵدەدا. "سوپاس بۆتۆ سوپاس." دادەکان بەوانیشیان هەر واگوت.
- "من گوێم لەدەنگی پێی شادمانییە. ئەرێ چی خۆش ڕوویداوە؟" بانگدەرەکەش لە نێو ژێرزەمینی گۆزەدروستکردنەوە وا بانگی کرد.
گوڵبانو و گوڵبێ بەیەکەوە چوونە ژێرزەمینەکە تا سڵاو لە بانگدەرەکە بکەن، ئەویش لەپشت مێزی ئیشکردنەکەی وەستابوو، خەریکی خشتکردنی قوڕەکە بوو، لووسی دەکردەوە.
تۆ بڵێی پێویست بێ هەواڵەکەی پێڕابگەیەنن؟ دەکرێ ئەوان بەشێکی ڕازەکەیان بدرکێنن؟ نەخێر، سەرەتا دەبێ ئەوان بچنە لای حاجی موستەفا. ئینجا بۆیان دەردەکەوێ ئاخۆ خەونە لەمێژینەکەیان دێتە دی یان نا.
- "بەیانیت باش!" دادەکان بە دەنگێکی بەختیارانەوە سڵاویان لە بانگدەرەکە کرد.
- "خانمان، بەیانی ئێوەش باش، من دەزانم ئێوە شتێکتان لەبن سەردایە." بانگدەرەکە وای پێگوتن.
- "بەڵێ ڕاستە، ئێمە شتێکی خۆشمان پێیە." گوڵبێ وای پێگوتەوە، بەڵام گوڵبانو قسەکەی پێبڕی وگوتی: "بانگدەری بەڕێز، ئای ئەو گوڵدانانە چەند جوانن. پێموابێ هەموویان تازە دروستکراون."

---

[٧٠] یەکسم: نەسپ

- "هەق نییە زێدەڕۆیی بکەی، من لە هەموو ژیانمدا هەر خەریکی دروستکردنی گۆزەکاری بوومە، ئەمڕۆ ئێوە شتەکان بە شێوەیەکی جیاوازتر لەجاران دەبینن."

دادەکان بەخەندەوە سەیری یەکدییان کرد.

- "بەڕاستی ئێمە هەواڵێکی زۆر خۆشمان پێگەیشتووە، تۆ لەئێمەت گوێ لێدەبێ، ئەوسا دەتوانی بچییە سەربانی مزگەوتێ و بانگ رادێری."

- "ئای چ رازێکە." بانگدەرەکە وای پێگوتنەوە.

دادەکان هەروەک ئەوەی کیژۆڵەی جاران بن، خەریکبوون بە بازدانەوە بە سەر پەیژەکانی ژێرزەمینەکە بچنەسەر و پێ بنێنە ناو حەوشەی خانووەکە. ئەوان لە خۆشیان نەیاندەزانی چیبکەن، بۆ کوێ بڕۆن، لای کێ لابدەن. بینیان وا فەخری سادات بەرەو ناندینەکە دەچێ. نابەجێیانە دەستیان بۆ هەڵوەشاند، لەباری ئاساییدا رەفتارێکی وایان نەدەنواند. پشیلە پیرەکەی مزگەوتێش بەوێدا تێپەڕی، ئیدی دادەکانیش لە خۆیانەوە دادەکانیش بە دوایدا رایانکرد. پشیلەکە، کە پێشتر ئەمەی بەسەر نەهاتبوو، سڵەمیەوە و بازیدایە سەر بان. دادەکان جلی جوان و لایەقیان لە دۆلابەکە دەرهێنا و پۆشیان، هەندێ پۆدرەشیان لە روومەتەکانیان دا، جوانترین چارشێوی رەشیشیان بەسەر خۆیان دادا و لەدەرگاکە چوونەدەر و ملی رێی بازاڕیان گرت.



حاجی موستەفا دۆستێکی دێرینی ئاغاجان بوو، پیاوێکی دەسەڵاتداری شارەکە بوو، تاکە پیاوی رێپێدراوبوو، کە کاروانی حاجیان بەرەو کەربەلا، نەجەف، مەدینە، دیمەشق و مەککە بەرێ بکا.

نووسینگەی حاجی موستەفا کەوتبووە ناوچەقی بازاڕ، رۆژانە بەسەدان لە حەجخوازان سەردانیان دەکرد و لەبارەی کاروباری رێکخستنی کاروانی حەج لەگەڵیدا دەدوان. دادەکانیش سەریان بە نووسینگەکەیاندا کرد، بەڵام خۆ پێویست نەبوو وەک باقی حەجخوازەکانی دیکە لە نۆرەی چاوەڕێبووندا بوەستن، ئاخر ئەوان، هەریەکەیان نامەیەکی تایبەتیان بۆ حاجی موستەفا پێبوو.

کاتێ گەیشتنە لای نوسینگەکە، لە پەنجەرەکەوە سەیریکیان کرد، هەرچەندە پێشتر یەکجار لە تاریکییدا لە مزگەوت حاجی موستەفایان دیبوو، بەڵام دەستبەجێ ناسییانەوە. ئەو لە پشت مێزی نووسینگەکەی خەریکی تەلەفۆنکردن بوو. کاتیکیش حاجی چاوی بە دادەکان کەوت، ئاماژەی بۆکردن کە بچنە ژوور. ئەوانیش بە هێواشی قاپیەکەیان کردەوە.

"دەتوانم چیتان بۆ بکەم؟" دوای ئەوەی حاجی موستەفا لە تەلەفۆنکردنەکە بووە، وای لێپرسین. دادەکانیش بەیەکەوە نامەکانیان ڕادەستی حاجی کرد.

"ئێمە پەیامێکمان بۆ تۆ پێیە." گوڵبانو بوو وای بە حاجی گوت.

ئەویش چاویلکەکانی کردنە چاو، نامەکانی لێککردنەوە و بە سەرنجەوە خوێندنیەوە، کاتێکیش لە خوێندنەوەی نامەکە بووەوە، چاویلکەکەی لەچاوکردەوە و سەیریکرن. دوای ئەوەی دووهەمین نامەشی خوێندەوە، بۆ ماوەی یەک خولەکی ڕەبەق کە چاویلکەکەشی هەر لەدەست دابوو، بێدەنگ ما.

دادەکانیش بە چاوی پڕ لە پرسیارەوە سەیری یەکدییان کرد.

پاشان ئەو نامەکانی خستنەوە نێو زەرفەکان، بە ڕێزەوە نامەکانی بۆ ئاستی نێوچاوان بەرزکردنەوە و ئینجا خستیە نێو چەکمەجەی مێزەکەی.

- "فەرموون دانیشن." بەشکۆوە وای پێگوتن.

دادەکانیش لەسەر دوو کورسی چەرمینی کۆنینە کە لە تەنیشت مێزەکە داندرابوون، دانیشتن.

حاجی مستەفا سەری بەسەر بارستە کاغەزێکدا کرد و لەشتێک گەڕا، چەند تێبینییەکی تۆمارکرد و تەلەفۆنێکی ڕازدارانەشی سازدا. پاشان لە نوسینگەکەی هاتەدەر و دادەکانی بەتەنها لەوێ جێهێشت، بێ ئەوەی هێشتا هیچ باسوخواسێکیان لەگەڵدا باس بکا. دوای چارەکە سەعاتێک گەڕایەوە و دەفتەرێکی قەبەی بەرگ قاوەیی تۆخی پێبوو. ئینجا دەفتەرەکەی لێککردەوە، بە شکۆوە گوتی: "گوڵبانو."

- "ئەوە منم." یەکێ لە دادەکان وای گوت و لەکۆتاییدا لێیهاتەپێش.

ئەویش ئەستەمپەیەکی کۆنینەی لەپێش دانا و پێیگوت: "دەکرێ پەنجەی شایەتمانەکەت سەرەتا لێرە لەسەر ئەو مەرەکەبە دابنێی پاشان بخەیتە سەر ئەم فایلە؟"

گوڵبانوش پەنجەی شایەتمانی کە دەشلەرزیەوە بەمەرەکەب کرد و خستیە سەر ئەو شوێنەی کە حاجی ئاماژەی بۆکرد.

- "تۆ دەتوانی لەشوێنی خۆت دانیشیتەوە." حاجی وای پێگوتەوە.

ئینجا چەند تێبینییەکی دیکەی تۆمارکردن، ئەمجارە بانگیکرد" گوڵبێ."

- "ئەوە منم،" دادەکەی دیکەش بە دەنگێکی لەرزۆکانە وا وەڵامی دایەوە، لەشوێنی خۆی هەڵسا.

- "تکایە، یەکەمجار پەنجەت لێرە دانێ پاشان بیخەرە سەر ئەو شوێنە."

ئەویش پەنجەکەی خستە سەر ستەمپە بە مەرەکەبکراوەکە و دواتریش خستیە سەر ئەو شوێنەی کە حاجی بە نووکی قەڵەمەکەی ئاماژەی بۆکرد.

- "ئەرێ ناونونێشانەکەتان چییە؟" حاجی وای لێپرسین.

- "خانوەکەی مزگەوتێ." گوڵبانو وەڵامی دایەوە.

- "ئێوە لەوێ دەژین؟"

- "بەڵێ." وا وەڵامیان دایەوە.

کاتیکیش حاجی لە نووسینەکە بووەوە، چەند پولێکی لە فایلەکان دا، لەکۆتاییشدا هەڵسا و پێیگوتن: "فەرموون بەدوامدا وەرن."

دادەکانیش بە ڕاڕەوێکدا بەدوایدا ڕۆیشتن، دەبوایە بەنێو ژوورێکی تەنگدا رەت بن پاشان هۆڵێکی گەورەتر و لە کۆتاییشدا ڕاڕەوێکی نیمچەتاریک تا حاجی لە بەردەم قاپیەک وەستا. ئیدی کلیلیکی لە گیرفان دەرهێنا، دەرگاکەی کردەوە: "پێڵاوەکانتان داکەنن ئینجا بچنە کەون."

گوڵبێ و گوڵبانو چوونە ژوورە سەرنجڕاکێشەکە، لەوێدا تابلۆی درێژ کە دەقی پیرۆزی لەسەر نووسرابوو بەسەر دیوارەکەدا هەڵواسرابوون، ئیدی ژوورەکە هەر لەناوکەوەوە تا بمیچی پڕبوو لە بارستایی سەدان جانتای زەردی چەرمینی روشاو، کە لەنێو سندوقی داردا داندرابوون. بۆنی ناسراوی کتێبەکان و پێستەکان کەشێکی پیرۆزییانەی دابووە ژوورەکە. لەسەر زەویش مافوورێک ڕاخرابوو، هەموو ناوکەوەکەی داپۆشیبوو.

لەیەکێک لە دیوارەکان دۆلابێکی پڕاوپڕ لە تۆمارنامەی لەسەر یەک داندرابوون. سەری سەرەوەشیان بارستێک تۆز و غوباریان لەسەر کەوتبوو. دادەکان لەژێر چارشێوەکانیاندا، دەستیان دەلەرزی. ئیدی پێلاوەکانیان داکەندن و چوونە ژوور.

- "فەرموون دانیشن." حاجی وای پێگوتن و ئاماژەی بەدوو کورسی بۆکردن، کە لەبەردەم مێزێکی دارین داندرابوون.

چلچرایەکی زیوین بە بنمیچی سەر مێزەکە هەڵواسرابوو، حەفت مۆمی کۆنینەی نیوە سوتاویشی لێبوون. ئیدی هیوا لەدڵی دادەکان هەر ختوکەی دەدا.

- "ئەوەی تائێستا کردوومانە و ئەوەی بەیەکمان گوتووە، هەمووی دەبێ لە نێوانی خۆماندا بمێنێ. خۆ ئەگەر یەکێکی بەو نهێنییە بزانێ، یەکسەر گرێبەستەکە هەڵدەوەشێتەوە." حاجی بە ڕشتبوونێکەوە[٧١] وای پێگوتن.

- "ئەمە زۆر ڕوون و ئاشکرایە." گوڵبانوش وا وەڵامی دایەوە.

ئینجا ئەو چووە پشت پەردەیەک، بە دوو جانتای نوێی ڕەنگ قاوەییکی مەیلەو زەرد گەڕایەوە کە وێنەی کەعبەیان لەسەر نەخشابوو. بە ئاماژەیەکی فەرمییانە هەگبەکانی لە بەردەم دادەکان دانا، کە خەریک بوو لە خۆشیان لە خۆیان بچن.

ئەوسا حاجیش لە بەرامبەریان دانیشت.

- "لەوانەیە لە ماڵ پرسیارتان لێبکرێ،" کابرا بە ئارامییەوە وای پێگوتن، "بەڵام ئێوە هیچ وەڵام مەدەنەوە. من لەسەر ئەو قسەیەم پێدادەگرم، نابێ ئێوە هیچ وەڵامێکیان بدەنەوە."

- "باشە، لەمە تێدەگەین." گوڵبانو بە شڵەژاوییەوە وای پێگوتەوە.

- "لە ڕۆژی لەدایکبوونی فاتیمەی پیرۆزیشدا، ئێوە دەبێ حازروبازر، هەگبە بەدەستەوە لە بازاڕەکە سازوئامادەبن." حاجی وای پێگوتن.

- "باشە." گوڵبانوش وای وەڵامدایەوە.

- "خۆ ئەگەر هیچ پرسیارێکتان هەبێ، دەکرێ بیکەن، چونکە هەر کاتێک لێرە دەرچوون، هیچ بوارێک بۆ پرسیارکردن نامێنێتەوە."

---

[٧١] ڕژشتبوون: سووربوون، جمختکردن.

دادەکان بە دوودڵی ئاوڕیان لەیەک دایەوە. تۆ بڵێی پرسیاریان هەبووبێ؟ نەخێر، ئەوان هیچ پرسیاریان نەبوو.

- "ئا بەڵێ، باشە سەعات چەند لە بازاڕ ئامادەبین؟" گوڵبانو بە دڕدۆنگی وای لێپرسی.

- "بەیانی سەر لەزوو، بەر لە ڕۆژهەڵات." حاجیش بەمجۆرە وەڵامی دایەوە. گوڵبێ هێشتا پرسیارێکی مابوو، بەڵام نەیدەوێرا بیڵێ، بۆیە بە سرتە چرپاندییە گوێی گوڵبانو.

- تکایە لێمان مەگرە،" گوڵبانو بوو وا دوا؛ "بەڵام خۆ ئێمە هێشتا هیچ بەڵگەنامەیەکمان وەرنەگرتۆتەوە. باشتر وایە شتێکمان پێبێ، بۆنموونە کاغەزێ، شتێک کە ناوەکانی ئێمەی لەسەر تۆمارکرابێ."

- "هەگبەکان!" حاجی وای پێگوتن؛ "ئاخر، هەگبەکان خۆیان بەڵگەن. ناوەکانیشتیان لەسەریان نووسراوە."

- دەستبەجێ دادەکان سەیری هەکبەکانیان کردن، بە واقوڕماییەوە بینیان، ناوەکانیان بە پیتی گەورە لەسەر کاغەزێکە لە بەرگێکی پلاستیک لەسەر لایەکی هەگبەکاندا لێدراوە.

- "بەڕاست!" گوڵبانو بە تووڕەییەوە ئاوڕی لە گوڵبێ دایەوە کە پرسیارە نابەجێیکەی کردبوو.

- "هەرچیی پاسپۆرتەکانیشتانە، لە هەمان ڕۆژدا دەتاندرێتەوە،" حاجی وایگوت و لێیپرسین؛ "چ پرسیاری دیکەتان ماوە؟"

دادەکان سەیری یەکدییان کرد، خەندەکەیان بە چارشێوەکەی سەریان شاردەوە، دەستیان دایە هەگبەکانیان، ئەوێیان بەجێهێشت و گەیشتنەوە نێو بازارە جەنجاڵەکە.



لە ماڵیش هەگبەکانیان خستە نێو دۆڵابێکی کۆنینە وەک ئەوەی هیچ ڕووینەدابێ، بەڵام ڕازەکەیان زۆر لەسەر دڵ گران بوو. ئەوان خەویان لێنەدەکەوت، تا درەنگانێکی شەو هەر بەبێداری دەمانەوە. ڕۆژەکان تادەهاتن درێژ دەبوون و شەوەکانیش پێدەچوو هەر نەبڕێنەوە. تۆ بڵێی گەشتەکەیان بە ڕاست وەربگەڕێ؟ تۆ بڵێی ئەو ڕۆژە بێ، دەست بدەنە هەگبەکانیان و بۆ

گەشتەکەیان بکەونە ڕێ؟ تۆ بڵێی ڕەوشی جەستەیان دەرەقەتی ئەو گەشتە دووردوردرێژە بێ؟
ئەوان لەو ڕۆژە دەترسان گەشتەکەیان بۆ مەیسەر نەبێ، بەوەی کارەساتێکی نەخوازراویان بەسەردا بێ، بەوەی لاقیان بشکێ یاخود مردن بۆخۆیان بباتەوە. بەڵام خۆ هەر ئەوان بوون چل ساڵی ڕەبەق بەو پەڕی ئارامییەوە چاوەڕێبوون، ئیدی دەکرێ چەند مانگێکی دیکەش خۆبگرن.

## ژووری گەنجینە

يَاأَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١)
قُمْ فَأَنْذِرْ (٢)
وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣)
وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤)
وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ (٥)
وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ (٧)
{ئەی کەسێکی جلکت بەسەر خۆت داداوە!
رابە! ترس وەبەربێنە.
راشکەیەنە کە پەروەرندەت مەزنە!
بەرگیشت خاوێن راگرە!
لەهەرچی ناپاکە دووربە!
بۆ خاتری پەروەرندەت خۆڕاگر بە!}



لە سەری کۆڵانەکە حەوت پیاو بەدەرکەوتن، چواریان لەوان دارەبازێکیان لەسەر شان بوو، ئەوانی دیکەش لەپێشدا دەڕۆیشتن. پیاوەکان لادێی بوون و لە گوندی جیریاوە هاتبوون، کازم خانیان بەدارەبازێک بۆ خانووەکەی مزگەوتێ هێنابووەوە.
یەکێ لە پیاوەکان لە دەرگاکەی ماڵەکەی دا، بەڵام دەمێکی پێچوو، تا لەکۆتاییدا گوڵبێ دەرگاکەی لێکردنەوە.

- "بەڕێـــزینە؟" گـــوڵبێ لەگەڵ دیتنـــی دارەبـــازەکەدا ئەم وشـــەیەی بە حەپەساوییەوە لەدەم دەرپەڕی.
- "ئێمە کازم خانمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە." یەکێ لە پیاوەکان وای پێگوت، لەکاتێکدا دارەبازەکە هەر بەسەر شانی چوارکەسەکانی دیکەوە بوو.
- "گوڵبانو! کازم خان!" گوڵبێ بە پەرۆشەوە وای بانگکرد. کاتێکیش گوڵبانو دارەبازەکەی بینی، تێگەیشت، چی لەسەرە بیکا. دادەکە ڕێنوێنی پیاوەکانی بۆ ژووری بەنگکێشانەکە کرد. لەوێ پیاوەکان، کازم خانیان بە ئەسپایی لەسەر دارەبازەکە داگرت و خستیانە سەر پێخەفەکەی خۆی. چاوەکانی کازم خان نوقابوون، ڕووخساری بزرکابوو، جەستەشی لەڕولاواز ببوو. ئینجا پیاوەکان لەژوور دەرکەوتن و چوونە لای حەوزەکە تا قەلن و نێرگلەی خۆیان بکێشن. گـوڵبێ بە بێـدەنگی گریـا، لەکاتێکـدا گوڵبـانوو هەمـوو شـتێکی پێویسـتی ڕێکخسـت. دادەکە پەتـۆی بەسـەر کـازم خـان دادا، ئـاوێنەیەکی بچکـۆلە و قورئـانێکی لەسـەر یەکـێ لەچەکمەجەکـانی پشـت سـەری دانـا، ئینجـا چـووە ناندینەکە تا سفرەی بەرچاییەکی بەیانیانە بۆ گوندییەکان ئامادەبکا. گوڵبـانو چایەی لە دیم نا، پەنیر، نان، مرەبا و سەبەتەیەک مێوەی لەسەر مێزەکە دانا و بانگی پیاوەکانی کرد: "بەڕێزینە، دەکرێ نانی بەیانیتیان بخۆن؟"

لەو نێـوەدا ئاغاجـانیش هـاتەوە. ئەو یەکسـەر بەرەو ژووری بەنگکێشـان ڕۆیشـت. کازم خـانی لەنـاو جێگەدا بینـی، زانـی تـازە هـیچ کەڵـک و سـوودی نەمـاوە بیگەیەنێتە نەخۆشـخانە. ئینجـا گەڕایەوە لای پیاوەکـانی گونـد، کە لە ناندینەکە دانیشتبوون و بەخێری هێنان.

هەر کـــاتێ چاویـــان بە ئاغاجـــان کەوت، یەکجـــێ لەبەری هەڵســـان و سەربردەکەشیان بۆگێڕایەوە: "ئەو یەک دوو ڕۆژ بوو وەک جاران نەدەهاتە چایەخـانەکە. پێمـانوابوو لە سـەفەرە. لـێ شـەوێکیان گوێمـان لەدەنگی حیلەی ئەسپەکەی بوو، وامـانزانی لە گەشـتەکەی گەڕاوەتەوە، بەڵام خۆ ئەسـپەکە لە حیلاندن هەر نەکەوت. ئینجا ئێمە ڕاستەوخۆ چووینە مـاڵەکەی، بینیمـان نیوە مردوو لە نێو جێگادا کەوتووە. بۆ ڕۆژی دوایی یەکسـەر خستمانە نێو ئەم دارەبازە، لەوێوە بە پاس تا ئێرەمان هێنا."

- "من زۆر سوپاسی ئێوە دەکەم، ڕێزوپێزانینم بۆتان هەیە سەبارەت بەو چاکەیەی دەرهەق مامتان کردووم." ئاغاجانیش وا وەڵامی لادێییەکانی دایەوە.



بۆ شەوەکەی ئاغاجان کورسییەکی بردە لای تەختەکەی کازم خان. بۆ ماوەیەکی درێژ لای مایەوە. بە هێواشی سورەتی ئەلفاتیحای لەسەر خوێند.
کازم خان گیانی ماڵەکە بوو، بەڵام لەو جۆرە پیاوانە بوو، خۆی بە مزگەوت و ماڵ گری نەدەدا. ئەو کتومت پیاوێک بوو، نەدەکرا وەک ئاغاجان بێ. ئاغاجان پیاوی ماڵ، پیاوی مزگەوتی، پیاوی بازاڕ بوو، پیاوێک بوو خاوەن بەرپرسیارێتی زۆروزەوەند بوو لە نێو شارەکەدا، لێ کازم خان ئەوەندە ئازادبوو وەک مەل وابوو، هەنووکەش هەروەک باڵندەیەک دەمرێ. باڵندە پیرەکان لەپڕ لە هەوا بەردەبنەوە، سەراوسەر بەسەر زەویدا دەکەون، ئیدی چاوەکانیان دادەخەن و چیدیکە بێدار نابنەوە. کازم خان شاعیرێک بوو، هیچ سنوورێکی نەدەناسی. ئەو هەموو شتێکی کردبوو، شتگەلێک کە ئاغاجان نەیدەوێرا هەر بیریشیان لێبکاتەوە.
ئاغاجان لە نێو گیرفانەکەیدا دەستی بەدوای دەفتەری شیعرەکانی کازم خاندا گەڕا. کاتێک دەفتەرەکەی دۆزیەوە، بە نەرمی ئەم پارچە شیعرەی خوێندەوە:

**"ئاوایە دەمی شیرین، جامی بادە ئاوایە**
**بەڵێ وایە، هەموو شتێک هەر هیچی کۆتایە**
**دە بیرکەوە، چەند مایەوە، هێشتاش هەر ئەوەی**
**خۆ نەشدەکرا لەو هیچە کەمتر بووبایە"**



ماوەی حەفتا ساڵی ڕەبەق بوو، کەسانێک هەبوون، هەرکاتێک کازم خان پێی نابایە ماڵێ، تریاکیان لە ژووری بەنگکێشانەکە بۆئامادە دەکرد. هەنووکە چیدی ئەوە لە گۆڕێدا نەما.
لە ناندینەکەدا دادەکان دەست لەسەرچۆک دانیشتبوون، لەگەڵ یەک دەدوان و بە بێدەنگیش دەگریان. ئەو پیاوەی خۆشیان دەویست وەک خۆی نەماوە. ئەرێ بەڕاست، ئەوە بۆ یەکەمین جار کەی بوو کە بینیان؟ نیو سەدە بەر لە ئێستا بوو، کاتێک ئەوان تازە کیژۆڵە بوون، کازم خانی شاعیریش دوای

نیوەڕۆیەک بەسواری ئەسپ لێوەژوور حەساری خانووەکە کەوت. هێشتا گوێیان لە شیعر نەبیبوو. یەک دوو ڕۆژیش دواتر، ئەو دوو شیعری بۆ نووسین، دانەیەکیان بۆ گوڵبانوو، یەکێکیشیان بۆ گوڵبی. شیعرەکە دەربارەی چاوەکانیان، کەزیە درێژەکانیان، دەربارەی خەندە و دەستە کانیان بوون، کە زۆر گەرم و نەرم بوون کاتێ ئاگری بزۆتی بەنگەکەیان بۆ فوودەدا. بۆ جاری داهاتوو کاتێ کازم خان گەڕایەوە، هەردووکیان بوونە هی ئەو، بۆ هەمیشەش.



مام ڕەمەزان بەدەم قاپیکردنەوە لەوێ پەیدابوو، ئەو ڕۆژانە کە مشووری باخچەکەی دەخوارد، دوای ئەوەی تاریک و ڕوون دادەهات سەرێکی بابای بانگدەرەکەی لە ژێرزەمینی دروستکردنی گۆزەوهێزەکان دەدا. هەروەها مشووری ئەو بارستاییە قوڕە پێویستەشی بۆ بانگدەرەکە دەخوارد، لێنەدەگەڕا قوڕی لێببڕێ. مام ڕەمەزان بە تەنیا دەژیا، ژنەکەی کۆچی دوایی کردبوو، هیچ منداڵیشی نەبوون. ئەو تەنها چوارپێیەکی هەبوو، کە ڕزق و ڕۆزیی ڕۆژانی خۆی پێدابین دەکرد، بەتەنیاش لم و چەوی لە ڕووبارەکە دەردەهێنا و بەسەر پشتی کەرەکەی بۆ کڕیارەکانی دەگواستەوە.

مام ڕەمەزان بە نەرمی سڵاوی لە ئاغاجان کرد ئەویش وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە و بەدەست ئاماژەی بۆ کرد بفەرموویتە ژوور.

- "گوێم لێبگرە، دەمێکە کازم خان هیچ بەنگێکی نەکێشاوە. جەستەکەی لاسەنگ و بێ ئۆقرە بووە. دەکرێ دادەکان دەستەیەک بەنگی بۆ سازو ئامادە بکەن، سائەگەر ئەو بەنگەکەی کێشا و دووکەڵەکەی بەدەم و لووتدا پەرشوبڵاوبووەوە، دێتەوە سەرخۆی و ئارام دەگرێ."

مام ڕەمەزانیش ناوبەناو بەنگی دەکێشا، لێ پارەی بەنگەکەی نەبووتا بیکڕێ. ئەو بەسەرداناکەی بۆ ئاغاجان دڵخۆش بوو، چونکە دەیزانی کازم خان باشترین جۆری بەنگی شاخەکانی کێشاوە. ئەو بەنگەش کە خۆی جاروبار لای دۆست و هاوڕێیانی دەکێشا بەنگێکی قاوەیی تۆخ بوو، هەندێکیش بۆن بۆگەنی لێدەهات، هەرچی ئەوەی کازم خان بوو بەنگێکی ڕەنگ زەردی قاوەیی بوو، بۆنەکەشی بۆنی گوڵە کێویلکەی شاخانی لێدەهات.

ئیدی ئاغاجان نیو دەسکی لە بەنگ دایە دەست مام ڕەمەزان. ئەویش هەر یەکسەر خستیە بەرکی لەوێ چووە دەر تا یارمەتی ئاگرکردنەوەی دادەکان بدا.

زۆری نەخایاند، گولێ بە خوێی و چەند سەرکە بزۆتێکی گەشاوە و چایەدانێک هاتە ژوور. بەچاوی فرمێسکاوییەوە تەماشای کازم خانی کرد و پەنگردانەکەشی لەسەر زەوی دانا. مام ڕەمەزانیش قەلنەکەی لەسەر پشکۆ گەرمەکە دانا و بەستە بەنگەکەشی وردورد کرد.

کاتێکیش سەبیلەکە[٧٢] گەرم داهات، پارچەیەک بەنگی بە دەزیلەیەک گرت و خستییە سەری سەبیلەکە، ئەوسا بە پەنگرکێش[٧٣] ژیلەمۆیەکی گەشاوەی لەسەر بەنگەکە دانا. پاشان بە نەرمی هەندێکی کێشا تا دەشهات قوومی قووڵی لێدەدا. بۆ چرکەساتێکی چاونوقاندن خۆی لەبیرکرد، لەیادی چوو بەنگەکە بۆ کازم خان سازێندراوە، کاتێکیش نیگای بە نیگای ئاغاجان کەوت، سەبیلەکەی بە دەستی چەپ و پەنگرکێشەی بە دەستی ڕاستی بزۆتە گەشاوەکەی پێگرتبوو.

ئەو هەندێک بەسەر کازم خاندا چەمایەوە، بزۆتە گەشاوەکەی لە سەر بەنگەکە دانا، مژێکی لێدا، بەنگەکەش سووربوو گەشایەوە و دووکەڵەکەشی بە دەموچاوی کازم خاندا کرد.

نیو سەعات بەو ئارامییە بەنگەکەی کێشا و دووکەڵە شینە تۆخەکەش بەناو هەوای ژوورەکە وەربوو.

ئەوسا قاپیی ژوورەکە کرایەوە، قودسییە شێتۆکە لێوەژوور کەوت. دادەکانیش هەوڵیاندا ڕێگەی پێبگرن، لێ بەدەست ئاماژەیەی بۆکردن کە پێویست ناکا سەخڵەتی بکەن. قودسی هاتە سەر سەری کازم خان، هەندێ بۆ پێشەوە بەسەریدا چەمایەوە، سەیری ڕووخساری کازم خانی کرد، منگەمنگێکی لێوەهات، بێ ئەوەی هیچ شتێکیش بە ئاغاجان بڵێ، لە هۆدەکە دەرچوو.

---

[٧٢] سەبیلە: قەلن.

[٧٣] پەنگر گر ، بۆ گرتنی پەنگر و بزوت و دارراپێشکردنی بۆ نێو سپبە بەکار دێ.

"دەی بەسیەتی." گوڵبانو وای بە مام ڕەمەزان گوت؛ "خۆ ئەگەر ئێوە لە ژوورەکە بچنەدەر، ئەوا ئێمە هەندێ قورئانی لەسەر دەخوێنین." ئاغاجان، کە بەهۆی بەنگەکە هەندێ خەواڵوو ببوو، لە کۆتاییدا لەگەڵ مام ڕەمەزان چوونەدەر.
پاشان گوڵبێ دەستی دایە قورئانەکە و لە تەنیشت گوڵبانو لەسەر ناوکەوی ژوورەکە، لەسەر زەوی دانیشت. ئەوان هیچ زەحمەتییەکیان لە خوێندنەوەی کتێبە کۆنەکان نەدەبینی، لێ لە خوێندنەوەی قورئان هەندێ هێواشتر بوون. مایەی بەختەوەرییان بوو، کە چەند سورەتێکی قورئانیان لەبەر بوو. گوڵبانو کتێبەکەی لێککردەوە و سەیری لاپەڕەکانی کرد، سورەتێکی هەر لەبەر خوێندەوە. گوڵبێش هەمان شتی دووبارە کردەوە.
ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (١)
إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ (١٧)
فَتَنَادَوْا مُصْبِحِينَ (٢١)
أَنِ اغْدُوا عَلَى حَرْثِكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَارِمِينَ (٢٢)
وَغَدَوْا عَلَى حَرْدٍ قَادِرِينَ (٢٥)
فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوا إِنَّا لَضَالُّونَ (٢٦)
بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ (٢٧)

{سوێند وە بنووس، بەوەش کە دێتە نڤیسین.
ئێمە ئەوانەمان ئەزموو، وەک خاوەنانی باغەکەن بەر ئەزموون دا، کە سوێندیان خوێند: سۆزی بەری باخەکەیان هەموو دەڕنن.
ئەوسا سۆزی، هەموو بانگی یەکتریان کرد:
ئەگەر ئێوە میوەڕنن هەر بەیانی بگەنە سەر کێڵگەی خۆتان.
بڕیاریان دا مەرجەکەیان بەجێبێنن؛ واشیان دەزانی دەتانن.
وەختێ چاویان پێداگێڕا، وتیان: ڕێمان لێتێکچووە.
نەخێر، ئێمە بەشبڕاوین.}
ئەوسا دەمی بردە بنگوێی نەخۆشەکە و بە سرتەوە پێیگوت: "کازم خان، تۆ دەستت بە کۆچەکەت کرد. ئێمەش بەدواتدا دێین. ئێمە ڕازێکمان هەیە، هێشتا بۆ کەسمان نەدرکاندووە، بەڵام هەر ئێستا بەتۆی دەڵێین. زۆر نابا دەچینە مەککە، هەموو شتێکیشمان لە لای پێغەمبەر خدری زیندە بۆ ڕێکخراوە. ئێمە

لە نەخشەماندا بوو بێینە جیریا و ماڵئاواییت لێبکەین. من ماچت دەکەم، کازم خان، ئێمە چاوت ماچ دەکەین. ئێمە لەگەڵ تۆ زۆر بەختەوەر بووین."
ئیدی هەردووکیان هەنیەی کازم خانیان ماچکرد ولە ژوورەکەش هاتنەدەر.



بۆ شەوی سێهەم ئاغاجان هەستیکرد مردنی کازم خان نزیکبۆتەوە؛ ئیدی بە تەنها چووە ژوورەکەی و دەرگاکەشی لەدواوە داخست، ماچێکی لە تەوێڵی مامەکەی کرد و چرپاندییە بن گوێی: "دەکرێ هەنووکە بەگەردن ئازادیی کۆچ بکەی. ئێمە هەمووان تۆمان لەیاد دەمێنێ، منیش پێڵاوەکانت بۆیاغ دەکەم و دەفتەری شیعرەکانیشت لە ژووری گەنجینەدا هەڵدەگرم. من لە تەنیشت تۆ دانیشتووم، دەستەکانت توند دەگوشم."
ئینجا شاباڵ بەئارامی هاتە لە لای دەرگاکە وەستا.
- "دەتوانی چایەکی رەش و کەوچکێک بێنی؟" ئاغاجان وای داوا لە شاباڵ کرد.
ئینجا بە پەنجەی دەست هەندێ بەنگی کردە نێو پیاڵە چایەکە کە شاباڵ بۆی هێنا، و وردە بەنگەکەی بە کەوچکەکە لەنێو چایەکەدا وەردا تا تاواندییەوە. "ئەوەتانێ، ئاغاجان وای بە شاباڵ گوت؛ "دەی هەندێ بەو کەوچکە بەسەر دەمی وەبکە، ئاخر جەستەکەی داوای ئەو شتە دەکا. بۆ ئەوەی گیانەکەی بە ئارامی لە لاشەی بێتەدەر."
شاباڵیش بە ئەسپاییەوە شلە قاوییە زەردباوەکەی، کەوچک بە کەوچک بەسەر دەمی کازم خانەوە کرد.
ئاغاجان دەستی خستە سەر شانە رووتەکانی مامی و گوتی: "گیانەکە وا دەڕوا." ئینجا بەسەریدا نووشتایەوە دیسان نێوچەوانی ماچ کردەوە. بە هێواشی ژیانی ئەو پیرە پیاوە کۆتایی هات. "ئەو کۆچی کرد،" بە دەنگێکی خەمبارەوە گوتی؛ "دەی دەکرێ هەنووکە ماڵێ لێئاگادار بکەیتەوە."
دادەکان پێش هەموویان هاتنەوە ژوور، ئەوان سەرەخۆشیان لە ئاغاجان کرد و بە بێدەنگی لەوێ وەستان. دواتر بەگریانەوە فەخری سادات، زینەت خانم و بانگدەرەکەش هاتن. پاشان ئاغاجان پێڵاوەکان و دەفتەری شیعرەکانی کازم خانی هەڵگرت و بە تاریکی بەرەو مزگەوتێ بەڕێکەوت.



مزگەوتەکە ژوورێکی گەنجینەی هەبوو، شوێنێکی پەنهان لە ژێرزەمینەکەدا بوو، چەندان سەدە بوو شتە پڕ بایەخەکانی ماڵەکەی تێدا هەڵدەگیرا.
بڕوانامە، گرێبەست، نامە و شتە تایبەتییەکانی مەلا کۆچکردووەکانی سەردەمی زوو تا هەنووکە، هەموویان لەوێ هەڵگیرابوون. بێجگە لەو شتانەش، سەدان فایل بە هەواڵنامەی مزگەوتێ کە لە لایەن سەرپەرشتیارانی مزگەوتێ، هەروەک ئێستا چۆن لە لای ئاغاجانەوە بەڕێوەدەچێ و دەنووسرێ، لە ماوەی سەدەکانی ڕابردوو تا ڕۆژی ئەمڕۆ لێرە لەو پەنا ژێرزەمینەدا پارێزراون. هەمووشیان بە ڕیزبەندی لەنێو سندووق و باولەکان لەسەر یەک داندراون.
ژووری گەنجینەکە وەک کانییکی زێڕینی ڕووداو و زانیارییە مێژووییەکانە. مرۆ دەتوانێ دیرۆکی وڵاتەکە، هەرچی لایەنە ئۆلییەکەی بگرێتەوە، لە ئەرشیفەکەدا بدۆزێتەوە. هەروەها هەندێ شتی تایبەت و گرانبەهای ئاکنجیانی ماڵەکە لەوێدا حەشاردرابوون.
خۆی لەڕاستیدا دەبوایە ئەرشیف و شتەکان بخرابانە مۆزەخانەیەک و نمایش بکرێن، بەڵام خۆ ئەو کەلوپەلانە، شتە تایبەتە دەگمەن و بێوێنەکانی ئەو کەسانە بوون، کە بەشێک بوونە لە ماڵ و لە مزگەوتەکە.
هەمیشە سەرپەرشتیارانی ماڵەکە، کلیلی ژووری گەنجینەکەیان لە لای خۆیان بووە.
بەڵام بەدەر لە ئاغاجان، شاباڵیش بە باسوخواسی ژوورەکە و ئەوەی تێیدایە دەیزانی. ئاخر ئاغاجان باسی فایلەکانی بۆکردبوو.
- "هەر خودا بە تەنیا دەزانێ ئاخۆ مرۆ کەی سەردەنێتەوە. بەڵام ئەگەر مردم، کلیلەکە لای تۆ دەبێ. تۆ لە فایلی هەواڵنامەی ڕووداو شتەکان تۆماردەکەی. هەر تۆش بڕیاردەدەی چی بەسەر بێ." ئەم قسەیە ئاغاجان بە شاباڵی گوتبوو.
ئاغاجان بە خۆیشی بیست و حەوت ساڵان بوو، کە بۆ یەکەمین جار ژووری گەنجینەکەی بینی.

کاتێکیش باوکی کۆچی دواییکرد، دەستی دایە لایەت و بەتاریکی شەو لە هۆدە ژێرزەمینەکەی مزگەوتێ وەژوور کەوت. بەدەستی لەرزۆکەوە کلیلەکەی لە کونی دەرگا کۆنینەکە بادا، قاپیەکەی کردەوە و پێینایە ژوور.
ئەوکات واپێدەچوو وەک ئەوەی لە نێو خەون دابێ، ئاخر ژوورەکە هیچ بە ژوورێکی ئاسایی نەدەچوو. مافوورێکی گوڵناری کۆنینە لەسەر ناوکەوەکەی ڕاخرابوو. کورسی و مێزێکیش لەوێ داندرابوو، کە کتێبێکی کراوەی لەسەر بوو. ئەنجا پەڕی قازێکی لەنێو مەرەکەبدانێکدا بینی. لەوێدا بەدەیان پێڵاوی خاوێن لەنێو دۆڵابێکی لای دیوارەکەدا هەبوون، پەردەیەکی تەنکی تۆزو غوباریان لەسەربوو، هەریەکەشیان کارتێکی تێدابوو، لەسەری نوسرابوو ئاخۆ ماخوکەی[٧٤] کێیە. پێڵاوەکان هی مەلا کۆچکردووەکانی مزگەوتێ بوون. لە بەرامبەر دۆڵابی پێڵاوەکانیش، دۆڵابێکی دیکە هەبوو، دووگرد و مێزەری ڕەشی هەر مەلایەکی کۆچکردوی پێوە هەڵواسرابوو. لەنێو هەندێ باولدا گۆپاڵ و کەلوپەلە تایبەتییەکانی مەلا کۆچکردووەکان و کاغەز و بەڵگەنامە گرنگەکانیان تێدا هەڵگیرابوو.
ئاغاجان بە خۆی، دەقاودەق نەیدەزانی ئاخۆ مزگەوت و خانووەکەی مزگەوتێ چەند کۆنن، لێ گەر بیوستبایە، دەکرا بێتە ژێرزەمینەکە و شتەکەی بۆ ساغ ببێتەوە. ئەو بە خۆی و لایەتی دەستی بەلای دۆڵابی شتەکان بەناو ژوورەکەدا ڕۆیی تا گەیشتە کۆنترین باول، کە فایلی هەواڵنامەی بەرایی مزگەوتیی لەنێو خۆدا هەڵگرتبوو. لەوانەیە ئەو باولە نەخشە بیناسازییەکەی یەکەمین بناغەی ماڵ و مزگەوتەکەی تێدا بێ. لەو سەری ژوورەکەش ڕاڕەوێکی تەنگوتاریک هەبوو. ئاغاجان گومانی وابوو هێشتا باول و دۆڵابی دیکەی لێداندرابێ. ویستی سەرێکی بەسەردابگرێ، لایتەکەی هەندێ بەرزکردەوە، بینی لەسەر دیوارەکە کۆمەڵێ باوەڕنامە و دەستنووس هەڵواسراون. شەوقی لایەتەکە کزبوو، بەباشی دەقی نووسین و نیگارەکانی بۆ لەیەک جیانەدەکرانەوە. کاتێکیش ویستی بەناو ڕاڕەوەکەدا بڕوا، بینی تۆزێکی ئەستوور لەسەر مافوورە سوورەکە وەک هەموو سندووق و باول و جل و کەلوپەلەکانی دیکەدا کەوتووە. پێدەچوو لە سەدەکانی ڕابردوودا کەس

[٧٤] ماخۆ: خاوەن.

تخونیان نەکەوتبێ. کەواتە بۆ ئاغاجانیش نەبوو هەنگاوێکی دیکەیان لێبچێتەپێش.

شتەکە وەک ئەوە وابوو، بە تەبەقە تۆز و غوبارێکی تەنک مۆرکرابێ، ئیدی تۆش بۆت نەبێ مۆرەکەی سەری بشکێنی. ئەو مەیلی لێبوو بەلای جوبەکاندا بڕوا و لە خاوەنە کۆنەکانی، مەلا کۆچکردووەکانی سەردەمی بەرێ بکۆڵێتەوە. تۆ بڵێی ئەوان کێ بووبن؟ چ جۆرە جلێکیان پۆشیبێ؟ چ جۆرە ئەنگوستیلەیەکیان لە قامکیان کردبێ؟ ئەو حەزی لێبوو سەری یەکێ لەو باولە دێرینانە هەڵبداتەوە و سەیری شتومەکەکانی نێویان بکا، بۆنی جلەکان بکا، یەکێ لە ئەنگوستیلەکان بخاتە پەنجەی و هەواڵنامەیەکی بەرێی مزگەوتێ بخوێنێتەوە. تۆ بڵێی ئەوان لەو سەردەمیاندا دەربارەی چییان نووسیبێ؟ چی لە خانووەکە، مزگەوت و بازاڕی ئەوێ ڕۆژێ گوزەراوە؟ تۆ بڵێی ماسییە بەرایییەکانی نێو حەوزەکە ڕەنگیان چۆن بووبێ؟ چ جۆرە درەختێک لەجێی دار کاژە پیرەکە لەنێوەڕاستی حەوشەکەدا ڕوێندرابووە؟ چ جۆرە قەلێنک پێشەنگی ئەم قەلەی ئێستا بووە؟ ئەو دەیەویست، بە هەفتە، بە مانگ لەژێر زەمینە تاریکەکەدا بمێنێتەوە و گەشتی خۆی بۆ سەردەمانی ڕابردووی دوور بکا. وەڵامی پرسەکانی وەربگرێتەوە. لێ ئەمە ئەستەم بوو، ئاخر ژێرزەمینەکە ڕازێک بوو لەبن تاریکییدا، نهێنییەکی سەر بەمزگەوتێ، سەر بە قورئان و سەردەمی لەدەستچووی ڕابردوو بوو.

ئاخر تۆ هیچ دەروازەیەکت بۆسەر ڕۆژگاری ڕۆیشتوو نەبوو. ئاغاجان تێگەیشت، دەبێ واز لە پرسنییەکەی[٧٥] خۆی بێنێ. ئیدی دەفتەرە شیعرییەکەی کازم خانی خستە ناو باولێک، بەدواییدا پێڵاوەکانیشی لەنێودانان و لایتەکەی کوژاندەوە و لە ژێرزەمینەکە هاتەدەر.



کازم خان لە وەسیەتنامەی خۆییدا نووسیبووی، ئەو نایەوێ لە گۆڕستانە ژێرزەمینییەکەدا بنێژرێ. هەر بۆیە گوندییەکان لە شوێنێکی جوان لە لادێکەدا بۆی گەڕابوون. ئەوان شوێنێکیان لەسەر گردێک بەرامبەر دار بادەمێکی پیر

[٧٥] پرسنیی: فزولییەت.

دەستنیشـانکردبوو، کە لە بەهارانـدا بەهەزاران گـوڵ و گوڵـوکی بەسـەردا هەڵدەوەری.
بۆ ڕۆژی پاشتر، دەیان لەخەڵکی گوند بەرەو شار هاتن، تا تەرمی شاعیرەکە لەگەڵ خۆیـان بـبەنەوە گونـدی جێریـا و لەوێ بەخـاکی بسـپێرن. ئاغاجـان، فەخـری سـادات، زینـەت خـانم، بانگـدەرەکە و دادەکـانیش لەگەڵ تەرمەکەدا ڕۆیشتن.



ڕێک چل ڕۆژ دوای مردنی کـازم خـان، ئەو ڕۆژە هـات، کە دادەکـان گەشتی حەجێیـان بەرەو مەکـکە دەسـتپێکرد. دوای نـوێژی بەیـانی، دادەکـان چارشـێوەکانیان لەخۆیـان دا و دەسـتیان دایە جانتاکانیـان و چـوون لە لای حەوزی ئاوەکە وەستان.

- "ئێمە وا دەڕۆین!" گوڵبانوو وای بانگکرد.
- "ئێمە دەڕۆین گەشتی ژیانمان دەکەین!" گوڵبێش بەدوایدا وای گوت.

دادەکـان هەمیشـە لەوە دەترسـان، نەبـادا کەسـێک بە نهێنییەکەیـان بزانـێ و گرێبەسـتی حەجەکەیـان هەڵبوەشـێتەوە. بانگـدەرکە یەکەمـین کەسـبوو، گوێی لێبوون، دەستبەجێ لە ژوورەکەی هاتەدەر و بانگی کردن: "ئەرێ ئێوە بەرەو کوێ دەڕۆن؟"

- "بەرەو مەککە!" ئەوانیش وا وەڵامیان دایەوە.
- "مەککەی مەککە؟" دیسان وای لێپرسینەوە.
- "لەڕاستیدا نابێ ئێمە هیچ بڵێین، ئەم شتەمان بەئاسایی لێوەربگرە."

بانگدەرەکە دەستی لە هەگبەی دادەکان دا، جانتاکان هەگبەی ڕۆیشـتن بەرەو کەعبە بوون. ئینجا بە دەنگی بەرزەوە بـانگیکرد: دادەکـان وا دەڕۆنە مەککە!" دیـاربوو هەمـووان بەخەبەر بـوون، چـونکە ئاغاجـان گڵۆپەکـانی حەوشـەی پێکردبـوو، ئیـدی هەمـووان بە جلـی ئاهەنگئـامێزانە لەوێ دەرکەوتـن. ئەوان پێـدەکەنین و دەگریـان، باوەشـیان بە دادەکانـدا دەکـرد و لە دڵەوە ماچیـان کردن.

فەخری سادات بە بخورێکی داگیرساوەوە بەرەو دادەکان هات، لەکاتێکدا کیژەکانی نەسرین[٧٦] و ئەنسی[٧٧] بە ئاوێنەیەک و سێوێکی سوور یاوەری دایکیان دەکرد. زینەت خانمیش بە گوێرەی دابونەریت جامە ئاوێکی وەک ئاماژەیەک بۆ بەختی گەشتکەران هێنا.
شاباڵ قورئانێکی کۆنینەی لەسەر ڕەفەی کتێبخانەکە دەرهێنا و دایە دەستی ئاغاجان. گوڵبانو و گوڵبێش دەستیان دایە هەگبەکانیان. ئاغاجان ماچی کردن، قورئانەکەی لەسەر سەر ڕاگرتن و تا دەرگای دەرەوەیان لەگەڵدا چوو.
زینەتیش بەدوایاندا جامە ئاوەکەی ڕشت. هەموویان وا گریان وەک ئەوەی جارێکی دیکە دادەکان بۆ ماڵەکە نەگەڕێنەوە.

## سایە

ئاغاجان تێبینی ئەوەی کرد، یەک دوو جاران زینەت بە شەو لە ژوورەکەی خۆی دەردەچێ، لێ نەیدەزانی بەرەو کوێ دەڕوا. هۆدەکەی زینەت لە نهۆمی دووهەمی خانووەکە بوو، هەر کاتێکیش لە نهۆمەکە دابەزیبا، هەر دەبوایە بە لای ژووری نوستنی ئاغاجان و فەخری ساداتدا تێپەڕیبایە.
شەو درەنگانێک، کاتێک هێشتا ئاغاجان هەر لە ژووری کارەکەی خۆیدا مابۆوەوە، دەیخوێندەوە؛ گوێی لەدەنگێک بوو لەسەر پەیژەکانی نهۆمی سەرەوە. سەرەتا وایزانی دەنگەکە هی فەخری ساداتە، بەڵام دواتر کە گوێی لە دەنگی پێ نەما، لە درزی پەردەکە سەیرێکی دەرەوەی کرد، بینی کەسێک لە تاریکییدا بەوێدا تێدەپەڕێ.
ئینجا دەرگای ژوورەکەی کردەوە و چووە نێو حەوشەکە. بۆ ساتە چاوتروکاندنێک تارماییکی چارشێوێکی ڕەشی لەسەر پەیژەکانەوە بینی.
لەوانەیە زینەت بێ، بەڵام تۆ بڵێی بەو ناوەختەی شەو بچێتە کوێ؟
ئاغاجان چووەوە ژوورەکەی. قەلەباچکەکەش لەناکاودا قیغاندی.

---

[٧٦] Nasrin
[٧٧] Ensi

ئەو قـیفە هۆشـداریەی قەلەڕەشـەکە بەسـەرهاتی ژنەکەی (سـەرانديب)ی[78] بیرهێنایەوە:

جارێکیان لە سەرانديب دووکاندارێک هەبوو، ژنێکی هەبوو ناوی جامیس[79] بوو. کەس بڕوای نەدەکرد، ژنە شۆخ و شەنگ هەبێ. سیمای ژنەکە وەک ڕۆژی پیرۆز دەدرەوشایەوە و قژەکەشی وەک شەو تاریک و درێژ بوو، وەک شەوێک کە ئەڤینداریک بێهوودە چاوەڕێی یارەکەی بکا.

جامیس پەیوەندییەکی نهێنی لەگەڵ هونەرمەندێکی ناودار پەیداکردبوو، کە فڵچەی دەستی نیگاری تەلیسمائاسای لێدەباری. جارێکیان ژنەکە بە دزییەوە چووبووە لای یارۆی هونەرمەند و بەیەکەوە شەوێکی هەرە خۆشی ئێرانییانەیان بەسەر بردبوو. شەوێکیان ژنەکە بە دۆستەکەی گوتبوو: "ڕۆژ بە ڕۆژ تادێ، بۆ من سەختتر دەبێ بگەمەلات، لەوەش سەختتر چاوەڕێی شەوێکی گونجاو بکەم. دەی بیر لە شتێک بکەوە، بۆ ئەوەی زۆر جار بێمە لات، ئاخر خۆتۆ هونەرمەندی، دەکرێ شتێکی وات بەخەیاڵدا بێ."

- "بەڵێ شتێکم لە خەیاڵدایە." هونەرمەندەکەش وا وەلامیدایەوە: "بەڵێ من چارشێوێکت بۆ دروست دەکەم، دیوێکی ئەوەندە روون بێ وەک ئەستێرەی بەرەبەیان لەنێو ئاودا وابێ، دیوەکەی دیکەشی بەقەد تاریکی شەو ڕەش بێ. بە شەوان لایە ڕەشەکەی بەسەر خۆت دابدە، وەک بەشێک لە شەو خۆت بخشێنە لای من. بەیانیانیش چارشێوەکە هەڵبگێڕەوە و بەدیوە ڕۆشنەکەی وەک بەشێکی بەیانیان بچۆرەوە ماڵ."



هەنووکە دادەکان لەوێ نەماون، ئیدی قۆناغێکی نوێ لە ماڵەکە دەستپێکردووە. ئەو ڕیتمەی ئەوان بە ماڵەکەیان بەخشیبوو، نەما و ڕۆیی. خۆ مرۆ هەر لە کاتژمێرە کۆنباوەکەدا دەیزانی، کە لەپڕێکەوە لە کارکردن کەوت و وەستا. کاتێکیش هێشتا دادەکان هەر لە ماڵ بوون، نادینەکە بە جووڵە بوو، قەلەکەی مزگەوتێ لەگەڵ هاتنی هەر میوانێک بۆ ماڵەکە

---

[78] Srandieb
[79] Djamis

دەیقیغاند و ژووری کتێبانیش هەمیشە پاک ڕادەگیرا، بەڵام واپێدەچی ئەو ڕۆژگارە بەسەر چووبێ.
پێشتر دادەکان منداڵەکانیان لە خەو هەڵدەستاندن، یارمەتی فەخری ساداتیان دەدا تا ژوورەکەی خاوێن بکاتەوە. ئەوان ئاغاجانیان لە هەموو شتێکی ماڵەکە ئاگادار دەکردەوە و ئاگاداری ژووری گۆزەکاری بابای بانگدەرەکەش دەبوون. بەڵام ئێستا دوای ئەوان، کەسێک نییە ئەو ئیشانەی ئەوان دەیان کرد، لە ئەستۆ بگرێ.
کەس نەیتوانی جێگەی ئەوان پڕ بکاتەوە. خۆ ئەگەر ئەوان هێشتا لەوێ مابان، ئەوا بۆ سەربانەکە بە دوای زینەتدا دەچوون.



ئاغاجان لە مەلایە جێگرەوەکە ڕازیبوو؛ ئاخر کارەکانی خۆی بە جۆش و پەرۆشەوە ڕایی دەکردن و کەسێکی بەختەوەریش دیاربوو. لە کاتی گفتوگۆی یەکەمیاندا، ئاغاجان تێبینی ئەوەی کرد، مەلایەکە مجێزبەرز و باڵافرە، لێ گومانی لە توانا و کارامەییەکەی هەبوو.
ئەو شتێکی وای نەبوو بەدەر لە باسوخواسی کێشەکانی لادێ نەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا کارەکانی خۆی باش بەجێ دەگەیاند. لە دواجاردا ئەو ڕەخنەی توندی لە وەزیری کشتوکاڵ گرتبوو، بە بەراورد لەگەڵ هەژاری لادێیەکاندا، نەخشەکانی وەزیر کەموکورتیان هێنابوو، ئەویش ئەمەی بە توندی باسکردبوو.
مەلایەکە هەرگیز نەچووبووە تاران، بەڵام لەیەکێ لە وتارەکانیدا، سەرنجێکی لەسەر ڕەوشەکە دابوو، کە لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەیەکی خۆجێییدا هاتبووەوە: 'وەک گوێم لێبووە، لە تاران هەموو کەسێک تەلەفۆنی لە ماڵەکەی خۆیدا هەیە، بەڵام لە سەدان گوندی نێو شاخەکاندا تاقە دەزگایەکی تەلەفۆنیش بەدیناکرێ. لە تاراندا و لە حاڵەتێک گەر سەری پەنجەی خۆت لە ناندیندا بریندار بکەی، دەمودەست دەتوانی زەنگ بۆ ترۆمبێلی فریادرەس[80] لێبدەی، بەڵام لێرە لە گوندەکان گەر باوکت بە مردوویش لەسەر جێگا بکەوێ، هیچ شوێنێک شک نابەی پەنای بۆ بەری. من تاران ئاگادار

[80] ئەمبیولانس

دەکەمەوە، بـا بیـری لێبکەنەوە! ئـاخر خـوا هەمـووانی وەک یەک دروسـت کردووە."

پۆلیس و ئاژانەکانی دەزگای هەواڵگری نهێنی بە خەندەوە لەو تاوانبارکردنە نیازپـاک و بێوەییـانەی مەلای مزگەوتێیـان دەڕوانـی. ئەوان پێزانینیـان بـۆ قسەکانی هەبوو، لە دڵەوە پشتیوانی لەو جۆرە ڕەخنانە دەکران.

لەسـەر سـەرنج و تێبینییەکـانی مەلای جێگـرەوە، وردە وردە خۆشەویسـتتر دەبوو، ڕۆژنـامە و بڵاوکراوە ناوخۆییەکـانیش ئاماژەیـان بە دوانەکـانی دەدا. ئاغاجـانیش پشـتگیری دەکـرد و مەودایەکـی فراوانتـری بـۆ ڕەخسـاند. جارێکیشیان، کاتێک وێنەیەکی مامۆستا و بەشێک لە دوانەکەی لە ڕۆژنامەدا بڵاوکرابـووەوە، ئاغاجـان تەلەفـۆنێکی لە هاوکـارێکی بـۆ کـرا: "ئەو پیـاوێکی سـاویلکەیە، بەلام تـا دێ لە گۆشـە نیگـایەکی چـاوەڕواننەکراودا تیژتـر دادەبەزێ."

تا ئەوکات ئەوە ڕووی نەدابوو، کە وێنەی مەلایەکی مزگەوتێ بکەوێتە سەر ڕووپەڕی ڕۆژنـامەیەک و بڵاوبکـرێتەوە. ڕۆژنـامەکە وێنەگرێکـی تـایبەتی ناردبووە مزگەوتێ. وێنەی مامۆستای بە وەستاوی لەسەر بانی مزگەوتێ، لە نێوان هەردوو منارەکاندا گرتبوو.

کـاتیکیش مامۆسـتا بـۆ ڕۆژی پاشـتر، وێـنەکەی خـۆی لەسـەر لاپەڕەی ڕۆژنـامەکەدا بینیـیەوە، هەمـوو ڕۆژەکە لە خۆشـی و وروژانەوە هەدادانـی نەمابوو. ئاخر خەونەکەی بەدیهات. ئەوەش خەونی لاوێتی بوو، کە ڕۆژێک لەڕۆژان دوان لە مزگەوتێکی گەورەدا بـدا. هەنـووکەش دوانەکەی کەوتـۆتە سـەر لاپەڕەی ڕۆژنامـان، ئیدی بەمە لەپڕێکەوە لە شـاری زەنجانـدا نـاودار بوو.



بە گوێرەی شەریعەت، زینەت و مەلای جێگرەوە هیچ هەڵەیەکیان نەکردبوو، پێویستیش نەبوو بترسێن. خۆ ئەگەر ئیماندارێک بۆ ماوەیەک لە شوێنێکی دیکە بژی و لە ژنە شەرعییەکەی خۆی دوور بێ، دەکرێ ژنێک بە سیغە[81]

[81] بەگوێرەی شەریعە کۆنەکەی ئیسلام دەکرێ پیاوێک ، بەدەر لە ژنە شەرعییەکەی خۆی، ژنێکی دیکە بێنێ. ئەم ژنهێنانەی کاتی دەبێ و لە تۆمارنامەی فەرمییدا لای شارەوانی یان مەلا تۆمار

بینێ. بەڵام مەلایەکە دەیزانی، بەم کارەی لەگەڵ زینەتدا سەرچڵییکی زۆری دیتەپێش. خۆ ئەگەر ئاغاجان بەم پرسە بزانێ، ئەوا دەستبەجێ لە ماڵ و مزگەوتەکە دەری دەکرد.

زینەتیش هەر زوو بە سەختی هەستێکی وای بە پێگەکەی خۆی وەک ژنی دووهەمی مامۆستا کرد. شەرمی لەخۆی دەکردەوە، کە لەگەڵ مەلا جێگرەوەکەدا لە شوێنێک چۆتە سەرجێ، کە مێردەکەی و دەیان مەلای پێشووتر لە گۆڕەکانی ساردادوەکەدا نێژراون. مامۆستاش هەموو شەوێ داوای لە زینەت دەکرد، سەرجێی لەگەڵدا بکا، لێ زینەت ئەمەی ڕەت کردەوە، دەترسا نەبادا ئاغاجان بە گۆبەندەکەیان بزانێ.

کاتێکیش مەلا زینەتی بە ڕۆژی ڕووناک دەبینی، ژنەکە بڕوای بە خۆی نەدەکرد، کە شەوانە بەیەکەوە و بە ڕووتی لەگەڵ یەک دەخەون. بەڵام خۆ لە تاریکایی شەودا بازار بازاڕێکی دیکە بوو، خەڵک ئەوانیان نەدەبینی، زینەت تەنها هەستی بۆ دەست و شانەکانی، پشت و ئەو جوڵەیەی مەلا لە سەر پێخەفەکەی دەکرد، دەڕۆیشت. ئاخر مەلا وەک ئەسپێکی خورت بە تەکان و گوڕ بوو.

دوای ئەوەی شەوان گانی خۆیان دەکرد، زینەت دەستی دەدایە چارشێوەکەی خۆی و خێرا لە ژوورەکەی مەلا دەردەچوو، دەگەڕایەوە هۆدەکەی خۆی. لەگەڵ دەرچوونیشیدا، نەیدەویست جارێکی دیکە بگەڕێتەوە لای، یان هەر بیچمیشی ببینێ. بەڵام هەر شەو دادەهات، گڵۆپی ژوورەکەی دەکوژاندەوە دەچووە سەر پێخەفەکەی و لێیڕادەکشا، غەریبی جەستە و هەرامەی مەلای دەکرد.

ئاخر مەلا کۆچکردووەکەی مێردی، هەرگیز مەمکەکانی ماچ نەدەکردن، ئەو هەرگیز وەک جانەوەرێک پری نەدەدایە و رانەکانی نەدەگەستن، کەچی ئەو مەلا جێگرەوەیە زینەتی دەگەیاندە ئەوپەری خۆشی چێژ و لەززەت، بەو زەوقەی وەریدەگرت، هەموو شتێک، یار و ئەغیاری لەبیردەکرد و دەچووە جیهانێکی دیکەوە.

---

ئاکرێ. نووسەر. (ئەمە پەراوێزی خودی ڕۆمانووسەکەیە، لەبەر ئەوەی بابەتەکەش ڕوونە، بۆیە من هیچ ڕوونکردنەوەیەکم نەنووسی. وەرگێڕ)



لەدوا جاردا مەلایەکە زینەتی بردە ناو سەردابە ژێرزەمینەکەی مزگەتیێ؛ لەوێ زینەتی ڕووت ڕووت کردەوە و هەرلەوێ لەسەر گۆڕە بەردینە رەق و ساردەکان بە توندی گای. هەرچەندە سەرەتا زینەت هەندێ پرکێشی کرد، نەیدەویست لە ساردداوەکە، کارەکەی لەگەڵدا بکا، بەڵام مامۆستا لەسەر حەزەکەی مکوڕبوو، باوەشی پێداکرد، توند گرتی، ئیدی زینەتیش خۆی بۆ شل کرد.

- "من جارێکی دی ئەمە ناکەمەوە، جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە لای ئەو پیاوە."

هەموو جارێک کاتێ زینەت دەگەڕایەوە ژوورەکەی خۆی، لای خۆی وای بڕیار دەدا؛ "بەڵام، ئای کە چ کاتێکی بە چێژ بوو، ئای چەند بەختەوەر بووم کە کەس بەمەی نەزانیووە. من دەبێ بوەستم، هەردەبێ بوەستم. بۆ ماوەیەک لێرە دووردەکەومەوە، دەچمە قوم، سەرێکی کچەکەم دەدەم، ماوەیەک لە لای ئەو دەمێنمەوە. من دەچمە سەر گۆڕی فاتیمەی زەهرا تا تۆبە بکەم، داوای لێبوردن دەکەم. من دەبێ ئەو کارە بکەم، هەر بەیانی، خۆم کۆدەکەمەوە، هەگبەکەم هەڵدەگرم و دەڕۆم."

بەڵام ئەو کارەشی نەکرد، هەنووکەش دیسان بۆلای مەلا جێگرەوەکە بەڕێوەیە. مەلایەکەش گوێی لە دەنگی پێیە نەرمەکانی زینەتە، کە لە قاڵدرمەکان دادەبەزێ. لە سەر پەیژەکان لە تاریکاییدا ون دەبێ، دواتر دەستەکانی لای حەوزی مزگەوتێ دەشوا و هەندێ ئاویش بە دەموچاویدا دەکا.

مەلا جێگرەوەکەش دیسان دەیەوێ بیباتەوە بۆ ژێر زەمینەکە، بۆ لای گۆڕەکانی سەردابەکە، بەڵام ئەو قایل نابێ. کاتێکیش مامۆستا ژنەکە بە هەردوو لەپە گەورەکانی دەگرێ، سەری خۆی دەخاتە سەر سینگ و پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر مەمکەکانی، ئیدی زینەت شل دەبێ و خۆی بە دەستەوە دەدا. ئینجا مەلا زینەت هەڵدەگرێ، دەرگای سەردابەکە دەکاتەوە و لە پەیژەکان دادەبەزێ.

لەوێ لە قووڵایی تاریکایی سەردابەکەدا، مۆمێک لەسەر کێلە گۆڕێکی بەرز هەڵدەکا. سەرەتا جلەکانی، پێڵاوەکەی و گۆرەوییەکانی ژنەکە دادەکەنێ، بە

پێی پەتی دەیبا دەیبا، تا دەیگەیەنێتە بەرتیشکی مۆمەکە. ئەوسا جوبەکەی لەسەر گۆڕێکی بەردین، لەپاڵ مۆمەکە ڕادەخا. لە پڕێکیش جادوبازانە هێشووە ترێیەکی سوور دەردێنێ، دەیخاتە سەر مەمکەکانی زینەت، ئەوسا دەنوشتێتە سەری و دانەدانە دەیخوا. ئاوی ترێکەش بە سەر سینگ و بەنێو درزی مەمکەکانی زینەت بۆ سەر زگ و ناوکی شۆڕدەبێتەوە، ئیدی مەلاش دەست بەلێسینەوە دەکا، ئەمما لێستنەوە، زینەتیش لە خۆشیان خەریکە لەخۆی بچێ.

ئەوان بەو شێوە سەرگەرمی خۆشی و لەززەتی خۆیان بوون، بێئاگا لەوەی کەسێک بەلایەتی دەستییەوە بە بەر پەنجەرە بچکۆلانەکەی ژێرزەمینەکەدا تێپەڕی.

مەلا جێگرەوەکە بە زینەت و شەربەتەکە مەست بوو، بە دەنگێکی بەرز لەو کاتەی سواری زینەت بوو، سورەتی ئەلفەلەقی دەخوێندەوە:

**قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ الفَلَق (١)**
**مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ (٢)**
**وَمِنْ شَرِّ غاسِقٍ إذَا وَقَبَ (٣) ...**

**{بێژە: من خۆم دەپارێزم، بەوەدیهێنی زا لەماک،**
**لە وەزەنی هەرچی دروستی کردووە؛**
**لە رووشەی شەو، کاتێ تاریکایی دادێ.}**

ئەو دەیگوت و زینەتیش بە چاوی نوقاوەوە گوێی گرتبوو، ئەوان تێبینییان نەکرد، کە یەکێ بە لایتەوە لە پلیکانەکانی ژێرزەمینەکە دێتەخوارێ.

سەرەنجام لەپڕ ڕوناکییەکیان بینی و گوێیان لەدەنگی پێیەک بوو. زینەت پاڵێکی بە مەلایەکەوە نا، دەستی دایە چارشێوە ڕەشەکەی و خۆی لەتاریکاییەکەدا حەشاردا.

مەلا جێگرەودکەش خۆی وەرسوڕاند، بیچمێکی بینی کە بەلایەتی دەست لەسەر سەریەوە وەستاوە.

"مەلا، دەی بارگەوبنەت بپێچەوە و لێرە برۆ و دەفن بە!"

# حاجی

ئاغاجان مەلا جێگرەوەیەکی دیکە، مامۆستا پیرەیەکی لە ساروخەوە[82] هێنا. ئەو کەسێکی ئارام بوو، لە وتار و دوانەکانیدا زیاتر باسی ژیانی ئیمامە پیرۆزەکانی سەردەمانی زووی دەکرد. ئاغاجان لێیرازی بوو. ئاخر مایەی سەختڵەتی نەبوو، کە ڕەوشی مزگەوتەکە هەندێک هێوربکرێتەوە.



سێ مانگ بەسەر هاتنی مەلا نوێیەکەدا تێپەڕی، کاتی گەڕانەوەی کاروانی حاجیانیش لەمەککەوە هات.

ئاغاجان ویستی بە گەڕانەوەی دادە حاجییەکان ئاهەنگێکی گەورە ساز بکا، هەموو ئەندامانی خانەوادەکەی تێدا ئامادە بین.

هەموو کاتێکیش ئاهەنگی بە پیرەوەچوون و بەخێرهێنانەوەی حاجیان بۆنەیەکی تایبەت بوو. ئیدی ماڵی حاجییە گەڕاوەکە بە گڵۆپی تیشک تەنک و کەمی ڕەنگین دەنەخشێندرا، مافوورەکانی ژوور لوولدەدران و ئامادەکارییێکی باش دەکرا. ئاخر هەفتەیەکی ڕەبەق ئەندامانی ماڵباتەکە، خزم و کەسوکار، دەروردراوسێ دەهاتنە پێپیرۆزانەی حاجییەکان، هەمووشیان بۆ ژەمە خواردنی سفرەی ڕازاوەی ئاهەنگئامێز دەمانەوە. لە ماوەی ئەو مێوانداریيە خۆشەدا، ئەو پیاوەی لە گەشتی مەککە گەڕابايەوە نازناوی ڕێزلێگیراوی "حاجی" و ئەگەر ژنیش بووایە "حاجییە"ی پێدەبەخشرا. ئیدی ئەو نازناوەیان بۆ هەمیشە بەسەردا دەبڕا.

ئاغاجان نامەیەکی بۆ نوسرەتی برای نووسی:

- "برا خۆشەویستەکەم، لە دوا جاری گەڕانەوەت بۆ ماڵ، عەیامێکی درێژی بەسەردا تێپەڕیوە، دەی زووتر و زیاتر سەربدەوە. بۆ بەخێرهاتنەوەی دادە حاجییەکان هەمووانم بانگهێشت کردوون، دەمەوێ لەو بۆنەیەدا تۆش ئامادەبی، هەوڵدە لە کاتی خۆیدا بگەڕێیتەوە ماڵ. ئاخر ئەوان هەموو ژیانی خۆیان لەپێناوی ماڵەکەدا خەرج کرد، ئیدی ئەرکی ئێمەیە بە ئاهەنگێکەوە

[82] Saroeg

پێشوازییان لێبکەین. لە ماڵەوە هەمووان غەریبی مام نوسرەت دەکەن! تا ئەو کات!"



چەند ڕۆژێک دواتر نوسرەت زەنگی بۆ ئاغاجان لێدایەوە: "ببوورە، ناتوانم جارێ بگەڕێمەوە، دیدارێکی زۆر گرنگم هەیە، لێ بەڵێن دەدەم دواتر بگەڕێمەوە، کە هاتمەوە تۆڵەیان بۆ دەکەمەوە."
لەو شەوەی دەبوایە دادە حاجییەکان بگەیشتبانەوە ماڵێ، نوسرەت سەری بە گەورەترین شانۆی تاران، لە شەقامی لالەزاردا[83] کرد، ئاخر مەهوەش[84] ئاهەنگی گۆرانی سازدەکرد. ئەو گرێبەستی لەگەڵ تیاترۆخانەکەدا هەبوو، کە زنجیرەیەک وێنەی هونەری گۆرانیبێژە ناودارەکانی تاران بگرێ. ئەوەش کارێکی زۆر گرنگ بوو، حەزی لێبوو بە باشترین شێوە بیکا، چونکە گەر هاتبا و چەند وێنەیەکی ئەو هونەرمەندە گۆرانیبێژانەی بە جوانی بگرتبایە، ناوەکەی ئەو وەک هونەرمەندێکی وێنەگر دەچووە سەر وێنەکان.
مەهوەش ببووە یەکێ لە ئەستێرە درەوشاوەکانی شەوەکانی تاران. وەنەبێ شتەکەش پەیوەندی بە دەنگی خودی هونەرمەندەکەوە هەبێ، بەڵکو بە جووڵە و خۆبادانەکەی، بە قۆڵەکانی، بە سینگ و مەمک و سمتیەوە هەبوو. ئاخر مەهوەش پەری نێو خەونی هەموو پیاوەکانی ئێران[85] بوو. خانمە هونەرمەندەکە هێمای ڕۆژگارێک بوو، کە ئافرەتان بە خواستی خۆیان ڕووبەند و چارشێویان لە ماڵ فڕێدەدا و بەبێ هیچ ڕووپۆشێک دەهاتنە دەر.
کاتێ مەهوەش لەسەر سەکۆی شانۆ دەبنیرا، گۆرانی دەچڕی، پیاوەکان نەوسی حەز و ئارەزوویان دەبزووت. ئاخر ئەو بە جووڵەی قۆڵە ڕووت و قوت و مەمکەکانی، بە خۆبادانەکەی لەبن ئەو جلە تایبەتە نیمچە ڕووتەی، پیاوەکانی شێت و هار دەکرد. بە کەوشی پاشپانی بەرز و فستانە تەسک و بریقەدار و لێوە سوورەکانی پیاوەکانی نائومێد دەکرد. ئاخر ئەو ڕازی ئافرەتە تەقلیدییە ئێرانییەکانی لەسەر سەکو بۆ پیاوانی ئامادەبوو ئاشکرا

---

[83] Lalezaarstraat

[84] Mahwash

[85] ڕۆمانووس دەستەواژەی Perzische mannenی بەکارهێناوە، کە زیاتر مەبەستی پیاوەکانی ئێرانە لەوەی پیاوەکانی فارس بێ. وەرگێڕ.

دەکرد. ئەو وەک خوایەکی جوانی لەسەر سەکۆی شانۆکانی تاران پێشوازی لێدەکرا و وێنەگرانیش لەسەر وێنەگرتنی هەر قەرپەستێنیان[٨٦] بوو.



(مەهوەش) یەکەمین ئافرەتی مێژووی نیشتمان بوو، کە سمت و مەمکەکان بەو شێوەیە لەژێر فستانێکی تەنک و تەسکدا، بە جۆرێکی سەرنجڕاکێش لەسەر شانۆ نمایش بکا. خانمە هونەرمەندەکە قۆڵە خڕ و گۆشتنەکانی لە هەوا دەهەژاندن، سمتی خۆی بادەدا و بە شێوەیەکی هاوسەنگانە خۆی دەسوڕانەدەوە. لەساتەوەختێکدا هەندێ سمتی لار دەکردەوە و هەوەسبازانە گۆرانی دەچڕی:

دیشەب کە از هند اومدم
با ماشینی بێنز اومدم

**دوێنێ شەو لە هیندستان**
**هاتمەوە ماڵی خۆمان**
**بە مارسیدیس گەڕامەوە**
**بە کەیف و خۆش و تامەوە**
**دەی توخوا پێمناڵێنەوە**
**ئاخۆ سمتم لار بۆتەوە؟**

پیاوەکانیش بە بەختەوەرییەوە هاواریان دەکرد. "نەخێر، نەخێر، کێ بوو وای گوت؟"

"*(مادەرێ شوهەر)*، خەسوم، خەسوم!" ئەویش وای بانگ دەکردنەوە.

"ئاخر ئەو ئێرەیی بە سمتت دەبا!" پیاوەکان بە کەیفەوە و بەیەکەوە وا هاواریان کردەوە.

هەموو ڕۆژێ وێنەیەکی مەهوەش لە ڕۆژنامەکان دەدرا، بەڵام هێشتا هیچ وێنەگرێک بە شێوەیەکی تایبەت و دووبەدوو پۆترێتێکی تایبەتی بۆ نەگرتبوو. نوسرەتیش کە پەیوندییەکی مەحکەمی لەگەڵ ئەربابەکەی تیاترۆخانەی

---

[٨٦] قەرابەستانە: پاڵپێوەنان، نۆرەبری کردن بۆ نەوەی بەپەلەپڕوزێ بگەنە شتێک.

میلانـرۆژ[87]دا هەبـوو، قەنـاعەتی پێهێنا بەڵکو یەک دوو وێنەی بگـرێ و بـۆ هەتاهەتایە هەر بمێنێ.

بڕیـاڕ بـوو خـانمی هونەرمەنـد لە مـاڵەکەی خۆیـدا پێشـوازی نوسـرەت بکـا، ئەوەش هەر لەبەر ئەوەی خـاوەنی تیاترۆخـانەکە پێیگوتبـوو، کە نوسـرەت وێنەگرێکی جیاوازە و لەوانی دیکە ناچێ، ئاخر ئەو بۆ پوول و پارەی نەبوو، بەڵکو لەبەر خودی مەهوەشی گۆرانیبێژ بوو.

لەوکـاتەی، نوسـرەت بەرەو مـاڵی مەهوەشـی گـۆرانیبێژ بەڕێکەوت، لەشـاری زەنجانیشدا ئاغاجان بەرەو وێستگەی قەتار چـوو تـا پێشـوازی لە گەڕانەوەی حاجییەکـانی لە مەکـکەوە بکـا. ئەوان بـۆ سـێ هەفـتە دەچـی بەڕێکەوتـوون، سـەرەتا ئەوان شـاری مەککەیـان بە پـاس جێهێشـتبوو بەرەو مەدیـنە گەڕابـوونەوە، ئەو شـوێنەی تەرمـی پێغەمـبەر مـوحەمەدی تێـدا بە خـاک سپێردرابوو، پاشـان دەبـووایە وڵاتـی عەرەبەسـتانی سـعودی بەرەو عێراق، بەرە شـارە پیرۆزەکـانی نەجەف و کەربەلا جێبـێڵن. لە کەربەلاش زیـارەتی گـۆڕی ئیمـام حوسـێن بـکەن و لە نەجەفـیش هـی گـۆڕی ئیمـامی عەلـی. لە کۆتاییشدا بە بەلەم بەسەر ڕووباری ئەروەندرود[88] دەپەڕینەوە و دەگەڕانەوە وڵاتی باب و باپیرانیان.



هەمووان دادەکانیان لەخەیاڵ بوو، نەخاسـمە گەنجەکان بە گەڕانەوەیـان زۆر خۆشـحاڵ بـوون. ئـاخر دادەکـان دیـاری نەریتییانەیـان لە مەککە و مەدینەوە لەگەڵ خۆیاندا بۆ دەهێنانەوە.

جۆرە کاتژمێریک کە بە شـەوانیش وەک گڵۆپێکی بچکۆلە هەڵدەبن و جـۆرە قورمیشێک کراون کە دەنگی تێکستی پیرۆزیان لەسەردا تۆمارکراوە. دادەکان لەگەڵ خۆیـان بـازنە و ئەنگوسـتیلەیان بـۆ کیژەکـان دەهێنـایەوە و قایشـی ئاوزینگ جـوانیش بـۆ کوڕان. ئەو دیارییـانەی لە مەککەوەڕا دەهـاتن، جـۆرە دیـارییێکن لە لای هەمـوان بەقەدربـوون، ئـاخر خـۆ ئەوان جـۆرە کەلوپەلێـک نەبوون لە دوکانەکانی لای خۆیان هەبن، ئەوان دیـاری شـارێکی وەک مەککە

---

[87] Molanroeg
[88] Arwandroed

بوون، کە کەعبەی ماڵی پەروەردگاری مەزنی لێیە. ئەو شارەی پێغەمبەر موحەمەد لێی لەدایکبووە. ئەو شارەی، خەدیجە، دەوڵەمەندترین ژنی مەککە ، کە خاوەنی هەزاران حوشتر بووە، تیایدا ژیابوو.



ئەو قەتارەی قەول وابوو بەو زووانە بگا، قەتارێکی تایبەت بوو، بە وێستگەی هەموو شارە گرنگەکانی ولات تێدەپەڕی و حاجی شارەکانی لێدادەبەزین. وێستنگەی هێلی ئاسنینەکەش بایەخێکی تەواویان بەو قەتارەی گەڕانەوەی حاجیان دەدا. کەسکیش ڕەنگی ئیسلام بوو، ئیدی هەموو واگۆنەکانی قەتارەکە بە ئالای کەسک ڕازابوونەوە، لە هەموو لایەکیش تابلۆی سەوز هەڵواسرابوون و دەقە پیرۆزەکانی لەسەر نووسرابوو بە جامی پەنجەرەکانەوە هەڵواسرابوون و هەموو حاجییەکیش شاڵێکی کەسکی بەسەر شانی خۆی دادابوو.
قەتارەکە بە ماوەیەکی درێژ بەرلەوەی بگاتە وێستگەکە، توتەتوتی هۆڕنەکەی گوێی ئادەمیزادی کەڕەدکرد و گلۆپەکانیشی وەک چاو تروکاندن بوون تا لەسەرەتای ڕێڕەوی وێستگەکە بە دیارکەوتن. هەر کە قەتارەکەش دەوەستا، دەستەی موزیکژەنەکانی سوپاش، دەکەوتە ژەنینی پارچە موزیکی بەخێرهێنانەوە.



ترومبێلەکەی ئاغاجانیش لە بەردەم وێستگەی قەتارەکە وەستا. بەڕێوەبەری وێستگەکە بە خۆی و جلە ئاهەنگئامێزە یەکپۆشییەکەی، لەسەر پلیکانەکانی وێستگەکە پێشوازی لێکرد. ئەو وەستا تا هەموو ئەندامانی ماڵباتەکە گەیشتن، ئەوسا بۆ هۆڵی چاوەڕوانی وێستگەکە یاوەریکرد، لەوێ پێشوازی لە میوانە تایبەتییەکان دەکرد. لەهۆڵەکەدا چایە و شیرینەمەنیان لەسەر سینییەک کە تایبەت بە هێلی ئاسنین دروستکرابوون، پێشکەشکردن. قورئانخوێنەکانی مزگەوتیش بە مایکی دەستیان، چەند ئایەتێکیان لە دەقە پیرۆزەکان بە تەرتیلەوە خوێندنەوە. ژنە پیرەکانیش بە سەبەتەی دەستیان دەهاتن و دەچوون و بخوری بۆنداریان لەسەر بوو. خانەوادەی حاجییەکانیش شەربەت و خواردنەوەیان لەبەردەم هەموو ئامادەبوواندا دەگێڕا و لە هەموو

لایەکیشەوە کارمەندانی وێستگەکە گوڵاوی بۆنخۆشیان لە دەستی میوانەکان دەدان و بەخێرهاتنیشیان دەکردن.
کاتێکیش ئەو قەتارەی قەول وابوو دادەکانی تێدابێ، گەیشتە وێستگەکە، بەسەدان حاجی بە دەسرۆکە کەسکەکەیان لە پەنجەرەکەوە دەستیان بۆ ئاپۆرای خەڵکە ئامادەبووەکە ڕاوەشاند. سێ وارگۆن کە حاجییەکانی شاری زەنجان و گوندەکانی دەوروبەری هەڵگرتبوو، بە خۆیان و هەگبە گەورەکانیانەوە لە قەتارەکە دابەزین و بەڕێوبەری وێستگەکەش بە مایکرۆفۆنی دەستی بە گەرمی بەخێرهاتنەوەی لێکردن.
- "ئەرێ کوا دادەکان لە کوێن؟" فەخری سادات ئەم تێبینییەی دا.
- - "لەوانەیە هەر لەنێو قەتارەکەدا بن." زینەت خانمیش وای گوت، "خۆ تۆ باش دەیانناسی، دەبێ ئەوان سەرەتا شوێنەکەیان باش پاکبکەنەوە، خۆیان کۆبکەنەوە ئەوسا کابینەی وارگۆنەکەیان جێبێڵن."
- "دە شابال، دەکرێ بچی تەماشایەک بکەی ئاخۆ بۆچی بەجێماون؟" ئاغاجان ئەم داوایەی لە شابال کرد. "دەترسم قەتارەکە بەگەڕ بکەوێتەوە و بڕوا، کەچی ئەوان لە کابینەی وارگۆنەکەیاندا هێشتا هەر خەریکی خۆکۆکردنەوەبن."
شابالیش چوو بە دوای دادەکاندا بگەڕێ، بەڵام لە هیچ شوێنێک نەیدۆزینەوە.
- "ئەوانی تێدا نییە." لەیەکێ لە پەنجەرەکانی قەتارەکە وای بانگی دەرەوە کرد.
- "دەی خێرا برۆ وارگۆنێکی دیکە سەیرکە، کێ ناڵێ سەریان لێتێکنەچووە و گوم نەبوونە؟"
قەتارەکە زۆر دووروودرێژ بوو، شابالیش بە غار لەم وارگۆن بۆ ئەو وارگۆن بازی دەدا.
ئاغاجان شتەکەی بە بەڕێوەبەری وێستگەکە ڕاگەیاند: "حاجییەکانی من هێشتا لەنێو دابەزیوەکاندا نین، لەوانەیە لە وارگۆنێکی هەڵەدا سواربووبن، شایەد ئەوان هێشتا نەیانزانیبێ، دەبێ لێرەدا دابەزن."
بەڕێوەبەری وێستگەکەش ناوی دادەکانی تۆمارکرد و بەرەو نووسینگەکەی ڕۆیشت، ئینجا مایکی وێستگەی بەگەڕ خست و تیایدا بانگی هەڵدا:

"ڕاگەیاندنێکی گرنگ! ئەم پەیامەم تەنها بۆ هەردوو حاجی گوڵبانو و گوڵبێیە. دەبێ لە قەتارەکە دابەزن. دووبارەی دەکەمەوە" حاجی گوڵبانو، حاجی گوڵبێ! دەی لێرە دابەزن!"

دوای دە خولەک هێشتا هیچ سەروسۆراخی دادەکان دیارنەبوو.

شاباڵ بەغاردانەوە هات: "من هەموو وارگۆنەکان گەڕام، ئەوان لە هیچ شوێنێک دیارنەبوون. لەوانەیە ئەوان پێشتر بەهەڵە لە شارێکی دیکە دابەزی بن."

حاجییە دابەزییوەکان گەڕانەوە ماڵی خۆیان و سەر شۆستە و وێستگەیەکان چۆڵ کرد، لێخوڕی قەتارەکە سواربووەوە و دەرگاکانی قەتارەکەشی خڕ پێوەدان.

هێشتاش دەنگی بەڕێوەبەرەکە چەند جارێکی دیکە لە مایکەکانی سەر شۆستەی وێستگەکەوە دەهات: "پەیامێکی بەپەلە! خانم گوڵبانو، خانم گوڵبێ، دەی سەری بەڕێوبەرایەتی وێستگەکە بدەن!"

هێشتا چاودێرەکەی قەتارەکە لەسەر دەرگاکە وەستابوو، چاوەڕێی دەکرد، پاشان سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەستی کرد و فیکەکەی لێدا. قەتارەکە جوولا، وێستگەکە و ئاغاجان و ماڵباتەکەشی لەسەر شۆشتەکان بەجێهێشت.



پاش هەفتەیەک، ئاغاجان بە یارمەتی بەڕێوەبەری وێستگەکە زەنگی بۆ هەموو ئەو وێستگانەی کەوتبوونە نێوان ئەروەنرود و زەنجانەوە لێدا، کە قەتاری حاجییانی لێوەستابوو، بەڵام هیچ هەواڵێکی وای دەستنەکەوت. حاجییەکان دادەکانیان پێش دوایین ڕۆژیان لە مەککە بینیبوو، وایانزانیبوو ئەوان بەکاروانێکی دیکە ڕۆیشتوون.

ئاغاجان هێشتا چاوەڕێی وەلامی فەرمی کاربەدەستانی سەرپەرشتیانی کاروانی حاجیانی دەکرد، بەڵام هەواڵی ئەوانیش یەک دوو هەفتەی دەویست تا شتێک ببیستنەوە، چونکە دەبوایە زۆر ڕێکاری کارگێڕیی بگیرێتەبەر.



ئاساییانە بە هاوین باران نەدەباری، بەڵام چەند پەڵە هەورێکی ڕەش لەسەر ئاسمانی شارەکە و بە ئاراستەی بیابان پەیدابوون. باران وردەوردە دەباری، لەو کاتیشدا زەنگی دەرگای خانووەکەی مزگەوتێ لێدرا.
شاباڵ گڵۆپەکەی هەڵکرد و دەرگاکەی کردەوە. بینی حاجی مستەفا، ئەو پیاوەی کاروانی حاجیانی شارەکەی ڕێکخستووە، بە خۆی و دوو جانتای قەبەوە لە بەردەم قاپییەکە وەستاوە.
- "شەوباش، ئەرێ ئاغاجان لێرەیە؟" حاجی مستەفا وای لە شاباڵ پرسی.
- "دەکرێ یەک خولەک بوەستی؟ دەچم ئاگاداری دەکەمەوە."
شاباڵ لەتاریکاییەکە ونبوو، زۆریشی پێنەچوو گەڕایەوە لای حاجی مستەفا، بە فەرموو فەرموو تا بردییە ژووری کاری ئاغاجان.
لەوێدا حاجی مستەفا هەگبەکانی دانا و باوەشێکیشی بە ئاغاجاندا کرد.
- "من هەرگیز شتی وام لێ ڕوونەداوە،" هەر یەکسەر دەستی بە قسان کرد؛ "ئەمەش چیرۆکێکی سەیرە، ناشزانم چۆن بیڵێم و چی دەربارەی ئەو کوێرەوەرییە بڵێم. خۆئەگەر ئەوان لەوێ و لە ماڵی خودا دا ون بووبن ئەوا مایەی پیرۆزییە و بەرەکەتە، بەڵام کارەسات ئەوەیە چووبنە شوێنێکی دیکە."
حاجی مستەفا بە دڵێکی بەخەمەوە ئەم قسەیەی کرد.
- " کتومت پێمبڵێ چی ڕوویداوە؟"
- "ئەمانە هەگبەکانیانن. دادەکان وەک دوو دڵۆپی ئاو لە بیابانی مەککەوە ونبوون. من هەموو شوێنێکیان بەدوادا گەڕام، سەرم بەهەموو پۆلیسخانە، نەخۆشخانە، مزگەوتەکاندا کرد، لێ هیچم دەستنەکەوت، هیچ سۆراخیان دیارنەماوە. ئەوان تا دوایین ڕۆژەکەش لەگەڵ کاروانەکەدا بوون و باش و سەلامەت، بەختەوەر و لەشساغیش بوون. بەڵام شتێکی سەیر ڕوویدا: هەر یەک سەعات بەر لەوەی کاروانەکە لە مەککەوە بۆ مەدینە بەڕێبکەوێ، هاتنە لام، هەگبەکانیان لە نووسینگەکەم دانا، چارشێویان لەخۆییاندا، بێ ئەوەی هیچ قسەیەکیش بکەن، ڕۆیشتنەوە. من وامزانی بەڵکو بۆ دواجار سەرێکی بازاڕەکە بدەن. شتێک، دیارییەک، یادگارییەک مابێ بیکڕن، بەڵام ئەوان هەر نەگەڕانەوە. چوون و هەر ئەو چوون! ئەوەش هەگبەکانیانە. من زۆر بەداخم،

لەوانەبوو باشتر ئاگام لێبووبان. داوای لێبوردن دەکەم، من هەر شتێکم لەمست بێ دەیکەم. لەو بارەیەوە تۆش لە هەواڵەکان ئاگاداردەکەمەوە."



حاجی مستەفا ڕۆیشتبوو، هەنووکە هەر ئاغاجان و شاباڵ بەیەکەوە دانیشتبوون.

- "باوەڕناکەم ئەوان بزربووبن یان لە مەککە سەرگەردان بووبن." ئاغاجان وای بە شاباڵ گوت.

- "باشە چۆنی لێ تێدەگەی؟"

- "ئەوان خۆیان لە پشت بەرگە پیرۆزەکەی کەعبەدا پەناداوە. ویستوویانە یان دەیانەوێ جارێکی دیکە نەگەڕێنەوە ئێرە."

- "باشە بۆچی خۆیان شاردۆتەوە؟" شاباڵ بە حەپەسانەوە ئەمەی گوت.

- "ئەوان دەیانەوێ لە مەککە بمێننەوە، ئەوەش باشترین خەونە کە موسڵمانێک بیبینێ. بە بڕوای من هەردووکیان گەیشتوونەتە ئەو ئاکامە، کە ئەوان بایی خۆیان ژیاون. ئەوان بژاردەیەکیان لە پێشدابووە: یان بگەڕێنەوە ماڵ و چاوەڕێی مردنێکی ئاسایی بکەن، یان لە کەعبەی ماڵی خوا سەربنێنەوە. خۆ ئەگەر مرۆ لە کەعبەدا بمرێ، ڕاستەخۆ دەچێتە بەهەشت. دەی پێم بڵێ گەر تۆ لەجێی دادەکان بوایت، کامەیانت هەڵدەبژارد؟"

- "من بڕواناکەم، بە ئەنقەست لەوێ خۆیان هێشتبێتەوە. ئاخر ئەم بیرۆکەیەت چۆن بۆهات؟"

- "ئەوە شتێکە، ناتوانم ڕوونیبکەمەوە. خۆ بەلای کەمییەوە، ئەوان پەنجا ساڵ لەگەڵ ئێمەدا ژیاون، پەنجا ساڵی ڕەبەق هەر گوێیان لە چیرۆکی کۆن بۆتەوە، ئێدی ئێستا دەیانەوێ چیرۆکی خۆیان دروست بکەن."

شاباڵ مسکە بووەوە.

- "دەی با هەگبەکانیان بکەینەوە، بەڵکو نامەیەکیان تێداجێهێشتبێ." ئاغاجان وای بە شاباڵ گوت.

شاباڵ سەری هەگبەکانی کردنەوە. هەگبەکان پڕی دیاری بوون: کاتژمێری دەستی، بازنی ئاڵتوونی، ئەنگوستیلە و جلی ئاڵوالا کە لەبەر تیشکی

گڵۆپەکەدا شەوقیان دەدایەوە، هەموو شتێک دیاری بەنرخی مەککە بوون بۆ ئاکنجییەکانی خانووەکە.
- "ئەوە بەڵگەکەیە،" ئاغاجان وای بە شاباڵ گوت؛ "ئەوان هیچ کەلوپەلی خۆیان نەئاخنیوەتە نێو هەگبەکان، تەنانەت کفنی مەککەشیان نەخستۆتە نێو. ئەوەش خەونی هەموو کەسێکە، کە کفنی خۆی لەمەککەوەڕا لەگەڵ خۆی بێنێتەوە، هەر ئەمەش یەکەم شتە، کە حاجی مشووری کڕینی بخوا. ئاخر هەر بەو بەرگەوە کفن و دفن دەکرێ. ئەوان هەر لەگەڵ خۆیان هێشتۆتەوە، لەوانەیە لەژێر جلەکانیان دانابێ."
- "بە ڕاست؟" شاباڵ وای گوت؛ "باشە هەنووکە چی بە ئەوانی دیکە بڵێین؟"
- "هەگبەکان لەپشت مێزەکە دابنێ و بڕۆ بانگی هەمووان بکە، بێنە ئێرە."
شاباش ئەوەی پێیڕاسپێردرا کردی و هەمووانی ئاگادارکردەوە.
- "حاجی مستەفا تازە لێرەبوو." ئاغاجان وای بە هەمووان گوت؛ "بەڵام بە داخەوە هەواڵێکی خۆشی پێنەبوو. ئەو ڕۆژانە پەیوەندی لەگەڵ پۆلیسی مەککەدا هەیە و تا ئێستا هیچی لێهەڵنەکڕاندوون. هەرکاتێک شتێکی بۆ ڕوون بێتەوە، دەردەست ئاگادارمان دەکاتەوە."
هەمووان بە وروژاوییەوە، بەبێدەنگی گوێیان لە ئاغاجانەوە گرت.
- "ئەرێ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، ئیدی هەرگیز چاومان بە دادەکان نەکەوێتەوە؟" نەسرین، کچە گەورەکەی ئاغاجان بوو، ئەمەی لێپرسی.
- ""ئەوان هیچ شوێنێکیان نییە تا بۆی بچن. هەردەبێ پۆلیس بیاندۆزێتەوە."
ئەمەش قسەی جەواد، کوڕەکەی ئاغاجان بوو.
- "من دەزانم. حاجی مستەفا ئەوەی لە توانایدا بووە، کردوویەتی. خۆ ئێمە دەزانین، لەوانەیە ئەوان سواری قەتاری شارێکی دیکە بووبن. ئاخر بە ملیۆنان حاجی ڕوو لە مەککە دەکەن، سەدان هۆکاری ونبوون لە گۆڕێدا هەیە. بەڵام خۆ دادەکان شتێکی دلۆڤانەیان ئەنجام داوە. ئەوان هەگبەی پڕ لە دیارییان بە حاجی مستەفادا ناردۆتەوە. ئەوەش بەڕای من نیشانەی ئەوەیە، کە ئەوان ساغ و سەلامەتن. دەی شاباڵ، هەگبەکان!" ئاغاجان بەمجۆرە دوا.
شاباڵ هەگبەکانی لەسەر مێزەکە دانان و سەرەکانی کردنەوە. هەمووان بەو کاتژمێر، بازنە و گوارە و ئەنگوستیلە، بۆن، هەورییە ڕەنگینەکان و جانتای

دەستی تایبەت و بلوزەکان سەرسام بوون. هەر دیارییەکیش کارتێکی لەگەڵدابوو، ناوی ئەوکەسەی لەسەر نووسرابوو کە بۆی هاتبوو. بۆ نەسرین و ئەنسی، کیژەکانی ئاغاجان، دادەکان بلوزی جوان و ڕەنگینیان بۆ کڕیبوون، هەرچی بۆ جەوادی کوڕیشی شەپقەیەک و کاتژمێرێکی دەستی، بۆ فەخری ساداتیش دەستەیەکی میک ئەپ، بۆ بانگدەرەکە داردەستێک کە توانای چەماونەوەی هەبێ، شتێک بوو کەس پێشتر نەیبینبوو. زینەت خانمیش دیوانە شیعرێکی شاعیرانی مەککەی بۆ نێردرابوو. دیاری ئاغاجان قەڵەم پاندانێک بوو، وێنەیەکی ئیمامی عەلی لەسەر بوو، شابال کاتژمێرێکی دەست و پارچە قوماشێکی قاوەیی تاریک، کە هێڵی سپی ورد وردی تێدابوو، بۆئەوەی قاتێکی جوانی لێبدروێ.

هەمووان بە دیارییەکان کەیفساز بوون، هەمووان بە دادەکان کاریگەربوون، کە بە زەوقی جوانەوە یەکە بەیەکەیان بە دیارییەکانیانەوە بەسەرکردبوونەوە. هەمووان دڵشادبوون تا ئەوکاتەی گوێیان لە قیژەیەک بوو لەدەرەوە هات. ئافرەتێک لە دەرەوە بەسەر یەکێکی دیکەدا هاواری دەکرد و ئەویش بە جوێنی پیس پیس وەڵامی دەدایەوە. شتێکی وابوو، هەرگیز شتێکی ئاسایی نەبوو کە گوێت لە شەڕ و هەرایەکی بەمجۆرە بێ. ئاخر دوو ژن لەسەر بانی حوجرەکە، لە دیوی لای دراوسێکەیانەوە وەستابوون، دەستیان لە سەر و پرچی یەک نابوو.

زینەت خانمیش کە ئەمەی دی بە ئامادەبووانی گوت، "دیسان ئەوانە ژنەکانی حاجی شیشەگارن[٨٩]".



حاجی شیشەگار تەمەنی شەست ساڵان دەبوو. ئەو لەگەڵ دادەکان چووبووە مەککە و گەڕابۆوە. ئەو لەبازاڕ دوکانی شوشەواتی هەبوو.

حاجی خاوەنی دوو ژن بوو، ژنە گەورەکەیان ناوی ئەکرەم[٩٠] و گەنجەکەشیان ناوی تەلا[٩١] بوو.

---

[٨٩] Shishegar
[٩٠] Akram
[٩١] Tala

لە ئەکرەم حەفت کچی هەبوون، لێ ئەو عەیامێک بوو عەودالی کوڕێک بوو، هەر بۆیە ژنی دووهەمی بەسەردا هێنابوو.
لە دواییدا ژنێکی گەنجی دۆزیەوە و مارەی کرد، بەڵام دەرکەوت چیدیکە مندالی پەیدانابێ.
- "نەکەی! لێیم مەدە! بەداخەوە! من نەمزانی، بەڕاستی نەمزانی." تەلا وای لەبەر پاڕایەوە.
ئەکرەمیش هەر ڕانەدەوەستا، هاواری دەکرد و بەرۆکی تەلای گرتبوو، دیسان تێیسرەواندەوە.
- "مەکە! من هیچ هەڵەیەکم نەکردووە. منداڵەکانی تۆ، هی منیشن، لێتدەپاڕێمەوە، چیدیکە وامەکە!"
زینەت خانم، کە بەسەر پەیژەکاندا خۆی گەیاندبوونی، کەوتە نێوانیانەوە.
- "ئەوە چییە؟ بۆ شەڕ لەگەڵ یەکدی دەکەن؟"
- "هیچ نییە؟" تەلا، ژنە بچووکەکەی حاجی وای وەلامدایەوە.
- "باشە ئەدی بۆچی لێتدەدا؟ باشە بۆ خاتری خوا بۆچی لەوسەر بانە کەوتوونەتە وێزەی یەکدی؟"
- "حاجی لە ماڵە، بۆیە، حاجی میوانیشی هەیە." ئەو وایگوتەوە؛ "منیش، من..."
- "تۆ چی؟"
- "من دوو گیانم." ئەو بەنەرمی وایگوت.
ئەکرەم، ژنە گەورەکەی حاجی، بە گریانەوە لەنێو تاریکاییەکەدا ونبوو.
- "تەلا زگی هەیە!" زینەت وای بانگی کرد.
- "پیرۆزە! پیرۆز!" کچەکانی ئاغاجانیش لە نێو تاریکایی حەوشەی مالی خۆیاندا وا هاواریان کرد.



کاتێک حاجی شیشەگار لە مەککە بوو، لە خودای کەعبە پاڕابۆوە، بەڵکو کوڕێکی پێببەخشێ. خواش جمکەیەکی پێبەخشی، دوو کوڕ بەیەک زگ.
لە خانووەکەی مزگەوتێش چەندان مانگ بەسەرچوون. هیچ هەواڵیش لەدادەکانەوە پەیدا نەبوو.

# گەڕانەوە

کاتێک شاباڵ بۆ بەرچایی بەیانی سەری ناندینەکەی دا، بینی ژنێک بە خۆی و هەگبەکەی لەسەر تەختەبەندێک لای حەوزەکە دانیشتووە. دوای ئەوەی چارشێوی خانمەکەی بینی لەسەر ڕووخساری لاکەوت، ئینجا ناسییەوە.
- "سەدیقە، ئەوە تۆی؟"



دوای ڕووداوەکەی سینەما، خالخالی لەشاری زەنجان هەلات، سەدیقەش چووە شاری قوم تا لەگەڵ مێردەکەیدا بژی، لەو ڕۆژەوە جارێکی دیکە سەدیقە نەگەڕابۆوە خانووەکەی مزگەوتێ
زینەت، کە کیژەکەی بینی باوەشی پێداکرد، ماچی کرد و پرسیاری لێکرد ئاخۆ چی بەسەرهاتووە، بۆچی ئەو بەو شێوەیە بە کزومەلوولی گەڕاوەتەوە ماڵ. سەدیقەش سەری خستە سەرشانی دایکی و گریا، لەوە زیاتر هیچی نەکرد و نەگوت.
زینەت زانی کیژەکەی لەگەڵ خالخالیدا بەختەوەر نییە، ئاخر ئەو هەرگیز ژیانێکی ژن و مێردانەی ئاسایی بە کچەکەی نەبەخشیوە، ئەو بواری نەدەدا لە ماڵەوە مێوانداری کەس بکا، هەمیشە ترس لەگەڵ ئەودا دەژیا.
ئەو زۆر لە ماڵ نەدەبوو، سەدیقەی هەر بەتەنها جێدەهێلا، هەرگیز دەربارەی کار و چالاکییەکانی خۆی لەگەڵ ژنەکەی نەدەدوا، نەدەبوایە سەدیقە هیچی لەسەر مێردەکەی بزانێ و بۆ ماڵە باوانی بگێڕێتەوە.
ئەو خەندەیەی بەردەوام لەسەر لێوەکانی سەدیقە بوو، هەنووکە نەماوە. ڕووخسارەکەی بە ڕووبەندێکی خەم و خەفەت داپۆشراوە.
- "ئەرێ چی ڕوویداوە؟"
سەدیقە نەیدەویست هیچ بڵێ.
- "باشە تۆ لە ماڵە مێردت ڕاتکردووە؟"
- "ئەی شەڕتان کردووە؟"
ئەویش سەری خۆی بەنەخێر بادەدا.

- "دەباشە، پێمبڵێ چیت لێقەوماوە؟"
بەڵام کیژەکەی هیچی پێنەگوت.
سەدیقە بەنێو حەوشەکەدا هاتوچوو، بیری لە ڕۆژگاری ڕابردوو دەکردەوە.
خالخالی بۆ چەند مانگێک دەبێ ڕۆیشتووە، ئەوی بەتەنها لە ماڵێ جێهێشتبوو، ئەویش نەیدەزانی بەتەنیا ڕوو لە کوێ بکا. ڕۆژێکیان نامەیەکی لە مێردەکەی پێگەیشت، لێینووسرابوو: "من جارێ ناگەڕێمەوە ماڵێ. دیارنەبوونەکەم لەوانەیە زۆری پێبچێ. بگەڕێوە لای ماڵباتەکەت. ناشبێ لەو بارەیەوە لەگەڵ هیچ کەس قسە بکەی!"
سەدیقە بێدەنگ بوو، هیچی نەدرکاند، بەڵام هەمووان دەیانزانی، شووکردنە تێکشکاوەکەی هۆکاری گەڕانەوەیەتی بۆ ماڵێ. ئەو لەگەڵ پرسیارێک لە ململانێدا بوو. باشە کاتێک خالخالی گەڕایەوە، تۆ بڵێی بیەوێ بۆ ماڵە مێردی بگەڕێتەوە؟ بۆ ئەو ماڵە ترسناکەی قوم بچێتەوە؟ تۆ بڵێی ویستبێتی لەگەڵ ئەو پیاوەدا بژی؟ ئایا ویستویەتی لەگەڵ پیاوەکە بچێتە ناو جێگا؟ بەڵام ئەوەشی دەزانی، وەک ژنێک هیچ بژاردەیەکی دیکەی لە بەردەستدا نەبوو.
هەر کاتێ مێردەکەی بگەڕێتەوە، دەبێ ئەویش هەندووانی[92] بەدوایدا بڕوا.
نەخێر، من لەگەڵیدا ناڕۆمەوە، سەدیقە لەبەرخۆیدا وای بیردەکردەوە، خۆ ئەگەر هەر ناچاریشم بکا، ئەوا ئەوندە بەرز هاوار دەکەم و دەقیژێنم تا هەموو هاموشۆکەرانی مزگەوت لێوەسەر بان بکەون.
سەدیقە چووە ناندینەکە، هەستی بە شوێنی بەتاڵی دادەکان کرد، کە لە دوای خۆیان بەجێیان هێشتبوو.
کاتێ دادەکان هێشتا لە ماڵ مابوون و سەفەری حەجێیان نەکردبوو، هەمووردەمێ ناندینەکە خاوێنوبژوون و ڕێکوپێک بوو، لێ هەنووکە هیچ قاپوقاچاخێک بە جوانی لە شوێنی خۆی دانەندراوەتەوە، ئەو ناوە پاشاگەردانی تێکەوتووە. زبڵدانەکە پڕبووە، دەرمان و بەهاراتەکەش کە لەنێو شوشەیەکی سەر داخراودا و لە شوێنی دیاریکراودا بوو، لەوێ بەسەر ڕەفەی شتەکاندا ڕژابوو. بۆنی خۆشی میوەی تەڕوتازەش، کە هەمیشە لە سەبەتەیەک لە لای ڕاستی ناندینەکە دادەنرا، نەماوە. سەدیقە خەریکی

[92] پێشینان لەو بارەیەوە گوتوویانە، مێرد هەندووە؛ ژن لەدووە. وەرگێر.

هەڵبژاردنی ناندینەکە بوو. زبڵدانەکەی بردە دەرێ، شوشەی دەرمانی کاری و بەهاراتی پاککردنەوە، شتەکانی لە شوێنی خۆی دانانەوە. مەنجەڵەکانیش کە لە گۆرێ کەوتبوون، بەجوانی هەڵیگرتنەوە و لەسەر یەکی دانان، ناوکەوی ناندینەکەشی گەسک دا، جامی پەنجەرەکانی سڕینەوە و گوڵەکانیشی ئاودان. پاشان مەنجەڵێکیشی خستە سەر ئاگر و دەستی بە چێشتلێنان کرد.



کاتێکیش هەمووان بۆ مەغریب پەیدابوونەوە، بینیان چرای ناندینەکە دادەگیرسێ و بۆنی شێوەکە بەو ناوەدا پەرشوبڵاوبۆتەوە.
سەدیقە مێزی ژووری نانخواردنی ڕاخست، ئیدی بۆ ماوەیەکی درێژبوو هەموو ماڵباتەکە لەسەر مێزەکە گردنەبووبوونەوە، هەنووکە گردبوونەوە.
کەس پرسیاری نەکرد و کەسیش ناوی خالخالی بەسەر زاردا نەهات، هەمووان دەیانزانی، ئەگەر پێویست بکا، ئەوا ئاغاجان لەو بارەوە باسوخواسی لەگەڵدا دێنێتە گۆڕێ.
هەمووان چێژیان لە شێوەکە بینی، پێیانوابوو دەمێکە غەریبی دەستەوای[٩٣] کابانێکی وادەکەن. دوای ئەوەی لە خواردنەکە بوونەوە، سەدیقە تا درەنگ لە ناندینەکە مایەوە، سەرقاڵی دەستپێداهینان و ڕێکخستنەوەی بوو. کاتێکیش لە شوشتنی قاپوقاچاخەکە بووەوە، بۆ ماوەیەکی کەم چوو لەبەردەم پەردەی پەنجەرەکە دانیشت، لەو تاریکاییەدا سەیری هەگبەی خۆی کرد، کە هێشتا هەر لە تەنیشت حەوزەکە بوو. زینەت داوای لە کیژەکەی کرد، بچێ لە ژوورەکەی ئەودا بمێنێتەوە، بەڵام ئەو بانگهێشتنامەکەی دایکی ڕەت کردەوە.
سەدیقە لە ئاوێنە کۆنینەکەی ناندینەکەدا، کە هەمیشە دادەکان لەوێدا سەیری خۆیان دەکرد، تەماشایەکی خۆی کرد. ئاوێنە شلوێکەش ئەوەی پێگوت، کەوا قۆناخێکی نوێی لە ژیانیدا دەستپێکرد. هەموو ڕۆژەکەش ئەو هەر دوودڵ بوو، لێ هەنووکە ئەو دڕدۆنگییەی ڕەویەوە. لەکۆتاییدا هاتەوەسەر خۆی، گڵۆپەکانی ناندینەکەی کوژاندنەوە بەرەو ژێرزەمینەکە ڕۆیشت.
بانگەدەرەکە بانگی کرد: "ئەوە کێ لەوێیە؟"

[٩٣] دەستەوا: دەستکرد دەستوپوخت.

سەدیقە سڵەمیەوە.

- "سەدیقە، ئەوە تۆی؟ ئەری باش گوێم لێتبوو؟"

- "بەڵێ، ئەوە منم."

- "سەرەتا دوودڵ بووم، دەنگی تەپەی پێی تۆ جیاوازە، بەزووی نەمناسیتەوە. باشە بەو نیوە شەوە لەو ژێرزەمینەدا، لەچی دەگەڕێی؟

- "کلیلێک، هەر دەبێ لێرە لەنێو کۆنە باولێکدا دابنابێ."

- "کامە کلیل؟"

- "کلیلی ئەو هۆدەیەی تەنیشت پەیژەکانی مزگەوتێ، ژووری نێوان پەیژەکان و نووسینگەی ئاغاجان."

- "دەتەوێ هەر ئێستا ئەو کلیلەت هەبێ؟"

ئەو لە باولە کۆنینەکەدا بەدوای کلیلەکەدا گەڕا، بەڵام نەیدۆزیەوە.

- "دەی سەیری ئەو سەردابە[94] پەناگەیە بکە، باولێکی دیکە لەوێدا هەیە، لایەتە دەستییەکە ببە، دەنا نایبینی و بۆت نادۆزرێتەوە." بانگدەرەکە وای بە سەدیقە گوت.

لەوێ لە دەلاقەکەدا[95] لایەتێکی دەستی لێبوو، لەپاڵیشی دەستە شخارتەیەکیش هەبوو. سەدیقە لایتەکەی پێکرد بەرەو باولەکەی پەناگەکە چوو، سەری هەڵدایەوە، هەمووی گەڕا، لێ هیچ کلیلێکی تێدانەبوو.

- "من دەزانم هێشتا تورەگەیەک هەیە، لێرە لەنێو ئەو باولەدا. بەڵکو کلیلەکەی تێدا بێ." یارۆی بانگدەر وای بەسەدیقە گوت.

ئەویش تیشکی لایەتە دەستیەکەی گواستەوە سەر کەلوپەلەکانی و بینی بانگدەرەکە لای فڕنیەکەی وەستاوە و خەریکی گوڵدانێکە.

- "ئاگادار بە." بانگدەرەکە هۆشیاری دایە، "یەک دوو گوڵدانم لەوێ داناون."

سەدیقەش بە ئەسپاییەوە بەنێو گوڵدانە سوورکراوەکاندا بۆ لای دۆلابەکە ڕۆیشت و سەری هەڵدایەوە.

[94] لێرەدا مەبەستی (قبو)ە، هاواتایەکی دروستم نەدۆزییەوە، بۆیە سەردابە پەناگەم بەکارهێنا. وەرگێڕ.

[95] دەلاقە وەک پەنجەرەیەکی بچکۆلانە وایە لەدیوارەکان دەکرێتەوە، دەکرێ کونبەریش بێ، دەکرێ هەروەک ڕەفەیەکیش سوودی لێببیندرێ. وەرگێڕ.

لەوێدا یەک دوو چاکەتی کۆنینەی پیاوانە و یەک دوو گۆپاڵی پێوە هەڵواسرابوو.

- "دۆزیتەوە؟"
- "نەخێر، تەنها جلوبەرگ بەو دۆلابە هەڵواسران."
- "کلیلەکە هەردەبێ لەوێ بێ، کاتێ دادەکان دۆلابەکەیان خاوێنکردەوە، گوێم لە زرینگەی کلیلەکان بوو."

سەدیقە چاکەتەکانی جوڵاندن. لەپڕ گوێی لە خڕەی کلیلەکان بوو. بانگدەرەکە بانگی کرد: "دۆزیتەوە؟"

سەدیقە بە کلیلەکەوە گەڕایەوە ناو حەوشەکە، بەتەنیشت ژوورەکەی ئاغاجاندا تێپەڕی و لەبەردەم ژووری سێیەمین وەستا. هەوڵیدا کلیلەکە بخاتە کونی کیلۆنی دەرگاکە. کلیلەکەی تێهاوێشت، بەڵام بانەدرا.

سەدیقە بە ڕێگای خۆیدا گەڕایەوە ژێرزەمینەکە.

بانگدەرەکەش هەندێ ڕۆنی لەکلیلەکە دا، لەگەڵ کیلۆنەکەش هەوڵێکی دیکەی دا، بەڵام هەر پێینەبۆوە.

- "من لەبیرم نەماوە ئاخۆ بۆدواجار کەی بوو، ئەم ژوورەیان بەکارهێناوە. هەر دووکیان، چ کیلۆنەکە و چ کلیلەکە ژەنگیان هەڵێناوە." بانگدەرەکە وای بە سەدیقە گوت.

بانگدەرەکە ویستی لێی بپرسێ: باشە بۆچی کتومت، بەو نیوە شەوە ژوورەکە دەکەیتەوە؟ خۆ ئەگەر بتەوێ برازێی[96]، باشتر وایە ژووری مانەوەی میوانان بەکاربێنی. لێ لەبری ئەوەی لێبپرسێ، ڕۆنی زیاتری لە کلیلەکە داو هەوڵێکی دیکەی لەگەڵدا دایەوە.

"هەنووکە باشتر بوو، بەڵێ، کردمەوە، وا دەسوڕێ، کەمێ بوەستە، دیسان گیربووەوە، پێویستم بە چەکوچ هەیە، یەک دوو نەرمە کوتکێکی دەوێ، بەڵام خۆ هەمووان نوستوون، دەترسم بێداریان بکەمەوە."

وێڕای ئەوەش، مامەی بانگدەر چووە ژوورەکەی و چەکوچێکی هێنا. یەک دوو جار بەنەرمی چەکوچەکەی پێداکێشا و کلیلەکەی زیاتر ڕەپێش کرد.[97]

---

[96] برازێی: بخەوی

[97] ڕاپێشکردن: پاڵدان، بردنەژوور.

ˇکرایەوە! بەلام بۆ خاتری خودا، خۆمن لەوە تێناگەم بەو نیوەشەوە چیت لەم ژوورە دەوێ؟ˇ بانگـدەرەکە وای پێگـوت، کەچـی لەسـەر وەڵامدانەوەشـی نەوەستا، گەڕایەوە ژوورە ژێرزەمینیەکەی خۆی و دەرگاکەشی داخست.
سەدیقەش بە نەرمی پاڵێکی بە دەرگاکەوە ناو و کردیەوە.
ژوورەکە تاریـک بـوو. سـەدیقە بە دوای پلاکـی گڵۆپداگیرسـاندنەکەدا گەڕا، بەڵام پلاکەکە ئیشی نەکرد. ئینجـا لایتە دەسـتییەکەی لەژێرزەمینەکە هێنـاو لێوەژوورەکە کەوت.
لەوێ هەموو شتێک بە قوماشێکی سپی داپۆشرابوو، تەنانەت ئەو مافوورەی لەسەر ناوکەوەکەش[98] ڕاخسترابوو. بە هێواشی قوماشەکەی لەسـەر لابرد و لە دەرەوە داینا.
لەوێ پێخەفێـک دانـدرابوو، لەپـاڵ پـێخەفەکەش ئـاوێنەیەکی کـۆنینە هەبـوو. چاڕشێوێکیش بە  بە دارسێپێکێک هەڵواسرابوو، لە ژێرەوەش جووتە نەعلێک هەبـوون. لەسـەر مێـزۆکەی تەنیشـت پـێخەفەکەش، شـانەیەک، قوتـووە پۆدرەیەک و جانتـایەکی بچکـۆلەی میـک ئەپ هەبـوو. لەسـەر دیـواریش کە پێخەفەکەی لەپاڵ بوو، یەک دوو ڕەفە هەبوون، چەند کتێبێکی لەسەر بوو. لەسـەر زۆپـای دارانیش چایەدانێک و لە نێو دۆڵابەکەشدا یەک دوو فسـتان هەڵواسرابوون.
سـەدیقە دوو چەرچەفـی خـاوێنی لە ژووری شوشـتنەکە هێنـان، دەسـتی دایە هەگـبەکەی چـووە نێـو ژوورەکە، هەگـبەکەی لە تەنیشـت دۆڵابەکە دانـا، پەتـۆیەکی بەسـەر دۆشـەکەدا دادا و چـووە ژێـری و لێـپاڵکەوت، چاوەکـانی نوقاندن و خەوی لێکەوت.
بۆ بەیانیش سەر لەزوو، دیسـان هەمـووان سـەدیقەیان بینییەوە، کە خەریکی ناندینەکەیە. ئەو مـافوورەکەی داوەشـاند و هەمـوو جامی پەنجەرەکانیشـی بە هێواشی سترینەوە. شابالیش هێلێکی نوێی کارەبای بۆ ژوورەکەی ڕاکێشا.
بۆ شەوەکەشی گڵۆپ لە ژورەکەی هەڵگیرسـا، لەپشـت پەردەکـان ڕووناکی گڵـۆپەکە لە تەنیشـت پەیژەکـان سـوور، کەسـک و زەرد لەسـەر زەوی دیاردەکرا.

---

[98] ناوکەو: نەرزیەی ژووردکە.



شەوێکیان، کاتێک سەدیقە قاپی ژوورەکەی خۆی دەکردەوە، سەیری تیشکی سوور، کەسک و زەردی ژورەکەی لەسەر زگی خۆی کرد، ئیدی ئاغاجان تێگەیشت و لە فایلی هەواڵنامەکاندا نووسی: "سەدیقە دووگیانە."

## گەریللا

لە دەروازەی بازاڕەکەدا، چەند پۆلیسێک خەریکی هەڵواسینی چەند پۆرترێتی گەورەی ڕەش و سپی بوون. پۆرترێتی چوار پیاو بوون بەسەر و سمێڵ و چاویلکەوە، بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوون.

لەژێر وێنەکانیشدا ئەم بڕگەیە نووسرابوو: "زیندانییە ڕاکردووەکان! کۆمۆنیستە چەکدارەکان! هەرکەس خەبەریان لێبدا بە 10.000 تمەن پاداشت دەکرێ!"

ڕۆژنامە خۆجێییەکەی شارەکەش وێنەی هەر چوار کەسەکەی لەسەر لاپەڕەی پێشەوەی ڕۆژنامەکەدا دابوو، لەژێرەوەش نووسیبووی: "ئاگاداربن، چوار تیرۆرستی مەترسیدار بەناو شارەکەماندا دەخولێنەوە!"

ئەوکات دەروازەی بازاڕ لە خەڵکی سیخناخ بوو، پیاوان دەستە دەستە لەگەڵ یەک وەستابوون، قسەیان دەکرد. هیچیشیان دەربارەی کۆمۆنیزم نەدەزانی، بەڵام خۆ کۆمۆنیستەکان کەسانی دژوارن، باوەڕیان بە خوداش نییە.



لە ڕۆژنامەکەدا چاوپێکەوتنێک لەگەڵ شوانێک بڵاوکرابووەوە، ئەویش گوتبووی گوایە زیندانییە ڕاکردووە دژوارەکانی بینیون.

- "باشە ئەوان چەکیان پێبوو؟" یارۆی پەیامنێری ڕۆژنامەکە وای لێپرسیبوو.

- "بەڵێ، ئەوان بەسواری ئەسپ بوون و تفەنگیشیان بەشانەوە بوو."

- "لە کوێ تووشیان هاتی؟"

- "من تووشی کەس نەهاتووم، تەنیا ئەوەبوو، من خەریکی خڕکردنەوەی مێگەلەکەم بووم، بە دوای بزنێکدا ڕامکرد. لەپڕ چوار سوارم لێوەدەرکەوتن، ئیدی دەستبەجێ زانیم، ئەوانە کەسانی غەوارەن. ئەوان وەک سوڵتان لەسەر

زینی ئەسپەکانیان سواربووون، ئاخر خۆ زۆر کەم وایە مرۆ تووشی ئەو جۆرە سوارانە بێ.

- "باشە قسەت لەگەڵدا کردن؟"

- "سەرەتا نەخێر، دواتر بەڵێ، من ڕووخساری ئەوانم نەبینی، ئەوان بە شاخەکاندا سەرکەوتن، هەر سەیری پشتیانم کرد. ئەوان بەرەو دوندی کێوەکان هەڵکشان، پێموابێ دەیانەویست بچنە ئەودیو، بچنە ئەودیوی سنووری ئەفغانستان، بەڵام لە ناکاو سوارێکیان گەڕایەوە، بەرەو لای من هات، لێیپرسیم بەڵکو هەندێ نان و شیریان بدەمێ."

- "جا تۆ نان و شیرت دانێ؟"

- "بەڵێ، بەڵام خۆ نەمدەزانی، ئەوان کۆمۆنیستن، دەنا نەمدەدانێ."

- "باشە لە پیاوەکەت نەپرسی ئاخۆ ئەوان کێن؟"

- "نەخێر، خۆ نابێ هەر یەکێکت بینی و دەستبەجێ لێی بپرسی کێیە. من دەستم دا جامێک و بەدوای بزنێکدا گەڕام ، بیدۆشم."

- "باشە، کاتێک نان و شیرەکەت داێ، کابرا چیکرد؟"

- ئەو دەستی بۆدرێژ کردم، دەستی گوشیم، تۆقەی لەگەڵدا کردم و گوتی: کاکە، لێمان مەگرە، کە نەمتوانی پارەکەت بدەمێ؟"

- "باشە هیچی دیکەیشی نەگوت؟"

- "بەڵێ، ئەوەندەشی گوت، کەوا ئەو هەرگیز ڕووخساری من لەبیر ناکا."

- "مەبەستی لەوە قسەیە چی بوو؟"

- "نازانم، بەڵام بۆ ڕۆژی پاشتر، وێنەکانی ئەوانم بە هەڵواسراوی لە ژەندرمەخانەی گوندەکە بینی. چوار تیرۆرست، منیش نانم دابوونێ."



خەڵکی ئاسایی نەیاندەزانی چی لە گۆڕێدایە و باسوخواس چییە، بەڵام ئەو کەسانەی بە نهێنی گوێیان لە ڕادیۆی مۆسکۆ بە فارسی گرتبوو، لە هەموو شتێک ئاگاداربوون.

ئەو چوار پیاوەی هەلاتبوون، چوار ئەندامی هەرە گرنگی بزووتنەوەی چەپی ژێرزەمینیی بوون. ئەوان ساڵێک پێشتر و لە ڕاپەڕینی جەنگەڵی باکووری پارێزگای شیمالدا[99] گیرابوون.

ئەوان سەرکردەی کۆمەڵێک بوون بەناوی کۆمەڵەی جەنگەڵ. ئەم بزووتنەوە گەریللا چەپە دژە ئەمریکاییە، هەوڵیاندا لە دارستانەکانی باکووردا ڕاپەڕینێک دژی شا سەرپێ بخەن.



زۆرینەی ئەو خەڵکەی لە نێو چیاکان دەژیان، لە بن باری هەژارییدا بوون. ئاخر پێداویستییەکانی ژیان زۆر کەم بۆ گوندەکان دابینکرابوو. قوتابخانە، پزیشک و تەلەفۆنیان نەبوو. فەراهان[100] ئەو گوندەی زێدی حامید ئەشرەف[101] بوو، لە لایەن کاربەدەستانەوە هەر هیچ بایەخی پێنەدرا، دەسەلات گوندەکەیان لەبەر چالاکییە سیاسییەکانی ئەشرەفەوە، پشتگوێ خستبوو.

حامید ئەشرەف، سروشتناسی لە زانستگەی تەکنیکی لە تاران خوێندبوو. ئەم زانکۆیەش لانکەی هەموو گرووپ و کۆمەڵە چەپخوازەکانی ولات بوو. ئەشرەفیش سەرکردەیەکی گەنج بوو، کە پارتە کۆنەکەی کۆمۆنیست، تودەی جێهێشتبوو. ئەو بزووتنەوەیەکی ژێرزەمینی ڕێکخستبوو، ناوی فیدائی[102] بوو، خەباتی چەکدارانەیان دژی شا ڕاگەیاندبوو.

خەڵکی لادێش هەر بە نەریتی خۆیان دژی ڕژێم بوون، گوندەکە بە **گوندی سوور** ناسراو بوو، لەوێدا خەڵک گوێی لە ڕادیۆی مۆسکۆ دەگرت.

کاتێکیش خەڵکی گوند هەواڵی زیندانییە هەلاتووەکانیان پێگەیشت، دەنگوباسی ڕاکردنەکەیان بە گوندەکانی ئەو ناوەدا بلاوکردەوە.

دانیشتووانی گوندی سوور گوتیان ئەوەی لە نێو ڕۆژنامەکەدا نووسراوە، شتی بێ مانا و قۆڕە، شوانێکی لەوجۆرە هەر بوونی نییە. ئەم شتانە هەمووی درۆی شاخداری پۆلیس و دەزگای هەواڵگری نهێنین. بەلام ئەوانی

---

[99] Shamol
[100] Farahan
[101] Hamid Ashraf
[102] Fadai

دیکەش دەیانگوت، شوانەکە لە لایەن لادێیەکان خۆیان هێندراوەتە پێش، بۆئەوەی پۆلیس و دەزگای هەواڵگری نهێنی لەخشتە ببەن.



لە وڵات و لە هەموو شوێنێک هەر هاوسۆزی بۆ بزووتنەوە چەپگەراییەکە دەربارەی گوندەکە دەربڕا و هەریەکە بە شێوازی خۆی گوندێکی خەیاڵیانەی دادەهێنا. ئەوان گوتیان کەوا سەرجەم گوندییەکان کۆمۆنیستن، گوایە ئەوان لە ڕۆژانی جەژندا ئاڵای سوور لەسەر بانەکانیان هەڵدەدەن و هەرگیز ژاندرمەش ناوێرێ تخونی تخووبی گوندەکە بکەوێ.
نزیکەی هەموو گوندییە هەراشەکان نەخوێندەوار بوون، بەڵام خەڵک دەیگوت گوایە لە گوندی سووردا هەموو کەسێک دەتوانێ بخوێنێ و بنووسێ، ئاخر بە نهێنی هەوادارییان بۆ گوندەکە ناردوون تا ئاکنجییەکانی فێرە خوێندەواری بکەن.
ڕادیۆی ئەمریکاش ڕاپۆرتێکی لەسەر هەڵاتنی حامید ئەشرەف بڵاوکردەوە. تیایدا واهاتبوو گوایە هەر گوندییەکان بە خۆیان شوێنی پەناگەی حامید و هاوڕێکانیان دابینکردووە.
بۆ ڕۆژی پاشتریش، چوارده ترومبێلی زرێپۆش گەیشتنە سەر گوندەکە، هێزەکە لە ئاسمانەوەش بە هەلیکۆپتەر یاوەری کرا. لە شاخەکاندا هێشتا کەس، وا لە نزیکەوە کۆپتەری نەبینیبوو، ئیدی گوندییەکان وازیان لە ئیشوکاری خۆیان هێنا، بەسەر گردەکان کەوتن تا سەیری هەلیکۆپتەرەکان بکەن.
هەلیکۆپتەرەکانیش نزم دەفڕین، تیدا پۆلیس دەبینرا، کە ئاساییانە لەنێو کۆپتەرەکەدا بە خۆیان و چەکەکانیان دانیشتوون. لە گوندەکەشدا، خەڵکەکە دەرگای ماڵەکانیان خستنە سەر گازی پشت، بۆئەوەی پۆلیسەکان دەرگاکان هەڵنەتەکێنن و خۆشیان وەک نارەزایەتییێک وەسەر گردەکان کەوتن.
پۆلیسەکان یەکە بەیەکەی ماڵەکانیان پشکنی و خەڵکەکەشیان خستنە بەر پرسیاران. ئەوان هێشتاش چەند دەرگایەکیان شکاندن و گوندەکەیان سەراوبن کرد، بەڵام سەروسۆراخی گەریلا هەڵاتووەکانیان بۆ ساغ نەکرایەوە.

لەگەڵ ئەوەشـــدا ژمـــارەیەک لە گەنجـــانی نێـــو گونـــدەکە گیـــران، ئەوانەی نەیـانتوانیبوو بســەلمێنن، کە خەڵکـی گونـدەکەن یـان ماڵباتیـان لەوێ هەیە. کـاتێکیش تاریـک داهـات، هێـزەکە وازی لە گەڕان و پشـکنینی خـۆی هێنـا، و گەڕانەوە مۆڵگەکانی خۆیان.



ئەو شـــەوە شـــاباڵ نەگەڕابـــۆوە مـــاڵ. بانگـــدەرەکەش، کە هەواڵەکەی لە ڕادیـۆکەی گیرفـانی بیسـتبوو، خەمـی لێخـوارد. ئیـدی چـووە لای ئاغاجـان و ئاگاداری کردەوە، کە کوڕەکەی تا ئێستا نەگەڕاوەتەوە ماڵ.
ئاغاجانیش وێنەی ڕووخساری گەریللا هەلاتووەکانی لە گوڕەپانەکەی بـازاڕ بینیبوو، بە هەلاتنەکەی حامیـد ئەشـرەفی زانیبـوو. ئـاخر ئاغاجـان بە گونـدی سـوور بەڵەد بـوو[102]، چـونکە لەوێ یەک دوو مـاڵ مافووریـان بـۆ دەچنـی. خەڵکـی گونـدیش بە دەوری خۆیـان ئاغاجانیـان بـاش دەناســی و ڕێزیـان دەگرت، بەلام ئەو سـەبارەت بە بیرۆکەی ئەوەی، نەبـادا شـاباڵ پەیوەنـدییەکی لەگەڵ کاروباری کۆمۆنیستیدا هەبووبێ، هەدادانی نەمابوو. تا بەترێک لەشـەو ڕابرد، خەوی لێنەکەوت، هەر چاوەڕێی شاباڵی دەکرد، لێ ئەو نەگەڕایەوە.
- "ئەرێ هیچ بیرۆکەیەکت هەیە ئاخۆ بۆ کێ چووەوە؟" بانگدەرەکە وای لە ئاغاجان پرسی.
- "ئەم بەیانییە لە ژێرزەمینەکە هاتە لام، گوتی جارێ دەڕوا و بە درەنگیش دەگەڕێتەوە، بەلام ئەوەم لێچاوەڕێ نەدەکرد، ئەوەندە درەنگ بکا."
- لەوانەیە گەوجـانە بێ کە شـتێکی وابگـوترێ، بەلام پێتـوایە شـتێکی لەگەڵ گوندی فەراهاندا هەبێ؟"
- "لەگەڵ گوندی سوور؟"
- "پۆلیس بە هێزێکی زۆرەوە بەسـەر گوندەکەی داداوە، من لەبازاڕ گوێم لەو دەنگوباسانە بوو، لەوێ ژمارەیەک خەڵکیشیان گرتوون."
- "باشە ئەوە چ پەیوەندییەکی بە شاباڵەوە هەیە؟" بانگدەرەکە بە حەپەسانەوە وای پرسی.

---

[102] بەڵەد بوو: ئاشنابوو.

- "لەم ڕۆژانەدا، هەموو شتێ تێکەڵ و پێکەڵە. هەموو ڕۆژەکە شارەکە نائارام بوو، سەری زمان و بنی زمانی خەڵکی هەر باسی **گوندە سوورەکە** بوو. دەی لێگەڕێ با جارێ وابێ، ئێستا نیوەی شەوە، لە چاوەڕوانی زیاتر هیچمان پێناکرێ. باشتر وایە بچین بخەوین. بەیانیش بۆمان دەردەکەوێ ئاخۆ چی لێ شین دەبێتەوە."

بانگدەرەکە هیچی دیکەی نەگوت و بەرەو ژوورەکەی خۆی کشا، لێ لەپڕ لە هەناوی ئاغاجان ختوکەی شتێک درا.

- "دەی کەمێک بوەستە!" وای بانگی بانگدەرەکە کرد. "گریمان ئەو چووبێتە گوندەکە، وادابنێ، گیرابێ. خۆ ئەگەر وابێ، پێویستە بەرلەوەی پۆلیس بەسەرماندا بدا، با خۆمان دەستبەجێ کەلوپەلەکانی بگەڕێین. گەر هاتبێ و پۆلیس ئەویان بندەست کردبێ، ئەوا بەئاسانی ماڵەکەی دەدۆزنەوە."

ئینجا ئاغاجان سەری بە ژوورەکەی شاباڵدا کرد، و لە نێو کەلوپەلەکانیدا گەڕا. بۆ مایەی سەرسامی، بارستەیەک کتێبی لەژێر پێخەف و دۆلابی جلەکانی دۆزییەوە. کتێبەکان لەو جۆرانە بوون، کە لە کتێبخانەکەیاندا نەبوون، ئەوانیش ڕۆمان، کورتەچیرۆک و شیعری نوێ و هاوچەرخانەی فارسی بوون. لەنێویاندا کتێبی نهێنیشی تێدابوو، ئەو کتێبانەی ڕەخنەی توندیان لە ڕژێمی شای هەوادارانی ئیمپیریالیزمی ئەمریکا دەگرت.

ئاغاجان لاپەڕەی کتێبەکانی هەڵدایەوە، لێ ئەو کاتەی بەدەستەوە نەبوو، هەموویان پەڕبەپەڕ هەڵداتەوە. ئەو دەبێ بەپەلە دەستوبرد بکا. ئینجا کتێبەکانی خستنە نێو گونیەیەک و بە دوای خۆیدا لەنێو تاریکاییەکەدا بۆ لای ڕووبارەکەی ڕاکێشا.



شاباڵ ئەو شەوە نەهاتەوە ماڵ و هیچ سەروسەکوتی پۆلیسیش لە بەردەم قاپیەکەیاندا دەرنەکەوت.

بۆ بەیانییەکەی ئاغاجان وەک جاری جاران، ئاساییانە بەرەو سەرکاری خۆی ڕۆیشت وەک ئەوەی هەر هیچ شتێک نەقەومابێ. لە دەوروبەری سەعات دەدا زەنگی تەلەفۆنێکی بۆ هات. تەلەفۆنەکە هی پۆلیس بوو، داوای لە ئاغاجان کرد سەرێکی پۆلیسخانەکە بدا.

ئاغاجانیش کڵاوشاپۆکەی خستە سەر و داوای لە شوفێرەکەی کرد بەڵکو بیگەیەنێ. لەر پۆلیسخانەکەشدا بە ئارامی لە ژووری بەڕێوەبەری پۆلیس، دوای فەرموولێکردنی لەسەر کورسییێک دانیشت.

- "ئێمە برازاکەتمان لەگەڵ چەند لایدەیەکدا گرتوون." بەڕێوبەرەکە وای بە ئاغاجان گوت.

- "گیراون؟" ئاغاجان بە لەسەرخۆییەوە وایپێگوتەوە؛ "بە چ پەیوەندییێک؟"

- "ئێمە ئەومان لە گوندی سوور دەستبەسەر کردووە. لە گیرفانیشدا رادیۆیەک و کتێبێک هەبوون."

- "باشە ڕادیۆکە چی تێدایە؟ ئەم ڕۆژانە هەمووان ڕادیۆییان هەیە."

- "ئاخر میلی ڕادیۆکە لەسەر ئێزگەی دەنگی مۆسکۆ بوو."

- "دیارە تۆ باش ئاگادار نی، ئەو لە ماڵی خانووەکەی مزگەوتێدا دەژی. لە ماڵی ئێمەشدا هیچ پێویست ناکا گوێ لە ڕادیۆی مۆسکۆ بگیرێ."

- منیش باوەڕناکەم لای ئێوە پێویست بکا گوێ لە مۆسکۆ بگیرێ، هەر بۆیە داوام لێکردی بێیتە ئێرە."

- "من زۆر سوپاست دەکەم، پێزانینم بۆت هەیە." ئاغاجان بوو وایگوت.

- "بەڵام پرسیارەکەی من ئەوەیە، ئاخۆ ئەو لەو گوندەدا چیدەکرد؟"

- " ئێمە لە گوندی فاراهان یەک دوو ماڵی مافووردروستکردنمان هەن، کە دەیان لە گوندییەکان ئیشی تێدا دەکەن. بە بەردەوامیش یەکێ لە پیاوەکانم بۆ چاودێری و پشکنین دەنێرمە ئەوێ. شاباڵیش هەر لەبەر ئەو مەسەلەیە چۆتە ئەوێ."

- "بەڵام ئەو کتێبەی لە هەگبەکەیماندا دۆزیوەتەوە، کتێبێکی قاچاغە." بەڕێوەبەری پۆلیسەکە وای پێگوتەوە.

- "چ جۆرە کتێبەکە؟"

- "کتێبێک دەربارەی شۆڕشی رووسیا."

- "باشە بۆچی ئەوە بە قاچاغ دادەنێی؟"

- "ئاخر کتێبەکە هی ماکسیم گۆرکییە؟"

- "ماکسیم گۆرکی کێیە؟"

- "نووسەرێکی ڕووسە. خۆ ئەگەر کتێبێکی وا لە بەرکەی خوێندکارێک دەربهێنین، بێ مەرج شەش مانگ سزای جووونە ژووری بۆ دەبڕدرێتەوە، بەلام برازاکەت بەختی هەیە، کە ئێمە تۆ دەناسین. ئێمە لە شارەکە پێویستمان بە یەکدی هەیە، بۆیە ئەمجارە وازی لێدەهێنم، ئەوەش لەبەر تۆ، هەر لەبەر خاتری چاوی کاڵی تۆ."

- "من سوپاست دەکەم، ئەوە بۆمن ڕوونوئاشکرایە. لە ماڵ باسی ئەو شتەی لەگەڵدا دەکەم، گوێی ڕادەکێشم و ئاگاداری دەکەمەوە." ئاغاجان وای پێگوت و لە دواجاریشدا هەڵسا.



زۆری نەخایاند شاباڵیش گەڕایەوە ماڵ. ئاغاجان بانگی ژوورەکەی خۆی کرد.

- "تۆ ڕادیۆیەکت هەیە و گوێت لە ئێزگەی دەنگی مۆسکۆ گرتووە، ئەمە واتای چی دەگەیەنێ؟ باشە بۆچی پێمنەزانیوە؟"

- "پۆلیس هەندێ پێی لێهەڵبڕیوە. ئەم ڕۆژانە هەمووان تەلەفزیۆنێکیان لە ماڵ هەیە، لە ڕادیۆ هەر گەڕێ. مرۆش گوێ لە هەموو شتێک دەگرێ. من گوێ لە هەموو ئێزگەکان دەگرم، گوێ لە مۆسکۆ، لە ئەمریکا، لە بی بی سی و لە ئێزگەکانی لای خۆشمان دەگرم."

- "ئاخر کتێبێکی کۆمۆنیستیانەشیان لە بەرکەت دەرهێنابوو."

- "ئەوەی دەمخوێندەوە، ڕۆمانێک بوو، چیرۆکێک بوو، ئاخر خۆ کتێب کتێبە، چ قەیدیە. بۆ بەڕێوەبەری پۆلیس نییە بۆ خوێندنەوە کتێبم بۆ دەستنیشان بکا!"

- "بەلام خۆ هەر ئەو بڕیاردەرە، چونکە ئەو تۆی گرتبوو!"

- "دەکرێ ئەو بمگرێ، بەلام ئەو ناتوانێ خواستی خۆی بەسەرمدا بسەپێنێ."

- "باشە بەو نیوە شەوە چیت دابوو لە **گوندی سوور**؟"

- "ئەوە شتێکی دیکەیە، من دەبووایە پێشتر پێتبڵێم، لێ دوودڵ بووم. ئاخر هەنووکە ساتێکی شیاو نییە باسی بکەین، دەترسم خەمی پێوەبخۆی و

ئازارت بدا، بەڵام لە هەمان کاتدا بێدەنگ بوون، بێدەنگبوونیش زۆر قورس دەکەویتەوە."

- "دەی ، شاباڵ پێمبڵێ."

- "من دەمێکە تووشبووم. تادێت گومان لەناو مێشکمدا فراونتر دەبێ."

- "گومانت لەچی هەیە؟"

- "لە هەموو شتێک. نامەوێ بیڵێم، چونکە من هەمیشە بەگومانم، بەڵام ئاخۆ تۆ لێم تێدەگەی؟ من، ناتوانم جارێکی دیکە بچمە مزگەوتێ."

- "بەڵام خۆتـۆ دەچییە مزگەوتـێ، تـۆ لەوێ دەبینـم، هەمیشـە هەر لەوێ ئامادەی."

- "لێرەدا باس لەسەر ئامادەبوونی جەستەییم نییە، ئاخر خودی خۆم ئامادە نییە، هەر کاتێک ڕوو لە مەککە دەکەم، مێشکم تەواو بە شتی دیکەوە سەقاڵ دەبێ."

- "چ جۆرە شتێک؟"

- "ناوێرم بە دەنگی بەرزەوە بیڵێم. هەر بۆیە بە باشی دەزانم، لە مزگەوت و نوێژکردن دوور بکەومەوە."

- "گومان شتێکی مرۆکردە، تۆ نابێ کاتێ دەستت پێیکرد، دەستبەجێی لێی بسڵەمێیەوە."

- "من پێموایە من بە گومانترین کەس بم، من بڕواکەشم لەدەستداوە، من لە مزگەوتێ هەست بە ئاسوودەیی ناکەم." شاباڵ ئەم قسەیەی بە یەک کەڕەت لە دەم دەرپەڕی.

ئاغاجان چووە نێو قوڵایی کورسییەکەی، شاباڵیش بینی، بەرامبەرەکەی دەستی بۆ ژێر چاکەتەکەی بۆ سەر قورئانە گیرفانییەکەی برد.

- "بەداخم، بوومە مایەی سەرئێشەت." شاباڵ بە نەرمییەوە وای بە ئاغاجان گوتەوە.

- "بەڕاستی، ئەوەی گوتت ئێشاندمی، لێ خۆ منیش قۆناغی وام لە ژیانی خۆمدا گوزەراندووە." ئاغاجانیش وای گوت و لەسەر قسەکەشی بەردەوام بوو؛ "ئەوەش بەسەر دەچێ، بەزۆریش وایە شتەکە پەیوەندی بە تەمەنەوە هەبێ. لە ڕۆژگاری مندا، نە ڕادیۆ هەبوو نە تەلەفزیۆن و نە ئەو جۆرە

کتێبانەش. ئەو شتانە باندۆرێکی بە هێزیان لەسەرت داناوە، بەڵام من هێشتا خەمم نییە و ناشترسم، چونکە من هیچ وێنەیەکی شاشی تۆم لاپەیدا نەبووە، کە خودای خۆت لەبەرچاو نەگری. من لەو بارەیەوە هیچم پێناکری، جارێ چاوەڕێ دەکەم. بەڵام هەق نییە یەک شت فەرامۆش بکەی. من لەوەدا سەرچیخ نەچووم، من باوەڕم پێت هەیە، من متمانەم بە تۆ هەیە. گومانیش شتێکە لەگەڵ ژیاندا هەیە. هەنووکە ماندوو دیاری، جارێ برۆ پشوو بدە. جارێکی دیکە لەبارەی ئەو پرسە، قسە دەکەینەوە."

شاباڵ خەریکبوو بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە لای ئەو جێبێڵی، بەڵام ئاغاجان لە پڕێکەوە بەم پرسیارە تاساندی: "ئەرێ شتێکی زیاتر دەربارەی گەریللا هەڵاتووەکان نازانی؟"

"نەخێرا" ئەویش وا وەڵامی دایەوە، بەڵام ئاغاجان وای گوێ لە دەنگەکەی بوو، وەک ئەوەی شتێکی لەبن سەردا هەبێ.



بۆ بەیانی سەرلەزوو، ئاغاجان بەرەو بازاڕ بەڕێکەوت و لەسەر شەقامیش تووشی قودسییە شێتۆکە هات.

- "ئەرێ، قودسی چۆنی؟"
- "باش!"
- "ئەدی دایکت چۆنە؟"
- "باش!"
- "هیچ هەواڵی نوێت بۆ من هێناوە؟"
- "کیژەکەی موشیری[104] بە قوون ڕووتی کەوتۆتە سەر جادە."

ئاغاجان لە مەبەستەکەی قودسی نەگەیشت. موشیریش یەکێ لە مافوورفرۆشە دەوڵەمەندەکانی بازاڕ بوو. کابرا کچێکی تەمەن بیست و چوار ساڵانەی هەبوو، نەخۆشی دەروونی هەبوو. بۆیە هەمیشە هەر لە ماڵ دەیانهێشتەوە، هەرگیز لێنەدەگەڕان لە ماڵ بێتەدەر.

- "باشە کیژەکەی موشیری چییەتی؟ دەکری جارێکی دیکە بۆم دووبارە بکەیتەوە؟ ئاغاجان وای لێپرسی.

---

[104] Moshiri

قودسیش هەندێ سەری لێهێنایە پێشەوە و بە سرتەوە پێیگوت: "تارمایی لەناو مزگەوتێ دەسوڕێنەوە."

- "تارمایی؟ قوونی ڕووت؟ دەی قودسی پێم بڵێ. تۆ دەبێ لەوە زیاترم پێبڵێی!"

بەلام قودسی هەر زوو، لەگەڵ بینینی یەکەمین دەرگای کراوەی ماڵێکی بەردەمیان، ئاغاجانی جێهێشت و لێوەژوور ماڵەکە کەوت.



پۆلیس خەبەری سووسەکارێکی[١٠٥] بۆهاتبوو، گوایە لە گۆڕەکانی سەردابی ژێر مزگەتەوکە کارو چالاکی گوماناوی سازبدرێ. گومانیان هەبوو، هەندێ گەریللا لەوێدا خۆیان شاردبێتەوە.

بۆ شەوەکەی دوو ئاژانی دەزگای نهێنی، خۆیان وا هەڵهێخستبوو گوایە دوو مەلای گەنجن، ئیدی لێوەژوور مزگەوتێ کەوتن و لە کاتی نوێژیشدا لەپشت مەلا بە تەمەنەکەدا نوێژەکەی خۆیان دابەست.

کاتێکیش لە نوێژ بوونەوە، ئەوان لەوێ مانەوە بە قسەکردن لەگەڵ مەلای مزگەوتێ خۆیان وەخراند. ئەوان بە مەلاکەیان گوت، کەوا لە ئیسفەهانەوە هاتوون و دەیانەوێ سەردانی شارە پیرۆزەکەی قوم بکەن، شەویش لە میوانخانەیەکی شاری زەنجان دەمێننەوە.

مەلا پیرەکەش فەرمووی لێکردن لەگەڵیدا بچنە حوجرەکەی و چایەکی تازە دێمکراو بخۆنەوە. بەدەم چایەخواردنەوە پێیڕاگەیاندن، کە ئەو مەلایەکی جێگرەوەیە، ئیدی تا دەوروبەری ساڵێک لەوێ دەمێنێتەوە. تا ئەوکاتیش ئەگەر هیچ نەیەتە پێش، ئەحمەدی کوڕی مەلا ئەلسابری کۆچکردوو لە خوێندنی مەلایەتی دەبێتەوە و لەمزگەوتێدا جێگەی باوکی خۆی دەگرێتەوە.

ئاژانەکانیش چایەکەی خۆیان خواردەوە، لەهەمان کاتیشدا چاویان هەر لەسەر حەوشەی مزگەوتێ بوو، ئەو ناوەیان خستبووە بن چاودێری خۆیانەوە.

- "ئەرێ باشە هیچ کەسێکی دیکە لێرە دەژی، یان هەر خۆت بەتەنها لێرەی؟"

---

[١٠٥] سووسەکار: سیخوڕ، جاسوس.

- "هەر من بەتەنیا لێرە دەژیم، بەڵام مجێورەکەش تاڕادەیەک بەردەوام لێرەیە، ئاخر مزگەوت هەموو ژیانی ئەوە، منیش پێزانینم بۆ کارەکەی هەیە، ئەو بە یەکجار ئیشی دە پیاو دەکا. هەر لە بەرەبەیانێکی زووەوە دەستپێدەکا تا دەرەنگانێکی شەو دەمێنێتەوە، ئەوسا دەڕواتەوە ماڵی."

- "پێموابێ گوێم لە دەنگەدەنگێک بوو لەژێرزەمینەوە هات." یەکێ لە ئاژانەکان کە بە هەنجەتەکەوە هەڵساو ڕۆیشت، وای بەمەلا خانەخوێکە گوت.

- "مزگەوتەکە کۆنە، گەلێک کۆنە و ڕازی زۆری هەن. پێویست ناکا لێرە بپرسی ئاخۆ کێ دەچێتە ژێرزەمینەکە و کێشی لێدێتەدەر. ئەوشتە لە مزگەوتە کۆنەکان هەردەبێ. هەندێ جار بە شەوان گوێم لە دەنگی نامۆ دەبێ، دەنگێکی باش نەبیستراو، ئاخر مزگەوتەکە ژیانی تایبەتیانەی خۆی هەیە. کاتێک لێرە دەنووی نابێ گوێ لەو دەنگانە بگری، واپێویست دەکا سەرت بخەیتە سەر سەرین و چاوەکانیشت بنوقێنی."

بە درەنگی شەو و لەکۆتاییدا گوێیان لە ترپەی پێیەک بوو لەوناوە دەهات، ئیدی ئەوانیش هەڵسان و خواحافیزییان لە پیرە مەلایەکە کرد، کە هەڵیشستان و حوجرەی مەلایان جێهێشت، سوودیان لە تاریکاییەکە بینی، خۆیان پەنادا، لەوێ لە پەنای دەلاقەیەک کە دەکرا سەیری ژێرزەمینەکە بکرێ، خۆیان حەشاردا.

بیچمێک بە خۆی و مۆمێک بەدەستەوە بەرەو سەردابەکە دابەزی. واپێدەچوو، وەک ئەوەی کەسەکە بەدوای شتێکدا بگەڕێ. ئاخر ئەو لەسەر ڕیتوێلێک دەڕۆیشت. ئەو شتێکی بەدەستی چەپەوە گرتبوو، تۆ کتومت نەتدەزانی ئاخۆ چییە هەڵگرتووە. ئەو لەگەڵ یەکێکی دیکە دەدوا و زیاتر بە نێو قوڵایی تاریکییەکەدا شۆڕدەبۆوە خوارێ، گوێت لە تەقەی کردنەوەی دەرگایەک بوو، پاشان بیچمەکە ون بوو.

ئاژانەکانیش بە نەرمی و ئەسپاییەوە بۆ ژێر زەمینەکە چوون، بە هێواشی لە پەیژەکان دادەبەزین و لە تەنیشت یەکدی بەبێ دەنگی وەستان گوێیان لە خامۆشییەکە گرت. ئەوان نەیانوێرا لایتە دەستیەکانیان پێبکەن، هەر لەبەر تاریکاییەکەدا زیاتر بەرەو ئەو شوێنە چوون کە بیچمەکەی لی ونببوو. ئەوان دەبووایە ئاگایان لەخۆیان بووایە، نەوەک بەسەر کێلی گۆڕەکاندا دابکەون.

لەوێ لەنزیک قاپییەکە گوێیان لە دەنگێکی ناڕوون بوو، تروسکاییێکی زەردباو لە ژێر دەرگاکە پەیدابوو.
ئاژانەکان لە بەردەم دەرگاکە وەستان. دەنگ یان دەنگەکان ناڕۆشن بوو، شتەکە وەک ئەوە وابوو، کەسێک دەقێک بۆ یەکێکی دیکە بخوێنیتەوە.
ئاژانەکان گوێیان بە دەرگاکەوە نا، گوێیان لە ڕستەی تێکشکاو بوو کە هیچی لێی حاڵی نەبوون:

**أرضِعِيهِ**
**فَإذَا خِفْتِ عَلَيْهِ**
**فَألْقِيهِ فِي اليَمِّ**
**وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي**
**إنَّا رَادُّوهُ إليْكِ ...     (القصص:٧)**

**{شیری دەیە،**
**هەروەختێ لێی نیگەران بووی،**
**بیهاوێژە ناو دەریاوە،**
**هیچ مەترسە و خەمیش مەخۆ!**
**ئێمە بۆتی دێنینەوە...}**



لە پڕێکیش گوێیان لە قیژەیەکی توندی ئافرەتێک بوو. ئاژانەکان سەیری یەکدییان کرد، تادەهات ترسەکە زیاتر دەبوو، ئەوان نەیاندەزانی، ئاخۆ دەنگەکە لە سارداوەکەوە هات یان لەنێو مزگەوتێ. ئیدی بەبێدەنگی کشانەوە دواوە و مزگەوتیان جێهێلا.



ئەو ژنەی لەهاواری دا سەدیقە بوو. ئەو لەپاڵ حەوزەکە بوو، کە لەپڕ ژانێکی تیژ گرتی. ژانەکە لە زگیەوە بوو بەرەو پشتی ڕۆیشت، ئازارێکی وا بوو سەری سوڕاند. لەتاو ئازارەکەشدا قیژاندی و کەوتە سەر زەوی. ئەوێ شەوێ ئاغاجان، فەخری سادات، زینەت و بانگدەرەکە بە سەردان چووبونە گوندێکی دەوروبەر بۆ ڕۆژی پاشتر گەڕانەوە. شاباڵ گوێی لە قیژەی سەدیقە بوو. بەپەلە غاریدایە لای حەوزەکە، چووە بنپاڵی و گەیاندیەوە

ژوورەکەی خۆی. لەبەر تیشکی گڵۆپی ژوورەکە خوێنی لەبەرڕۆیشتووی لەسەر ناوکەوەکە بینی. شاباڵ بانگی نەسرین، کچە گەورەکەی ئاغاجانی کرد. "دەی بانگی دکتۆر بکە! منیش وا دەڕۆم مامانەکە دەهێنم." سواری پایسکلەکە بوو، بە ئاراستەی ڕووبارەکە لێیخوڕی و پەیدانی بە توند لێدا.
کاتێکیش ژنە مامانەکە گەیشت و سەدیقەی بینی، گوتی: "ئەمە باری خراپە، پێویستە بانگی پزیشکێک بکەن، من بەتەنها بۆم ناکرێ."
- "دکتۆر لە ڕێگادایە." نەسرین بوو وای گوت، "من لەدەرەوە چاوەڕوانی دەکەم."
سەدیقە زیاتر خۆی پێنەگیرا، ئەمجارەیان ئەوەندە قایم قیژاندی، وای لەمامانەکە کرد هەوڵێک بدا، بەڵکو کۆرپەلەکە قوتار بکا.
- "کۆرپەلەکە دەیەوێ بێتەدەر، بەڵام هەوڵەکە سەری نەگرت. چاوەکانم لەبەر ئەو تیشکە هیچ نابینن. دەی نەسرین چرایەک بێنە لەگەڵ چەند پارچە پەڕۆکێکی خاوێنیش.!"
نەسرین بە خێرایی چووە یەکێ لە ژوورەکان و بە چراو دەستەیەک خاولی گەڕایەوە.
- "دەی دەرکەوە، ئەوەندە خۆت ڕەق مەکە!"
نەسرین هەنگاوێک چووە پێشەوە، بەڵام سەیری سەدیقەی نەکرد، چرایەکە لەسەر سەری مامانەکە ڕاگرتبوو، ئینجا گوتی. "پێموابێ دکتۆرەکە هات."
- "دەمت داخەو چرایەکە باش ڕاگرە!"
لەودەمەدا ترومبێلێک لەبەردەم دەرگاکە وەستا. دەستەکانی نەسرین دەلەرزین، ورتەورتەیەکی لە دەم هاتەدەر، شتێکی خوێندەوە. مامانەکەش هانی سەدیقەی دەدا بەهێزتر پاڵ بنێ و هەر پشیش بخواتەوە.
- "کۆرپەلەکە لەنێو وێڵداشدا وەرسوڕاوە، بۆی ناکرێ بێتەدەر، ئەم کارە سەرناگرێ." لەو ساتەدا هاوارێکی توند لە سەدیقە بەرزبووەوە بووڕایەوە.
پزیشکەکەش هاتە ژوور.
- "هەمووکات دکتۆرەکان دوادەکەون! مامانەکە بە توورەییەوە وای بانگ کرد. "ئەو دکتۆرانە هەمیشە دەچنە نێو قووڵایی پێخەفەکانیان."

بە یارمەتی مامانەکە و لەبن ورتەورتی نەسرین، کە دیاربوو شتێکی دەخوێندەوە، یەک سەعات دواتر پزیشکەکە مەلۆتکەکەی لە زگی سەدیقە دەرهێنا.

- "مەلۆتکەکە نێرە!" مامانەکە، مەلۆتکەکەی سەراوبن گرتبوو. "بەڵام خۆ شتێک لێرەدا تەواو نییە." مامانەکە چەند جارێک بەتوندی مەلۆتکەکەی ڕاوەشاند. ئیدی لە پڕێکەوە کەوتە گریان. "سوپاس بۆ خودا."

دکتۆرەکەش چووە لای سەدیقە، سەماعەکەی لەنێو قوتووەکەی دەرهێنا و گوێی لە ترپەی دڵی دایکەکە گرت.

"زۆر شەکەتە، بەڵام چاک دەبێتەوە." دکتۆرەکە وای گوت، ئینجا چووە لای مامانەکە، کە کۆرپەکەی لەنێو تەشتە ئاوێک دەشوشت، پێشتر نەسرین بۆی ئامادەکردبوو.

"شتێک لە کۆرپەدا هەیە، پشتۆکەی تەواو نییە." مامانەکە وای گوت و بە ئەسپاییش کۆرپەلەکەی لەسەر زگ درێژکرد.

دکتۆرەکەش چاویلکەکانی کردنە چاو بەسەری پەنجەش پشتی کۆرپەلەکەی پشکنی.

- "پشتەکەی هەر زۆر ناتەواوە." دکتۆرەکە ورتەیەکی وای لێوەهات.
- "من هەر زووم زانی." مامانەکەش قسەکەی وا لێسەندەوە.



دکتۆرەکە ئەوێی جێهێشت.

- "دایک و کۆرپەکە خەویان لێکەوت،" مامانەکە وای بە نەسرین گوت.

"ببوورە کە ئەوەندە ڕەق بووم، ئەو جۆرە دۆخانە هەمیشە سەخت و ناخۆشن. منیش دەڕۆم یەک دوو سەعات سەرخەوێک بشکێنم، بەیانی زوو سەر دەدەمەوە. هەر هیچ ناتەواوییەکیش لە کۆرپەلەکەدا هەبێ، بەیانی دکتۆرەکە زەنگ بۆ ئاغاجان لێدەدا و پێیدەڵێ."

ئیدی دیسان ئارامی بۆ ماڵەکە گەڕایەوە. ڕووناکی بەردەوام لە ژوورەکەی سەدیقە هەبوو، هێڵی تیشکە زەردەکان بەسەر بەردەکانی حەوشەکەدا ڕەنگیان دەدایەوە.

شاباڵ کەوتبووە ژێر باندۆری، ئەوەی لەو شەودا ڕوویدابوو.

جاران، کاتێک لە ماڵەکە منداڵێک لەدایک دەبوو، ئاغاجان چەند ئایەتێکی ئیقاعدارانەی بە گوێی کۆرپەلەدا بە تەرتیل دەخوێندنەوە، چونکە فەرموودەیەکی پێغەمبەر موحەمەد هەبوو: "یەکەمین وشە کە منداڵەکە گوێی پێدەزرنگێتەوە، هەمیشە لەیادەوەریدا دەمێنێتەوە، هەروەک ئەوە وایە رستەیەک لەسەر گاشەبەردێک هەڵبکەنی."
شاباڵ چووە ژووری کتێبخانەکە. دەستی دایە کۆنترین قورئان و لەنێو دۆڵابەکەی دەرهێنا و بە نەرمی چووە ژووری سەدیقە. سەدیقە خەوێکی قووڵی لێکەوتبوو، کۆرپەلەکەش لە لای دیوارەکە قۆنداغەکرابوو. ئیدی شاباڵ قورئانەکەی لێککردەوە بەدوای سورەتێکی بەریتمدا گەڕا، بەڵام هەر زوو هزری خۆی گۆڕی و قورئانەکەی خستەوە نێو بەرگەکەی خۆی. ئینجا سەری خۆی هەندێ بۆ پێشەوە هێنا، پارچە شیعرێکی ناودارترین شاعیری فارسی، ئەحمەدی شاملۆ لەبەر بەگوێی ساوایە تازە لەدایکبووەکەدا چرپاند:

*بر زمینه سربی صبح*
*سوار*
*خاموش ایستاده است*
*ویال بلند اسبش در باد*
*پریشان میشود*
*خودایا خودایا*
*سواران نباید استاده باشند*
*هنگامی که*
*حادثه اخطار میشود*

**بە زەردەی قوڕقوشمینی بەیانی؛**
**خامۆشانە وەستاوە، کاکەی سوار**
**یاڵە شۆڕەکەی ئەسپەکەش بە دەم باوە پەرێشان**
**خودایا، ئەی خودایا**
**خو نابێ سوار بوەستێ**
**کە هاتە پێش کاری دژوار**

ئیدی مەلۆتکەکە چاوەکانی هەڵهێنان.

## مارمیلکە

هەنووکە تەمەنی مارمیلکەکە ببووە یەک ساڵ. ئەو لەناو حەوشەکەدا لەسەر زگ بۆ لای حەوزەکە دەخشا. ئەوەش یەکەمین جاری بوو لە ژوورەکەی دوور بکەویتەوە، ئاخر ئەو یاری لەگەڵ ئاودا دەکرد.
لە سەرەتادا هەمووان چاویان لێبوو، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک، هیچ کەس گوێی پێنەدەدا. ئەو لەسەر حەوزەکەدا سەیری ماسییەکانی ناو ئاوەکەی دەکرد، ئەوانیش بە چاوە زەقەکانیان بێ ئەوەی هیچ شتێک بڵێن سێرەیان لەو دەگرتەوە. یەکەمین جاریشی بوو ماسی ببینێ. ئەو هەر خۆی هەڵدەکوتا و حیتەی پێکەنینیشی بوو، زۆر دڵشاد بوو. ئەو زیاتر بۆ سەر حەوزەکە خشا، لێ لەپڕ کەوتە نێو ئاوەکە. هەمووان شڵەژان، سەدیقە بەغار خۆی هەڵدایە نێو ئاوەکە دەریبێنێ. بەڵام خۆ مارمیلکەکە ئەوەی نەدەویست، ئەو زۆر بە سووکی لە سەر ئاوەکە دەجووڵا و بەدوای ماسییەکاندا دەڕۆیشت.
شاباڵیش چووە نێو ئاوەکە و مارمیلکەکەی دەرهێنا. پاشان دایەوە دەستی سەدیقە. ئەویش بە گریانەوە منداڵەکەی لەباوەش گرت و بردیەوە ژوورەکەی خۆی.



مارمیلکە کوڕی سەدیقە و خالخالی بوو. ساواکە بە پشتێکی لاواز و سەقەتەوە لەدایک بوو، بۆیە نەیدەتوانی لەسەر قوونی دابنیشێ. ئەو هەر زووش گەورە بوو، زۆریش بە زوویی دەستی بە جووڵە کرد. وەک مارمیلکەیەکی گەورە لەژێر پێخەف و پەتۆکان دەخشا. هەر زووش ڕێگای چوونەدەری لە ژوورەکە بۆ نێو حەوشەکە دۆزییەوە، لەسەر زگ و لەپ بۆ نێو باخچەکە دەخشا.
منداڵەکانی ئاغاجان پێیان خۆش نەبوو، منداڵەکە بێتە ژوورەکەیان و بەنێو پێخەف و پەتۆکانیاندا بخشێ. بۆیە هەموو کات قاپی ژوورەکانیان لەدیوی

نــاوەوە لەســـەر خۆیـــان گـــاڵە دەدا. ئەوان شـــەرمیان لەو هەســـتەی قێزلێبــوونەوەی خۆشــیان لە هەمــبەر منــداڵە نــاتەواوەکە دەکــردەوە، لــێ هیچیشیان پێنەدەکرا. ئاخر کاتێکی باشی ویست تا لەڕەوشـەکە رادێن لەوەی منداڵێک زیاتر لە زیندەوەرێک دەچێ تا مرۆڤ، تا لەباوەشی بگرن. لێ ئەو منداڵە ساوایە کەسەکانی خۆی دۆزیبووەوە: هەر کاتێک مام ڕەمەزانی لەنێو حەوشەکەدا دەبینی، خێرا بەرەو لای دەخشا.

مـام ڕەمەزانـیش منداڵەکەی بەرزدەکردەوە، لەسـەر شـانەکانی خـۆی دادەنـا، لەنێو حەوشەی حەسارەکەدا پیاسەیەکی پێدەکرد و گوڵ، دارودرەخت، قەل و پشیلەکانی مزگەوتیی نیشان دەدان.

مارمیلکەکە لە کن مامە بانگدەرەکەش هەستی بەئاسوودەیی دەکرد؛ ئیدی بە نێو ژوورەکەیدا دەڕۆیشت تا خۆی دەخشاندە نێو پێخەفەکەی.

- "هـۆی گەنجـۆ، ئەوە تـۆی، یـاخود پشـیلەکەی؟" بانگـدەرەکە بە پێکەنینـەوە وای بانگدەکرد.

مارمیلکەکە دەستی دەگەیاندە گۆپاڵەکە و ڕادەستی بانگدەرەکەی دەکرد، بەم شێوە داوای لێدەکرد پیاسەی پێبکا. یارۆی بانگدەریش بە نێو حەوشـەکەدا دەهات و دەچوو، منداڵەکەش بە دوایەوە دەخشا.

کەس نەیدەزانی ئاخۆ کێ نازناوی "مارمیلکە"ی لە منداڵەکە نابوو. ئاغاجان بە ڕژدبـوونەوە هۆشـداری دابـووە منـداڵەکانی خـۆی، نـابێ بەهـیچ شـێوەیەک وشـــەی "مارمیلکە"یـــان لە دەم بێـــتەدەر، بەڵام خـــۆ نازنـــاوەکە ئەوەنـــدە گونجاوبوو کەس نەیدەتوانی خۆی لێنەبان بکا.

ئاغاجان ناوێکی جوان، ناوی "سـەید مـحەمەد"[١٠٦]ی بـۆ ناسـنامەکەی دانـابوو. منـداڵەکەش لە ئاسـت بـانگردنی بەو نـاوەوە هـیچ وەڵامێکـی نەدەبـوو. لـێ هەرکات بانگیان بکردبایە"مارمیلکە"، خێرا بەرەو ماخۆی[١٠٧] دەنگەکە دەخشا.

ئەو بوونەوەرێـک بـوو، ئەوەنـدەی سـەر بە جیهـانی پشـیلە، مریشـک و ماسییەکان بوو هەر ئەوەندەش سەر بە جیهانی مرۆڤەکان بوو.

---

[١٠٦] Sajjed Mohammad

[١٠٧] ماخۆ : خاوەن.

هەمــووانیش ئەوەیــان پێقبــووڵ بــوو، دایکەکەشــی چیــدیکە دژی ئەو شــتە نەوەســتایەوە. ئەم شتەی بە قەدەرێک، بەشتێک کە لەنێوچاوان نووسرابێ، دانابوو.

خالخالی لە ژیانی ئەوان نەمابوو، بەڵام لە سایەی ڕووخساری مارمیلکەدا بـۆ لایـان گەڕابـۆوە. ئـاخر مـارمیلکەکە سـیمای خالـخـالی هەڵگرتبـوو. ئەو بەنێـو پــێخەفەکەی ســەدیقەدا دەخشــا، خــۆی لە جەســتەی دەدا، ژنەکەش ئەوی نەدەویست، بەڵام هیچیشی پێنەدەکرا، دەبوایە هەر هەڵیگرتبایە.

زینەت خـانم، داپیرەی مـارمیلکەکەش، هەر کاتێک نەوەکەی لەنێو حەوشـەکە بـدیبایە کە دەخشـا، بەکرێ لەبەر خـۆیەوە دەگریـا. ئەو ژنێکی ئیمانـدار بـوو، مشووری ژیان و بەختی ژنە خواپێداوە ئیماندارەکانیشی دەخوارد، بەڵام وای بیردەکردەوە، کە خوا ئەوی بەهۆی ئەو منداڵەوە سزاداوە. سزایەک، چونکە ئەو زۆر بــاش ئاگــای لە عەباســی کــوڕی نەبــوو، ئەو کــوڕەی لەبەر کەمتەرخەمــی لە نێــو ئــاوی حەوزەکەدا خنکــابوو. هەروەهــا بەهــۆی ئەو گونـاحەی، لەنێو مـزگەوتەکەدا کردبـووی. ئـاخر ئەو کەتنێکی کردبـوو، هـیچ ژنێـک لە پێگەی ئەودا نەیکردبـوو. ئـاخر مەلایە جێگـرەوەکە ئەو شـتەی لەو داواکردبوو، کە پیاو لەژنێکی دەخوازێ، ئەوەش هەمـووی لە سـەردابێکی پڕ لەگۆڕ.



ئەو ڕۆژەی، کە مــارمیلکەکە کەوتە نێــو حەوزی ئــاوەکەوە، بــووە ڕۆژێکــی گرنگی ماڵ.

ئەحمەد، کوڕی مەلا ئەلسـابری کۆچکردوو، لەکۆتاییدا لە خوێندنی مەلایەتی بووەوە، لە شاری قوم گەڕابۆوە تا جێگەی باوکی لە مزگەوتێدا بگرێتەوە.

لە مــاوەی ڕۆژێــک یــان دووان، ئــاهەنگی ســوێندخواردن بـۆ جێگـرتنەوەی سازدەدرێ. بۆ ئەو بۆنەیەش هەموو خزم و ناسیاوان هـاتبوون. ئەمەش ئەو ئـاهەنگەیە کە لە ژیانـدا تەنهـا یەک جـار دێتەپـێش. شـتەکەش دەسـتپێکی قۆناخێکی نوێی شارەکە بوو، ئاخر هەڵسوکەوتی نێوان مزگەوتێ و بازاڕەکە دەگۆڕێ. هەمووشـیان مەڕاقبـوون ئـاخۆ ئەحـمەد چـۆن مـزگەوتەکە بەڕێـوە دەبا.

هەفتەی ڕابردوو، ئاغاجان چووبووە قوم و لە بۆنەی دەرچوونی ئەحمەد لە خوێندنەکەی ئامادە ببوو.

بۆ شەوەکەش، ئەو هەر لەوێ مابۆوە، تا لەگەڵ ئەحمەددا بەوپەڕی شێنەیی باسی سوێند خواردنەکە و گرنگترین ئەرکەکانی مەلای مزگەوتیی لەگەڵدا ببڕێنێتەوە.



ئاغاجان وای لە ئەحمەد دەڕوانی، کە کەسێکی بێ ئەزموونە، بەڵام خۆ ئەو گەنجێک بوو، مەلایەکی قۆز بوو، هەمیشە جلی کەشخەی لەبەردەکردن، بە پشت ڕاستی دەڕۆیشت، بۆنی لەخۆی دەدا، کەم تا زۆریش مێزەرێکی نوێی لەسەر دەنا.

سەربارەی ئەو شتانەش، دەنگێکی بەهێزی هەبوو، بە سەرنج بۆ خۆ ڕاکێشانەوە دەدوا، ئایەتەکانی قورئانیشی بە میلۆدییەکی خۆشەوە دەخوێندنەوە، بە بەهرەیەکی خۆکردی وا هەمووی هەر لەبەربوو. هەر ڕۆژگاریش دەیسەلمێنێ ئاخۆ ئەو چەند بەتوانایە و چی لەبن کڵاوەکەیدا هەیە.



ئەحمەد ئێوارەی دوێنێ بە خۆی و هەگبەیەکەوە گەیشتبووە ماڵ، دەستبەجێش ئاغاجان لە ژووری کتێبخانەکەدا پێشوازی لێکرد و دەربارەی بۆنەی سوێندخواردنەکە قسەی لەگەڵدا کرد، بەڵام ئەحمەد هەر بە تەواوی لەخەیاڵێکی دیکەدا بوو، ئەو شتی پێشنۆرەی[108] دیکەی هەبوون. ئەو هەگبەکەی لەسەر مێزەکە دانا، سەرەکەی کردەوە، جبە نوێیە مەلایەتییەکەی لە نێو دەرهێنا، بە دوای سێپێکێک[109] دەگەڕا تا پێیهەڵبواسێ.

- "ئەرێ بۆچی هیچ سێپێکێکی جلهەڵواسین لێرەدا نییە؟" ئەمەی بە جۆرە بێزارییەکەوە گوت.

ئەحمەد دەستی دایە قەڵەم دارێک و لەنێو ڕەفەی دۆڵابی کتێبەکانی ڕاکرد و جبەکەی پێوە هەڵواسی. پاشان کەلوپەلە تایبەتییەکانی لەنێو هەگبەکە

---

[108] پێشنۆرە: شتی لەپێشتر. ئەفزەلییەت.

[109] لێرەدا بەواتای عەلاگەی جلک پێوەهەڵواسینم بەکارهێناوە.

دەرهێنان و گوتی: "باشە، ئەدی ئەمانە لە کوێ دانێم؟ من دۆلابێکی دیکەم لێرە پێویستە."

- "دەکرێ شتەکانت لە ژووری تایبەتی خۆت دابنێی." ئاغاجان بە دانبەخۆداگرتنەوە وایپێگوت.

- "ئاخر دەمەوێ شتەکانم لێرە بن."

ئاغاجان وایبینی، کە هەنووکە کاتەکە لەبار نییە تا لەگەڵ ئەحمەد بکەوێتە گفتوگۆ.

- "پێمـوایە پێویستت بە پشـودانێک هەبێ. بەیانی لە ژووری کارکردنم سەبارەت بە باقی شتەکان دەدوێین." ئاغاجان ئەمەی گوت و لە ژووری کتێبان هاتەدەر.

بەدرەنگانێکی شەو، ئاغاجان لە هەواڵنامەی مزگەوتێدا نووسی: بەیانی مەلایەکی نوێ دەست بەکار دەبێ. ئەحمەد گەیشتووە. لەئەودا وا دەبینم کە ڕۆژگار گۆڕاوە، ئەو زۆر لە باوکی و لەو مەلایانەی تا ئێستا بینیومن جیاوازترە. من نابێ گومان لە کارامەیی بکەم، ئەو هێشتا گەنجە و هێشتا سەراودەراوی زۆری ماوە ببینێ، بەڵام ئەوەی بەدڵنیاییەوە بتوانم بیڵێم، ئەمەی خوارەوەیە: هەنووکە مەلایەکی کەشخەمان لەماڵێدا هەیە. من کەیفم پێدێ و مەڕاقیشم ئاخۆ تا کوێ سەردەکێشێ."



ڕۆژی هەینی لە سەروبەندی سەعات دەدا، بازاڕ دادەخرێ. بە هەزاران کەس بۆ نوێژی سوێندخواردن دێنە مزگەوتێ. بۆنەکەش بۆنەیەکی سادە بوو، لێ لەگەڵ ئەوەشدا ڕووداوێکی ئاهەنگئامێزیش بوو، ئاخر مەلایەکی نوێ سوێندی دەخوارد. نوێژەکەش دەبوایە لە دەرەوەی مزگەوتێ بکرابایە، بۆ ئەو مەبەستەش بە دەیان مافوور ڕاخران. پۆلیسیش لە هەموو لایەکەوە هەبوو، یەک دوو ترومبێلی سەربازیش بە چەکدارەوە لە شەقامە لاوەکییەکاندا لەوپەڕی ئامادەباشیدا بوون. ئاخر خۆ لە شاری زەنجاندا ڕۆژێکی ئاسایی نەبوو.

ئەو دوو سێ ساڵانەی ڕابردوو، بارودۆخی وڵات بەتەواوی گۆڕابوو. لە زانکۆکانی تاراندا خۆپیشاندان بەرپا ببوو، خوێندکاران دژی شا هەڵسابوون، دروشمی "لەگەڵ ئەمریکا دەفن بێ!" ببووە دروشمی سەرەکی.
ڕژێم لە یاخیبوون دەترسا.
ئاغاجانیش بۆ دواجار، هەمووشتێکی لەگەڵ ئەحمەددا براندەوە، ئیدی کڵاوشاپۆکەی کردەوە سەر و لە ماڵ دەرچوو، ڕووی لە مزگەوتێ کرد.

- "ڕۆژێکی پیرۆز!" حاجی شیشەگاری دراوسێ وای بانگی ئاغاجان کرد، کە بە خۆیی و هەر دوو کوڕە جمکەکانی بۆ مزگەوتێ دەڕۆیشتن.
- "ئەگەر خوا بیکا!" ئاغاجانیش بە کەیفسازییەوە وەڵامی دایەوە.
- "من ئەمڕۆ لەخزمەت تۆ دام، ئەگەر هەر کارێکم پێبکرێ، ئامادەم." حاجی شیشەگار وای پێگوتەوە.
- "هەمووشتێک ڕێکخراوە، بەڵام سوپاسی لوتفت دەکەم. ئەوانە جمکەکەتن؟"
- "بەڵێ، ئەم ڕۆژانە منداڵ هەر لەخۆیەوە گەورە دەبن، کوڕەکەی تۆش گەورە بووە." وای وەڵام دایەوە.
- "بەڵێ ڕاستە. جەوادیش بۆتە لاو."
لەو دەمەدا ئاغاجان قودسییە شێتۆکەی بینی لەیەکێ لە ماڵەکان بەرەو ڕوویان دەهات.
- "قودسی، زۆر باش بوو تۆم بینی. ئەرێ دایکیشت دێتە ئاهەنگەکە؟" ئاغاجان وایلێپرسی.
- "دایکم چارشێوێکی ڕەشی نوێی کڕیوە."
- "خۆشحاڵم بە هاتنی." ئاغاجان وای پێگوتەوە.
- "بەڵام خۆ ئەو نایەت."
- "بۆچی نا؟"
- "ئاخر ئەو چارشێوە ڕەشە نوێیەکەی بزرکردووە."
- "چارشێوەکەی ونکردووە؟ هەر ئێستا؟ کێ ناڵێ تۆ نیت، ئاخۆ لەچ کونێکت شاردۆتەوە؟" ئاغاجان ئەمەی بە خەندەوە پێگوتەوە.
- "نەخێر، من وام نەکردووە."

- "ئاخر ئەدی چۆن بوو، دەمودەست چارشێوە نوێکەی لێبزربوو؟"
- "من چوزانم. هەموو شەوەکە هەر بەدوایدا گەڕا، بەڵام نەشیدۆزیەوە."
- هەر دەبێ لەوەختی خۆیدا بیبینێتەوە." ئاغاجان ئەم قسانەی پێگوت و هەنگاوی بەرەو مزگەوتێ هەڵێنان.
- "کیژە شێتەکەی موشیری بە لینگ ڕووتی لەسەر جادە و کۆلانان دەسوڕێتەوە، دوێنێ شەویش هەروای کرد." قودسی ئەم قسەیەی بە سرتەیەکەوە گوت.
- "ئەزانی دەبێ چی بکەی،" ئاغاجانیش وایپێگوتەوە؛ "برۆ ماڵی ئێمە. ئەحمەد جبە نوێیەکەی لەبەردەکا، برۆ با هەندێ قرۆشت بداتێ، دەی هەر ئێستا برۆ!"

قودسی بەرەو ماڵی ئاغاجان ڕۆیشت، ئەو شەقامەی رەتدا کە ئاپۆرەی خەڵکەکە لەچاوەڕوانی بۆنەکە ڕاوەستابوون.

لەوێ پیاوێک بە خۆی و کامێرایەکی سەر شانی، لەنێو ئاپۆراکە هاتەدەر و چاوی کامێراکەی لە ئاغاجان کرد و پێشی گوت: "تۆ ئەمرۆ بەم کڵاوشاپۆ و ئەم قاتە قاوەییە تاریکباوە، زۆر کۆک دیاری."

- "نوسرەت، ئەوە تۆی؟" ئاغاجان بە خۆشییەوە پێیگوت: "ئاخر نازانی چەندت شادمان کردم، پێموابوو ئیدی ناگەڕێیتەوە. باشە کەی گەیشتی؟"
- "تازە، هەر ئێستا، بە قەتاری شەو هاتم."

جێگری سەرۆکی شارەوانی لە ئاغاجان چووە پێش و تۆقەی لەگەڵدا کرد و پیرۆزبایشی لێکرد.

- "ئەرێ بۆ خاتری خوا، پێم نالێی چ پێویستی بەو هەموو ترومبێلە سەربازییانە دەکرد؟" ئاغاجان وای بە کاربەدەستەکە گوت.
- "بۆ ئەوەی ئاهەنگەکە سەرنجڕاکێشتر بێ." جێگری سەرۆکی شارەوانیش وای وەڵام دایەوە. ئیدی کابرا لەگەڵ ئاغاجان ڕۆیشت و دەرگای مزگەوتییان کردەوە، لەوێ بەڕێوەبەری پۆلیس، نوێنەرانی ژاندرمە، کاربەدەستانی پارێزگاکە، بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە و بەڕێوەبەری قوتابخانەکانی لێڕاوەستابوون.

- نوسـرەتیش بەدوای ئاغاجاندا چـوو، هەمـوو شـتێکی تۆمـارکرد. ئاغاجـان خەریکبـوو لەخۆشـی ئەو هەمـوو ئامـادەبوونەی کاربەدەسـتانی شـارەکەدا بـاڵبگرێ، بەڵام لەهەمـان کاتیشـدا سـەیری پێـدەهات. پێشـتر ئەوان هەر لە خۆیانەوە دەهاتنە ئاهەنگ و بۆنەکانی مزگەوتێ، بەڵام لەو سـاڵانەی دواییدا کەمتر رووی خۆیان نیشان دەدا. هەر بۆیە ئاغاجـان چاوەڕوانی ئەو هەمـوو هـاتنەی لێنەدەکردن. جێگای سـەرنجیش بـوو هـیچ کەسێکیشـی لێنەدەناسـین، ئاخر هەموو بیچمەکان نوێ بوون.

- نوسـرەت گـرتەی ڤیـدۆیی ئاغاجـانی دەگـرت کاتێـک لەگەڵ بەڕێـوبەری پۆلیسـدا دەدوا. لەپڕێکیشـەوە قودسـییە شـێتۆکە دامەنـی ڕاکێشـا و بە گوێیـدا چرپانـد: "دایکـم ئامـادە نـابێ، ئـاخر چارشـێوە ڕەشـەکەی دزراوە و کیـژە شێتەکەی موشیریش بە لینگ ڕووتی لەسەر جادە و کۆلانان دەسوڕێتەوە."

ئاغاجانیش بـانگی شاباڵی کـرد: "شـاباڵ، دەکرێ جـارێ قودسـی ببەیـتە نـاو ژنان."

لە دووریشەوە کاروانی مارسیدیسی ڕەش پەیدابوون.

ئاغاجـــان بانگـــدەرەکەی ئاگـــادارکردەوە کەوا ئـــایەتوڵڵای بەتەمەن، گوڵپایەگانی[110] گەیشت.

- "ئەڵڵاهو ئەکبەر!" بانگدەرەکەش بە دەنگی بەرزەوە هاواری کرد.

ئیدی ئاپۆرای خەڵکەکە بە دوایدا گوتیـان: "صـلی ألله علی محمد و علی آل محمد! سڵاو لە محەمەد و نەوەکانی."

نوسرەت لێوە سەربانی کەوت تا بتوانی بەباشی وێنەی هەموو شتێک بگرێ. ئـایەتوڵڵا گوڵپایەگـانی یەکێک لە ئـایەتوڵڵا بەدەسـەڵاتەکان بـوو، بەتـایبەت لە قـومەوە بـۆ پەسـندکردنی سـوێندخواردنی ئەحـمەدی کوڕی مەلا ئەلسـابری هـاتبوو.

ئاغاجـان و نـوێنەرانی شـارەکە بەپیـر تـرومبێلەکەی ئـایەتوڵڵاوە چـوون، کە بەیاوەری کۆمەڵێ شاگردەوە تەشریفیان هێنابوو.

[110] Golpajeghani

ئاغاجان یارمەتی ئایەتوڵلای دا تا لە ترومبێلەکە دابەزێ، گۆپاڵەکەی دەستی خۆی دایە میوانەکە، ماچی کرد و چووە بن باڵی و ڕێنوێنی کرد تا گەیشتە سەر کورسییەکی شاهانە، کە تایبەت بۆ ئەو داندرابوو.

دیسان قودسی پەیدا بۆوە.

- "شاباڵ!" ئاغاجان بە بێزارییەوە بانگی کرد.

شاباڵ دیسان دەستێ قودسی گرتەوە، کە بەتوڕەییەوە هەوڵی خۆڕاپسکاندنی دەدا.

ئێستا ئایەتوڵلاکە گەیشتووە، ئیدی بۆنەکە دەست پێدەکا.

بەیاوەری شەش مەلای گەنج و نوێ، ئەحمەد لەسەر شۆستەی مزگەوتێ پەیدابوو. بانگدەرەکەش هاواریکرد؛ "ئەڵلاهو ئەکبەر!"

ئەحمەد لەگەڵ یاوەرەکانیدا بەرەو ئایەتوڵلاکە ڕۆیشت، لەبەری چەمایەوە، بە شکۆمەندییەوە دەستی ماچکرد. ئایەتوڵلاکەش بەنەرمی دەستێکی بۆ سەر مێزەرە ڕەشەکەی ئەحمەد برد و **ئەم ئایەتەی خوێندەوە:**

**قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ (١)**
**مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ (٢)**
**وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ (٣)**
**وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ (٤)**

**{بێژە: من خۆم دەپارێزم، بە وەدیهێنی زا لە ماک،**
**لە وەزەنی هەرچی دروستی کردووە،**
**لە روشەی شەو، کاتێ تاریکایی دادێ،**
**لە تۆشی جادووگەرانێ، پف دەکەنە چەند گرێیەک.}**



ئاغاجان بەپێی دابونەریت، جبە کۆنینەکەی، کە لە ژووری گەنجینەی ژێرزەمینی مزگەوتێی دەرهێنابوو، ڕادەستی ئەحمەد کرد. جبەکەش بە بەردی مروارییەوە ئاودامێن کرابوو. هەموو مەلاکانی مزگەوتێ لە سەدەکانی ڕابردوودا ئەم جبە ڕازاوەیان لە کاتی سوێندخواردنەکەدا بەسەر شان دادابوو.

کاتێکیش ئەحمەد جبەکەی لەبەرخۆکرد، بەرەو لای دووگردە کۆنینەکە ڕۆیشت. ئاغاجان و ئایەتوڵلا پیرەکەش لە دوای ئەوە وەستان. ئیدی هەموو حەشاماتی ئامەدەبووش بە دوایاندا نوێژیان دابەست.

- " ئەڵلاهو ئەکبەر، ئەڵلاهو ئەکبەر" بانگدەرەکە دووبارەی کردەوە.

ئەحمەد ڕوەو کەعبە ڕاوەستا، یەکەمین نوێژی فەرمی خۆی دەستپێکرد.

دەقاودەق هەر لەو ساتەشدا، یەکێ لە ئافرەتە گەنجەکان لەسەر سەکۆ لە بەرامبەر مزگەوتیدا پەیدابوو. ژنەکە چارشێوێکی ڕەشی نوێی پۆشیبوو، بە پاشپانییکی سووری بەرزەوە بەرەو لای ئەحمەد ڕۆیشت، تا گەیشتە بەردەمی.

ئاغاجان، ئافرەتەکەی بینی، بەڵام خۆنەدەبووایە نوێژەکەی بپچڕێنێ تا ژنەکە لەوێ دەربکا. ئافرەتەکەش چارشێوەکەی سەری لادا، قاچی ڕاستەی دەرهێنا. قاچەکەی ڕووت بوو. ئەحمەد چاوەکانی نوقاندن، هەوڵیدا تیشکۆی بیروهۆشی خۆی بخاتە سەر نوێژەکە.

- " ئەڵلاهو ئەکبەر!" ئاغاجان بە دەنگەوە وای بانگکرد، بەڵکو وا لە ژنەکە بکا بڕوا، لێ ژنەکە هەر خۆیشی لە گوورە نەبرد.

ئافەرەتەکە جارێک سوورڕایەوە، چادرە ڕەشەکەی لەهەوادا سەمای دەکرد و لنگە ڕووتەکانیشی بەدیارکەوتن. ئیدی سەراپای ڕووت بوو.

- " ئەڵلاهو ئەکبەر!"

ئایەتوڵلا بە تەمەنەکە، کە بە چاو نوقاندنەوە نوێژی دەکرد، ئەوەندە بە قووڵی چووبووە ناخی نوێژەکەی، هیچی لەو دیمەنەی بەردەمی نەبینی. ئەوکاتەی بۆ سێیەمین جار ئاغاجان بە دەنگی بەرزەوە هاواری کرد " ئەڵلاهو ئەکبەر" چاوەکانی کردنەوە. لێ لەبەر ئەوەی چاویلکەی لە چاو نەکردبوون، بەدەر لە تارماییێکی ڕەش نەبێ هیچی وای نەبینی. ئافرەتەکە کارێکی وایکرد چارۆگەکەی لەسەر سنگ لابکەوێ، دیسان بە نیگایەکی شانازانەوە سمتی بادا. ئیدی بەناچاری ئاغاجان نوێژەکەی خۆی بڕی، بەرەو لای ژنەکە ڕۆیشت، کاتێک دەستی درێژکرد چارشێوەکەی ژنەکە بەسەریدا دابداتەوە، ژنەکە چارشێوەکەی فڕێدایەوە سەر زەوی، ئیدی ژنەکە بە ڕووتی بەنێو حەشاماتەکەدا غاریدا. ئاغاجان دوو شەنقاوی گەورەی هاوێشت و ژنەکەی

لە ناوقەددا گرت. شابالیش چارشێوە ڕەشەکەی بۆ ئاغاجان هەڵدا، ئەویش هەر لە هەوای گرتەوە و بە جووڵەیەکی دەستوبردانە بەسەر ژنەکەی دادا و بانگی کرد "فەخری!"

فەخری سادات بە هانای پیاوەکەی هات و دەستی ژنەکەی گرت و بەرەو سەرشۆستەکە بردی، کە ژنەکان لەوێدا نوێژیان دەکرد.

بەهۆی ئەوەی ئەحمەد، توانی جڵەوی خۆی بگرێ، لەسەر نوێژەکەی بەردەوام بوو و خەڵکەکەش بە دوایدا نوێژەکەیان تێکنەدا.

ئاغاجانیش کە دەستی بە جەستەی ژنە ڕووتەکە کەوتبوو، نەدەبووایە نوێژ بکاتەوە، ئاخر دەستنوێژی شکابوو، ئیدی بەرەو حەوزی مزگەوتێ چوو تا سەرلە نوێ دەستنوێژ بشواتەوە. ئەو، کە هەرگیز تەماشای ژنێکی وا لایدەی نەکردبوو، ژنە ڕووتەکەی لە نێو قەددا توندگرتبوو. هەنووکە هەستی بەگەرمی مەمکە نەرمونۆڵەکانی ژنەکەی کردبوو کە دەستی پێکەوتبوو.

ئاغاجان چاکەتەکەی لەبەرکرد، سەردەستەکانی تا لای ئانیشکی هەڵکرد، لەسەر حەوزەکە چەمایەوە، دەستەکانی تا ئانیشکی بە ئاوە تازەکە تەڕکردن.

هێشتا بەسی نەبوو، زیاتر خۆی نوشتاندەوە، سەری تاملی خستە ژێر ئاوەکەوە. کاتێکیش سەری لە ئاوەکە دەرهێنا، هەناسەیەکی قووڵی دایەوە، لەکۆتاییشدا هەڵسا، دەموچاوی بەدەستەسڕەکەی وشک کردنەوە، چاکەتەکەی کردەوە بەر و بە ئارامی لەوێ چووەدەر.

نوسرەتیش هەر هەمووی تۆمارکرد.

## تریاک

لە پشت پەردەی پەنجەرەی ژووری کتێبان، گلۆپ داگیرسابوو.

ناوبەناو قرە و کێشەیەک پەیدادەبوو، نەخاسمە کاتێک شتەکە پەیوەست بووبایە بەو داخوازییانەی مەلایەکە دەیکردن.

فەخری سادات کیژێکی پێشخزمەتی لە گوندی جیریاوە هێنابوو تا یارمەتی سەدیقە بدا، ئاخر هەنووکە سەدیقە مارمیلکەی هەبوو، ئیدی نەیدەتوانی بە هەموو ئیشەکانی نێو ماڵێ ڕابگا.
کچە خزمەتکارەکە ناوی زارا[111] بوو. کچێکی باش و کارامە بوو، دەردەست سەرەداوەکانی ئیشوکاری نێو ماڵیی گرتنە دەست.
تەنها نادینەکە وەک پاوانگەی سەدیقە مایەوە، لەوێدا هەستی بە ئاسوودەیی دەکــرد. ئەو بەدەم چێشــتلێنانەوە لە ڕۆژگــاری ژیــانی خــۆی ڕادەمــا و لێیدەکۆڵیەوە.
هەنووکەش کە مەلایەکی هەمیشەیی دەستنیشانکراوە، لە پڕێکەوە هەمووان پەرۆشی دادەکان بوون، کوڵی غەریبیان بۆ هەڵسابوو. ئاخر ئەوان کاتی خۆی، هەمووشتیان بە بێدەنگی ڕێکدەخست، ئەوکات کاروباری ماڵێ وەک سەعاتی قورمیشکراو هەڵدەسوڕا، لێ ئێستا لەگەڵ پێنج ژنیشدا، هێشتا ماڵەکە نەهاتۆتەوە سەر ڕیتمی جاران.
زینەت خانم چەند جارێک هەوڵی دا تا عەزام، ئەو ژنەی جارێکیان بە چەقۆ هەڕەشەی لە مێردەکەی خۆی کردبوو، وەک خزمەتکارێک بێنێتە ماڵ، لێ فەخری سادات نەیدەویست هەر ناویشێ بێنێ.
ئێســتا زارا هــاتووە و لەوێ کــار دەکــا، کاروبــاری مــاڵێ وەک ســەعاتی لێهــاتۆتەوە. خزمەتکــارەکە زۆر گورجوگــوڵە، بەڵام هەنــدێک لاپەڕگە و شەرمنیشە، ئەوەندە شەرمنە، کاتێ قسەی لەگەڵدا دەکرێ، هەرگیز سەیری دوڕ چاوی بەرامبەرەکەی ناکا.
- "خۆ ئەوە شتێکی باشە کە کیژەکە شەرم لەخۆکێش بێ،" زینەت بوو وای گوت، "دەنا دەبووە مایەی سەرئێشە، ئاخر خۆ چەندان کوڕی گەنج بە نێو ئەو ماڵەدا دەسووڕێنەوە."
زارا کیژێکی جوان بوو، ژنێکی لاو بوو، ئاخر تازە گەیشتبووە بیست و یەک بەهــارەی تەمەنــی. ئەو تەمەنــی شــانزە ســاڵان بــوو کە مێــردی بە پیاوێــک کردبــوو. کــاتێکیش، دوای چــوار ســاڵ هێشــتا دووگیــان نەبیــوو، مێــردەکەی گەڕاندبوویەوە ماڵە باوانی.

---

[111] Zara

ماڵباتەکەش بەوە زۆر بەختەوەر بوون، کە وەک پێشخزمەت لە ماڵی ئاغاجان دەستنیشانکراوە، هیوایان وابوو بەڵکو لەوێ بۆ ماوەیەکی بەردرێژ بمێنێتەوە.

پێشان هەردوو دادەکان کاتێکی زۆریان بۆ مەلا ئەلسابری تەرخان کردبوو. ئەحمەدی کوڕیشی پێویستی بەو جۆرە کۆمەکە نەبوو.

زارا هەموو شتێکی بە بێدەنگی ڕێکدەخست، کەس هەستی بە هەبوونی نەدەکرد، ئاخر ئەو کەسی هەراسان نەدەکرد. ئەو بە هێواشی لێوەژوور هۆدەکان دەکەوت، هەموو شتێکی هەڵدەگرتەوە و لەشوێنی خۆی دادەنایەوە، قاپو قاچاخەکەی لەوێ لادەبرد، لە بەخێوکردنی مارمیلکە دەدا یارمەتی سەدیقەی دەدا، جامی پەنجەرەکانی دەسڕینەوە، ئەو ناوەی دەماشت، گەڵای وەریوی دارەکانی گەسک دەدان و سەرێکی لە ژێرزەمینەکەش دەدا ئاخۆ مامەی بانگدەر پێویستی بە هیچ نییە.

نووسینگەی ئەحمەدیشی پاک دەکردەوە، پێخەفەکەی ڕێکدەکردەوە و کراسەکانیشی بۆ ئوتو دەکردن.

کاتێکیش مەلا ئەحمەد لە نوێژی بەیانی دەگەڕایەوە، جارێکی دیکە خۆی دەخشاندە نێو پێخەفەکەی و تا سەعات دوازدەی نیوەڕۆ لەخەو هەڵنەدەستا، تەنانەت هەندێ جار تا سەعات دووش هەر لەنێو جێدا دەمایەوە، ئەمەش شتێک بوو کە هیچ مەلایەک، پێشتر نەیکردبوو. لە ڕاستیدا ئەو ئەوەندە لەژێر پێخەفەکەیدا دەمایەوە، تا زارا لە دەرگەکەی دەدا و دەیگوت: "مامۆستا، خواردن ئامادەیە."

هەموو بەیانییێک ئەو کیژە خزمەتکارە پارچەیەک نان، نفیشک و هەندێ هەنگوینی بۆ مامۆستا دەهێنا، بەرلەوەی بچێتە نوێژی بەیانی. ئەوسا بە نەرمی لە قاپییەکەی دەدا بە سرتەیەکیشەوە دەیگوت: "ئەرێ بەخەبەری؟"

- "فەرموو، وەرەژوور!" مەلا ئەحمەدیش لەژێر نوینەکانی خۆیەوە وا بانگی دەکرد. کیژەکەش بە شەرمنییەوە سینی بەرچاییەکەی لە سەر ئەو مێزۆکەیەی تەنیشت پێخەفەکەی دادەنا و دەچووە دەر.

ئاخر خۆ مەبەست ئەوەنەبوو، کیژەکە خزمەتی ئەحمەد بکا، بەڵام شتەکە هەر لە خۆوە، بە شێوەیەکی سروشتی دەڕۆیشت.

مەلا ئەحمەدیش بە زارا خۆشحاڵ بوو.



سەرلەبەیانییێک، کاتێ زارا ئەحمەدی لەخەو بێدار کردەوە تا بچێتە مزگەوتێ، ئەحمەد زیاتر لەنێو جێوبالنگانەکەی[112] مایەوە و خەوی لێکەوتەوە. کاتێکیش بۆ دووهەمین جار خەبەری کردەوە، ئیدی بە پەلەپڕوزێ[113] جلەکانی لەبەرکردنەوە و بەغار لە ژوورەکەی هاتەدەر. زارا لێی سڵەمیەوە، ئاخر تائێستا هیچ کەس وای نەترساندووە. ئیدی زاراش لەوە تێگەیشت، نابێ کەس بەم حاڵەتەی بزانێ.

جارێکیشیان کاتێ زارا مەجمە[114] بەرچاییەکەی بۆ مەلا ئەحمەد بردە ژوور و لەسەر مێزەکەی تەنیشت پێخەفەکەی دانا، مەلا ئەحمەد بە نەرمی دەستی کیژەکەی گرت و بۆ سەرجێیەکەی خۆی رایکێشا. کیژەکەش بۆ چاوترووکاندنێک بەرگری کرد، بەڵام دواتر خۆی بۆ شلکرد. کاتێکیش مەلا ئەحمەد زارای لەناو قەد گرت و بردیە بن بەتانیەکانی. هەر زوو کیژەکە قاچەکانی وێک هێنانەوە.

- "ئەنکەحتو وە زەوەجتو 'انكحت و زوجت" ئەمەی بەچرپەیەکەوە و لە بن پەتۆکانیدا بە کچەکە گوت.

زاراش بێدەنگ بوو.

- "ئەنکەحتو وە زەوەجتو 'أنكحت و زوجت" مەلا ئەحمەد جارێکی دیکە لێی دووبارە کردەوە. زارا هەر بێدەنگ بوو.

- "ئەنکەحتو وە زەوجتو 'أنكحت و زوجت" بۆ سێهەمین جار چرپاندیەوە بن گوێی.

- "قەبەلتو 'قبلت" زارا بە نەرمییەوە پێیگوتەوە، ئیدی مەلا لێوەخۆکەوت و دەستبەکار بوو.

پاش ماوەیەک زارا لەنێو جێگاکەی هەڵسا، چارۆگەکەی بەسەر سەر دادایەوە و بە نەرمیش گوتی: "کات درەنگە، تۆ دەبێ بچیە مزگەوتێ."

---

[112] جێوبالینگان: نوێن، پێخەف

[113] پەلەپڕوزێ: زۆر خێرا، بەهەڵەداوان.

[114] مەجمە: سینی



لە کاتی نوێژی هەینیدا ، زۆر لە کچ و ژنە لاوەکان سەردانی مزگەوتییان دەکرد، بە تایبەتیش دەهاتنە لای مەلا ئەحمەد.
ئاخر شێوازی قسەکردنی ئەو بەتەواوی لەهی مەلا ئەلسابری باوکی و لە هی خالخالی جیاوازبوو. ئەو هەوڵی دەدا، سیاسەت بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش باس بکا. ئەو هیچ نەدەبووە مایەی ترس، بەڵام بە نەرمی ختوکەی جەماوەرەکەی خۆی دەدا.
تا ئەو ڕادەیەی دەزگای هەواڵگری بەدوای مەلا ئەحمەدا ڕۆیشت، بۆیان روونبووەوە، هیچ پەیوەندییەکی تۆکمەی بە بزووتنەوە دینییەکانی قومەوە نییە. ئەو زیاتر لە کەسێک دەچوو حەزی لەژیان بێ لەوەی یاخیبووێک بێ، بەڵام ئەوەش روون نەبوو ئاخۆ ڕەوشی ئەو چۆن پەرەدەسێنێ و چۆن پێگەی خۆی وەک مەلای مزگەوتێک کە وتاری هەینی هەبێ، لەنێو شارەکەدا بەهێز دەکا و سەر بۆ چی دەکێشێ.
لەیەکێ لە وتارەکانیدا، ئەو دەربارەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە دوا، دەوڵەتێک کە قورئان بەردی بناغەی ژیانی کۆمەڵگەکە بێ. بەڵام ئەو لەوەندە زیاتر، تێنەپەڕاند و روونیشی نەکردەوە ئاخۆ کتومت مەبەستەکەی چییە.
وتارەکەشی وەک ئەوە وابوو، بەردێک فڕێ بداتە نێو گۆمێکی قوڵ تا ڕاددەی ئاوەکەی بۆدەربکەوێ.
لە وتارێکی دیکەیدا لەبنی کولەکەی دا. لەپڕ و بە شێوەیەکی ناچاوەڕوانکراو ناوی ئایەتوڵڵا خومەینی لە دەم دەرپەڕی. ئەو بە شێوەیەکی ئەوەندە بێوەییانە گوتی، کەس نەیزانی ئاخۆ دەربڕینەکەی ڕێکەوتانە بوو یان بە ئەنقەست.

لێ ئاغاجان تێبینی ئەوەی کرد، کەوا ئەحمەد لایەنگری بۆ خومەینی نواند.
ئایەتوڵڵا خومەینی یەکێ لە نەیارە سەرسەختەکانی شا بوو، لە دوایین دوانی ئاشکرای خۆیدا، گوتبووی: "شا مایەی شەرمەزارییە. ئێمە بە هۆی ئەو پیاوەوە شەرم لەخۆمان دەکەینەوە، ئاخر ئەو شا نییە، بەڵکو نۆکەرێکی ئەمریکییەکانە."

هەر یەکسەریش دوای وتارەکە، شەڕو هەرایەکی زۆر لە قوم بەرپابوو، خەڵک ڕژانە سەر شەقامەکان و دروشمی دژە شایان دەگوتەوە. سوپاش بە سەر مزگەوتێی دادا، ئەو مزگەوتەی خومەینی دوانەکەی لێدا و لە هەموو لایەکەوە ئابلۆوقە درا. بەسەدان مەلا و فەقێی گەنج لە ژێرزەمینی مزگەوتەکەدا تفەنگ و دەمانچەیان دەرهێنان و لێوەسەربان کەوتن، ئیدی شەڕی دەستەویەخە لە سەر شەقام و کۆڵانەکان هەڵگیرسا.

لەو هەرایەدا سەری دەیان مەلای تێداچوو، ژمارەیەکی زۆریش گیران. سوپا بەرەنگارییەکەی تێکشکاند، پاشان ژەنەڕاڵێک چووە بەردەم ماڵی ئایەتوڵڵا خومەینی تا بە شێوەکی تایبەت بیگرێ.

لەوێ دەستەیەک لە مەلایەکان پارێزگارییان لە ئایەتوڵڵا دەکرد، ئەوان ڕێگەی ژەنەڕاڵیان نەدا، دەبووایە سەرەتا پۆستاڵەکانی دابکەنێ، دەنا بۆی نەبوو بچێتە ژووری کاری ئایەتوڵڵا. ژەنەڕاکەش زانی تەنانەت سوپای ئەمریکاش لەوێ فریای ناکەوێ، ئیدی پۆستاڵەکانی داکەناند.

- "دەبێ شەپقەکەشت دابگری!" یەکێک لە پاسەوانانی ئیمام وایپێگوت.

ژەنەڕاڵەکە شەپقە سەربازییەکەشی دانا و ئینجا لە هۆدەی ئایەتوڵڵا وەژوورکەوت. ئەو هەندێ سەری خۆی بۆ چەماندەوە و پێیگوت: "فەرمانی ئەوەم پێدراوە، بتگرم!"

لەهەمان ڕۆژدا خومەینی نەفی کرا، شا ئەوی ڕەوانەی عێراق کرد. ئیدی دواتر هەر لە وێوە بۆ ماوەی چەندین ساڵ ڕابەرایەتی شۆڕشێکی مەزنی دژی ئەمریکا کرد و تەخت و بەختی پاشایەتیشی لە ڕەگوڕیشەوە دەرهێنا.



لەو سەردەمەدا کەس نەیدەوێرا ناوی ئایەتوڵڵاکە بێنێ، ئەوکات هیچ کەس باسی ئەوی نەدەکرد، بەڵام هەنووکە لێرە و لەوێ گوێت لەناوەکەی دەبێ. ئاخر نامیلکە و وتارەکانی ئەو بڵاودەکرێنەوە، لە شاری قومیش بە دزییەوە وێنەی ئەو بە دیواری مزگەوتەکانەوە هەڵدەواسران.

خومەینی دوور خرابووەوە، بەڵام گیانی ئەو بەهێزەوە لەجەستەی مەلایە نوێکاندا یە و ئەوانیش هەموو بۆنەیەک دەقۆزنەوە تا ناوی ئەو بێنن و بەناوی ئەوەوە بدوێن.



ئەحمەد بەرەبەرە ناوبانگی پەیدادەکرد، نەوەک هەر لە شاری زەنجان، بەڵکو لەشارەکانی دیکەش. ئەو زیاتر و زیاتر لە شوێنانی دیکەوە بانگهێشت دەکرا تا وتار و دوان بدا. دوایین وتاری لە خومەین[115]، لەو شوێنەی خومەینی لێ لەدایکببوو، دا.

کورتە سەفەرەکانی دوان و وتارەکانی ڕەنگین کرد، ئەو بێوەییانە(بێخەتایانە) باسی گەشتەکانی خۆی دەکرد: "لە دواجاردا لە ئەسفەهان بووم، شارێکی یەکجار دەوڵەمەند، سڵاوم بۆ هەموو ئیسفەهانییەک. گەشتی داهاتووشم کاشانە. کاشان ئەوندە لە لای خەڵکەکەی خۆشەویستە، سڵاوم بۆ کاشانیەکان. هەفتەی ڕابردووش لە (خومەین) بووم، ئەوەش یەکەمین جارم بوو سەردانی ئەو گوندە مومبارەکە بکەم. خومەین شوێنێکی بێوێنەیە، لەوێدا خەڵکی نازدار دەژین، سڵاوم بۆ خومەینییەکان."

مەبەست لە وشەی "خومەینی" کەسی دانیشوتووی خومەین بوو، بەڵام خەڵک وایان لە لای خۆیان لێکدایەوە گوایە ئاماژەیە بۆ خومەینی، ئیدی خەڵکەکە هاواری کرد: "سەلام بر خومەینی- سڵاو لە خومەینی-!"

ئاغاجانیش لە خۆشیان دەگەشایەوە.

ئەو دەیزانی، تێبینییەکەی مەلا ئەحمەد ڕێکەوت نەبوو، بەڵکو شتێکی لە بن سەردا هەبوو، بێگومان شتەکە ڕاسپاردەیەکی قوم بوو.



ئاغاجان بە دزییەوە هەواڵێکی لە قومەوە بۆهات، کەوا خالخالی بە قاچاغ چۆتە عێراق و خۆی گەیاندۆتە خومەینی.

خالخالی زیرەک بوو، ئەو بەهەوەنتە و لەخۆڕا نەچووبووە عێراق. بێ سێودوو، ئەو هەستێکی هەبوو، کە ڕۆژێک دادێ خومەینی دەسەڵات دەگرێتە دەست وخەونی دامەزراندنی کۆمارێکی ئیسلامی بەدیدێنێ.

ئێستا ئاغاجان لەوە تێگەیشت، کە بۆچی خالخالی ئەو هەموو ماوەیە دەستبەرداری ژن و منداڵەکەی بووە.

---

[115] Khomein

لەسەر شەقامدا هیچ شتێکی وا تێبینی نەدەکرا بەوەی لە سۆنگەی شۆڕشێک کە بە ڕێگاوە بێ، دەسەڵات ئاڵوگۆڕ بکرێ. ئاخر شا لە خۆشترین ساڵەکانی قەڵەمڕەوێتی خۆیدا دەژیا، لە دیدارێک لەگەڵ ڕۆژنامەی the Times تایمزدا گوتبووی: هەست بەو پەڕی ئاسودەیی دەکا و وڵاتەکەشی مێرگێکی زۆر ئارام و مەندە.

ئەمریکاش لە یەکێتی سۆڤیەت دەترسا و کەسێکی باشتری لە شا بۆ بەڕێوەبردنی وڵات شک نەدەبرد. ئەو هەمیشە تازەترین فڕۆکە و چەکی نوێی لە ئەمریکا دەکڕی و بەشێکی زۆری داهاتەکەشی لە نێو بانقە ئەمریکییەکان دانابوو.

ئەو بڕوای تەواوی بەوە هەبوو، کە باشترین سەرەک دەوڵەتی ئێرانە بۆ ئەمریکاییەکان، بۆیە بەتەواوی پشتی لێکردبووەوە و متمانەی بە کۆمەکی ئەوان هەبوو، لەوە دڵنیابوو، هەرگیز ئەمریکییەکان دەستبەرداری نابن. ئەو هیچ هۆکارێکی بۆ خەم و مشوورخواردن دەربارەی کەسێکی وەک خومەینی نەبینی، کە ڕەوانەی وڵاتی عێراقی کردبوو.

ئیدی بە بەوپەڕی ئارامی و ئاسودەییەوە ئامادەکاری بۆ کوڕەکەی دەکرد، تا دوای خۆی، جێگەی بگرێتەوە.



لەکاتێکدا مەلا ئەحمەد سەرقاڵی چالاکییەکانی مزگەوتێ بوو، شاباڵ ئارەزووی خۆی بەوە دەربڕێ بچێتە زانکۆی تاران بخوێنێ. ئەو خوازیار بوو ئەدەبیاتی فارسی بخوێنێ، بەڵام ئاغاجان ئامۆژگاری شتێکی دیکەی کرد: هەرچی دەربارەی ئەدەبیاتی فارسییە دەتوانی لە ماڵەوەش بیخوێنی و لێکۆڵینەوەی لەسەربکەی، بۆئەم ڕشتەیە پێوست بە چوونە زانکۆ ناکا. تۆ کوڕێکی بەهرەمەندی، بڕۆ بیرکاری بخوێنە، یان بڕۆ تەکنیک یان شتێک بە ئاراستەی بەڕێوبردنی کاروبار بخوێنە. ئاخر بابی خۆی بەرهەمی کلاسیک لەنێو کتێبخانەکەماندا هەیە، ماڵەکە پێویستی بە گیانێکی نوێ هەیە.

کاتێکیش بەتەواوی شاباڵ ماڵی بەرەو تاران جێهێشت، ئاغاجان بە ترومبێلی خۆی، ئەوی گەیاندە وێستگەی قەتار.

- "ئەرێ چەند شتێک هەن، نازانم پێویستە ئێوەی لێ ئاگادار بکەمەوە یان نا." شاباڵ ئەم قسەیەی لەناو ترومبێلدا بە ئاغاجان گوت.
- "شتەکان چین؟" ئاغاجانیش وا لێیپرسی.
- "من مەلا ئەحمەدم چەند جارێک لەسەر بانی مزگەوتێ بینیوە، لەوێ خۆی لەپەنا گومبەزەکە حەشار دابوو، شتێکی دەکێشا. ئەو خۆی دەزانێ ئاخۆ بکێشێ یان نا، بەڵام جگەرەکانی ئەو بۆنی شتی دیکەیان لێدێ، شتێک لەگەڵ مەلایەتی یەکناگرێتەوە. وێڕای ئەوەش، ئەو بەردەوام دەچێتە لای کەسانی لایدە تا بە دزییەوە تریاک بکێشێ. پێموایە تۆ لەو پرسە ئاگاداربی، باشە."
- "زۆر چاکتکرد پێتگوتم،" ئاغاجانیش دوای پشوێکی درێژی بێدەنگی وای پێگوتەوە، "بەدوایدا دەچم ئاخۆ هیچم پێدەکرێ. باشە لەوە زیاتر شتێکی دیکە هەیە ، پێویست بکا بیزانم؟"
- "لە ڕاستیدا نەخێر، ئەو هەندێ بەرامبەر ئافرەتیش هەستیارە. من جارێک لە مزگەوت بینیم لەگەڵ ئافرەتان پێیلێهەڵبڕیبوو، ئەمەش لە مەلایەکی وەک ئەو ناوەشێتەوە."
- "منیش تێبینی ئەوەم کردووە. ئەو دەبێ وریا بێ، ئاخر ئێمە لەو شارەدا ناحەزمان زۆرن."

لەنێو وێستگەی هێڵی ئاسنیندا، ئاغاجان بە بێدەنگی یاوەری شاباڵی تا لای وارگۆنی قەتارەکە کرد.

دوای ئەو جارەی کە شاباڵ باسی بڕوابوونی خۆی و گومانەکانی هێنابۆوە گۆڕێ، جارێکی دیکە لە دەرگای ئەو باسەیان نەدابۆوە. ئاغاجان یەک دوو جاران هەوڵیدابوو سەرەداوی باسەکەی لەگەڵدا بکاتەوە، بەڵام سەرنجی ئەوەی دابوو، شاباڵ حەز بە کردنەوەی بابەتەکە ناکا. ئیدی جارێ دەستی لێنەدا. هەنووکەش کە لەسەر شۆستەی قەتارەکە وەستاون، ئاغاجان دەیەویست پێیبڵێ کە لەگەڵ زانکۆکەدا ئاگای لەخۆی بێ، بەڵام شاباڵ ئەو دەرفەتەی پێنەدا. ئەو ئامێزی لە ئاغاجان وەرێنا، ماچی کرد و بەرەو ناو وارگۆنی قەتارەکە لێیدا ڕۆیی.

ئاغاجانیش تا قەتارەکە کەوتە گەڕ و لەبەرچاوان ونبوو، هەر لەسەر شۆستەکە وەستابوو.



ئاغاجان بە وردی ئەحمەدی خستبووە ژێر چاودێرییەوە.
شەوێکیان کاتێ زارا لەکاتێکی ناوەختدا بە خۆی و مەجمەیەک چووە ژووری کتێبخانەکە، کە ئەحمەد لەوێدا کتێبی دەخوێندنەوە، ئاغجانیش بە دوایدا چوو. لە درزی پەردەکەوە بینی کیژەکە خۆی بەسەر مەجمەکەدا شۆڕکردەوە، کە پیاڵەیەک چاو چەند قەسپی لەسەر بوون، لەوێ لەسەر مێزەکەی دانا. ئەحمەد دەستێکی بۆ بلوزی کیژەکە برد، ئەویش لێگەڕا بەئارەزوی خۆی دەستی تێدا بگێڕێ. لە کۆتاییدا، تەنوورە درێژەکەی بەرزکردوە بردی بردی تا کچەکەی بە دۆلابێکی کتێبان هەڵنا.
ئاغاجان بۆ بەیانییەکەی زارای بانگی ژوورەکەی خۆی کرد.
- "فەرموو دانیشە." ئاغاجان ئاماژەیەکی دۆستانەی بۆکرد.
ئەویش بەشەرمەوە لەسەر کورسیەکە دانیشت.
- "من هەر ئەوەندە دەڵێم، زۆر لە کاروباری ناوماڵێی تۆ ڕازیم. لەتۆ باشتر کچێکی پێشخزمەتچی وامان دەستناکەوێتەوە. بەڵام دەبێ تۆ واز لە ئەحمەد بێنێ یان بوخچەکەت دەپێچیەوە! ئایا ئەمە ڕوون و ئاشکرایە بۆت؟"
زارا لەو تۆنە دەنگە توندەی ئاغاجان سڵەمیەوە و نوتقی گیرا.
ئاغاجان لێی دووبارە کردەوە: "قسەکەم ڕوونوئاشکرایە؟"
بەکپییەوە سەری بۆلەقاند.
- "باشە چیت دەوێ؟ ئایا دەتەوێ لێرە بمێنیتەوە یان بگەڕێیتەوە لای ماڵە باوانت؟"
- ""دەمەوێ لێرە بمێنمەوە." کچەکە ئەم وەڵامەی بە دەنگێکی لەرزۆکەوە دایەوە.
- "زۆر باشە، دەکرێ کارەکانت دەستپێبکەیەوە. بانگدەرەکە زۆری پێویست بە تۆ دەبێ، ئەگەر جاروبار هیچت نەبوو بیکەی، زۆر بایەخ بە بانگدەرەکە بدە. ئێستاش دەکرێ بڕۆی."
بۆ شەوەکەش، لە دوای نوێژ، ئاغاجان داوای لە مەلا ئەحمەد کرد، پیاسەیەکی لای ڕووبارەکە بەیەکەوە بکەن. کاتێک ئەوان بە تاریکایی بە کەنار ڕووبارەکەدا دەڕۆیشتن، دوای پێشەکییکی کورت، بە توندی قسەی

لەگەڵ ئەحــمەد کــرد. ڕاشــکاوانە پێیڕاگەیانــد، کە ڕەفتــارە ناشایســتەکەی دەربــارەی ئافرەتــان مــایەی قبــووڵکردن نیــیە و تریــاک و مزگەوتێشــیان بە یەکەوە نەگوتووە. خۆ ئەگەر ئەحمەد مەبەستی نەبێ گوێبگرێ، ئەوا ئاغاجان بە توندی ئازادییەکەی سنووردار دەکا.

ئەحمەد بەبێدەنگی گوێی لە ئاغاجان گرت.

- "شتێکت هەیە پێمبڵێی؟"

تەناتەن بەو قسەیەش ئەحمەد نەهاتە وەڵام.

یەک دوو ڕۆژ دوای ئەوە، ئاغاجــــان چــــــووە لای بــــــاوکی یەکــــــێ لە مافوورفرۆشەکانی شار تا داوای دەستی کچەکەی بۆ مەلا ئەحمەد لێبکا.

مانگێک دواتــر، ئــاهەنگێکی گەورە لە لایەن کەسوکاری بووکەخــان ڕێکخــرا. نزیکەی نیوەی شەو بوو، کە بووکە خان بەکەژاوەیەکی ڕازاوە هێندرایە مــاڵ. بووک ژوورێکی لە نهۆمی دووهەم پێدرا، بەڵام حەفت شەوی یەکەم ژووری مێوانایان بۆ ساز و ئامادە کردبوو.



مەلا ئەحــمەد یەک هەفــتە پشــووی وەرگرتبــوو تــا لەگەڵ خێزانەکەی ســەری گوندی جیریا بدات و بووکەکەیان پێبناسێنێ.

ئەحمەد جلی لۆکەی پانوبەرینی لەبەر دەکردن، بۆ ئەوەی بە ڕەحەتییەوە لە ناویاندا بجوڵێتەوە. ئەو وەک شــازادەیەک کە بــووکەکەی لەگەڵ خــۆی دەبــاتە نێو قەڵا، ڕەفتاری دەنواند.

ژنەکەی ناوی سەمیرە[١١٦] بــوو. تەمەنی هەژدە ســاڵان بــوو، شۆخوشــەنگێکی کلاســیکیانە بــوو. لە شــەوی یەکەمــی زاوا و بوکێنیانــدا، ئەحــمەد کیــژەکەی جادووبەنــدکرد تــا بەیــانییکی زوو هەر ســەرجێی لەگەڵــدا کــرد، کــاتێکیش زەردەی بەیان پەیدابوو، ئینجا وازیان هێنا و لێکەوتنە خەو.

بۆ نیوەڕۆکەی، لەســەرو بەنــدی ســەعات یەکدا، لە ژووری ترياككێشــانەکەدا پێشوازی لە مام ڕەمەزان کرد. ئەویش ترياكێكی شاهانەی بۆ ئامادەکردبوو.

---

[١١٦] Samira

ئەحمەد بەتایبەت داوای لە مام ڕەمەزان کرد، حەفت ڕۆژ لەسەر یەک تریاکی بۆ ئامادە بکا، چونکە تریاک زەوقی پیاو دەکاتەوە. خۆ ئەگەر تریاک بکێشی، ئەوا کاتێکی زیاتر بە گانکردنەوە بەسەر دەبەیت.
کاتێکیش ئەو چارەکە جگەرەیەکی لە تریاک دەکێشا، دیسان دەگەڕایەوە ژووری نهۆمی سەرێ و خۆی لەگەڵ بووکەکەی دەخستەوە نێو نوێن، هەرچەندە بووکەکەش هەر لە قوولایی شیرین خەویدا بوو.
سەمیرە کچێکی بوو، ناویان نا مەسعوودە[117]. هەمووان بە لەدایکبوونی منداڵەکە خۆشحاڵ بوون، بەڵامماڵەکە چاوەڕێی لە ئەحمەد و ژنەکەی دەکرد، کوڕێکیان ببێ، تا لە ئایندەدا جێگەی باوکی بگرێتەوە.



مزگەوت تا دەهات قەرەباڵغتر دەبوو، ئەحمەدیش دوانی سەرنجڕاکێشانەی دەدان. ئەحمەد هەقایەتخوانێکی لەبلەبان بوو، چیرۆکی خۆش و مەزنی لە قورئانەوە دەگێڕانەوە. ئەویش بەو وشە جادوویانەی خۆی شتێکی دەخستەسەر، ئەوسا هەقایەتەکانی سەردەمی بەرێی دەگێڕایەوە، هی ئەو چاخەی کە پێغەمبەر محەمەد تیایدا لەدایکببوو، کە چۆن لەگەڵ عائیشە، ژنە خۆشەویستەکەی لەسەر بان خۆشەویستیان کردووە.
محەمەد ئەو سەردەم موزیکژەنەکانی کۆڵانانی قەدەغەکردبوو، نەدەبووایە هیچ موسڵمانێک گوێیان لێبگرێ. کاتێکیش ئەو لەگەڵ ژنە گەنجەکەی لێوەسەربان دەکەوت، لە پڕ لەکۆڵانێک گوێی لە موزیک بوو. "بەڵام، من دەمەوێ سەیرکەم، دەمەوێ تەماشای کەم، من دەمەوێ ببینم، دەمەوێ تەماشا بکەم." عائیشە ئەم داوایەی چەند جارێک لە پێغەمبەر دووبارە کردەوە.
لە دوایدا خۆشەویستی بردییەوە، محەمەد سەلماندی، عائیشە چووە سەر پشتی ئەو، لەسەر لێواری دیواری سەربانەکە سەیری موزیکژەنەکانی کرد.
کەسێک نەبوو ئەو شتانە لە مزگەوتێدا باس بکا، بەڵام مەلا ئەحمەد هەمیشە کاتی وای دەدۆزیەوە بە قسەکانی سەرنجی گوێگرەکانی بۆخۆی رابکێشێ.

---

[117] Masoede

لەراستیدا نەدەبووایە ئەحمەد ببوایە مەلا، بەڵکوو ببوایە هەقایەتخوان، ببوایە نمایشکارێک لەوێ لە گۆڕەپانی بازاڕدا خەڵک لێی خڕببانایەوە، ئەویش چیرۆک و هەقایەتی بۆ بگێڕابانەوە.
ئەو هێشتاش هەر لەسەر گەشتەکانی خۆی بەردوام بوو، گەشتەکانی بۆ شارە دینییە گرنگەکانی وەک کاشان[118]، ئەراک[119]، هەمەدان[120] و ئیسفەهان و هەندێک جاران بە هەفتە لە ماڵ دوور دەکەوتەوە.
هەموو جارێکیش بە دوو توورەگە دەگەڕایەوە، تورەگەیەک پڕی پارە و زێڕ بوو، توورەگەی دیکەش پڕ لەنامەی خۆشەویستی و دیاری تایبەت وەک دەرپێ، گۆرەوی، بۆن، سابوون، فانیلە و ئەنگوستیلە کە ژنە چارۆگەدارەکان بە دزییەوە دەیاندایێ.



هەرچەندە ئەحمەد بەڵێنی بە ئاغاجان دابوو، جارێکی دیکە تخوونی تریاک نەکەوێتەوە، لێ بە دزییەوە لە هەندێ شوێنی تایبەت لە شارەکە دەیکێشا.
بۆ ئەوەی ئازادی زیاتری هەبێ، تا پێیبکرابا بانگهێشتی ئەملا و ئەولای پەسەند دەکرد و گەشتە دوورەکانی خۆی دەکردن. لەوێدا ئاغاجان دەستی نەدەگەیشتێ. ئەو پەیوندی بە پیاوگەلێک هەبوو، لەگەڵ خۆیان دەیبردە بازنە تایبەتیەکانیان تا زەردەی بەیانی تریاکیان دەکێشا و لەگەڵ ژنانیشیان رادەبوارد.
ئەو لە شاری زەنجاندا، ئەو ئازادییەی نەبوو، هەر بۆیە پەیوەندی لەگەڵ دەستەیەکی نهێنی پەیداکرد. بەڵام بێئاگاش بوو لەوەی دەزگای هەواڵگری نهێنی تەڵەیان بۆ داناوەتەوە.
بەنگکێشان نزیکەی ساڵێک بوو لە وڵات قەدەغەکرابوو. ئالودەبووەکان بە تریاک دەکرا لە ڕێی تۆمارێکی شارەوانی لەمانگێکدا دوو جاران نیو جگەرەی ڕێگەپێدراو لە دەرمانخانەیەک وەربگرن، لێ مەلا ئەحمەد ئەوەی دەیویست لەجیهانی نهێنی و ژێرزەمینییدا بە ئاسانی دەستی دەکەوت.

---

[118] Kashan
[119] Arak
[120] Hamadan

کاتێکیش لە شەوێک لە شەوەکاندا، لەگەڵ دوو پیاوی دیکەدا بە ئامادەبوونی چەند ژنێک لە ژێرزەمینی ماڵێک لەزەنجاندا سەرقاڵی تریاک کێشان بوون، چەند ئاژانێکی دەزگای نهێنییان لێوەژوورکەوتن. ئاژانەکان دەستبەجێ وێنەیەکی ئەحمەدیان گرت کە بەدەم تریاک کێشانەوە لە نێوان دوو ئافرەتی بێ چارشێو دانیشتبوو. ئاژانەکان چەند جگەرەیەکی تریاکیان لە پاکەتەکەیان دەرهێنان، وێنەی هەمووشیان گرتن، ئەنجا ئەحمەدیان لەگەڵ خۆیان راپێچکرد، بردیانە شوێنێکی نهێنێ کە ئاژانێکی لێکۆڵەرەوە لەوێ چاوەڕێیانی دەکرد.

ئەحمەد هیچی پێنەبوو بیگێڕێتەوە، زانی بە داوەوە بووە، داوێک نەیدەتوانی بە ئاسانی لێی دەرباز بێ.

- "دەکرێ تۆ بچیەوە نێو پێخەفەکەی خۆت و بە بێخەمی لێی برازێی و بەیانیش ئاساییانە بچیەوە مزگەوتێ، بەڵام بە یەک مەرج." ئاژانەکە وایپێگوت.

- "مەرجەکە چییە؟" ئەحمەد بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وایلێپرسی.

- "مەرجەکە ئەوەیە، ئێمە لەمەوپاش دەبینە دۆستی یەکدی. تێدەگەی باسی چیت بۆدەکەم."

- "من تێناگەم ، ئاخۆ باسی چی دەکەی."

- خۆ ئەگەر تێنەگەی، ئەوا هەندێ ئاڵۆزتر دەبێ، کەواتە پێویستە راستەوراست رەوانەی زینداننت بکەم. ئیدی بەیانی لەگەڵ بەرچایی رۆژنامەیەکت بۆ دێ و وێنەکەی تۆشی لە سەر یەکەمین رووپەڕەکەی بڵاوکردۆتەوە. ئەوسا دەکرێ تێبگەی."

شەوەکە درێژەی کێشا. مەلا ئەحمەد بەبێ دەنگی گریا. ئەو نەیدەزانی، لەپڕ ئابڕوی خۆی لە دەست دەچێ.

کاتێکیش لە کۆتاییدا، سپێدە داهات، ئاژانێک لێیهاتە ژوور، وێنەکەی ئەوی شوشتبووەوە، وێنەیەکی نیشاندا و پێشی گوت: "باشە چی بکەین؟ باشە ئەم دوای نیوەڕۆیە وێنەکەت چاپ بکەین یان بەیەکەوە لەسەر مێزەکە دابنیشین؟"

بۆ ئەحمەد هیچ دەرەتانێک نەمابۆوە. خۆ ئەگەر وێنەکەی ئەو لەگەڵ دوو ژنی بێ چارشێو، کە جگەرەی تریاک دەکێشێ، لە ڕۆژنامەدا بڵاوبکرێتەوە،

ئەوا ئەو کۆتایی پێدێ و شەرمەزای و شوورەییش بەسەر ماڵباتەکەیدا دێنێ. کەواتە لەگەڵ ئاژانەکە چووە سەر مێزەکە، کە کورسییێکی بۆ دانا و فۆرمێکیشی دایەدەست تا پڕیبکاتەوە. ئاژانەکە پێیگوت: "ئەگەر ئێمە باش لەیەکدی بگەین، ئەوا لە ماوەی پێنج خولەکدا دەیبڕێنینەوە و هەر بەخۆشم دەتگەیەنمەوە ماڵێ! ئەوەی ئێمە لەتۆمان دەوێ، زۆر سادەیە، ئێمە دەمانەوێ تۆ زوو زوو پەیوەندی بە قومەوە بکەیت و ئەو زانیارییانەی پێویستمان پێی هەیە، بۆمان بێنی. ئەمە هەموو ئیشەکەیە."

دوای نیو سەعات، ترومبێلێکی تایبەت ئەحمەدی گەیاندەوە مزگەوتێ و لەبەر دەرگـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــا دابەزی.

- "گوێت لەدەنگمان دەبێتەوە." ئاژانەکە وای پێگوت بە شوێنی خۆیدا گەڕایەوە.



یەک دوو مانگ دواتر هیچ ڕووینەدا. ئەحمەد پێیوابوو، کە خواخواشی بوو دەزگای هەواڵگری نهێنی بەڵکو هەر بۆ ترساندن وایان لێکردبێ، بۆئەوەی جڵەوی بکەن. ئاخر ئەوان هێشتا خالخالی و کردەوەکەی بەردەم سینەماکە و ئەو پاشاگەردانییەی لە کاتی سەردانی فەرەح دیبادا، پەیدابوو، هێشتا لە بیریان نەکردبوو. ئەوان دەیانەویست تۆڵە بکەنەوە و ئەحمەدیش کەم تا زۆر بە بارمتە بگرن.

ئەو هیوای وابوو بەڵکو وازیان لێهێنابێ، نەیانەوێ وەک سوسەکارێک بەکاری بهێنن، چونکە ئەو هەرگیز نەیدەویست ببێتە سیخوڕێک. ئاخر شوێنپێهەڵگرتن لەگەڵ ئەودا نەدەگونجا، ئیشەکە لەکەسێک لە پێگەی ئەو وەک مەلای مزگەوتی گەورەی شار، نەدەوەشایەوە. باشە تۆ بڵێی، ئەگەر پێویست بکا، شوێنپێی چی هەڵبگرێتەوە و سیخوڕێ لەچی بکا؟

ئەو وایلێحاڵیبوو، دەزگای هەواڵگری نهێنی، بەم جۆرە ویستویانە ئەحمەد لەمەڕ ڕووداوەکاندا دەمی خۆی دابخاو لەمەشدا سەرکەوتن، چونکە نەیدەویرا هیچ شتێک دەربارەی شا یان دەربارەی قوم دەم بکاتەوە. بە ئەسپایی و لەدڵەوە وردە وردە هەستی بەبەختەوەری کردەوە و ئەو ترسەش کە لەدڵیدا بوو خەریکبوو دەڕەوایەوە. بەڵام شەوێکیان، کاتێک تازە

لە نوێژی مەغریب ببۆوە، یەکێ لە ئاژانەکانی دەزگای نهێنی لە تەنیشتی بۆ نوێژ چەمایەوە.

- "ئەرێ چۆنی؟" ئاژانەکە بە دەنگێکی جاڕسەوە وای چرپاندە گوێی مەلا ئەحمەد.

ئەحمەد بە تۆقاوییەوە سەیری ئاغاجانی کرد کە لە ڕیزی پشت ئەو وەستابوو، بەڵام هیچی بەدینەکرد.

- "باشە چیت لێم دەوێ؟" بە نەرمییەوە بە ئاژانەکەی گوت.

- "تۆ دەزانی هەندێ ئاژاوە لە قوم سەریهەڵداوە. دەمانەوێ سەرێکی ئەوێ بدەی، سەردانی ئایەتوڵلاکان بکەی و بزانی ئاخۆ چی لە ئارادایە. پێموابێ ژمارە تەلەفۆنەکەی منت هەیە؟"

- "بەڵێ، هێشتا ژمارە تەلۆفەنەکەتم هەر ماوە. ئەحمەد بە ڕەنگبزرکاوی و بەترسێکەوە وا وەڵامی دایەوە، ئیدی کڕنوشی خۆی برد و نیوچەوانی گەیاندە سەر زەوی وەک ئەوەی نوێژەکەی هەر نەبڕیتەوە.

لە دواییدا کاتێک هەڵسایەوە، ئاژانەکە لەوێ نەمابوو.

ئیدی بە دەستێکی لەرزۆکەوە عەباکەی بەسەر شانەکانی دادایەوە، هەڵستا و بە پشتکووڕی وەک ئەوەی تای لێبێ، گەڕایەوە ماڵ.

کە گەیشتەوە ماڵ، یەکسەر چووە ژوورەکەی ئاغاجان، لەوێ کەوتە سەرچۆک و پێیگوت: "ئاغاجان، فریام کەوە! من بەتەڵەوە بووم."

ئاغاجانیش بە سەرسامییەوە ڕووبەڕووی ئەم دەربڕینە لەپڕەی ئەحمەد بووەوە، بە هێواشی لێیڕوانی. "ئەوان چەند وێنەیەکیان لێگرتووم، وێنەی پیس پیس کە تریاکم کێشاوە و لەگەڵ ژنان دانیشتووم. هەنووکەش دەیانەوێ وەک سوسەکارێک بەکارم بێنن و بمنێرنە قوم. خۆ ئەگەر بەگوێیان نەکەم، ئەوا وێنەکانم لە ڕۆژنامەکەدا بڵاودەکەنەوە."

ئاغاجان، بەدەر لەوە، چاوەڕێی هەموو شتێک بوو، لەسەر کورسیەکەی خۆی دانیشت و نوتقی گیرا.

- "لە کوێ؟" دواتر وایلێپرسی.

- "لە ژێرزەمینی ماڵێکی ئەم شارە."

- "تریاکەکە نابێتە کێشە، بەڵام ژنەکان کێ بوون؟"

- "ژنانی سیغە."
- "دەزگـای هەواڵگـری نهێنـی دەسـتی خـۆی وەشـاندەوە. باشـە پێشـتر هاوکاریت کردوون؟"
- "نەخێر! هەرگیز!" ئەحمەد وا وەڵامی دایەوە.
- "قەت ڕاپۆرتت بۆ نووسیون؟"
- "نەخێر، تاکە وشەیەکیشم نەنووسیوە!"
- "دووبارەی دەکەمەوە،" ئاغاجان بە جەختکردنەوە پرسی؛ "تۆ هیچ شتت پێگوتوون؟"
- "نەخێر، من هیچم پێنەگوتوون، هیچشم نەکردووە." ئەحمەد وای پێگوتەوە.
- "تۆ بەختت هەبووە، کە هیچت پێنەگوتوون و هاوکاریت نەکردوون، دەنا من یەکسەر لە ماڵیم دەردەکردی. بەڵام هێشتا درەنگ نەکەوتووە، پێموایێ دەکرێ زیانەکە سنووردرابکەین. تۆ بێدەنگ بە و منیش لەو مانگانەی دادێ بە تەنیا جێتناهێڵم. من دەستبەجێ سەیردەکەم ئاخۆ چیم پێدەکرێ. ئەوان پێویستیان بە ئێمەیە تا ئارامی شارەکە ڕابگرن، بۆیە وێنەکانت لە ڕۆژنامەدا بڵاوناکەنەوە، ئەوان دەیانەوێ کەڵەگاییمان بەسەرەوە بکەن. تۆ دەمت دادەخەی و هەر چییەکیش ڕوویدا هەر لە تەنیشت من دەمێنیتەوە."
- "من دەبێ شتێکی دیکەشت پێبڵێم،" ئەحمەد وای بە ئاغاجان گوتەوە؛ "خۆ ئەگەر تریاک نەکێشم، ناتوانم تەنانەت وتاریش بدەم. بەداخەم، وا ئازارت دەدەم."
- "ئەمە زۆر ئازارم دەدا،" ئاغاجان بە خەمبارییەوە وای پێگوت؛ "هەڵەیەک دەکرێ هەمووان بیکەن، بەڵام تریاک، من بە شەرمەزاری دەیبینم، سووکایەتییکە بە هەموومان. من ئەمەم بۆ قوت نادرێ، مەلای مزگەوتەکەمان بە بێ تریاک نەتوانێ قسە بکا. بە ڕاستی ئازارت دام، تۆ لەکەدارت کردم. بۆ ئەمەیان هیچ سازانێکم پێ نییە، دەبێ فێربی وازی لێبێنی. خۆ ئەگەر پێویست بکا، دەتخەمە نێو قەفەزێک. جارێ بە بێ پرسی من هەنگاوێک بۆ دەرەوە ناهاوێژی!"

بۆ ڕۆژی پاشتر ئاغاجان هەموو وادە و دیدارەکانی مەلا ئەحمەدی هەڵوەشاندەوە و پەیوندییکی متمانەدارانەشی لەگەڵ پزیشکی ماڵبات سازدا.

لە نـۆڕینگەی پزیشـکی خانەوادەکەشـەوە ڕاسـتەوخۆ و بەبـێ هـیچ وادە دیدارێک سەری نووسینگەی دەزگای هەواڵگری نهێنی دا و دەستبەجێ داوای دیتنی بەرپرسـەکەیان کرد. ئەوانیش بەخێریان هێنا و دوای ئەوەی لەسـەر کورسـییەکی قـاوەیی چەرمینـی فراوانیـان دانـا، وێنەکـانی مەلا ئەحمەدیشـیان نیشـــان دان. بەناچـــاری دەبـــووایە لەگەڵ بەرپرســـەکەیان بگەیشـــتبایە ڕێککەوتنێک. ئەو لەمەوپاش دەبێ مزگەوت بە ئارامی ڕابگرێ کە لە شاری قومـدا پەشـێوی لە گۆڕێـدابوو. لە بەرامـبەر ئەوەشـدا، بەرپرسـی دەزگـاکە وێنەکانی مەلا ئەحمەد لەنێو چەکمەجەکەی خۆیدا هەڵدەگرێ.

بۆ شەوەکەی ئاغاجان فایلەکەی خۆی کردەوە.

"مەلای مزگەوتیمـان ئـالوودەی تریـاک بـووە. ڕۆژگـارێکی سـەختمان لە پێشدایە."

## ساڵانێکی ئارام

ماوەیەکی زۆر بە کڕی و ئارامی بەسەر چوو.

ئاغاجان بە چەند ڕێسایەکی توندوبەندی ژیانەوە مەلا ئەحمەدی خستەوە ژێر ڕکێف. تا تەواو دڵنیانەبێ کە لە تریاک کێشان دوورکەوتۆتەوە لێنەدەگەڕا بە بێ ڕێنوێن بۆ وتاردان بچێتە هیچ کام لە شارەکان.

هەرچەندە ڕووداوەکانی پشت سەری ئەو وێنەیەی لە مەلا ئەحمەد گیرابوو، تێپەڕیـون، لـێ ئاغاجـان شـتەکەی وەک خـاڵێکی وەرچەرخـان لە مێـژووی مزگەوتەکەدا دەبینی.



شـاباڵ سـەرەتا بە لای کەمییەوە مـانگی جارێک دەهـاتەوە مـاڵ، بەڵام دوای ئەوە کاتی درەنگتری پێدەچوو. هەندێ جار زەنگی بۆ ئاغاجان لە بازاڕ لێدەدا و قسـەی لەگەڵدا دەکرد، لێ هەمـوو کاتێک هەر باسـی کاروبار بوو: "ئەرێ کاروبار چۆن دەڕوا؟ هەموو شتێک بەپێی خواست بەڕێوە دەچێ؟"

- "ئەرێ پێویسـتە چـۆن بڵێم، گەنجـۆ جیهـان گـۆڕاوە. ئێمە پیاوێکمـان بە هێزی نوێوە پێویستە. هەستێکی وام لاپەیدابووە کە پیربووم."

- "تۆ؟ تۆ پیری؟ تۆ هەر هیچ پیر نی!"

- "لەوانەیە پیرنەبم، لێ هەڵبەت کۆنباوم. ئەم سەردەمە بەو بیرۆکە کۆنانەی جاران لە بازاڕ ناتوانی کێبەرکێی بازرگانی جیهانی پێبکەی. تکایە باش بخوێنە و شتی زۆر فێر بە، من پێویستم بە تۆیە. کاتێ هاتیەوە ماڵ، لەو بارەوەیە بە تێروتەسەلی قسان دەکەین."

کاتێ شابالێش بەسەردان دەگەڕایەوە ماڵ، زۆر جاران بەدرەنگەوە دەگەیشتەوە جێ. بۆ ڕۆژی پاشتریش بە قەتاری شەو دەگەڕایەوە تاران، هیچ کاتێکی وایان بۆ نەدەمایەوە تا لەبارەی بازرگانیکردن بە فەرش و مافوور و بازاڕەوە بدوێن.

شابال بە نابەدڵی ئاغاجان قسەی نەکرد، بەلام ئەو هیچ حەز و مەیلی بۆ بازرگانی نە مابوو، چیدیکە چارەی مافوورفرۆشی نەدەویستەوە. لە زانکۆشدا ببووە ئەندامی بزووتنەوەیەکی خوێندکاری چەپی ژێرزەمینی. لەوێدا تەونەداوی دیکەی ڕاچاندبوو لەوەی کاتی خۆی لە گوندی سووری هەبوو.

لەوێ لە زانکۆ بە یەکجار سەرقاڵی دەستەیەکی بچکۆلەی نووسەرانی ڕۆژنامەیەکی نهێنی خوێندکاران بوو. لەوێدا هەستێکی وای لاپەیدا بوو وەک ئەوەی لە ماڵ بێ وابوو. ئەو بە بەراورد لەگەڵ هاوپۆلەکانی خامەیەکی بەبڕشتی هەبوو، ڕەفتارەکەی هەراشتر دیاربوو. ئیدی هەر زوو وەک بیچمێک سەیردەکرا کە ڕابەرایەتی خوێندکاران بکا.



بەلام خۆ وەنەبێ هەر شابال گۆڕانکاری بەخۆوە بینیبێ. هەموو شتێک گۆڕا بوو. پێشان بازاڕ ڕۆڵێکی گرنگی لە شارەکەدا دەگێڕا، بەلام هەنووکە ئەو ڕۆڵەی جارانی نەمابوو. مافووری ئێرانی هۆکاری دیارخەر و لێبڕاوی لەسەر ئابووری و سیاسەت نەمابوو. گازی سروشتی و نەوت جێگەکەیان گرتبۆوە. جاران ئاغاجان لە بازاڕدا دەستڕۆیشتوو بوو، دەسەلاتداران هەمیشە بە شکۆوە لێیان دەڕوانی، کەچی ئێستا ڕەق و زبر بوونە و تەنانەت جورئەتی ئەوەیان پەیدابووە ئاژانێک بنێرنە مزگەوت تا مەلایەکە ناچاربکەن ببێتە سیخوڕیان. پێشتر بە لای کەمییەوە سەرۆکی شارەوانی هەفتەی جارێک زەنگی بۆ لێدەدا تا پەیوەندی نێوان بازاڕ و باقی شارەکە بە هاوسەنگی

ڕابگــرێ. کەچــی هەنــووکە ســـەرۆکە نــوێیکەی شــارەوانی تەنــانەت بــۆ بۆنەئــاهەنگی دەســتبەکاربوون هەر بانگهێشتیشــی نەکــرد، چجــای ئەوەی بــۆ پرسـوڕا تەلەفـۆنی بـۆ بکـا. بەڵـێ بەرپرسـەکە بانگهێشـتی چەنـد بازرگـانێکی بــازاڕی کردبــوو، ئەوەش واتــای ئەوەی دەگەیانــد، کە ڕژێــم ویســتوویەتی شیرازەی یەکێتییەکەیان بپچڕێنێ. کاتێ پشـتی مافوورفرۆشـەکانی بشـکاندبا، ئەوا بازاڕی بۆ تەخت دەبوو. لەنێو شـارەکەدا چەندین کارخـانەی مـافوور و فەرش دروســـتکردن دامەزرێنـــدران. پێشـــتر کەس ئەو جـــۆرە مـــافوورە هەرزانبەهایانەیـان نەدەکـڕی، ئـاخر بـۆنی پلاسـتیکیان لێدەهات، کەچـی ئەم ڕۆژانە بەردەوام بانگاشە بۆ ئەو جۆرە کالایانە دەکرێ.

تا یەک دوو سـاڵی ڕابردوو بوو، هەبوونی ئـالیەری تەلەفزیۆن لەسـەر بـانی ماڵەکـانی شــاری زەنجـان ، بڤەبـوو؛ لـێ هەنـووکە ئەو بـارودۆخەی جـاران نەماوە. کاتێکیش بەڵێندەرێک ویستی گەرماوە کۆنینەکەی نـاو شـار بەشـتێکی دیـکە بگـۆڕێ، کەسـێکی وەک خالخـالی تـوانی هەمـوو ئیمانـدارانی شـارەکە خڕبکـاتەوە و تەنـانەت فەرەح دیبـاش ڕاوبنـێ. بەڵام لەو دوایـانەدا کەسـێک گەراجەکەی نێو جەرگەی شـاری کڕی و باڵەخـانەیەکی نـوێی لەسـەر ڕۆنـا و کــردییە ســینەماخانەیەکی گەورە. هەمــوو ئێــواران بە ســەدان گەنــج لەبەر دەرکەی سینەماکە ریزیان دەبەست، تـا بلیتی چوونە ژوورەوە بکڕن. ئـاخر ئەوەندە شتی سەرنجڕاکێش کەوتبوونە نێو شارەکە، پەیوەندی بازاڕە کۆنەکە بە نەوە نـوێیەکە بەتەواوی پچڕابوو. چەنـد سـاڵێک لەمەوبەر گەنجەکـان هەر دەچـوونە بـازاڕەکە و پیاسـەیان تێدا دەکـرد. لـێ ئەم ڕۆژانە چیـدی ئەوەیـان نەدەکـرد. شـارەوانی شـەقامێکی جـوان و ڕەنگینـی کورنیشـی بە داروباریـان درسـتکردبوو، ئیـدی کـوڕان و کچـان کـاتی نـوێژی مەغریـب لەوێ پیاسـەیان دەکرد، لەژێر دارەکاندا و لەبەر تیشکی کزی گڵۆپە نیۆنەکانـدا دادەنیشـتن و خواردنیان دەخوارد، خەریکی کەیفوسەفای خۆیان بوون.

لە کۆتاییدا شا دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. تـابلۆی گەورە گەورەی سیما و ڕووخسـاری شـا بەسـەر هەموو باڵەخانەکانی میرییەوە هەبوون، دەنگیشـی لە هەمـــوو ئێزگەکـــانەوە دەبیســـترا. پێشـــتر دوکانـــدارەکان ڕادیـــۆیەکی بچکۆلانەیان لەبن مێزەکەیان دانابوو، چونکە دەترسان نەوەک مەعمیلەکانیان

لە دەست دەربچن. کەچی هەنووکە ڕادیۆکەیان لە شوێنێکی دیار داناوە تا هەمووان گوێیان لێبێ. تەنانەت لە بازاڕەکەشدا هەندێ لە مافوورفرۆشە کۆنینەکان وێنەی شایان لە مەغازەکانیاندا هەڵواسی. چەند ساڵێک پێشتر شتی وا لەنێو بازاڕدا چاوەڕواننەکرابوو، بەڵام خۆ هەموو شتێک بەخێرایی گۆڕاوە، وای لێهاتبوو مرۆ شارەکەی خۆیشی نەناسێتەوە.
گۆڕەپانی بازاڕەکە چیدی وەک چەقی بازنەی شار نەمابووە، بەڵکو شەقامی کۆڕنیش، کە پەیکەرێکی گەورەی شا بە سواری ئەسپەوە لەنێو حەوزێکی گەورەی ئاو داندرابوو، ببووە مەڵبەندی شارەکە.
دەنگی شا دەگەیشتە هەمووماڵێکی شاری زەنجان، تەنانەت خودی ماڵەکەی مزگەوتێش بەو هەموو دیوارە ئەستوورانەی خۆی، هێشتا نەیتوانی بەر بە دەنگەکە بگرێ.
خۆ ئەگەر شا لە شوێنێک لە شوێنەکان وتارێکی بدابایە، یەکسەر شارەوانی جێبێکی لە دەروازەی مزگەوتەکە ڕادەگرت، کە بڵندگۆیەکی گەورەیان لەسەر دانابوو، ئیدی دەنگی شا بە هەموو کون و قوژبنێکی ئەو ناوە بڵاو دەبووە. فەخری ساداتیش لەوە تێنەدەگەیشت، بۆچی لەم بارەیەوە ئاغاجان بێدەنگە و چما[121] مەلا ئەحمەدیش دەنگی ناڕەزایەتی هەڵنابڕێ.
کاتێک کەمێک دوای ئەوە، سەردانێکی سەر گۆڕی کۆرش[122]ی کرد، ئەو کەسەی یەکەمین پاشای قەڵەمڕەوێتی ئێرانی بوو، شا بە وشەی قەبە و گەورەوە گوتی: "کۆرش، ئەی شاهەنشای مەزن! ئارام لێی بخەوە! چونکە من بێدارم!"
ئیدی ئەوکات بۆ ماوەی هەفتەیەکی ڕەبەق جێبەکە بە خۆی و بڵندگۆ گەورەکە بە شەو و بە ڕۆژ لەبەردەم دەروازەی مزگەوتێ بوو.
"ئای چ ڕۆژانێکی ڕەزاقوڕسن! وای لەو شەوە قوڕسانە! ئەوە سوکایەتییکی گەورەیە بۆ ئێمە، بەڵام خۆمن هیچیشم لەدەست نایەت! چیدیکە لە چاوشۆڕییان زات ناکەم بچمە مزگەوتێش." ئاغاجان ئەم دێڕانەی سەرەوەی لە فایلی هەواڵنامەکەدا نووسین.

---

[121] چما: بۆ
[122] Cyrus

نەخێر، کەس لە توانا و وێزەی نەمابوو شا لە ماڵەکە دەربکا، تەنانەت (با)ش وێنەکانی شای دەهێنانەوە نێو حەوشەی ماڵێ، لەو سەربانانە هەلیکۆپتەرێک دەفڕێ و وێنەکانی بە سەر شارەکەدا بەردەدانەوە.
مارمیلکەش یەک دوو وێنەی چوارچێوە ئاڵتوونی خڕکردبوونەوە و لە ژوورەکەی ئاغاجانی دانان.



کاتێکیش ئاغاجان لە حەوشەکەوە وەستابوو، گوێی لەدەنگی موزیکێک بوو، لە ماڵی حاجی شیشەگارەوە دەهات. موزیک لە ماڵی شیشەگاری دیندار؟ هەردەبێ شتێکی تایبەت لە ئارادابێ. هەندێ سەری وەرسوڕاند، چاوی بە ئەنتێنێکی تەلەفزیۆن لەسەر بانی ماڵی حاجی شیشەگار کەوت. ئالیەری تەلەفزیۆن لەسەربانی ماڵی بەڕێزترین و باشترین شووشەواتفرۆشی ناو بازاڕ؟ تۆ بڵێی ئەو خۆی سەرچیخ نەچووبێ؟
دیاربوو ماڵی حاجی جەنجاڵ بوو.
بە ئەسپایی ئاغاجان بەپەیژەکان و بەتاریکی لێوەسەر بانی حاجی شیشەگار کەوت، تا بزانێ ئاخۆ چی لەگۆڕێدایە.
نەخێر، ئەو شاش نەچووبوو، لەوێ لەسەر بانەکەیان ئەنتێنێکی ئەلەمنیۆمی درێژ لەسەر بانەکە چەقێندرابوو.
حاجی دەیەویست لەگەڵ کوڕەکانی هەموو پێشهاتە نوییەکان ببینێ. ئاخر هەر ئەویش لە لایەن سەرۆکی شارەوانی نوێوە بانگهێشتی ئاهەنگی دەستبەکاربوونی کرابوو. هەموو ئەوانەی لەو ئاهەنگەدا بانگهێشت کرابوون، وێنەیەکی گەورەی شایان بە بەلاش پێدرابوو. ئەو پۆرترێتەش ئێستا لە چوارچێوەیەکی ئاڵتونی، ڕێک لە سەرووی تەلەفزیۆنەکەش دراوە.
بەڵام ئاخۆ بۆچی بەم وەختە، ئەو موزیکە بە دەنگە لە ماڵەکەی ئەوەوە دێ؟
بەشێنەیی ئاغاجان چووە سەر لێواری بانەکە و سەیری نێو ماڵی حاجی شیشەگاری کرد.
لەوێدا ئاهەنگێک سازدرابوو، هەموو ئەندامانی خانەوادە و برادەرەکانی ئامادەبوون. بە ڕاستی شەوێکی گەرم بوو، ئەوەندە گەرم بوو هی ئەوە نەبوو لە ژوور دابنیشن. لەوێ لەناو حەوشەکەدا و لە تەنیشت حەوزەکەدا،

تەختەبەندێکی گەورەیان لێدانابوو، تاکو هەر دوو کوڕەکانی حاجی بە خۆیان جلی شۆڕی لۆکەوە لە تەنیشت یەک جێگەیان ببێتەوە. دەستەیەکیش لە موزیکژەنەکان موزیکێکی ئەمریکایی ناقولایان لێدەدا، چەند پیاوێکیش دەست لەناو دەست لەبەر موزیکەکە سەمایان دەکرد.
دیاربوو حاجی کوڕەکانی سونەت دەکردن، ئیدی ئاهەنگەکەی بەو بۆنەیەوە سازکردبوو. دایکی دوو کوڕە سونەتکراوەکانیش چارشێوەکەی کەوتبووە سەر شانەکانی و بە دڵخۆشییەوە لەگەڵ میوانەکان کەوتبووە گفتوگۆ. ژنی یەکەمینی حاجی و هەر حەوت کیژەکانیشی لەوێ دیارنەبوون.
لە هەموو لایەکیش سینی و خوانچە[١٢٣]ی پڕ لە کولیچە نوقڵ و شیرنەمەنی داندرابوو، منداڵانیش بەدوای یەکدیدا غاریان دەدا. حاجیش لەگەڵ هەمووان دەدوا، شیرنەمەنییەکانی دابەش دەکردن، کامێرای وێنەگریشی لە کامێراوانەکە وەرگرت و هەر بە خۆی وێنەی کوڕە سونەتکراوەکانی گرتن. بۆ چەندەمین جار چووە لای کوڕەکانی و پڕ بەدەم بانگی دەکرد: "دەی وێنەیەکمان بگرە!" کەمێک دواتر لەگەڵ دوو پیاوی دیکەدا چووە ژووری میوانان، ئینجا بە خۆی و ئامێرە تەلەفزیۆنێکی گەورەوە هاتەدەر، تەلەفزیۆنەکە زیاتر لە سندوقێکی دار دەچوو. ئیدی تەلەفزیۆکەیان لەوێ لە پاڵ حەوزەکە ، لە ژێر دارەکان لەدەرەوە، لە نزیک کوڕەکانی دانا. حاجی تەلەفزیۆنەکەی پێکرد، لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکەدا دەستەیەک ژنی تارانی دەرکەوتن، سەمایان دەکرد، هەمووان هاتن و لە بەردەم تەلەفزیۆنەکە وەستان و بە حەپەساوییەوە سەیری سەماکەرەکانیان دەکرد.
ئاغاجانیش بە شوێنی خۆیدا گەڕایەوە، لە تەنیشت گومبەزە شینەکەدا وەستا، دەستێکی لە بەردە شوشە ساردەکانی گومبەزەکەدا خشاند. پاشان زیاتر ڕۆیشت و سەیری دیواری حەوشەی ناوەوەی مزگەوتێی کرد، لەوێدا سەری بۆ سەرمنارەکان، هێلانەی حاجی لەقلەقەکان هەڵبڕی، بەڵام بۆمایەی سەرسامی، بینی حاجی لەقلەقەکان لەوێ نەمابوون. ڕۆیشت و لەسەر پەلەسواندەی دیوەکەی دیکەی بانەکە وەستا و سەیری سەرووی خۆی کرد،

[١٢٣] خوانچە: سینی. مجمە.

بەلام خۆ بەجوانی ئەو ناوەی لێدیاربوو، هیچ شوێنەواری حاجی لەقلەقەکان لەوێ نەمابوو.
ئینجا دەرگای هەورەبانێکی یەکێ لە منارەکانی کردەوە، بەنێویدا و بەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوت، بەرز ڕۆیشت تا گەیشتە دوندی[١٢٤] منارەکە. لەژێر پێیدا هەندێ چیلکەدار قرچەیان هات، چیلکەدارەکان پاشماوەی هێلانەی حاجی لەقلەقەکان بوون. هەستێکی وای لاپەیدابوو، شتێک لەناخی ئەودا شکا، کەوا ئەو پیر بووە، ئەو هەستە ناچاوەڕوانکراوەش بە تەواوی دایگرت.
هەر لەو لوتکە بڵندەوە چاوێکی بەسەر شارەکەدا گێڕا، لە هەموو لایەک هەر گڵۆپ بوون داگیرسابوون، لە پاڵ دەروازەی بازاڕەکەشدا وێنەیەکی گەورەی شا هەڵواسراوە کە بە بلاجۆکتۆرێک ڕووناک کراوەتەوە. لە سەنتەرە نوێیکەشدا گڵۆپی نیۆنی سوور و زەردی سینەماکە هەڵدەبوون و دەکوژانەوە. هەرچەندە شەوەکە درەنگیش بوو، کەچی دەنگی موزیک و دەنگی ژنان لە شەقامی کۆرنیشەوە دەهات.
تۆ بڵێی لە کەیەوە دەنگی سورەتەکانی قورئان لەو شارەدا ونبووبن؟ ئەو دەیزانی مزگەوت، بازاڕەکە و قورئان نەیانتوانی بەرگرییەکی زۆر بکەن، بەلام ئەوەشی ڕەچاونەدەکرد، کە ڕژێم ئەوەندە زوو دەست بەسەر زەنجاندا بگرێ.



تۆ بڵێی ئەو ئایەتوڵلایانەی دژی شا دەجەنگان، لە کوێ بن؟
ئەرێ چی بەسەر ئەو گەریللایانەدا هات کە لە دۆخێکدابوون بتوانن لە زیندانەکانیاندا ڕابکەن؟
چۆن بوو کتێبەکان کە شاباڵ بە دژی دەیخوێندنەوە، گۆڕاندیان؟
لە کوێن ئەو ڕادیۆیانەی دژی ڕژێم دەنگیان هەڵدەبڕی؟
خالخالی بە خۆی و جۆشوخرۆشی بەرەنگاربوونەوەی شا لە کوێیە؟
لە کوێن ئەو خوێندکارانەی دەیانەویست دنیا بگۆڕن؟
باشە ئەدی نوسرەت لە کوێیە تا ئەو هەموو گۆڕانکاریانە بە کامێراکەی تۆمار بکا؟

---

[١٢٤] دوند: لوتکە.

ئەوانە ساڵە بێدەنگەکان بوون، بەلام تۆ بڵێی ئەو چۆن ئەوە بزانێ، کە زۆری دیکە نابا، ڕۆژگارێکی نوێ بە خێراییێکی نوێ دێتە کایە؟ لە کوێ بزانێ کە باهۆزێکی تێکدەرانە بەڕێوەیە؟ ڕەشەبایەکی تووڕە، ئەو وەک ئەو دار کاژە پیرەی نێو حەوشەکەیان دەچەمێنێتەوە.

ئیدی بە تێکشکاوییەوە ئاغاجان لە قاڵدرمەکان دابەزی، دەلاقەی هەورەبانی منارەکەی پێوەدایەوە و گەڕایەوە ناو حەوشەی ماڵێ. ویستی بڕواتە لای فەخری سادات تا لەناو نوێنەوە هەموو شتێکی بۆ بگێڕێتەوە، بەلام واشی نەکرد، لە دەرگای سەرەکی چووەدەر و پیاسەیەکی بەرەو لای ڕووبارەکە کرد.



لەوێ تاریک و خاموش بوو. تەنانەت خودی ڕووبارەکەش هاژەهاژی نەدەکرد. سەیرێکی دارمێوەکانی ئەوبەری و تەماشای شاخەکانی کرد. هەمووشتێک هەر ماتوخاموش بوو، ئەو پیاسەی خۆی دەکرد، بیری لێدەکردەوە و گەڕایەوە سەر ژیانی خۆی.

ئەو لەو خانووەدا لەدایک ببوو، ژیانی خۆی بۆ مزگەوتێ تەرخان کردبوو، بێ وچان لە بازاڕەکەدا ئیشی دەکرد، بەهرە و توانای لە جیهانی مافووردا خەرجکرد. کیژەکانی هەراش ببوون، گەیی مێردیان[125] بوو، جەواد، تاقانە کوڕەکەشی لە منداڵێکەوە ببووە پیاو. ئەو خەریکی تاقیکردنەوەکانی بوو تا بەمزووانە بچێتە زانکۆ. ئاغاجان هەستی کرد، هێشتا نەچۆتە مەککە، هەرچەندە وەک پیاوێکی دەوڵەمەند لەسەری بوو گەشتی حەجێش بکا.

هەموو شتێک گۆڕابوو، لەپاڵ ئەو گۆڕانکاریانەشدا هێشتا ئەحمەد ناوناوبانگی مزگەوتیی زڕاندبوو.

قەلە ڕەشەکەش ناوەختانە لەنێو دار مێوەکاندا و قیغاندی و بەسەر روبارەکەدا پەڕیەوە ئەوبەر. ئاغاجان گوێی لەدەنگی چەند پیاوێک بوو، بیچمی ژنێکی چارشێوبەسەریشی بینی، لەنێو دارەکاندا لە دواوە بەرەو پردەکە دەڕۆیشت.

یەکسەر شتێکی بۆهات، ئەوە قودسییە شێتۆکەیە.

---

[125] گەیی مێردیان بوو: وەختی مێردکردنیان بوو.

"قودسی!" ئاغاجان وای بانگکرد.
ئەویش تیژ ڕۆیشت. "قودسی!" کەمێ بوەستە! تۆ بەو کاتە درەنگە لێرە چیدەکەی؟" ئاغاجان وای بانگکرد و بەو تاریکاییە بەدوایدا غاریدا.
"هەمووان دەمرن، بەڵام تۆ نامری." قودسی لەگەڵ دەنگی قەلەکە وای جاڕدا.

## تەلەفزیۆن

مارمیلکە وەک بوونەوەرێکی مەتەڵئاسا لەنێو ماڵەکەدا گەورەبوو. مرۆڤ نەیدەزانی ئاخۆ ئەو منداڵێکی کەمئەندام بوو یاخود زیندەوەرێک. سەر، دەست و پێیەکانی مرۆڤئاسا بوون، بەڵام جووڵەی زیاتر لە جووڵەی ئاژەڵێک دەچوو.
هەرچەند بە تەمەنتر دەبوو، لایەنە ئاژەڵیەکەی تێدا زیاتر گەشەی دەکرد.
سەدیقە هەوڵی لەگەڵدا بەڵکو فێرە قسەکردنی بکا، بەڵام سەرنەکەوت، ئەویش هیچ مەیلێکی لەسەر نەبوو فێری قسەکردن بێ.

ئەو شێوازی تایبەتی خۆی هەبوو، حەزیشی لێنەبوو هیچ لە ڕەفتاری مرۆڤەکانی دوورووبەری بچێ. ئەو نەیدەویست لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بچێتە سەر سفرە و نان بخوا، لە کاتی خۆشیدا نەدەچووە سەر پێخەفی خۆی بڕازێ، نەیدەویست کەوچک و چەنگاڵ بۆ خواردن بەکاربێنێ، بەڵکو هەروەک پشیلەیەک نانی دەخوارد.
- "من چیدیکە دەرەقەت نایەم! من تەواو بووم. من چیدیکە ئەو منداڵە سەیر و سەمەرەیەم ناوێ!"
- "تۆ بۆت نییە وا بڵێی." ئاغاجان بەسەرکۆنەکردنەوە وای پێگووتەوە.
سەدیقە دەستی بەگریانێ کرد و فرمێسکی داباراندن.
- "کوێرەوەری لە دوای کوێرەوەری!" بە فونگە فونگی گریانەوە وای گوتەوە. "باشە بۆچی هەموو ژیانم هەروا بە سەقەتی ڕۆیی؟"
- "کیژم، تۆ هێشتا گەنجی، تۆ ژیانێکی دووروودرێژت لەبەردەمدایە. ژیان هەموو جارێ هەر تەنیا هەمان ڕووت نیشان نادا، تۆ دەبێ ئەوە لەبیرکەی،

کە بۆ هەموو شتێک هۆکارێک لە ئارادایە. خۆ ئەگەر کەسێک هەبی سکالا بکا، بێ سێودوو دەبێ بانگدەرەکە بێ، خۆ هەر بە کوێریی لە دایک بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ناکڕوزێتەوە، دادەداد ناکا، جەستەکەی هەروا دروست بووە و پێشی قایلە، ئێمەش هەروا. ئەو ناتوانێ هیچ ببینێ، بەلام دوو گوێی تیژ و سووکی هەن، دوو دەستی هەرە هەستیاری هەن، دوو قاچی هەن دەتوانێ پێیان بڕوا. بە گوێرەی من ئەو هەموو شتێک دەبینێ، تەنانەت ئەو شتانەی، کە ئێمەش لە تواناماندا نییە بیانبینین. کچەکەم، تکایە مەگریێ! کوڕەکەت هی ژیانە، منیش پێیەوە دڵشادم، من ئەو وەک دیارییەک لەو ماڵەدا دەبینم، قسەکەشم بە ڕاستییە، ئێمە پێویستمان پێیەتی، دەنا ئێمە ئەومان بۆ پەیدا نەدەبوو. بە سەدان کەس لەو ماڵەدا ژیاون. ئەوەش یەکەمین جار نییە، بوونەوەرێکی نائاسایی لێرەدا لە دایک ببێ. بڕوات بە ژیان هەبێ، ئێمە کوڕی تۆمان بۆشتێک پێویستە، دەنا ئەو لەنێواماندا پەیدا نەدەبوو!"

- "کاشکی منیش وەک تۆ بڕوادار بوام." سەدیقە ئەمەی بە گریانەوە پێگوتەوە.

بۆ ڕۆژی پاشتر، ئاغاجان بانگی مارمیلکەی کردە ژووری خۆی و ڕوونوئاشکرا پێیگوت، دەبێ هەموو ڕۆژێ دوای نوێژی بەیانی بێتە ژووری کارکردنی. ئەو بڕیاری دابوو بە حەوسەڵەوە لە ساڵەکانی دادێدا فێرە دیسپلینێکی توندوتۆڵی بکا. مارمیلکەکەش بە سەرسامییەوە بە باشی وەڵامی دایەوە. ئەو بەلینگەخشکێ بە خۆی و سیپارەیەکەوە کە بە دانەکانی دەگرت، دەهاتە لای ئاغاجان، سیپارەکەی دادەنا و لێکیدەکردەوە، ئەویش وشە بە وشە لەگەڵیدا دەڕۆیشت تا بتوانێ بە باشی وشەکان گۆ بکا و فێریان بێ.

کاتێکیش مارمیلکە توانێ کەمێک فێرە خوێندنەوە ببێ، هەمیشە دەچووە نێو باخچەکە لەژێر سێبەری دارە پیرەکەدا لێیڕادەکشا. کاتێکش هەوا گەرم بووایە، خۆی لەسەر پەیژەکان دەخشاند و لێ وەسەربان دەکەوت، بە خۆی و کتێبەکەی شوێنێکی لە پەنای سێبەری گومبەزەکە دەدۆزیەوە.

لە زستانیشدا دەچووە ژێر زەمین و لە تەنیشت زۆپای یارۆی بانگدەر هەڵدەکوڕما و خەریکی خوێندنەوەی خۆی بوو.

ئەحمەدیــش ڕێــی دەدا بچێــتە ژووری کتێبــان، لەوێ بە چەنــدان ســەعات دادەنیشــت و کتێبــی دەخوێنــدنەوە. کەســیش نەیــدەزانی ئاخۆ ئەو کتێبــانەی دەیــانخوێنێتەوە، لێیــان تێــدەگا، یــاخود ئەو بە شــێوازی خــۆی خەیــاڵ و ئەندێشەی بۆ دەهۆنێتەوە.

جیهانی ئەو، جیهانی ماڵەکە بوو، بە دەگمەنیش لە ماڵ دەچووە دەر، مەگەر مام ڕەمەزان هاتبا و سواری سەر پشتی کەرەکەی کردبا و پیاسەیەکی تا سەر ڕووبارەکە پێکردبا.

لە بەردەم دوکانی کاری و بەهاراتەکشدا، پیرەپیاوەکان دەهاتن و کەرەکانیان لەوێ ڕادەگرت و بەسەرسامی لە مارمیلکەیان دەڕوانی. هەموویان دەربارەی ئەویان بیستبوو. ئەوان کە دەگەیشتنە لای ئەو، شەپقەکەیان دادەگرت قسەی خۆش و نوکتەیــان لەگەڵدا دەکرد. مــارمیلکەش زۆری کەیــف پێدەهات، بە دڵگەرمییەوە وەڵامی دەدانەوە.

پاشان مام ڕەمەزان زۆرجاران لەگەڵ خۆی دەیبردە سەر ڕووبارەکە، ئەو شوێنەی زیخ و چەوی زۆرتر لێبوو. لەوێ مام ڕەمەزان کونێکی گەورەی لە گردە لمینەکە دەکرد و مارمیلکەش خۆی دەخزاندە نێو کونەکە و کتێبەکەی خۆی تێدا دەخوێندەوە. مارمیلکە لەگەڵ مام ڕەمەزاندا هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد.

چەند جارێک سەدیقە ڕێی بە مام ڕەمەزان گرت و لێنەدەگەڕا مارمیلکەی لەگەڵ خۆیدا ببا.

- "باشە بۆ نا؟" مام ڕەمەزان وای لە دایکەکە پرسی. "بۆت نییە بیشاریتەوە."



لەو کاتانەدا زینەت بەزۆری لە دەرەوەی ماڵ بوو. بەردەوام دەچووە دێهات بــۆ ئەوەی دەرســی قورئــان بە ژنە لادێییەکــان بڵێــتەوە. بەڵام کــاتێکیش دەگەڕایەوە ماڵ، یەکسەر بە دوای مارمیلکەدا دەگەڕا، تا هەقایەتە کۆنینەکانی بــۆ بگێــڕێتەوە، ئەویــش هەرگیــز لە گوێبیســتنی ئەو جــۆرە هەقایەتــانە تێرنەدەبوو.

زیــنەت زیــاتر لە ئەوانــی دیــکە مشــووری مــارمیلکەی دەخــوارد. ئەو لە مارمیلکەدا سزای خودی خۆی دەبینییەوە. مارمیلکەش فێرە قسەکردن نەبوو،

بەڵام دوو گوێی سووکی هەبوون، بە خێراییەکی نائاسایی گوێی لە قسان دەبوو. ئەو دەورووبەرەکەی ناچارکردبوو هاموشۆی لەگەڵدا بکەن.
نوسرەتیش کاتێ بەسەردان دەگەڕایەوە، خۆی لێبەدوور دەگرت، دەستێکی لەسەر دادەنا و یەک دوو نوقڵی دەدانێ، لەوە زیاتر نەبوو. کاتیکیش دەخەوت، لە دیوی ناوەوە دەرگاکەی لەسەر خۆی باش شمشێرە دەدا، بۆئەوەی مارمێلکە نەتوانێ بێتە ژوورەکەی خۆی بخشێنێتە ناو جێگای.
لەگەڵ ئەوەشدا، شەوێکیان مارمێلکە توانی بچێتە هۆدەکەی. لە ژوورەکەیدا چووە سوچێک لێی پاڵ کەوت، کتێبێکی لە نێو گیرفاندا دەرهێنا و سەری بەسەردا داگرت.
نوسرەتیش نەیدەزانی چی لێبکا، بۆ ماوەیەک قیت لەسەر پێخەفەکەی دانیشت و سەیری دەکرد. ئەو دەیەویست شتێکی بۆ بکا، بەڵام نەیدەزانی چی بکا. لەپڕ شتێکی بە مێشکدا داهات.
"دەی وەرە لەگەڵم." نوسرەت وای پێگوت.
مارمیلکەش لە دوای نوسرەت خشا بۆ نێو حەوشەکە، لەوێشەوە بە دوایدا چووە ژێرزەمینەکە.
"گوێبگرە، جارێکیان شاباڵ ئامێرێکی تەلەفزیۆنی هێنابووە ماڵ، تا مانگ نیشانی مەلا ئەلسابری باپیرەت نیشان بدا. ئەلسابری مەلایەکی سادە و ساویلکە بوو، ئەو کەوتە نێو حەوزەکە و مرد، بەڵام هەر دەبێ تەلەفزیۆنەکە لێرە لە شوێنێک هەڵگیرابێ. ئەگەر تەلەفزیۆنەکەم دۆزییەوە، دەکرێ بۆ تۆ بێ. ئەرێ دەزانی، تۆ لە ماڵێکی هەڵەدا لەدایکبووی. جیهان گۆڕاوە، بەڵام ئەم ماڵە هەر وەک خۆی ماوەتەوە. لەمەبەستەکەم تێدەگەی؟"
مارمیلکە بەنابەڵەدی سەیری کرد هیچی لێتێنەگەیشت.
"لەگەڵ ئەوەشدا بەختت هەبوو، خۆ ئەگەر لە ماڵباتێکی دیکەدا لەدایک بووبای، ئەوا دەمێک بوو تۆیان بە سێرکێک فرۆشتبوو. ئەوانەی ئێرە خۆشەویستیان بەتۆدا، خۆشەویستیش بۆ مرۆڤ زۆر گرنگە. بەڵام هەرچۆنێک بێ، ئێرە ماڵێکی پاشکەوتووە. لەبەرئەوەی هەموویان لە خوا دەترسن، بۆیە لە هەموو شتێکیش دەترسن، ئەوان لە ڕادیۆ، لە تەلەفزیۆن، لە موزیک، لە سینەما، لە تیاترۆ، لە شادمانی، لە ژنەکانی دیکە، لە پیاوەکانی

دیکەش دەترسن، ئەوانە تەنیا گۆڕستانیان خۆش دەوێ. ئەوێ وەک ماڵی خۆیان دادەنێن، بەڕاستی من مەبەستمە، ئایا هیچ جارێک لەگەڵیان چوویتە سەر قەبران؟ لەپڕێکەوە دەبینی ئەوان لێراهاتوون، هەڵسوکەوتێکی شادمانانە دەکەن، ئەوان لەگەڵ مردووان هەست بە ئاسوودەیی دەکەن. هەر بۆیە کاتێ هێشتا گەنج بووم لەو ماڵە هەڵاتم. دەی وەرە، با بزانیت ئامێری تەلەفزیۆنەکە لە کوێیە، هەر دەبێ لێرە لەبن ئەو شتە پەرشوبڵاوانەدا بێ. خۆ ئەگەر دادەکان فریێیان نەدابێ باشە. ئاخ، ئەو دادانە، تۆ هەرگیز ئەوانت نەناسی، ئەوان دوو خانمی بەشکۆ بوون. ئەوان حەزیان بە چارەی من نەدەکرد، بەڵام باشە باوابێ. ئەوان چوونە سەفەری حەجێ، چوونە مەککە و هەرگیزیش نەگەڕانەوە، ئای لەو مەکرۆیانە. هــــــاااااا، پێموابێ دۆزیمەوە. سەیرکە! تەلەفزیۆنێکی بچکۆلە بۆ تۆ.! بەو زووانە و هەر بەو ئەنتێنە ژیانت دەگۆڕم. هەندێ بیربکەینەوە، باشە تەلەفزیۆنەکە لە کوێ دابنێم، تا کەسیش سەغڵەت نەکا؟ سەیرکە، لەوێ لە پشت گومبەزەکەی سەربانی پەناگەیەک هەیە. لە وێندەرێ جاران خۆم تێدا دەشاردەوە، لەوێدا کتێبە دژوارەکانم دەخوێندنەوە. پاشتر شاباڵ پێخەفێکیشی لێدانا. هەنووکەش ئەو لێرە نەماوە، ئەو حەشارگەیە با بۆ تۆ بێ."

مارمیلکەکە بەدوای نوسرەتدا بەسەر قاڵدرمەکان هەڵگەڕا و چووە سەربان. نوسرەت تەلەفزیۆنەکەی لەسەر مێزۆکەیەک لە تەنیشت پێخەفەکەی شاباڵ دانا.

- "ئەم پێخەوە لەمڕۆ بەدواوە بۆ تۆیە، دەی بڕۆ سەرێ، درێژبە، من فێرت دەکەم چۆن تەلەفزیۆنەکە بەکاربێنی."

مارمیلکە خشایە نێو پێخەفەکە. نوسرەت وایەری تەلەفزیۆنی ڕاکێشایە دەر و بەهێواشی ئەنتێنێکی بچووکی لەسەر قەپەنگەکە قایم کرد، لە شوێنێکی وا کەس نەیدەبینی.

- "ئێسا باش سەیرکە." نوسرەت وای پێگوت و تەلەفزیۆنەکەشی بۆ پێکرد. لەسەر شاشەکە ژنێکی شۆخ بە خۆی و فستانێکی سووری بێقۆڵ دەرکەوت.

- "گەنجۆ، نەترسێی! جیهانی دەرەوەی ئەم ماڵە بە تەواوی جیاوازە. ئەرێ حەزت لە ئافرەتانە؟ پەککو، پەکوو، خۆ نابێ ئەوە لەمن بپرسی. من جارێک لەگەڵ خۆم دەتبەمە تاران. لە راستیدا ئەم تەلەفزیۆنە زۆر بچووکە، جارێکی دیکە یەکێکی گەورەترت لەگەل خۆمدا بۆ دێنمەوە، بەڵام جارێ دەبێ ئەوەیان باش هەڵبگرێ، ئەوە هی تۆیە و کەسیش مافی ئەوەی نییە لێت بسەنێتەوە. ئەگەر هەر کەسێکیش ویستی ئەم تەلەفزیۆنەت لێبستێنێ، ئەوا یەکسەر قەپێکی لێبگرە، بە توندی ددانەکانت لە گوێزنگی پێی بگرە. تێگەیشتی؟"



مارمیلکە بۆ ماوەی ساڵێکی رەبەق حەشارگەکەی بە نهێنی هێشتەوە، بەڵام شەوێکیان ئاغاجان بە هێواشی لێوەسەربان کەوت و بە لەسەرخۆییش دەرگای پەناگەکەی کردەوە.

مارمیلکەش کە چاوەڕێی هیچ کەسی نەدەکرد، بەیەک جووڵە لەشوێنی خۆی هەڵبەزییەوە بەرەو لای تەلەفزیۆنەکە ڕۆیشت، هەروەک پشیلەیەکی گەورە لەسەرسەر بڕوا وابوو. سەری لە لایەک و قاچەکانیشی لە لایەکەی دیکەی تەلەفزیۆنەکە بوون.

ئاغاجان ماوەیەک لەنێو دەگا کراوەکەدا وەستا، ئینجا سەرلەنوێ دەرگاکەی پێوەدایەوە، بەرەو لای پەیژەکانی مزگەوتێ ڕۆیشت و لەولاش هاتەخوار.

## کوللە

ئەو ڕۆژە بۆ ئاغاجان ڕۆژێکی تایبەت بوو. شتێک ڕوویدا لەوەی چاوەڕوان دەکرا زیاتربوو.

لە دەرگا درا. مارمیلکە دەرگاکەی کردەوە، چاوی بە چاوە زەق و گەورەکانی دوو ئەسپ کەوتن کە گالیسکەیەکیان ڕادەکێشا. ئیدی ئەویش توند دەستی بە ڕۆخی دەرگاکەوە گرت و هەندێک کشایەوە تا بتوانێ باشتر دیمەنەکەی بۆدەربکەوێ و بزانێ ئاخۆ چی لە ئارادایە. ئاخر گالیسکەیەکی گەورە بە دوای ئەسپەکەوە بوو، لە بەردەم دەرگاکە وەستابوو، دوو سندووقی دارەمەیتی تێدا بوون. عەرەبانچییەکە، کە پاڵتۆیەکی ڕەشی لەبەردابوو، شەپقەیەکی ڕەشیشی لەسەر بوو، بانگیکرد: "ئاغاجان!"

مارمیلکەش گەڕایەوە دواوە و خێرا بۆ ژووری کاری ئاغاجان خشا، ئاماژەی بۆ دەرگاکە کرد و دەنگێکی وەک حیلەی ئەسپیشی لێوەهات.
کاتێکیش ئاغاجان عارەبانچییەکەی دی، یەکسەر کڵاوشاپۆکەی لەسەرنا و بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت.

- عارەبانچییەکە بانگی کرد. "إنا لله!"
- "إنا لله،" ئاغاجانیش وایپێگوتەوە ئینجا لێیپرسی، "دەتوانم چیت بۆ بکەم؟"
- "دوو مردووم بۆ هێناوی."
- مردوو؟ بۆ من؟"
- "تکایە لێم مەگرە. ئەوانە مردوو نین، بەڵکو پاشماوەکانیانن."
- "هی کێ؟"
- "هی دوو خانمەکەی مەککە."
- "دادەکان!" ئاغاجان بەهەندێ سڵەمینەوە وایپێگوتەوە.
- "تکایە، ئەگەر لێرەوە واژۆیەک بکەن." عەرەبانچییەکە وای پێگوت و کاغەزەکانیشی ڕادەست کردن.
- "چاویلکەکەم." ئاغاجان وای دەنگ هەڵبڕی.

مارمیلکەش غاریدایەوە ژوورێ و چاویلکەی خوێندنەوەی ئاغاجانی هێنان.
نووسینی سەر کاغەزەکە بە زمانی عەرەبی بوو. ئایەتێکی قورئان بوو، بە دوایدا کورتە ڕوونکردنەوەیەک سەبارەت بە دادەکانی تێدا بوو، کە لە ئەشکەوتی حەڕا[١٢٦] دۆزرابوونەوە.
ئەشکەوتی حەڕا پیرۆزترین ئەشکەوتە لە جیهانی ئیسلامدا، ئەوێ ئەو شاخەیە، کە محەمەد هەموو شەوان بۆی سەردەکەوت و لەگەڵ ئەڵڵا قسەی دەکردن. ئەو ئەشکەوتەی جوبرائیل[١٢٧] بۆ یەکەمین جار خۆی نیشان دا تا پێیڕابگەیەنێ، بۆتە پێغەمبەر و سروشی بۆ دابەزاند.
لەوێ ئەشکەوتێکی بچکۆلانە لە شاخەکەدا هەبوو، محەمەد خۆی تێدا حەشاردا، کاتێ لە نیوەی شەو دەبووایە لە مەککەوە بەرەو مەدینە هەڵبێ، چونکە دوژمنەکانی دەیانەویست هەر لەنێو نوێنی خۆیدا بیکوژن.

---

[١٢٦] Hera
[١٢٧] Djbraiel

ئەو ئەشـکەوتە و ئەو شـەوە ڕۆڵێکـی چارەنووسسـازانەی لە مێـژووی ئیسلامەتیدا گێڕا. ئیدی لەو شەوەوە، یان لەو ڕۆژەوە ساڵنامەی موسڵمانێتی ژمێردرا.

ئەشکەوتەکە دواتر ناوی مێژووینی ئەشکەوتی تەونە جاڵجاڵۆکەشی بەسەردا برا.

هەر جارێک محەمەد دەچووە نێو ئەو ئەشکەوتە، جاڵجاڵۆکەیەک پەیدا دەبوو، تەونێکی بەدەوری کونەکەیدا دەکرد، بۆئەوەی هیچ کەس، حەشاردراوەکەی نێـوی نەبینـێ. دادەکـانیش خۆیـان لەو ئەشـکەوتە ئـاخنیبوو. شـتەکەش واپێـدەچوو ئەسـتەم بـێ، بەڵام ئەوان وایـان کردبـوو، پۆلیسـیش لە پـاڵ تەرمەکانیان وەسیەتنامەکەیان دۆزیبۆوە.

چیرۆکەکەشـیان چیرۆکێکـی بـاوەڕنەکراو بـوو. ئەشـکەوتەکە، کە سـاڵانە بە ملیۆنان حاجی دەچنە سەر، بۆ کەسانی سـەردانکەر ڕێپێدراو نەبوو. ئەوان دەبوایە هەر لە دووەرەوە ئەشکەوتەکە ببینین.

خۆ ئەگەر چیرۆکەکە ڕاست بێ، هەردەبێ سەربردەیەکی ناوازەیان بەسـەردا هـاتبێ. ئاغاجـان شـڵەژا، لـێ لەهەمـان کاتیشـدا مێشـکی لە لای سـندوقە دارەمەیتەکانـدا هەر نەبـوو. ئـاخر ئەمـڕۆ دوای شـەش مانـگ، کـوڕەکەی دەگەڕێـتەوە مـاڵ. ئەو ئەمسـاڵ لە زانکـۆی ئیسـفەهان وەرگیرابـوو. ئەوەش یەکەمـین جـار بـوو، کـوڕەکەی ئەوەنـدە لە مـاڵ دوور بکەوێتەوە. ئەو لەوێ سروشتناسی(فیزیا)ی دەخوێند تاکو دواتر ببێتە ئەندازیارێکی بواری نەوت.

ئـاخر کانێکی گەورەی گـاز لە ژێررزەوی زەنجانـدا دۆزرابۆوە. کۆمپانیایەکی ئەمریکی خۆی بۆ هەڵکەندن و دەرهێنان ئامادەدەکرد، هەربۆیەشە ڕشتەیەکی نـوێی خوێنـدن سـەبارەت بەو بـوارە لە زانکـۆکەدا کرابـۆوە. بە سـەدان خوێنـدکار خۆیـان بـۆ خوێنـدنی ئەو هـۆبەیە نـاونووس کردبـوو، بەڵام هەر بەتەنیا دوازدە کەس وەرگیـران، ئەمەش دوای تـاقیکردنەوەیەکی زۆر قـورس. جەوادیـش یەکێـک بـوو لەو خوێنـدکارە سـەرکەوتووانە. ئەو خوێنـدکارە هەڵبژێـردراوانە بەجیـا لە لایەن ئەنـدازیارە ئەمریکیەکـان کۆلیژێکیـان بـۆ کرابۆوە. بەفەرمـی ئەوان خوێنـدکاری زانکـۆی ئیسـفەهان بـوون، بەڵام هەر زوو، دەبـوایە چـل کیلـۆمەتر لە دەرەوەی زەنجانـدا خوێندنەکەیان لە کێڵگەی

نەوتی شاهزەند[١٢٨] لەژێر سەرپەرشتی کۆمپانی نەوتی ئەمریکی درێژە پێبدەن. لەوێدا ئەوان جۆرە نشینگەیەکی ناوەخۆیان بۆ لیمانەوە دانابوو، کە دەبوایە بە زمانی ئینگلیزی دوابان.
خوێندنەکەش، جۆرە خوێندنێک بوو، کە لە دوای دەرچوونیاندا هەلی کاریان لەنزیک ماڵەوەیان مسۆگەر دەبوو. ئێ، لەوەش باشتر نەبوو، فەخری ساداتیش لە خۆشیان هەر خەوی لێنەدەکەوت و ئاغاجانیش کاتێ هەواڵی وەرگرتنی کوڕەکەی وەرگرت لە شانازییان باوەڕی نەدەکرد.
ئاغاجان هەموو شتێکی ڕێکخستبوو تا بەزووی لەگەڵ فەخری ساداتدا بەپیر کوڕەکەیان بچنە وێستگەی شەمەندەفەر.
- "باشە بۆچی ئەو سندووقە دارەمەیتانەت هێناوەتە ئێرە؟" ئاغاجان وای بە کابرای عارەبانچی گوت. "دەبوایە بیانبەیتە مزگەوتێ، دەبووایە بە تەلەفۆنێکیش ئاگادارت بکردباینەوە بەرلەوێ ڕاستەوخۆ بێیت. ئاخر کارێکی بەجێ نییە بەو درەنگەی دوای نیوەڕۆیە بەبێ ئاگادارکردنەوە بەخۆت و دوو سندووقی دارەمەیتەوە بێیتە بەردەرگا. باشە ئێستا من چی بکەم؟"
- "تکایە لێم مەگرە،" عارەبانچیەکەش وای پێگوتەوە، "خۆ من تەرمەکانم بۆ نەهێناویتەوە، بەڵکو دوو هەگبە."
- "هەگبە؟ چۆن دوو هەگبە؟" ئاغاجان بە هەراسانیەوە وەلامی دایەوە.
عارەبانچیەکە چووە سەر گالیسکەکەی وەستا و سەری یەکێ لە سندووکانی کردەوە و هەگبەیەکی لێدەرهێنا، پاشان سندووقەکەی دیکەی کردەوە و هەگبەکەی دیکەشی دەرهێنا. هەردوو هەگبەکانی بەرزکردنەوە و گوتی: "تەماشاکە! سعودیەکان تەنها ئەو دوو هەگبانەیان ناردۆتەوە. ئایا ئەمانەت دەوێنەوە یان بیانێرمەوە؟"
- "باشە بۆچی هەگبەکانت خستوونەتە نێو ئەو دوو سندووقە دارەمەیتە؟ بۆچی بۆ خۆت و گالیسکەیەکی دوو ئەسپییەوە بەو درەنگوەختە هاتووی؟"
- "من تەواو لە کاردانەوەت تێدەگەم، بەلام خۆمن هەر عەرەبانچییێکم."

---
[١٢٨] Shahzand

ئاغاجـان هەر زوو هەنـدێک پـوولی لە گیرفـانی دەرهێنـا و دایە کـابرای عەرەبانچی و هەگبەکانی لێوەرگرتنەوە، ئینجا گەڕایەوە ژوور و دەرگاکەشی پێوەدایەوە.

- "ئەرێ چی لەگۆڕێدایە؟" فەخری سادات لە نهۆمی سەرەوەی خانووەکە وای بانگی ئاغاجان کرد.

ئاغجانیش هەگبەکانی لە باخچەکە لە بن پەلکی کولەکە دانان و گوتی: "هیچ نییە، هیچ شتێکی وا نییە! تۆ ئامادەی؟ گوێت لێمە، دەبێ هەر ئێستا بڕۆین دەنا دوادەکەوین."



کاتێ ئاغاجان چووە پشت سوکانی ترومبێلە فۆردەکەی تا لەگەڵ ژنەکەی بگاتە وێستگەی هێڵی ئاسنینەکە، تۆپەڵە سوورە بە گڕەکەی ئاسمان خەریک بوو لە ئاسۆی بیابان ئاوادەبوو.

کـاتێ فەخـری سـادات چـاوی بە کـوڕەکەی کەوت، لە قەتـارەکە دابەزی لە بەختەوەرییان گریا. ئاخر ئەو هەمیشە کوڕە خۆشەویستەکەی دایکی بوو. شـەش مانـگ بەسـەر ئەو ڕۆژەدا تێـپەڕین کە ئەوانـی بەرەو ئیسـفەهان جێهێشت، پێش هەموو شەوێک بەر لە نووستنی ماچێکی لێدەکرد. بەڵام کە هەنووکە گەڕاوەتەوە، سمێڵەکەی ڕەش ببوو، پرچیشی زۆر هاتبوو.

فەخری سادات بە خۆی ئەو کوڕەی پەروەردەکردبوو. نەیدەویست کوڕەکەی زۆر متووی مزگەوت، بازاڕ و سیاسەت ببێ. خوازیار بوو ئازادانە پەروەردە ببێ، بۆئەوەی لە داهـاتوودا بە خۆی ڕێگای خۆی بکاتەوە. ئێستاش بەری بەرهەمـی بڕیـارەکەی دەدروێـتەوە. کـوڕەکەی بە شـێوەیەکی ڕەهـا هـیچ ڕەونەقـی کەسـێکی دینـداری نەدەدا، دایکەکە ئەوەی پێخـۆش بـوو، کە بینـی ڕۆڵەکەی هەندێ درێژتر بووە. ئەو هەنووکە زیاتر بە نوسرەتی مامی دەچێ لەوەی بە باوکی خۆی بچێ.

ئەو هەمــوو ســاڵانەی رابــرد، ئەو هــیچ خــۆی لە کاروبــاری مزگەوتــێ هەڵنەقورتاند، فەخری ساداتیش بەوە دڵشـاد بوو، کە ئاغاجـان شـاباڵ نەوەک جەوادی بـۆ ئەو مەبەسـتە، بـۆ جێگـرتنەوەی کاروبـاری مـزگەوت تەرخـان

کردبوو. دایکەکە نەیدەزانی کەوا ئاغاجان لە شابال بێهوا بووە و هەنووکە چاوی لەسەر کوڕەکەی خۆیەتی.

ئاغاجان تا ئێستا ئەو باسەی لەگەڵ فەخری ساداتدا نەهێنابووە گۆڕێ.

یەک دوو مانگ بەرلەئێستا، کاتێک شابال بۆ دواجار لەبازاڕ تەلەفۆنی بۆ ئاغاجان کرد، ڕاستەوخۆ زەنگی بۆ نووسینگەکەی لێنەدابوو. بەڵکو لە ڕێی کۆگاکەوە زەنگی بۆلێدابوو.

ئاغاجانیشیان ئاگادارکردەوە کەوا تەلەفۆنێکی بۆ کراوە.

- "ئەو کێ بوو؟"

- "بزنسمانێک لە تارانەوە."

- "بۆچی بەو ژمارە تەلەفۆنە زەنگی لێدا؟"

- "ئەو گوتی، چەند جارێک بە تەلەفۆنی نوسینگەکە هەوڵیداوە، بەڵام کەس هەڵی نەگرتبوو."

ئیدی ئاغاجان چووە کۆکاگە و دەستی دایە تەلەفۆنەکە.

- "ئاغاجان، تکایە لێم مەگرە کە سەغڵەتت دەکەم. دەترسم تەلەفۆنی خودی خۆت چاودێری لەسەر بێ. من بۆیە تەلەفۆنم کرد، گەر نەگەڕامەوە ماڵ پێویست ناکا، خەمم لێبخۆی. من هەنووکە بە یەک دوو ئیش خەریکم. هەر ویستم گوێم لەدەنگت بێ. تکایە سڵاوم بە هەمووان بگەیەنە."

- "سڵاوت دەگەیەنم، گەنجۆ، خوا بن باڵت بگرێ!"

شاباڵ پێویست نەبوو زۆری لەسەر بڕوا. ئاغاجانیش لێی تێگەیشت. بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو لەنەخشەیدا نەبوو ئەمە بە فەخری سادات بڵێ. ئاخر بۆ فەخری ئەمڕۆ ڕۆژی ئاهەنگئامێز بوو، نەیدەویست خۆشییەکەی لێتێک بدا.



شەوەکە شەوێکی خۆش بوو، هەمووان بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر مێزەکە مانەوە. گەر جاری جاران بووایە، زینەت خانم لەو بۆنانەدا هەقایەتی خۆش خۆشی دەگێڕانەوە، بەڵام خۆ ئەو لەوێ نەبوو.

ئاغاجان پێی نەدەزانی، کە زینەت لەگەڵ قومدا کەوتۆتە پەیوەندیکردن. زینەت ڕێنمایی بۆهاتبوو، ژنەکانی شارەکە لە ڕێی دەرسی قورئانەوە ڕێک بخا.

بۆئەوەی پارێزگاری لە دابونەریتەکەیان بکەن، مامەی بانگدەر دەستی بەقسان کرد و چیرۆکی یونس[١٢٩]ی لەبەر گێڕایەوە: "پێغەمبەر یونس بەیەکجاری ماڵی خۆی بە دڵشکاوی جێهێشت. شوێنکەوتوانیشی سەرسام و دڵ بەخەم بوون. یونس ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە سەر زێ، بینی گەشتیاران سواری بەلەمێکی گەورە دەبن، ئەویش بڕیاریدا لەگەڵیاندا بڕوا. سێ شەو و سێ ڕۆژ لەنێو بەلەمەکەدا بوون، لە ڕۆژی چوارەمدا لە پڕێکەوە تاریک داهات و پاشان ماسییەکی گەورە لەنێو زێ هاتەدەر و ڕێگای بە بەلەمەکە گرت. سەرنشینانی بەلەمەکە هیچ چارەیەکیان نەبوو، ئاخر ماسیەکە نەدەڕۆیشت و ڕێگەشی بەرنەدەدان. پاشان یەکێ لە گەڕیدە بەئەزموونەکان، کە پێشتر زۆی گەشتی دەریایی کردبوون، پێیگوتن: "دیارە یەکێ لەنێوماندا هەیە، گوناحێکی کردووە. ئێمە دەبێ ئەو بدەینە ماسییەکە، دەنا ماسییەکە لێمان ناگەڕێ ڕێگای خۆمان بگرینەبەر و بڕۆین."

- "ماسییەکە بۆ من هاتووە، ئێوە دەکرێ من فڕێ بدەنە نێو زێیەکە و ڕێگای خۆتان بگرن و بڕۆن." یونس بوو لەنێویاندا وای گوت.

- "ئێمە تۆ دەناسین،" یەکێ لە سەرنشینەکانی بەلەمەکە وای پێگوتەوە؛ "تۆ پیاوێکی سەرڕاستی، تۆ هەرگیز کارێکی بێخوداییت نەکردووە. هەروەها باوکیشت دەناسین، ئەویش پیاوێکی بەدینە، نەخێر تۆ ئەو کەسە نیت کە ماسییەکە داوای دەکا."

یونس، کە دەیزانی ماسییەکە بۆ ئەو هاتووە، گوتی: "ئاخر ئەوە شتێکە لەنێوان من و خودای خۆم. هەر بۆیەشە ماسیەکە لێرە ئامادەیە."

یونس هەڵساو هاتە سەر لێواری بەلەمەکە و خۆی هەڵدایە نێو ئاوەکە. ماسیەکەش بە یەک حەپ قووتی دا و لەنێو ئاوەکەدا ونبوو."



هەمووان دانیشتبوون بیریان لە چیرۆکەکە دەکردەوە، لەو کاتەدا دەنگێکی نامۆ لەنێو حەوشەوکەوە هات.

ئاغاجان گوێکانی قوڵاغ کردن.

- "ئەوە چییە؟ ئەو دەنگەی لەوێ دێ چییە؟" بانگدەرەکە وای پرسی.

---

[١٢٩] Yunus

ئاغاجان چووە دەرێ، بینی کە ئەو شەوە بە شێوەیەکی نائاسایی تاریکە.
- "گوێم لە ڕەوی زۆری زیندەوەری فڕۆکە." بانگدەرەکە وایگوت.
- "کوللە! ئاغاجان زۆر توند بانگی کرد. "دەی خێرا جامی پەنجەرەی هەموو ژوورەکان دابخەن!"
بەڵام تا ئەو وای گوت کارلەکار ترازابوو، بە هەزاران کوللە لەنێو ماڵەکەدا لەهەوادا دەسوڕانەوە، ئەو ناوەیان بۆر کردبوو، هەروەک ئەوەی باهۆزێکی لمین بێ لە بیابانەوە بەسەر ماڵەکەی هەڵکردبێ.
ژنەکان چارشێوەکانیان بەسەرسەر دادا و خێرا غاریاندایە ژوورەکان تا دەرگا و پەنجەرەکان دابخەن
مەلا ئەحمەدیش ڕایکردە حوجرەکەی و ئاغاجان یش غاریدایە ژێرزەمینەکە تا دەلاقەکان بگرێ.
کوللە بەو ناوە وەرببوون، لەسەر بان، لەسەر دارەکان، تەنانەت لەسەر حەوزەکەش هەموو شتێکیان راماڵی.



جارێکیان، کە ماوەیەکی گەلێک لەمێژە، کوللە لەدوورەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە لە شارێکی وەک شاری مەککەوە هاتبوون و بەسەر شارەکەدا کشابوون. دوای ئەوەی هەموو شتێکیان کەچەڵ کرد و ڕووتاندەوە، ئینجا بەرەو باخچە و ڕەزەکان و لەپشت چیاکانەوە ئاوابوون. بەڵام شەپۆلێکی کوللەی وا تائێستا کەس نەیبینیبوو، پیرەکان لەدایک و باوکی خۆیان سەربردەکەیان دەگێڕایەوە. لەنێو کتێبەکانی کتێبخانەکەدا، کتێبێک هەبوو، ئافاتی پەنجا ساڵەی ڕابردووی کوللەکانی تێدانووسرابوو: "کوللە بە ڕەوە هات، بە ملیۆنان دانە بوون. دنیایان تاریککرد. کوللەکان ئەوەندە گەورە بوون بە قەد قامکی دەست دەبوون، ڕەنگیشیان خاکی بوو، کاتێ لەسەر زەوی دەکەوتن، مرۆ نەیدەبینین، لێ کاتێ دەجوولان، وەک ئەوە وابوو هەموو زەویەکە بجوولێ. خەڵکەکە دەستیان دایە مەنجەڵ و قاپوقاچاخ و لێوەسەر بانان کەوتن، بە کەوچکەکان وەرگەڕانە بنی مەنجەڵەکان تا کوللەکان بترسێنن. بەڵام خۆئەوان هەر گوێشیان لێنەبوو. خەڵکەکە ئاگریان کردەوە، بە ئومێدبوون بە دووکەڵ راویان بنێن، بەڵام دووکەڵەکەش کاری تێنەکردن. ئیدی قورئانیان هێنان و

دەستیان بەخوێندنەوەی سورەتی سولەیمان[130] کرد[131]: "دۆڵەکە لە مێرووەکان ڕەش دەکرا، هەروەک ڕایەخێکی ڕەش بەسەر زەویەکەدا داکێشرابێ. مەلی خاتووسلێمانکە، تەتەری سولەیمان، بەسەر دۆڵەکەدا فڕی و بانگی کرد: ئەی مێرووەکان! ئەرێ ئێوە گوێتان لێنەبوو؟ ئەو پیاوەی تازە قسەتان لەگەڵدا کرد، سولەیمان بوو، ئەو بەزمانی زیندەوەران دەدوێ. ئەو بۆ لای شاژنی سەبەء بەڕێوەیە. ئایا ئێوە گوێتان لە شۆخوشەنگی سەبەء نەبووە؟ دەی ڕێگاکە بەردەن. ڕێگاکە چۆڵ کەن! لێگەڕێن با لەشکرەکە تێپەڕێ! ئاخر شتەکە پەیوەندی بە سولەیمانەوە هەیە! شتەکە دەربارەی

---

[130] Soleiman

[131] لە قورئاندا نە سورەتێک بە ناوی سولەیمان هەیە نە ئایەتی لەو جۆرەش. چیرۆکی سولەیمان و مێروستان و خاتووسلێمانکە و شاژنی سەبەئیش بە شێوەیەکی دیکەیە، لە قورئاندا و لە سورەتی (النمل)دا ئەم ئایەتانەی بۆ تەرخان کراوە: {وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ وَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنْطِقَ الطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ (١٦) وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ (١٧) حَتَّى إِذَا أَتَوْا عَلَى وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (١٨) فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِنْ قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ (١٩) وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ الْغَائِبِينَ (٢٠) لَأُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَذْبَحَنَّهُ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ (٢١) فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطْتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِنْ سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ (٢٢) إِنِّي وَجَدْتُ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ (٢٣)...} دەقی وەرگێڕانەکەش بە گوێرەی وەرگێڕانەکەی مام هەژار بەم جۆرەیە: (١٦- لەپاش داود، سولەیمان بوو بەجێنشین. بانگەوازی کرد: خەڵکینە! ئێمە فێری زمانی مەلان کراوین؛ هەموو شتێکیان پێداوین؛ دیارە ئەمەش چاکەیەکی ئاشکرایە. ١٧- سوپای سولەیمان تێکەڵاو لە جندۆکە و مرۆ و مەلان، دەنگدرابوون، هەموو بەڕێز دەڕۆیشتن. ١٨- تاگەینە بوهلی مێرووان، مرۆچەیەک دەنگی مێرووەکانی دا: بچنەوە ناو کونەکانوو! تا سولەیمان و لەشکری، بەبێ ئەوەی پێبحەسێن، دەبەر پێیانوودا نەبەن. ١٩- ئیتر کە ئەو ئەمانەی گوت، بزەی هاتێ. گوتی: ئەی پەرورندەی من! وام رابێنە سوپاسی چاکەی تۆ بکەم کە دەربارەی من و داکت و بابمت کرد؛ ئاکاری چاکی واشم بێ، پەسندی کەی، هەر لە بەزەیی خۆشتەوە بمخە ریزی عەبدە چاکەکارەکانتەوە. ٢٠- چاوی بە مەلاندا گێڕا، گوتی: چۆنە پەپوو سلێمانە نابینم، ئاخۆ خۆی دزیوەتەوە؟ ٢١- لەسەر ئەمە ئەشێ سزای زۆری بدەم؛ یان ملی هەڵدەقرتێنم، یان بەڵگەیەکی ئاشکرا بۆ من بێنێ. ٢٢- ماویی زۆری نەخایاند، هات و وتی: من شتێکم دەس کەوتووە کە دەستە تۆ نەکەوتبوو؛ وا من لە سەباوە هاتووم، دەنگو باسێکی دروستم بۆ هێناوی. ٢٣- من لەوێ ژنێکم دیوە پاشایە بەسەریانەوە و خاوەنی هەموو شتێکە و تەختێکی زۆر گەورەی هەیە....) وەرگێڕ.

شۆخوشەنگی شاژنی سەبەئەوەیە! شتێکی گەورە ڕوودەدا. دەی لەسەر ڕێگاکە لاکەون.

سەرەتا هیچ ڕوویەنەدا، بەڵام کاتێ ئاپۆرەی ڕەوە مێرووەکە جووڵا، لەنێو کونەکانی دۆڵەکەدا بزربوون.



پاش ئەوەی دنیا ڕووناک بووەوە، کوولەکان کشانەوە و بە ئاراستەی شاخەکان هەڵفڕین. کوللە لە دارودرەختی باخچەکەی دا، هەمووی ڕووت کردبووەوە و ئێسکەکانی ماسییەکان بە سەر حەوزەکەوە بوو. دادەکان ئەوانیان لەگەڵ خۆیان هێنان.

هەموو شتێک نیشانەی ئەوەی لێدەفامایەوە، کە شتێکی شووم ڕوودەدا، ئاغاجان لە پشت جامی پەنجەرەکەوە لە گڤ هزران ڕاچووبوو، تەماشای ناو حەوشەکەی دەکرد، خۆ کوللە لە خۆڕاوە نەهاتووە.

ئیدی دەستێکی بۆ گیرفانەکەی برد و قوڕئانەکەی دەرهێنا.

## زەمەن[132]

**وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا (١)**
**وَالْقَمَرِ إِذَا تَلاهَا (٢)**
**وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا (٣)**
**وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا (٤)**
**وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا (٥) -سورة الشمس-**
**{ سوێند بەخۆر و تیشکی،**
**بەم هەیڤەش کە بەدوویدا دێ،**
**سوند بەو ڕۆژەش کە تیفتیفەی هەتاو دەدا،**
**بەو شەوەیش کە دایدەپۆشێ،**
**بەو عاسمانە و بەوەی ئەوی وەدی هێنا...}**

بانگدەرەکە لەنێو نوێنەکەی خۆی هەر ئەو سورەتەی دەخوێندەوە.

[132] نوسەر ئەم ناونیشانەی هەر بەو شێوەیە بە تیپ و ڕێنووسی هۆڵەندی Zaman نووسیوە.



لەوەتەی کوللەکان هاتبوون، حەفت ڕۆژ تێپەڕیبوو. بەڵام هێشتا یارۆی بانگدەر لە ناو پێخەفەکەی خۆی لە ژوورەکەیدا نەهاتبووە دەر.

- "ئەرێ هۆ مامەی بانگدەر، باشە بۆچی خۆت لە ژوورەکەتدا ئاخنیوە؟" ئاغاجان لە پشت قاپیەکەوە وای لێپرسی. "بۆچی نایەیتە دەر؟"

- "زات ناکەم."

- "چۆن زات ناکەی؟ باشە لەچی دەترسی؟ چی قەوماوە؟" ئاغاجان وای وەڵامدایەوە و بە هێواشیش دەرگای ژوورەکەی کردەوە.

- "کاتژمێری نێو سەرم وەستاوە. من چیدیکە نازانم ئاخۆ سەعات چەندە."

- "مامەی بانگدەر، دیارە تۆ ماندوو و هیلاکی." ئاغاجان وای پێگوتەوە؛ "ئەمەش هەمووی لەبن سەری ئەو گۆزە دروستکرنەوەیە، ئاخر هەنووکە بەرهەمەکانت پێ ساغ ناکرێنەوە."

- "نەخێر، شتەکە بەهۆی گۆزەکانەوە نییە، بەڵکو بەهۆی کوللەکانەوەیە. کاتێک ئەوان هاتن ئیدی چکچکەی کاتژمێرەکەی منیش وەستا. ئێستا چیدی ناوێرم بێمەدەر، خۆ ئەگەر خەڵک پرسیاری زەمەنیان لێکردم، من دەتۆقم."



ئەو دوکاندارەی دەستکردەکانی یارۆی بانگدەری دەفرۆشت، گرێبەستەکەی لەگەڵ بانگدەرەکە هەڵوەشاندەوە. ئاخر ئەوەندە شتی پلاستیکی هەرزان هاتبووە بازاڕ، کەس هەر سەیری ئیشە دەستییەکانی یارۆی بانگدەری نەدەکرد. لێ کابرای بانگدەر نەیدەتوانی لە دروستکردنی شتەکانی خۆی بوەستێ، ئەو بێ وچان دەفر و سوراحی و گوڵدان و کوندەی ئاوی دروست دەکردن و دەیئاخنینە ژێرزەمینەکە. کاتێکیش هیچ جێگا لە ژێرزەمینەکە نەمایەوە، شتەکانی لە باخچەکە لەنێوان گوڵ و ڕوەکەکان دانان، کاتێکیش ئەوێ پڕبوو، بە یارمەتی مارمیلکە شتەکانی بردنە سەربان و لەسەر بانی مزگەوتێ جێی کارە دەستیەکانی خۆی کردنەوە.



یارۆی بانگدەر هێشتا سێ ڕۆژی دیکە لەناو نوێنەکەیدا مایەوە. لە دەیەمین ڕۆژدا لەپڕێکەوە سەعاتەکەی خۆی بەگەڕ کەوتەوە.

"سەعات دوازدە و سێ خولەکە." بانگدەرەکە لەبەر خۆیەوە بردەبردێکی لێوەهات، بە دڵخۆشیەوە هەڵسا و قیت لەسەر پێخەفەکەی دانیشت.
بانگدەرەکە گوێی قوڵاغکردن، هەندێ دەنگەدەنگی لە دەرگای دەرەوە بەرگوێ کەوت. پاشان دەنگی پێ هاتە نێو حەوشەکە بەرەو ژووری کاری ئاغاجان ڕۆیشت.
"شاباڵ!" دەستبەجێ ناسی کێیە.
لە کۆتاییدا هاتەوە، ویستی بانگی بکا، کەچی واشینەکرد. ئاخر دەیزانی لەخۆڕا نییە شاباڵ بەو درەنگ وەختە دەچێتە ژوورەکەی ئاغاجان. پێویستە ئەو جارێ چاوەڕێ بێ. خۆ زۆر نابا دێتە لای ئەویش.

کاتێک ئاغاجان لە درزی دەرگای خۆیەوە شاباڵی بینی وەستابوو، یەکسەر وای بیرکردوە: ئەو گۆڕاوە.
شوێنەواری ئەو گەنجەی لە ماڵەکەدا دەژیا، لەسەر ڕووخساری نەمابوو، هەنووکە پیاوێکی نوێ لەوێ وەستاوە.
لە کۆتاییدا ئاغاجان لەبەری هەڵسا و بەپیرییەوە چوو، لەباوەشی گرت، کورسییێکی لە تەنیشت خۆی بۆ دانا و فەرمووی لێکرد دابنیشێ. "ئەرێ کورەکەم چۆنی، تۆ ئێمەت لەبیرکردبوو، من عەیامێکە هیچم لەبارەوە نەبیستووی."
"ئاغاجان، ئەمە خۆی چیرۆکێکی درێژە، بەڵام لەکورتی دەیبڕێنمەوە: من بەختەوەرەم و بارودۆخیشم باشە."
ئاغاجان تێگەیشت، پێویست ناکا زیاتر لێبپرسێ، هەر بۆیە گوتی: "زۆر باشە، ئەمەش هەموو ئەو شتە داخوازە بوو، کە دەمویست بیزانم." ئەو بێدەنگ بوو، بواری دایە شاباڵ بە خۆی بکەوێتە سەر قسە.
- "ئەم ڕۆژانە زانکۆکان پشێویان تێدایە،" شاباڵ دەستبەجێ وای دەست بەقسەکردن کرد؛ "ئەمڕۆ جێگری سەرۆکی ئەمریکا بەسەردان هاتە تاران. خوێندکارەکانیش ڕێگای فرۆکەخانە بۆ کۆشکی شایان داخست، بەڵام بە دەستێکی توند لێیاندرایەوە و هێزێکی تایبەتی دژە ئاژاوە، خوێندکارەکانی ڕاونا. خوێندکارەکان دیسان خۆیان ڕێکخستەوە و بەسەر باڵوێزخانەی

ئەمریکایان دادا، لەوێدا هێزی ئاسایش و خوێندکاران ڕووبەڕووی یەکدی بوونەوە، شەڕی دەستەویەخە قەوما، چەند بۆمبێکی مۆلۆتۆڤ فڕێدرایە پەنجەرەکانی سویتی پێشەوەی باڵوێزخانەکە و ئاگریان تێبەردا. ئیدی دەمودەست هەلیکۆپتەرێک هەڵفڕی و لەسەر بانی باڵوێزخانەکە تەقەی لە خۆپیشاندەران کرد، هەرلەوێ دوو خوێندکار پێکران و کوژران و چەندانی دیکەش برینداركران. هەنووکەش پۆلیس هەموو کونوقوژبنێک بەدوای خوێندکارە خۆپیشاندەرەکاندا دەگەڕێ. خوێندکارەکانیش، هەر هەموویان هەڵاتن. منیش هەڵاتم. دەمەوێ بۆچەند ڕۆژێک لە مزگەوتێ خۆم بشارمەوە تا ئەوکاتەی دۆخەکە ئارام دەبێتەوە، هەڵبەت ئەگەر ئێوە هیچ لاریتان لەسەر نەبێ."

- "لاریبوون لەچی؟" ئاغاجان لە کاردانەوەیدا گوتی، "تۆ عاقڵیت کردووە، کە گەڕاویتەوە ماڵ،. تۆ لێرە لە هەموو شوێنێک سەلامەتتری. لێرە باشتر دەتوانم یارمەتیت بدەم لەوەی لە تاران بیت."

- "سوپاست دەکەم."

- "لە سەر چی؟"

- "ئاخر من ماڵەکەم جێهێشت، بەڵام کاتێک هەست بە نائارامی بکەم، ئەوا یەکسەر بیر لە تۆ دەکەمەوە. ئەم ماڵە هەمیشە بەندەرێکی ئارام بووە بۆ من. سوپاس بۆ ئەو هەستە بە هێزەی کە بەمنت بەخشی. من سوپاست دەکەم کە پەروەردەت کردووم. کاتێ هەر لە ماڵەوە بووم، من باش نەمدەزانی، کە کێم. بەڵام ئێستا تەواو لێی حاڵیبووم، تۆ منت کردۆتە پیاوێکی بەهێز."

ئاغاجان کەوتبووە ژێر پەسننامەی شابال.

- "تۆ بە ڕاستی بوویتە پیاوێکی ژیر و فامدار[١٣٣]. دەکرێ تۆ هەستەکانت هەڵبڕێژی." ئاغاجان وای وەڵامدایەوە.

- "هێشتا شتێکی دیکە ماوە دەمەوێ پێتی بڵێم،" شابال وای دەست بەقسان کردەوە؛ "من بە قەتار لە وێستگەی قومەوەڕا هاتم، لەوێ دیمەنێکی نەناسراوم بەرچاوکەوت. سەد دوو سەد مەلای گەنج ڕێگای وێستگەکەیان گرتبوو، ئەوان لەبەردەم قەتارەکان وەستابوون، لێنەدەگەڕان زیاتر بڕۆن.

---

[١٣٣] فامدار: تێگەیشتوو، عاقڵ.

هەر هاواریشیان دەکرد : 'لا اله الا ألله! (له ئەڵلا بەدەر هیچ خوایەکی دیکه نییه).'

- هەرگیز پێشتر خۆپیشاندانی وا بە شکوم نەبینیوه. هێزێکی دیار لەدەنگی خۆپیشاندەرەکاندا هەبوو. ئەوەی له قوم بینیم، شێوازه بەرگرییێکی نوێ بوو، پێدەچێ ئایەتوڵڵاکان تاکتیکەکەی خۆیان گۆڕیبێ. ئەو مەلایانه، که پێشتر تخونی قەتارەکان نەدەکەوتن، هەنووکه لەسەر هێڵی هێڵه ئاسنینەکان بەریان پێدەگرن. مەلایەکی گەنجیش هەروەک پشیلەیەک بازی دایه سەر دیواری هۆڵی وێستگەکه و وێنەیەکی خومەینی لەسەر پۆرترێتێکی لەچوارچێوەگیراوی شا دا. ئەمەش ئەزموونێکی سەرنجراکێش بوو. پێدەچێ شتێکی گەوره بقەومێ؛ باشه تۆ ئاگات له قوم هەیه؟'

- ئەمه پرسیارێکی چاوەڕوان نەکراوبوو. نەخێر، ئەو لەو چەند ساڵانەی دواییدا هیچ پەیوەندییێکی به قوم و به ئایەتوڵڵاکان نەمابوو. ئێستاش که شاباڵ وای پێدەڵێ، هەستێکی وای لاپەیدابوو، که ئەو قەتارەی ئایەتوڵڵاکانی تێدابوو له وێستگەکه تێپەڕی، ئەوی بازدا و قەتارەکەی له دەست دەرچوو.



نیوەی شەو، ڕێک سەعات یەک سێزده خولەکی دەویست، که یارزی بانگدەرەکه له داڵانەکه گوێی له تەپەتی پێ بوو. بانگدەرەکه تەپەی پێیەکانی ناسینەوه، بەڵام خۆ نەدەکرا بیڵێ. ئەو گوێی لێبوو، کەسێک کلیلی له کیلۆنی دەرگاکه وەردەدا. له کۆتاییدا به پێی پەتی بەهێواشی خۆی گەیاندە ژوورەکەی ئاغاجان و به سرتەیەکەوه پێیگوت: 'گوێم له کەسێک بوو له داڵانەکەدا بوو. دیاره یەکێک لەبەر دەرگایه!'

'یەکسەر بڕۆ لێ وەسەر منارەکه کەوه!' ئاغاجان دەستبەجێ وای بەشاباڵ گوت.

شاباڵ بەخێرایی باوکی ماچکرد و لێوەسەر بانەکه کەوت، به تانییێکی له پەناگەکه دەستدایه دەلاقەی منارەی لای چەپی کردەوه به هێواشیش قاپیەکەی داخستەوه.

ئاغاجان مارمیلکەی بەسەرلێشێواوی و به جلی تەڕەوه لەنێوەڕاستی حەوشەکەدا بینی.

- "دەی لێرە مەمێنەوە! برۆ سەرەوە." بەچرپەوە وای پێگوت.
ئینجا بە دانبەخۆداگرتنەوە، دەرگای سەرەکی دەرەوەی کردەوە.
پیاوێکی چاویلکە لەچاو، کە شەپقەیەکی لەسەر بوو، کلیلێکیشی بە دەستەوە بوو، لەبەردەرگا وەستابوو. ئاغاجان ئەوەی جارێک لە شوێنێک بینیبوو، بەڵام بیری نەکەوتەوە لە کوێ.
- "پێموابێ ئێمە یەکدی دەناسین، بەڵام بەو تاریکییە چاوەکانم باش نابینن." ئاغاجان وای بە پیاوەکەی بەردەرگا گوت؛ "ئەرێ هیچ یارمەتییەکت پێویستە؟"
پیاوەکەش شەپقەکەی داگرت، ئینجا ئاغاجان پیاوەکەی ناسییەوە، بەڵام خۆ کاتێکی دەویست تا هەمووشتێک رێک بێتەوە. پیاوەکە خالخالی باوکی مارمیلکە بوو. ئەو بە ڕووخسار پیر دیاربوو.
- "سەلامون عەلەیکوم." خالخالی وای بە خانەخوێکە گوت.
ئاغاجان نەیدەزانی چۆن وەڵامی بداتەوە. ئاخر خالخالی ژیانی سەدیقەی تاڵ کردبوو، دووگیانی کردبوو، منداڵێکی کەم ئەندامی لە دوای خۆی بەجێ هێشتبوو، چووبووە عێراق تا لەگەڵ خومەینیدا بێ. ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵانە لەبەر دەرکەی ماڵی مزگەوتێ وەستاوەتەوە.
- "چیم بۆتۆ پێدەکرێ؟" ئاغاجان بە بەساردییەکەوە وای پێگوت، لە کاتێکدا دەرگای لە دوای خۆی پێوەدا.
- "من لەگەشتێکدابووم بەنێو وڵات، تا پەیامەکەی ئیمام خومەینی بگەیەنم. ئەمڕۆش لە زەنجان بووم، لەگەڵ دەستەیەک لە دوکاندار و بازرگانەکانی بازاڕ کۆبوونەوەم هەبوو، پێموابوو تۆش لە کۆبوونەوەکەدا ئامادە دەبی، بەڵام مایەی سەرسامیم بوو، لەوێ نەمبینی. من دەبێ هەر ئەمشەو بڕۆمەوە عێراق، بەڵام داوایەکم لێت هەیە. دەکرێ هەندێ قسە لەگەڵ ژنەکەمدا بکەم؟"
- "ئەو بە شێوەیەکی قانوونی چیدیکە ژنی تۆ نییە. خۆ ئەگەر پیاوێک ژنەکەی بۆ ئەو ماوە دوورودرێژە بەبێ هیچ پەیوەندی پێوەکردن جێبێڵێ، ئەوا مارەکردنەکە هەڵدەوەشێتەوە. خۆ دەبوایە باشتر بتزانیبوایە. کەواتە تۆ هیچ مافێکت نییە بیبینی."
- "من ئەوە دەزانم، بەڵام دەڵێم بەڵکو ئەو بیەوێ ببینم."
- "من لێرە بڕیاردەرم! ئەو نایەوێ بتبینێ!" ئاغاجان وا وەڵامی دایەوە.

- "بەڵام خۆ من کوڕێکم لە سەدیقە هەیە، مافی خۆمە ببینم."
- "ئەمەیان ڕاستە، بەڵام واباشترە بەیەکجاری بگەڕێیتەوە و چاوپۆشی لەو دیدارەش بکەی." ئاغاجان بە نۆتە دەنگێکی ئارامتر قسەکەی پێگوت.
- "ڕاستیت دەوێ، لە نەخشەمدا نەبوو سەربدەم، من لەنێو ترومبێلەکەدا بووم، بڕۆم، بەڵام نەمتوانی شارەکە جێبێڵم، دەمەویست بتبینم. من لە تووڕەییەکەت تێدەگەم، لێ خۆ تۆ پیاوێکی بە ئەزموونی، شتەکە سیاسەتە، ڕژێمی ئەمریکایە، تۆ دەبێ بەشێکی جەستەت، ژن و منداڵی خۆشت لەپێناو سەراونخونکردنی ڕژێمدا دابنێی، دەنا سوودی نابێ. ئاخر هیچ دەرەتانی دیکە نەمابۆوە. ئەمە هەمووی بە یەکەوە بەندە."
- "من ئەو کاتەم نییە لەو نیوە شەوەدا گوێ لەو شتە قۆڕ و بێ مانایانەت بگرم!" ئاغاجان وای پێگوتەوە. بە دەستیش ئاماژەی بۆ ڕێگای ڕۆیشت بۆکرد.
خالخالی نیگایەکی تووڕەیی لە ئاغاجان بڕی، لەپشت چاویلکەکەیەوە پێیگوتەوە: "چۆنت دەوێ با وابێ، وا من دەڕۆم. بەڵام خۆ یەکدی هەر دەبینینەوە!"
ئیدی لێیدا و ڕۆیشت.



ئاغاجان لەناو جێدا ئەو دیدارە چاوەڕوانکراوەی گێڕایەوە. ئەوان لەو بارەیەوە هەندێ قسەیان کردن، بەڵام ئەوەندە ماندوو شەکەت بوون، نەیانتوانی زۆری لەسەر بڕۆن.
بۆ شەوی پاشتر فەخری لە دەرگای ژووری کاری ئاغاجانی دا: "دەمەوێ قسەت لەگەڵدا بکەم!"
"فەرموو وەرە ژوور!" ئاغاجان بە هەندێ سەرسوڕمانەوە وایپێگوت.
فەخری چوو لە نێوەڕاستی ژوورەکە وەستا: "پێموابێ زینەت پەیوەندی بە خالخالییەوە هەیە و ئەویش هەر بە پەسەندنامەی زینەتەوە هاتۆتە بەر دەرگا و ویستوویەتی تۆ ببینێ."
- "چی؟ تۆ باسی چی دەکەی؟ چۆن ئەوەت زانی؟" ئاغاجان بە ئەوقمانەوە وای لێپرسی.

- "گومانم لە هاوکاری نێوانیان هەیە. پێموایە خالخالی پەیوەندی زینەتی لەگەڵ قوم گرێداوە. زینەت بۆنی دەسەڵاتی هەڵمژیوە. ئەرێ سەرنجت نەداوە کە چیدیکە ناگەڕێتەوە مزگەوتی خۆی؟ تۆ دەبێ چاوێکت لەسەر بێ، من متمانەم پێنەماوە. ئەو کاری سەیرو سەمەرە دەکا."

ئەوەی فەخری سادات بە مێردەکەی ڕاگەیاند، دەکرا هەمووی ڕاست بێ، بەڵام بۆچی ئاغاجان بە خۆی بیری بۆ نەچووبوو؟

- "من پێویستە شتێکت پێبڵێم کە لەڕاستیدا نەدەبوایە بیڵێم، بەڵام لەبەر ئەوەی کار بەم ڕادەیە گەیشتووە، پێویستە تۆش بیزانی. خالخالی پێشتر سەدیقەشی بینیوە. پێموایە دیدارەکەشیان زیاتر لە چاوپێکەوتنێکی ئاساییانە بووە. سەدیقەت نەبینیوە لەو ناوە داویەتە بازبازێنێ."

- "چی؟ ئەم شتە نابێ! ئەوە هەر قسەوباسی ژنانەیە."

- "ئەوە هەر قسەوباسی ژنانە نییە. تۆ ئەو هەموو گۆڕانکارییە وردانەی نێو بازاڕ دەبینی، کەچی ئەو گۆڕانکارییانەی نێو ماڵی خۆت نابینی؟ بە خۆم نییە هەر کاتێ گوێم لەتەپەی پێی زینەت دەبێ بێتە ژوور، یەکسەر چارشێو بەخۆم دادەدەمەوە. من لە حزووری زینەتدا زات ناکەم، خۆشم دەرخەم، هەروەک ئەوەی پیاوێکی غەریبە لە ماڵەکەدا بێ و سەیرم بکا. من نازانم ئەو چی دەکا، ناشزانم پەیوەندی لەگەڵ کێدا هەیە. بەڵام شێوازی نیگاو سەیرکردنی گۆڕاوە. لە کاتی خڕبوونەوەی ژنانی خۆشماندا هەر هەمان هەستم هەیە. کەس ناوێرێ لە ڕووی ئەودا شتێک بڵێ. پێشتر زۆر چێژم لەو دانیشتنانەدا وەردەگرت، لێ هەنووکە چەند ژنێکی چەپەڵ دێن و هەر باسی شەریعەت دەکەن. زینەتیش ڕابەرایەتییان دەکا."

ئاغاجان بە قووڵی کەوتە نێو کورسییەکەی.

لەو ساتەدا لە دەرگا درا.

- "ئەوە کێیە؟"

- "سینەماکە ئاگری تێبەربووە." دەنگی قودسی بوو لەپشت قاپییەوەکەوە هات.

- "باشە بەم شەوە درەنگە تۆ لێرە چیدەکەی؟" ئاغاجان وایپێگوت.

لە دواییدا ئاغاجان هەڵساو بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت.

بارســتایی دوکەڵێکــی ئەســتووری لەســەر ناوەڕاســتی شــارەکە بینــی، ترومبێلکانی ئاگرکوژێنەوەش هەر زیڕوهۆڕی هۆڕنیان بوو، بەرەو شوێنی ئاگرەکە دەچوون.
خالخالی! ئاغاجان لەبەر خۆیەوە وایگوت، بەڵام هیچیشی بە فەخری نەگوت، ئیدی خۆی گۆڕی چووە دەرەوە، بەرەو مەڵبەندی شارەکە ڕۆیشت.
لە هەمــوولایەک هەر ترومبێلــی پــۆلیس، ترومبێلــی فریادڕەســی بــوون بریندارەکانیان بۆ نەخۆشخانە دەگواستنەوە. دیاربوو بۆمبێک لەنێو سینەماکە تەقێندرابووەوە، سێ کوژراو و بە سەدان برینداریش هەبوون.



هەفـــتەیەک دوای ئەوە، بـــۆمبێکی دیـــکە لە ســـینەمایەکی ئیســـفەهان تەقێندرابووەوە، لەوێش کوژراو و برینداری لێکەوتبوونەوە، بەڵام ڕژێم هیچ لێــدوانی لەســە ڕووداوەکــان نەدا و لە ڕۆژنامەکانیشــدا هیچیــان لەســەر نەنووسرا.
کاتێکیش فیلمێکی سینەمایی ئەمریکی پەخشی یەکەمی خۆی دەکرد، سینەما گەورەکەی باشــووری ئابــادان بە هــۆی بــۆمبێکی گەورەوە تەقیــیەوە. ڕووداوەکەش دوای چــل ڕۆژ بەســەر ڕووداوی تەقیــنەوەی ســینەماکەی ئیسفەهانەوە هات. لە ئاباداندا چوارسەد و حەفتا و شەش کەس کوژران و ژمارەیەکی زۆرتریش بریندارببوون.
ئیدی هەواڵەکە گەیشتە سەر لاپەڕەی هەموو ڕۆژنامەکانی دنیا.
(شا)ش گوێی لە تەپەی پێی خومەینی بوو، بەڵام واشی دانەنابوو لەماوەکی وا کورتــدا ســەرجەم بــازاڕ و مزگەوتەکــان لە دژی ئەودا یەکبگــرن. ئەو ڕووداوەکانی بە مایەی خەمخواردن دادەنان، بەڵام لەو شیکارییانەی کەلە کاربەدەستەکانی خۆیەوە پێیدران، لە هیچ شوێنێک ئەو تێبینی وانەدرابوو، کە ئەگەری ڕاپەڕینی گەل لەئارادابێ. شا گوێی لە هیچ نەدەبوو تەنیا لە نیشانە و دەربڕینی ڕەزامەندی و پێزانینی گەلەکەی نەبێ. وڵاتە ڕۆژئاواییەکانیش هەموو متمانەیەکیان بە شا هەبوو. ئەویش هیچ هۆکارێکی وای نەبوو لەو ناڕەزایەتیانە بترسێ.

بەڵام خۆ چاوی جیهان هەمووی لەسەر عێراق بوو، ئاخر خومەینی ماوەی ژیانی تاراوگەیی خۆی لەوێ بەسەردەبرد.
لە کاتی نوێژی هەینیدا بەشی فارسی ڕادیۆی بی بی سی ئەم پەیامەی خومەینی پەخشکرد: "ئێمە ئەو شتەمان نەکردووە. ئێمە ئەو تاوانانە ناکەین! خەتایەکە هەمووی لە ئەستۆی دەزگای هەواڵگری نهێنییدایە."
ئەمەش بووە پەخشێکی مێژوویی، ئاخر ئەمە یەکەمین جاربوو کە ئیمامێک، ئایەتوڵڵایەک، پەیامی خۆی بەهۆی ڕادیۆوە بگەیەنێ. دەنگەکەی دەنگێکی پیرانە بوو، بەڵام لە هەموو کاتێک بەرگەگرتر بوو. ئەو وشەی "شا"ی بەسەر زاردا نەهات، بەڵکو بەناوی دووەمیەوە ناوی دەهێنا، بەناوی ڕەزا[134]وە و هەر بۆ بچووک کردنەوە وایدەگوت: "ئەو ڕەزایە قسەی توند دەکا، لێیگەڕێن با هەر بۆخۆی بڵێ. ئەو لە نوکەرێک زیاتر، هیچی دی نییە! من دێم و گوێی ڕادەکێشم. من دایدەڕسێنمێ[135]، ئەو هیچ نرخێکی نییە. من دادەڕسێنمە ئەمریکاش!"
ڕادیۆی بی بی سی ڕایگەیاند، هەفتەی داهاتوو لە تاران خۆپیشاندان ساز دەدرێ. هەواڵەکەش وەک بۆمبێکی گەورە تەقییەوە.
شاش لەوە تێنەدەگەیشت، ئاخۆ بۆچی خەڵک خۆپیشاندان دەکەن. هەروەها ئەوەشی نەدەبینی کاتێک ئاڵۆزی و پشێوی بکەوێتەوە و پۆلیس و دەزگای نهێنی هەواڵگری بە توندی وڵاتەکە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، چی دەقەومێ.



لەو ڕۆژە هەینییە شومەدا، بە هەزاران دوکانداری بازاڕی تاران ڕژانە سەر گۆڕەپانی مەجلیس[136]، کە تەلاری پەرلەمانی لێبوو. هەزارانی دیکەش لە ڕێی شەقامە لاوەکیەکانی گۆڕەپانەکەوە چوونە پاڵیان، ئەوانەش ئەو خەڵکە بوون، کە لە نوێژی هەینیدا گەڕابوونەوە.

---

[134] Reza
[135] داڕسان: ناڵنگار، (تحدی).
[136] Madjles

کاتێکیش گۆڕەپانەکە پڕی خەڵک بوو، ئەو حەشاماتە مرۆییە جووڵا و بەرەو گۆڕەپانی شا کشا. یەکەمین ڕیزی خۆپیشاندەران لە مەلایە گەنجەکان پێکهاتبوو، لە پێشیشیاندا تاکە ئایەتوڵلایەکی گەنج بە خۆی و جلە مەلایەتییە سەرنجڕاکێشە کەشخەکەیەوە، کە پێشتر کەس نەیبینیبوو، دەڕۆیشت.

لە باری ئاساییدا، مەلا تەقلیدییەکان هیچ بایەخێکیان بە ڕووخساری دەرەکی خۆیان نەدەدا، بەڵام ڕوونوئاشکرا ئەم ئایەتوڵڵایە شتێکی دیکە بوو. ئەو بە پشتڕاستی و بەقیتی دەڕۆیشت، ڕیشەکەشی بە جوانی قەڵەم کرابوو، کراسە سپییەکەشی بە ڕێکی لە ئوتودرابوو، نەعلە زەردەکەشی سەرنجی هەمووانی بۆ خۆی کێشکرد.

ئەو کەسێکی نەناسراو بوو، کەس پێشتر نەیبینیبوو. هەفتەی ڕابردوو ئەو لەبن دەمامکی کابرایەکی بازرگانەوە بە قات و شەپقەیەکی ئینگلیزی کەشخەوە لە عێراق و لە ڕێی فڕۆکەخانەی (دوبەی)ەوە گەیشتبووە وڵات.

ئەم خۆپیشاندانە تاقیکردنەوەیە یەکسەر بەسەرکەوتویی کۆتاییهات. ڕادیۆی بی بی سیش ڕایگەیاند، بە سەدان هەزار لە خەڵکی دژی شا خۆیان نیشاندا و ڕژانە سەر شەقامەکانی تاران، ئەمەش ڕوونوئاشکرابوو، جڵەوی ڕەوشەکە کەوتۆتە دەست نەوەیەکی نوێ لە مەلایەکان.

وێنەیەکی ئەو ئایەتوڵڵا سەرنجڕاکێشە کەوتە سەر لاپەڕەی یەکەمی هەموو ڕۆژنامەکان.

"ئەرێ ئەم پیاوە کێیە؟" ئەمە سەرهێڵی "کەیهان"[١٣٧] بەناوبانگترین ڕۆژنامەی وڵات بوو.



پیاوەکە ناوی ئایەتوڵڵا بەهەشتی[١٣٨] بوو. تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵ و لەدایکبووی ئیسفەهان بوو. ئەو، ئەو سەردەم یەکێ لە ئایتوڵڵا گەنجەکانی هەرەمی مەزهەبی شیعە بوو.

[١٣٧] Keykan
[١٣٨] Baheshti

بەهەشتی کەسایەتییکی بە جۆش بوو کە ڕابەرایەتی ئیسلامەتی لە مزگەوتی ئێرانی لە هامبۆرگ[١٣٩] دەکرد. ئەویش گرنگترین مزگەوتی شیعەکانی ئەوروپا بوو.

ئەو یەکەمین مەلابوو شوێنپێی شۆرشەکەی هەلگرتبوو. دەستبەجێش مزگەوتەکەی جێهێشت و خۆی گەیاندبووە عێراق تا ببێتە یاریدەدەری ئیمام خومەینی.

لەبەر ئەوەی، ئەو ماوەیەکی درێژبوو لە ئەڵمانیا ژیابوو، جیهانی ڕۆژئاوای لەناوەوە دەناسی. ئەو کتومت ئەو بەهرەیە بوو، کە خومەینییە بە تەمەنەکە پێویستی پێبوو، تا خەونی دەوڵەتێکی ئیسلامی بێنێتەدی.

بەهەشتی بەهای چیرۆکەکانی ڕۆژهەلات و دەسەلاتی کامێرای ڕۆژئاواشی دەزانی. نەخشەکەشی ڕاکێشانی سەرنجی تەلەفزیۆن بوو بۆسەر خومەینی و بە شێوەیەکی تەلیسماوی بیخاتەڕوو: "پیرە مەلایەک کە لەسەر مافوورێکی ئێرانی سادە دانیشتووە. ئەو لە تاراوگە ژیاوە، نان و شیر دەخواو داشدەڕسێتە ئەمریکا!"

بە پێچەوانەی بەهەشتییەوە، ئیمام خومەینی هیچی دەربارەی جیهانی نوێوە نەدەزانی، ئەو بە زەحمەت وشەی "ڕادیۆ"شی لەدەم دەردەچوو.



بەرەبەرەی شەوبوو، کاتێ بەهەشتی لە شاری نەجەف[١٤٠] لە دەرگای ماڵی خومەینی دا.

خالخالیش دەرگاکەی لێکردەوە.

"من بەهەشتیم، مەلای مزگەوتی هامبۆرگ، هاتووم قسە لەگەڵ خودی ئایتوڵلادا بکەم." پیاوەکەی بەردەرگا وای خۆی بە خالخالی ناساند.

لەو سەردەمدا هەموو شتێک لە ماڵەکەی خومەینی و لەبن دەستی خالخالیدا ڕوویدەدا. بەردەوام خەڵک دەهات و دەیانەویست ئایەتوڵلاکە ببینن.

---

[١٣٩] Hamburg

[١٤٠] Nadjaf

خالخالی پێشتر بەهەشتی نەدیتبوو، هەرگیزیش باسی ئەوی گوێ لێنەببوو، بەڵام ئەو هەڵسوکەوتە بەجێیەی ئەو و ڕووخسارە نوێخوازییەکەی، دەستبەجێ کەوتنە بەر دڵی.

- "دەکرێ بزانم ئاخۆ بۆچی دەتەوێ لەگەڵ ئایەتوڵلادا قسەبکەی؟"خالخالی وایلێپرسی.

- "من لە پرسەنیی تۆ تێدەگەم، بەڵام ئەوە بابەتێکە دەمەوێ بە تەنیا لەگەڵ ئایەتوڵلادا باسی بکەم."

خالخالی بەهەشتی بردە ژووری میوانان، بە پێشخزمەتەکەی گوت چایەکی بۆبێنێ و بە میوانەکەشی گوت: "تکایە کەمێک چاوەڕوان بە؟"



خومەینیش بەهەشتی نەدەناسی، بەڵام، کە هێشتا باوکی مابوو، برادەری بوو. ئەو ئەوێ ڕۆژێ ڕابەڕێکی دەستڕۆیشتووی مزگەوتی هەینی ئیسفەهان بوو.

"ئایەتوڵلا باوکی تۆی ناسیوە، ئەو خۆشحاڵە بەهاتنت." خالخالی وای بە میوانەکە گوت و بردییە حوجرە سادەکەی ئایەتوڵلا بەتەمەنەکە، کە لەوێ لەسەر مافوورێک دانیشتبوو.

بەهەشتیش لە هۆدەکە چووە ژوور، هەندێک چەمایەوە و دەرگاکەشی لە دوای خۆی پێوەدا.

## پاریس

**ئەلیف لام ڕا.**

هەگیز پێشوەختە نایزانین

ئاخۆ چیتان لەبن سەردایە

من دواتان دەکەوم

بە کڕنووشەوە دواتان دەکەوم



کەس هـیچ تێبینـی نەکـرد، کەس چـاودێری ئەوەی لێنەدەکـرد، کەسـیش نەیدەزانی ئـاخۆ چـی لە ئـارادابوو، بەڵام هەر لە هـیچەوە، لەپـڕ خـومەینی بەساڵداچوو، لە فڕۆکەخانەی چارلس دیگۆل[141] لە پاریسدا دابەزی.

ئەوان چـوار کەس بـوون: خـومەینی، بەهەشـتی، خالخـالی و بەتـول، هاوسەرەکەی خومەینی.



لەو چواردە ساڵەی تاراوگەیدا، کە خومەینی لە عێراقدا بەسەری برد، شاری نەجەفی بەجێ نەهێشتبوو. هەموو ڕۆژێکیش لە پێنج و نیو لەخەو هەڵدەستا، نوێژی بەیانی دەکرد و دەستی بە خوێندنەوەی قورئانەکەی دەکرد.

سەعات حەفت و نیویش ژنەکەی بەرچایی بۆ دەبرد. تا سەعات دوازدە و نیو ئەو لە حوجرە بچکۆلانەکەی خۆی کاری دەکرد. ئینجا کاتی نانی نیوەڕۆ دەهات. دوای نانخواردنەکە سەرخەوێکی دەشکاند، ئەوسا تا سەعات چوار خەریکی کارەکەی خۆی دەبوو. لە کۆتایی دوای نیوەڕۆشدا، پێشوازی لە میوانەکـانی دەکـرد، زۆربەی ئەو بازرگانـانەی مـافووری ئێرانـی بـۆ کاروبارەکانیـان دەهـاتنە عێراق، سـەردانیان دەکـرد. بەڵام لە سـەردانکەران ئیسـلامییە جیابووەکـانیش هەبـوون، کە لەژێـر بەرگـی بازرگانانـدا خۆیـان حەشاردابوو. ئەوان ئەو کەسانەبوون، پەیوەندیی نهێنیان لەنێوان خومەینی و ئایەتوڵلاکانی قوم گرێدابوو.



لە زستانیشـدا، ئەو هەمـوو ڕۆژەکەی هەر لە حوجرەکەیدا بەسـەری دەبـرد، بەڵام لە بەهاران و هاویناندا دوای سەعات شـەش، کاتێک هەوا فێنک دەبوو، بۆ کارکردن دەچووە نێو باخچەکەی.

لە سەرەتای دەسپێکی شەویشـدا، دەسـت و دەموچاوی دەشوشـت، جبەکەی لەبەردەکرد و دەچووە مزگەوتە پیرۆزەکەی ئیمامی عەلی.

ژنەکەی بە دووری سێ مەتر بەدوایدا دەڕۆیشت.

ئێستاش ئەو بەسـەر عارەبانەیەک لەپاڵ سەبەتەی هەگبەکاندا لە فڕۆکەخانەی شارل دیگۆل لە پاریس نوشتاوەتەوە.

---

[141] Charles de Gaulle

کـاتێکیش جانتاکـانی خۆیـان وەرگـرتنەوە، لە لایەن مـاخۆی گەورەتـرین بازرگانی مافووری ئێرانی لە پاریس پێشوازی لێکران، لەویشـەوە بە مینی پاسی نیفل شاتو[١٤٢] گەیاندنیە ئەو خانووەی، کە پیاوەکە پێشتر مشووری بۆ خواردبوو.



نزیکەی شەست ساڵ بەر لەئێستا، خومەینی ئەو گوندەی لێی لەدایک بوو، بۆ خوێندنی مەلایەتی لە شاری قوم، جێهێشتبوو.

کاتێک ئەو هێشتا لە گوندەکە دەژیا، هیچ ترومبێلی لێنەبوون، چونکە ڕێگای ترومبێلی بۆ نەکرابۆوە. ئەو بەنێو شاخەکاندا و بەپێیان تا شـاری ئەراک دەیکوتـایەوە، لەوێشـەوە بە گالیسـکە دەچـووە قـوم. پاشـان و دوای چەنـد دەیەیەک، ڕەزاخـانی بـاوکی شـا، وڵاتەکەی نـۆژەنکردەوە و بە یـارمەتی بەریتانییەکان هێڵی ئاسنینی تێدا کردەوە. کاتێکیش خومەینی گەیشتە ئەراک، ئەو بە کـامیۆنەی کە شـوفێرێکی ئەرمەنـی دەیهـاژۆت و خەڵکـی دەگەیانـدە شـارە پیـرۆزەکەی قـوم، سەرسـام بـوو. ئـاخر بە دەیـان ڕێبـوار لەنێـو ترومبێلەکەدا دانیشتبوون.

گەشـتەکە بـۆ خـومەینی گەشـتێکی فەرامۆشـنەکراو بـوو، بەڵام کاتێ لە ڕێـی گـردە پشتئاسـاکە گەیشـتە قـوم، بەهـۆی بـۆنی دیـزل، کە لە تـرومبێلەکەوە دەهات، هەستی بە نەخۆشی کرد.

دواتـر، کـاتێ بـووە ئـایەتوڵڵا، هەمیشـە بە ترومبێلی مێرسـدیس بینـز گەشـتی دەکرد، بەڵام هەرچەند جارێکیش سواری ترومبێل دەبوو، بۆنی سـووتەمەنی ترومبێلەکە دەیڕشاندەوە.

هەنووکەش کە بەسواری مینیبوسێک شەقامەکانی پاریس بەرەو مەنزڵگایەک لە گەڕەکێکی دەرەوەی شار تەی دەکا، دیسان بۆنی ترومبێلەکەی بۆ هاتەوە.



بەهەشتیش، کە هەموو شتێکی پێشتر ڕێکخستبوو، دەستبەجێ ڕۆژژمێرەکەی لە هەگبەکەی دەرهێنا و دەستی دایە تەلەفۆن.

---

[١٤٢] Neauphle-le-Chateau

لەو کاتەدا، ڕۆژنامەوانێکی گەنجی ئێرانی لە تەلەفزیۆنی ئەی بی سی ABC ئەمریکی کاری دەکرد. بەهەشتی ژمارە تەلەفۆنەکەی ئەوی لێدا، پێیڕاگەیاند، ئیمام لە نەجەفەوە بۆ پاریس بەڕێکەوت، هەر لە پاریسیشەوە ڕابەڕایەتی شۆڕشی ئێران دەکا.

ئەوشی گوت، ئەگەر زوو بکەونەخۆ، دەتوانن پێشەنگی سازدانی دیدارێک بن لەگەڵ ئایەتوڵلادا لە پاریس. ئەگەر دەستوبردیش نەکەن، ئەوا دەستبەجێ زەنگ بۆ بی بی سی لێدەدا.



بۆ ڕۆژی پاشتر، ترومبێلێکی ئەی بی سی گەیشتە بەردەم ئەو ماڵەی بۆ خومەینی دیارکرابوو.

لە پاریس هێشتا دوای نیوەڕۆ بوو، بەڵام لە ئێران تازە شەو داهاتبوو.

بە پەشۆکاوییەوە مام ڕەمەزان گەیشتە دالانەکە، هەر خێرا لە گوێدرێژەکەی دابەزی و بەپەلە بەرەو ژوورەکەی ئاغاجان ڕۆیشت.

- "خومەینی لە پاریسە، زۆر نابا لە تەلەفزیۆن دەردەکەوێ" ئەو وا بانگی ئاغاجانی کرد.

- "لە کوێ؟"

- "لە مزگەوتی حاجی تەقی خان[١٤٣]. لەگەڵمان دێی؟"

ئاغاجان نەیدەویست بچێتە مزگەوتەکە. ئاخر لە ماوەی ڕابردوودا هەمووان دەچوونە ئەوێ. ئەوێ ببوە چەقی ئەو پشێویەی لەنێو شاردا دروست ببوو لە مزگەوتەکەی ئاغاجانیشدا تەنها خەڵکانی بەتەمەنی دەهاتنێ. هەرچی مزگەوتی حاجی تەقی خانیش بوو، لە خەڵک سیخناخ ببوو، دەبوایە لە حەوشەی دەرەوە وەستابان.

مەلا گەنجەکانی قوم هاتبوون، لەوێ دووانی ئاگرینیان دەدان. ئیدی جەماوەری وروژاویان بۆ خۆپیشاندان دەڕژاندنە سەر شەقامەکان

- "وای بەداخەوە!" ئاغاجان وای بە مام ڕەمەزان گوت: "من ئێستا نایەم، دواتر دێم."



---

[١٤٣] Hadji Taqi Chan

ئەو لە پرسەنییان لەناوەوە دەکولا. ئاخر ئەو شاهیدێک بوو، دەبوایە هەموو شتێک بەچاوی خۆی ببینێ، هەموویشی تۆماربکا و هەڵیبگرێ. ئەو هەر دەبێ لەوێ ئامادەبوایە. ئیدی عەبایەکەی لەبەرکرد و، کڵاوشاپۆکەی لەسەر نا بەرەو مزگەوتی حاجی تەقی خان کەوتەڕێ.



مزگەوتەکە پڕببوو، بەسەدان کەس لە دەرەوە لەسەر شەقامەکە وەستابوون. ئەویش بە نەناسراوی لە گۆشەیەکی تاریک گەڕا.

- "خۆ تۆ هیچت نەدزیوە، باشە بۆچی لەو گۆشە تاریکەدا وەستاوی؟" ئەو ئەمەی بە خۆی گوتەوە. "دەی بڕۆ ژوورێ و بزانە چی لەئارادایە."

ئیدی خۆی بەنێو ئاپۆرای خەڵکەکەدا کێشا و لێوەژوور مزگەوتێ کەوت. پیاوەکان لە حەوشەی ناوەوە بوون و ژنەکانیش لە شوێنی نوێژکردن. ساتەوەختێک داهات ئاغاجان نەیتوانی زیاتر بچێتە پێشەوە. ئیدی بڕیاریدا بگەڕێتەوە لە ڕێی پەیژەکانەوە بچێتە سەربان؛ لەوێشەوە چووە گۆشەیەک تا هەمووشتێک بە باشی ببینێ. لەوێ سێ تەلەفزیۆنی گەورە لەپاڵ دیوارەکە داندرابوون. ئاغاجان تەلەفزیۆنە بچکۆلانەکەی ماڵێ، کە کاتی خۆی شاباڵ هێنابووی، تا چوونەسەرمانگ نیشانی مەلا ئەلسابری کۆچکردوو بدا، بیرکەوتەوە. ئەو دەمەتەقێیەی ئەوێ ڕۆژێ شاباڵ دەربارەی تەلەفزیۆن لەگەڵی کردبوو، لەمێشکیدا نەخشابوو، هەر وەک ئەوەی دوێنێ ڕویدابێ.

- "ئاغاجان، دەکرێ قسەیەکت لەگەڵدا بکەم؟" شاباڵ بوو وای لێپرسی.
- " هەڵبەتە، گەنجۆ، بەڵام دەتەوێ باسی چی بکەی؟"
- "باسی مانگ؟"
- "مانگ؟"
- "نەخێر، دەربارەی تەلەفزیۆن."
- "چۆن، دەربارەی تەلەفزیۆن؟" ئاغاجان بە سەرسوڕمانەوە وایلێپرسی.
- "مەلا دەبێ هەموو شتێک بزانێ. ئەو دەبێ ئاگای لەو شتانە بێ کە لە دەوروبەریدا ڕوودەدەن." شاباڵیش ئەوکات وای وەڵام دایەوە.

ئەلسابری کۆچی دوایی کرد، پاشان خالخالی هات. ئەحمەدیش جێگەی ئەوی گرتەوە، هەنووکەش ئەو بەزمەیە.



لەوێ لە دەرگای مزگەوتێ جووڵەیەک هات.

- "صلی ألله علی محمد و علی آل محمد!" پیاوەکانی سەر شەقامەکە وایان هاوارکرد.

ئاغاجان تەماشای دەرگاکەی کرد. دەستەیەک لە پیرە پیاوان بە قاتی کەشخەوە لە مزگەوتێ وەژوور کەوتن. ئەوان یاوەری مەلایەکی گەنجیان بۆ لای تەلەفزیۆنەکان کرد، کە بەتەمابوو چاوپێکەوتنەکەی خومەینی تێدا پەخش بکرێ.

ئاغاجان پیاوەکانی ناسینەوە، ئەوانە ئەو بازرگانانەی بازاڕ بوون، کە جڵەوی کاروبارەکەیان کەوتوتە بن دەست.

ئافرەتێکیش بەرەو پیاوە قات لەبەرەکان ڕۆیشت و قسەی لەگەڵدا کردن. پاشان گەڕایەوە بەشی ژنان لە لای شوێنی نوێژکردنەکە.

ئافرەتەکە زینەت بوو، بەڵام بۆچی چارشێوێکی ڕەشی پۆشیوە، ئاغاجان لەو دووریە نەیتوانی بیناسێتەوە.

مەلایەکی گەنجی بەردێنیش تەلەفزیۆنەکەی پێکرد. حەشاماتە ئامادەبووەکەش هەناسەی خۆیان ڕاگرت، هەموویان ملیان بۆ لای تەلەفزیۆنەکە درێژکرد.

سەرەتا کامێرا شەقامە ئارامەکانی گەڕەکی نیفیو لی شاتۆی نیشاندا. لەوێ یەک دوو خانمی فەرەنسی دەبینران بۆ لای سوپەرمارکێت دەچوون. پاسێکی قوتابخانەش لە وێستگەیەک وەستا کە پۆستەرە ڕیکلامێکی ڕەنگینی ئافرەتێکی مۆدێرنی هەڵواسرابوو. دوو کیژ بە خۆیان و کۆڵەپشتەکەیان لە پاسەکە دابەزین. ئەوان بۆ ماوەیەک سەیری کامێراکەیان کرد. ئینجا کامێراکە بە هێواشی هات هات تا گەیشتە سەر خانووێک، لەوێ هەندێ دار، کەپرێک و باخچەیەکی نیشاندا.

ئینجا خومەینی لەسەر شاشەکە دەرکەوت. لەسەر مافوورێکی ئێرانی دانیشتبوو.

ئاپۆرا وروژاوەکەی مزگەوتێ بەیەک دەنگ بانگیان کرد: "***سەلام بر خومینی، سلام بر خومینی!***" سڵاو لە خومەینی، سڵاو لە خومەینی!



هێشتا لە ئێران نەدەکرا تەلەفزیۆنە بیانییەکان لە ڕێی سەتەلایتەوە وەربگیرێن، بەڵام ڕێکخەرانی ئەو بۆنەیە، سێڵی سەتەلایتیان لەسەر بانی مزگەوتێ دانابوو، دەتواندرا وێنەکان لە ڕێی عێراق. دەوڵەتی درواسێوە وەربگیرێن.

کامێرای تەلەفزیۆنەکە چووە سەر دەموچاوی خومەینی. پیاوەکان بۆ یەکەمین جاریان ڕووخساری ئەو ئایەتوڵڵا پیرەیان بینی، کە دەیەویست دژایەتی ئەمریکا بکا.

ئاخر کەسانێکی کەم خومەینیان دەناسی، هەرگیزیش وێنەیەک کە بەم دواییانە گیرابێ، بڵاونەبووە، بۆیە کتومت کەس نەیدەزانی ئاخۆ چ سەروسیمایەکی هەیە.

کامێرایەکە بۆ ماوەیەک لەسەر سەروسەکوتی ئیمام خومەینی مایەوە. ئەو ڕیشێکی بۆزی درێژی هەبوو، ڕووخساریشی لەبەر تیشکی کامێراکە بریقەی دایەوە و لە کەسە نوورانیەکان[144] دەچوو.

ئەو دەستێکی دایەبەر خۆی تا هەڵبستێ. دەستێک (پێدەچوو دەستی تیمی تەلەفزیۆنەکە بێ) یارمەتی دا، بەڵام ئەو بەو دەستە یاریدەدەرە قایلنەبوو، هەر بەهێز و تاقەتی خۆی هەڵستا سەر پێ.

ئەو قەدەمێکی بۆ دەرەوە لێدا، لەوێش دوو مافوور، یەکێکیان بچووک و ئەویدیکەشیان گەورە، لەسەر زەویەکە ڕاخرابوون. خومەینی پێڵاوەکانی داکەندن و چووە سەر مافوورە بچووکەکە وەستا. نمایشئاسا ڕووگەنمایەکی[145] لە گیرفان دەرهێنا، بەڵام ئەو دەرزی ئاماژەدەرەکەی ڕووگەنماکەی باش نەدەبینی. بە ئارامییەوە چاویلکەکانی کردنە چاو، ئینجا بە شوێن ئاراستەی دەرزی ڕووگەنماکە ڕووەو مەککە ڕاوەستا.

بەهەشتیش لە مەودایەک لەپشتی ئەوەوە لەسەر مافوورە گەورەکە دیاربوو. خالخالی خۆی نیشان نەدا. وەک متمانەدارترین ڕاوێژکاری خومەینی دەبوایە بە نەناسراوی بمێنیتەوە.

---

[144] لێرە مەبەست لە کەسە پیرۆزەکان(قەدیسەکان)ە، بەڵام لە کوردەواری خۆمان کە بە پەسنەوە باسی سەروسیمای کەسێک بکرێ، دەگوترێ سیمایەکی نوورانی هەبوو یان هەیە. وەرگێڕ.

[145] ڕووگەنما: قیبلەنامە.

بەتـــول[١٤٦]، هاوســـەرەکەی خـــومەینی لە ســـەر شاشـــەی تەلەفزیـــۆنەکە بەدەرکەوت، کە بەتەواوی لەژێر چارشێویکی ڕەش و لە دوای بەهەشتییەوە نوێژی دابەستبوو.

کامێراکە وەرسوڕایە سەر خێزانی ئایەتوڵلا، کە وەک پەیکەرێک وەستابوو. ئینجـا ڕووی کـامێراکە چـووە سـەر پەرژیـنە کەسـکەکە، یەک دوو ژنـی فەڕەنسی بە خۆیان منداڵەکانیان بەسەرسوڕماوییەوە سەیری دیمەنەکەیان دەکرد.



لە ماوەیەکی کورتدا شەپۆلێک لە ڕۆژنامەوانان لە هەموو لایەکەوە ڕوویان لە گەڕەکی (نیفلە لێ شاتو) کرد، هەربۆیە شۆڕشی ئایندەی ئێران تیشکی سەرنجی ڕۆژنامەوانی بەو پەڕی فراوانییەوە کەوتەسەر.

تا ئەو کات بەهەشتی و خالخالی تاکە کەسانێک بوون لەپشت خومەینییەوە بـوون، بەڵام دوای ئەو دیـدارە، بەیەکجـار حەوت پیـاو لە ئەمریکـا، ئاڵمـان، ئینگلســتان و پـاریس چـوونە پـاڵی. ئیـدی هەر ئەوان بە یەکەوە کـۆمیتەی سەرپەرشتی شۆڕشەکەیان پێکهێنا.

پاشـان، کـاتی شـا ڕووخـا و شۆڕشـکەش سـەرکەوت، هەرهەموویـان پلەو پۆستی باڵایان لەنێو حکوومەتدا وەک سەرۆک، سـەرۆوەزیر. وەزیـری دارایی. وەزیـری کاروبـاری پیشەسـازی، سـەرۆکی پەرلەمـان، بەرپرسـی دەزگـای هەواڵگری نهێنی و وەزیری کاروباری دەرەوەیان وەرگرت.

بەڵام یەک دوو سـاڵ دواتر، سێ لەو دەستەیەدا لە بەرگریەکی چەکدارانەدا لەنـاوبران، یەکێکـیش لەوان وەک سـیخوڕێکی ئەمریکـی لەسـێدارە درا، ئەوی دیکەشـیان بەهـۆی گەنـدەڵی خـرایە زینـدان، ئەو کەسـەی ببـووە سـەرۆکیش، بەرەو پـاریس هەڵات و داوای مـافی پەنـابەری کـرد. سـەرۆوەزیریش دوای ماوەیەکی کەم نێدردایەوە ماڵەوە.

لەتاران بەردەوام خۆپیشـاندان ڕێکدەخران، هەمـوو جـارێکیش بە ملیۆنـان لە خەڵک بەشداریان تێداکرد.

ئیدی کەس نەما ڕێگر بێ لەبەردەم گەڕانەوەی خومەینی.

---

[١٤٦] Batoel

ئـاخر ڕووخســاری وڵاتەکە بەخێرایـی گـۆڕا. پیاوەکـان ڕدێنیـان هێشــتەوە، ئافرەتانیش بە کۆمەڵ چارشێویان پۆشی.
مــانگرتنی گەورە لە کەرتــی نەوتـدا وڵاتــی خســتە تەنگژەیەکــی قــووڵ. کرێکارەکـان ئامێرەکانیـان لەکـار وەسـتاندن، خوێنـدکارەکانیش نەچـوونەوە کۆلیژەکانیـان. قوتابییەکـانیش قوتابخانەکانیـان بەجـێ هێشـت و ڕژانە سـەر جادە.



شۆڕشەکە مۆری خۆی بەنێوچاوانی خانووی مزگەوتیش وەنا.
زیــنەت بەئاشــکرا لەماڵبــاتەکەی دوورکەوتەوە وســەدیقەش زۆر جــاران دەچووە دەر. ئەویش لەگەڵ زینەت دەچووە کۆبوونەوەکانی ژنانی ئیسلامی.
سـەدیقە، کە سـەرەتا هەمووجـار بەبـێ سـەرپۆش لەنێو ماڵدا دەسووڕایەوە، هەنووکە هەروەک ئەوەی لە دەرەوە بێ، رووبەندی دەپۆشی.
پێشـان، هەمیشـە بـایەخی بە مـاڵێ دەدا. مشـووری مـارمیلکەی دەخـوارد. لـێ ئێســتا هەمــوو شــتێکی بەلاوە نــا. بە درەنــگەوە دەگەڕایەوە مــاڵێ، هەر بەتەنیاش لە ناندینەکە نانی دەخوارد و خێراش دەچووە نێو نوینەکانی.
ئاغاجان هەموو ڕۆژێ دەچووە بازاڕ، بەڵام خۆ هەموویان بە کاروباری دیکە بەدەر لە مافوورفرۆشییەوە خەریکبوون.
تادەهات لەنێو نووسینگە و بوغازەکانی، زیاتر هەستی بەنامۆیی دەکرد.
مـافوورە لوولـدراوەکان، کە دەبـووایە لەمێژبوبـا ناردرابـانە هەنـدەران، هێشـتا هەر بەبارســـتەی قەبە قەبەوە لە کۆکـــاگە مـــابوونەوە. خـــوری و بـــاقی کەلوپەکـــانی مـــافوورچنین، کە دەبـــوایە لەمێژبووبـــا نێردرابـــانە لای مافووردروستکەرانی گوند، هەر لە دالانی بوغازەکان مابوونەوە.
نۆکەرە بڕوادارەکەشیان، ئەوکەسەی کڕیار و مەعمیلەکانی دەهێنانە ژووری کـاری ئاغاجـان، ردینێکی بەردابـۆوە. چیدی نەدەهـاتە سـەر کـاری خـۆی، لە وەخـت و ناوەختـدا، هەر لە گـۆترە کـارەکەی بە بەهـانەی پێویسـتبوون بـۆ چوونە مزگەوت، جێدەهێشت.

كرێكارەكـانیش یەكێـك لە ژوورەكـانی كاریـان بەتـاڵ كـرد و كورسـی و مێزەكانیـان فرێـدابوونە دەرەوە. لەوێـدا یەک دوو مافووریـان ڕاخسـتبوو، شوێنەكەیان كردبووە نوێژگە.
وێنەیەكی گەورەی ئیمام خومەینیش بەدیوارەكە هەڵواسرابوو، سەماوەرێكی گەورەی مزگەوتێش لەسەر مێزەكە دانرابوو. كەس كاری نەدەكرد، هەموو ڕۆژەكە هەر بە قسەكردن دەربارەی ڕووداوەكانیـان بەسـەر دەبـرد. ئەوان لەژووری نوێژكردن بەدەم چاخواردنەوە گوێیان لە بەشی فارسی ڕادیۆی بی بی سی دەگرت، كە دوا ڕووداوەكانی پاریسی دەگواستەوە.
ئاغاجان بینی كارخانەكەی سەراوبن بووە، بەڵام لەدەسەلاتیشیدا نەبوو بارە لەنگەكە ڕاستبكاتەوە.



لەماڵیش فەخری ساداتی وەک جاران بە خۆئارایشتكردنەوە نەدەبینی. ئاخر ڕووخۆشی ژنانەی خۆی لەدەستدابوو. پێشان بەردەوام جلی نوێی دەكڕین، جلی شەوانە، بەڵام هەنووكە دەستی لەخۆ شوشتووە.
ئاغاجـان زۆری پێخۆشـدەبوو، فەخـری سـادات لەبەردەم ئـاوێنە دابنیشـێ و دەست لەمەكەكانی بدا ئاخۆ هێشتا هەر شۆخوشەنگی جارانن، بەڵام چیدی ئەو ڕەفتارەی نەدەكرد. فەخری چیدیكە زێڕ و ئاڵتونی بەخۆوە نەدەكرد. ئەو سـندوقێكی ئـاڵتوونی هەبـوو بەردەوام لای ئـاوێنەكەی دانـابوو، لـێ ئێسـتا خڕكراوەتەوە و لەنێو دۆلابەكەدا هەڵیگرتووە.
كیژەكانی ئاغاجـانیش ببـوونە قوربـانی ئەو گۆڕانكارییـانە. واپێـدەچوو وەک ئەوەی پیاوانی شارەكە، ئەوەیان لەبیركردبێ كە دوو كچی هەراش لەو ماڵەدا دەژین.



ئاغاجان غەریبی شاباڵی كردبوو. حەزی لێبوو قسەی لەگەڵدا بكا، دڵی خۆی لەلا بكاتەوە، بەڵام خۆ ئەمەی بۆ مەیسەر نەبوو. ئەو هەندێ جار دەگەڕایەوە مـاڵ، بەڵام هەر زووش دەڕۆیشـتەوە. ئاغاجـان زانـی، ئەو چیـدیكە نـاچێتەوە كۆلیژەكەی. ئەو دەیەویست یەک دوو جار لەو بـارەوە لەگەڵیدا بدوێ، بەڵام هەستێكی وای هەبوو، كە شاباڵ ئەو باسوخواسەی ناوێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ئاغاجان متمانەی پێ هەبوو. دەیزانی شاباڵ هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە.

لەو دواییانەدا ئاغاجان زۆرجار بە تاریکی و بە پیاسە دەچووە لای ڕووبارەکە. لەوێ قسەکانی باوکی بەبیر دەهاتنەوە:

- "ئەگەر خەمت هەبێ، ئەوا بڕۆ لای ڕووبارەکە. قسەی لەگەڵدا بکە، ئەویش خەمەکانت هەڵدەگرێ."

- "ئاخر خۆمن سکاڵا ناکەم، بەڵام هەست دەکەم بەردێکی قورس لەسەر سینگمە[١٤٧]." ئاغاجان وای بە ڕووبارەکە گوت.

چاوەکانی دەبریسکانەوە، فرمێسکیش بە ڕیز بەسەر ڕوومەتیدا دابارینە سەر زەوی. ڕووبارەکەش فرمێسکەکانی هەڵگرتنەوە، بە بێدەنگی لەو تاریکییەدا لەگەڵ خۆیدا بردن و لێنەگەڕا کەسیش پێیبزانێ.

## تاران

ئاغاجان لە نووسینگەکەی خۆی بوو لە بازاڕ. پێشخزمەتەکەی تازە پیاڵەیەک چایەی بۆ هێنابوو. لەو کاتەدا گوێی لە دەنگ و هەرایەک بوو لە نهۆمی ژێرەوەی نووسینگەکەی دەهات. هەموو کرێکارەکان لە ژووری کارەکانیان دەرچوونەدەر و سەیری هەواڵەکانی سەعات دوویان دەکرد.

- "ئەرێ ئەوە چ هەرایە؟" ئاغاجان وا بانگی کرد.

- "شا هەڵات! پێشخزمەتچییەکە لە خوارەوە وا وەڵامی دایەوە.

- "ئەللاهو ئەکبەر!" یەکێک وا بانگی دا.

هەواڵەکانی تەلەفزیۆن هیچ باسی هەڵاتنی شای تێدا نەبوو، دیاربوو قسەکە هەر بەندوباو بوو. بەندوباوەکەش ئەوەندە بەهێز بوو، ڕژێمی ناچارکرد شا بێنێتە سەر شاشەی تەلەفزیۆن و خۆی نیشانی خەڵکی بدا.

ئەو پێشوازی لە یەک دوو ژەنەڕاڵی خۆی کرد. بەڵام وێنەکە دۆخەکەی شڵۆقتر کرد. پێشتر، شا هەموو شەوێک لە سەر تەلەفزیۆن دیاردەکەوت، لەو

---

[١٤٧] لە دەقی ڕۆمانەکە دەربڕینەکە وایە، کە بەردێک لە ناو قوڕگی بێ، بەڵام بۆ دەربڕینی خەم و بارگرانی کەسێک ، لای خۆمان دەڵێن دەڵێی بەردێکی قورسی لەسەر سینگە. وەرگێڕ.

مانگانەی دواییشدا زۆر جاران دەرنەدەکەوت. کەسیش بڕوای بە چاوەکانی خۆی نەدەکرد. ئاخر شا زۆر لاواز ببوو، سەرنجێکی وای دایەدەست، کە پیاوێکی ترسنۆک بێ و لە سەروبەندی ئەوەدا بێ هەموو شتێک بدۆڕێنێ.
لە ڕاستیشدا بەندوباوی هەلاتنەکەی بەشێکی ڕاستی تێدابوو.
ڕۆژی پاشتر دیسان مەتەڵێک بلاوبووەوە: "فەرەح دیبا بۆ ئەمریکا ڕایکردووە و منداڵەکانیشی لەگەڵ خۆیدا بردوون!"
ڕاستیەکەش شتێکی دیکە بوو.
خۆ فەرەح دیبا نەبوو هەلاتبوو، بەڵکو دایکی فەرەح بوو، منداڵەکانیشی لەگەڵ خۆی ڕاپێچ کردبوو.
لەوێ لە تاران هەرەشەی شەڕی شەقام لە گۆڕێدابوو. خۆپیشاندەران تا دەهات لە کۆشکەکان نزیکتر دەبوونەوە. سوپاش ئەوەی لەپێش خۆی دانابوو گوایە مەلاکان بە تەمان بەسەر کۆشکەکان دابدەن.
شاش داوای لە فەرەح دیبا کرد، لەگەڵ منداڵەکان لە ولات بچێتەدەر.
- "من ناڕۆم. من لەو دۆخەدا بە چرکەسات لێت دوورناکەومەوە."
- "ئاخر خۆ شتەکە لەبەر من نییە، بۆ خاتری منداڵەکانە." شا وای بە فەرەح دیبا گوت.
- "کەواتە دەبێ بە شێوەیەکی دیکە چارەی بکەین. داوا لە دایکم دەکەم بڕوات و منداڵەکانیش لەگەڵ خۆیدا ببا." ئەمەش وەلامی شابانو بوو بۆ شا.



لە کاتێکدا هەلیکۆپتەرەکە ئاسمانی سەر کۆشکەکەی جێدەهێلا تا منداڵەکانی شا بگەیەنێتە فڕۆکەخانەیەکی سەربازی، لەوێشەوە بە فڕۆکەیەکی سەربازی ولات جێبێلن، لەو کاتدا نوسرەت سواری قەتاری شەو بوو، بۆ زەنجان دەگەڕایەوە.
قەتارەکە لە سەعات چواردا گەیشتە شارەکە. نوسرەت لە وێستگەکەدا تاکسییەکی بەرەو ماڵ گرت، لەوێشەوە بە بێدەنگی چووە ژووری مانەوە و لێیڕاکشا.
بۆ بەیانییەکەی مارمیلکە خۆی خشاندە ژوورەکەی و لەخەوی هەڵساند.

- "من شتێکم بۆ هێناوی،" بەدەم ئەم قسەیە دوو دەستەوانەی چەرمینی لە هەگبەکەی خۆی هێنایەدەر. "دەی بکەرە دەستت، ئەوسا دەچینە بازاڕ و نان دەخۆین، من برسیمە."
مارمیلکەش دەستەوانەکانی کردنە دەست و ئیدی بە دەست و پێ بەدوای نوسرەتدا ڕۆیشتە ناو شار.
لە مەیدانی بازاڕەکەدا بەرەو کۆتەڵە گەورەکەی شا خشا.
مارمیلکە سەیرێکی نوسرەتی کرد، ئاخۆ پێیخۆش دەبێ گەر لێوەسەر کۆتەڵەکە بکەوێ. نوسرەتیش چاوێکی لێداگرت، ئیدی لە چرکەیەکدا مارمیلکە چووە سەر کۆتەڵەکە و لەپشتی شاوە لەسەر ئەسپەکە خۆی بینییەوە.
مارمیلکە ئەوە یەکەم جار بوو میزاجی بگرێ ئەو جۆرە ڕەفتارە بنوێنێ و لێبەسەر پەیکەرەکە بکەوێ.
سەرەتا کەس تێبینی نەکرد، بەڵام وردە وردە ئەو خەڵکەی لە گۆڕەپانەکەدا بوون، سەیری مارمیلکەیان کرد. کاتێکیش ئەو، ئەو تاسەمەندییەی خەڵکەکەی بینی، مارمیلکە ئازاتربوو، خۆی بۆ پێشەوە شۆڕکردەوە، ئەستۆی ئەسپەکەی گرت وەک ئەوەی بکەوێتە گورگەلۆقە.
هەنووکە ئەو زیاتر لە مەیموونێک دەچوو لەوەی لە مارمیلکە بچێ. ئەو لەسەر ملی ئەسپەکە بازیدایە سەر سەری شا. پاشان خۆی خشاندە سەر کلکە درێژەکەی ئەسپەکە، دیسان گەڕایەوە لای شا، ئەو جوولانەش هەموو بە لەشسوکییەکی ناوازە ئەنجامی دان.
گۆڕەپانەکەش، تا دەهات قەرەباڵغتر دەبوو، هەمووانیش چەپڵەیان بۆلێدا.
ئینجا دوو پۆلیس پەیدابوون، بەڵام نەوێران خۆیان لە دۆخەکە هەڵقورتێنن. یەکێک لە پۆلیسەکان ڕاپۆرتەکەی خۆی بە بێسیمەکەی دەستی بە هاوکارەکانی ڕاگەیاند. ئینجا ترومبێلێکی سەربازی هات، کە یەکەکی پۆلیسی دژە ئاژاوەی تێدابوو، بەڵام ئەوانیش فەرمانیان پێنەبوو هیچ بکەن. تەنیا دۆخەکەیان خستبووە ژێر چاودێرییەوە، چونکە بارودۆخەکە لە وڵات وا گرژ ببوو، هەر کردەوەیەک شەڕ و هەرای لێدەکەوتەوە.
لەسەرێکەوە، دەکرا مرۆ وای لێکدابایەوە شتەکە ڕووداوێک بووە، کەسێکی کەم ئەندام هەڵبەزیوەتە سەر پەیکەری شای وڵات، بەڵام لەسەرێکی

دیکەشەوە خۆ ئەو کارە بێخەتایەی پەککەوتەکە مەبەستێکی سیاسییانەی لە پشتەوە بووە.
هەمووانیش سەیری ڕەفتاری پۆلیسیان کرد و بە لاوازی ڕژێم لێکیاندایەوە، بەڵام کەس پێشبینی ئەوەی نەدەکرد، کە زۆری دیکە نابا ئاپۆرای هیستریاگرتوو بە زنجیرەوە دێن و کۆتەڵەکە لەرەگ و ریشەوە دەردێنن.
بۆ ڕۆژی پاشتر وێنەیەکی گەورەی مارمیلکە، کە خۆی بە ئەستۆی ئەسپە شاهانەییەکدا شۆڕکردبووەوە، لەسەر لاپەڕەی پێشەوەی ڕۆژنامە خۆجێیەکە درابوو.
لە ماوەی سەعاتێکیشدا ڕۆژنامەکە هەموو فرۆشراو لە بازاڕدا نەما، ئەمە شتێک بوو پێشتر نموونەی نەبوو. هەموو ئەوانەی وتارەکەیان خوێندبووەوە، بەرەو مزگەوتێ ڕۆیشتن تا بە کارانگازییەوە سەیری مارمیلکە بکەن، کە چووبووە سەربان.
ئەمەش ببوە خاڵێکی وەرچەرخان لە ژیانی مارمێلکەدا؛ لەمەوە بەدوا هەموو ڕۆژێک دەچووە سەربان لەوێشەوە لێوەسەر منارەیەک دەکەوت، تا تۆپکەکەی ڕانەدەوەستا، بە تەواوی بۆ لووتکەکە، ئەو شوێنەی ڕۆژێک لە ڕۆژان جێهێلانەی حاجی لەقلەقەکان بوو. دەچووە ئەوێ گرمۆڵە دەبوو، کتێبەکانی خۆی دەخوێندنەوە.



پێشتر کەس نەدەهاتە مزگەوتێ تا بەشداری خۆپیشاندان بکا، بەڵام هەنووکە ڕۆژانە بە سەدان گەنج دێن و سەیری مارمیلکە دەکەن.
- "تۆ باندۆرێکی خراپت خستە سەر مارمیلکە." ئاغاجان لە تەلەفۆن بە سەرکۆنەکردنەوە وای بە نوسرەت گوت.
- "بۆچی؟ من کێشەیەک نابینم."
- "ئەو ئێستا مەیمونانی لێبەسەر منارەکان دەکەوێ، ئەو بۆتە لێبوکی شارەکە."
- "دەلێیگەڕێ کوێی پێخۆشە با لەوێ بێ. خۆ ئەمە بۆ ناوە ڕووشاوەکەی مزگەوتێ کارێکی باش دەبێ."

- ئـاخر ئەوەی باسـی دەکەی مـزگەوتە، نەوەک سـێرک. ئـێمە نـابێ زیـاتر خۆمان سووک بکەین، یەکەم جار ئێمە کردەوەکانی ئەحمەدمان لەپێش بوو، هەنووکەش بەزمی ئەو مێردمنداڵە."
- "من قسـەی لەگەڵدا دەکەم." نوسرەت وای بە ئاغاجان گوت.
دوو شەو دواتر، دیسان نوسرەت بە قەتاری شەو گەڕایەوە شاری زەنجان.
ئەو نەیدەزانی ئـاخۆ ئەم سـەردانەیان دوا جـار دەبێ، کە بە پرچـی ڕەشـەوە بگەڕێتەوە زەنجان، جاری داهاتوو پرچەکەی بۆز دەبێ و ڕووخساریشـی وا دەگۆڕێ، کاتێ دەگەڕێتەوە ماڵ، کەس ناشیناسێتەوە.



نوسرەت بـانگی مـارمیلکەی کردە ژوورەکەی خۆی، بارسـتاییەک بڵاوکراوە، کە وێنەی خومەینیـان لەسـەر بوو، خسـتنە نێو بەرکەی مـارمیلکە و پێگوت: "دوای ماوەیەکی دی، کاتێ جادەکـان پڕبوون لە ئـاپۆرەی خەڵک، بڕۆ سـەر منارەیەک و ئەم کاغەزانە فڕێدە خوارێ. تێدەگەی چیت پێدەڵێم؟" مـارمیلکەش ئاماژەیەکی بۆکرد، "هەموویان بەیەکجار بەسەر خەڵکەکەدا دابارێنە!"
سـەعات یـازدە و نیـو، مـارمیلکە لێوەسـەر منـارەکە کەوت. دوای یەک دوو بازبازێن لە سەر لوتکەی منارەکەوە، سەرنجی خەڵکی بۆخۆی ڕاکێشا، ئینجا دەستی بردە بەرکی و کاغەزەکانی بەسەردا باراندن.
نوسـرەتیش، لێچووبـووە سـەربان، دەسـتبەجێ یەک دوو وێـنەی گـرتن، کە چۆن خەڵکەکە هەوڵدەدا وێنەکان لەهەوادا بگرنەوە.
وێنەکـان گەیشـتنە ڕۆژنامەکـانی وڵات، ئەوەش یەکەمـین جـار بـوو، وێـنەی خومەینیان تێدا بڵاوبکرێنەوە.
ڕژێـم سەرسـام بـوو، بەڵام نەیـدەتوانی هـیچ ڕێکارێـک بگـرێتەبەر، چـونکە ڕۆژنامەکان بە گشـتی لایەنگری بڵاوکردنەوەی وێنەکانیـان کرد. ئاغاجـانیش ڕۆژنامەکـانی کـڕین و خسـتنیە نێـو ئەو بـاوڵەی کە فایـل و هەواڵنـامەی مزگەوتیی تێدا هەڵگرتبوو.



نوسرەت و کامێراکەی کاتێک ڕووداوە گرنگەکان دەقەومان حازر دەبوون و هەمــوو ڕۆژێکــیش ئەو وێنــانەی ئەو دەیگــرتن، لە ڕۆژنامەکانــدا بــڵاو دەکرانەوە.
هەروەهـا نوسـرەت ڤیدیۆی ئەو فیلمەی گرتبوو، هـی یەکەمـین خۆپیشـاندانی گەورەی تــاران، کە بەهەشــتی لەپێشــی پێشــەوەی خۆپیشــاندەراندا بــوو. بەهەشتی بە قاچاغ گەڕابۆوە وڵات، تا ڕابەرایەتی خۆپیشاندانە گەورەکە بکا.
نوســــرەت، ئامــــادەبوونی ئــــایەتوڵلاکە و هێــــزی ڕابەرایەتیــــیەکەی لە خۆپیشاندانەکە، باش نیشاندابوو. گەر هاتبا و سەیری ڕاپۆرتەکەت بکردبایە، دەتزانی ئاخۆ وڵات چاوەڕێی چی دەکا.



بەهۆی ئەو وێنە ناوازانەی نوسرەت بەردەوام دەیناردنە کۆمیتەی شۆڕش لە پاریس، هەر زوو پەیوەندی لەگەڵ بەهەشتیدا پەیداکرد. بەهەشتی زەنگی بۆ ماڵ بۆلێدا و لە نەخشەی خۆپیشاندانە گەورەکەی ئاگادار کردەوە. بەم جۆرە نوسرەت کاتی گونجاوی بۆ خۆئامادەکردن بۆ وێنە و فیلمەکانی لەبەردەستدا بوو.
کۆمیتەکە کەسێکی لە فڕۆکەخانەی تاران هەبوو، بە نهێنی وەک پۆستەبەر کاری دەکرد. نوسرەتیش ئەو وێنە و فیلمانەی دەیگرتن لە ڕێی کابراکە بە یەکەم فڕۆکەدا دەیناردنە پاریس.
نوسـرەت کەسـێکی سـەربەخۆبوو، بەڵام هەنـدێ جـاریش لە خـۆی دەپرسـی ئـاخۆ کـامە لایەن لەقـازانجی کـارەکەی ئەودایە. ئەرێ ئەو پڕوپاگەنـدەی بـۆ خــومەینی دەکــرد؟ نەخێــر، ئەو ســەر بە هــیچ کامیــان نەبــوو. ئەو هــیچ پەیوەندییکی بە دیینەوە نەبوو. هەروەهـا فڕیشـی بە سیاسـەتەوە نەبوو. ئەو لەگەڵ کەسدا نەبوو، بیروهۆشی ئەو تەنهـا و تەنهـا لای کـامێراکەی بـوو. ئەو لەو شوێنە بوو کە لێی بوو. کامێراکەی دەیخوارد.
ئەو بە نهێنــی پەیوەنـدی بە شــاباڵەوە هەبـوو. وێـنەی دەدانــی، شــاباڵیش لە ڕۆژنــــامە ژێــــرزەمینییەکەی خۆیانــــدا بــــڵاوی دەکــــردنەوە. لە یەکــــێ لە دیدارەکانیانــدا بە قــووڵی کەوتنەســـەر قســـەوباس. نوســرەت ڕۆژنــامەکەی

شـابالّی خوێنـدبووەوە، ئاگـاداری مشـتومڕێکی تونـدی پـارتەکەی ئەو بـوو سەبارەت بە قەڵەمڕەویتی ئیسلامی کە خومەینی بەنیاز بوو دایبمەزرێنێ.



تا خومەینی زیاتر سـەروکاری لەگەڵ دەسـەلات زیـاتر پەیدادەکرد، کۆمەڵە و دەستە چەپە ژێرزەمینییەکان ڕووبەڕووی پرسیارێک دەبوونەوە: ئاخۆ چۆن لەگەڵ خومەینیـدا بجـوولێنەوە؟ ئایـا پێویسـت دەکـا دژی بوەسـتنەوە؟ ئـاخر مشـتومڕێکی تونـد لەو بـارەیە بەرپـابببوو، لێکەوتەکەشـی لێکجیـابوونەوە بە ژانەکـان بـوون. بەشـێکی بچکـۆڵەی بـزووتنەوەکە نەیاندەویسـت پشـتگیری خومەینی بکەن و بڕیاریاندا لەسـەر کاری ژێرزەمینییانەی خۆیـان بەردەوام بـن. بەلام زۆریـنەی بـزووتنەوەکە چەکـی دانـا و پشـتگیری خـومەینی و هەڵوێستە دژە ئەمریکییەکانی کرد.

شـابالّ، کە لەمێـژ بـوو زانکـۆی بەجێهێشـتبوو، لەگەڵ ئەو تەوژمەی دواییـدا بوو.



لە حەفتەمـین ڕۆژی شـەهریوەر[148] (ئۆگسـت-سـێپتێمبەر)ی مـانگی هاوینـدا وەرچەرخانێک ڕوویدا. لە تەهران ئایەتوڵلاکان ریزەکانی خۆیان یەکخست بۆ ئەوەی تا بکرێ خەڵک لەدەوری مزگەوتەکان کۆبکەنەوە. لە سـەعات هەشتی بەیانییەوە، ئەوان بەیەکجـار لە مزگەوتەکـان هـاتنەدەر و بە دروشـم گوتنەوە بەرەو گۆڕەپـانی پەرلەمـان کەوتـنە ڕێ. ڕۆژەکەش ئەو ڕۆژە بـوو، کە چـۆن لایەنگرانی خومەینی، ئاواش هی ڕژێم دەیانەویست هێز و دەسەلاتی خۆیـان نمایش بکەن.



کاتێکیش بە هەزاران خۆنیشاندەر لە هەموو کون و قوژبنێکی تارانەوە بەرەو گۆڕەپـانی پەرلەمـان دەڕۆیشـتن، سـوپاش لە مۆڵگاکـانی خـۆی هـاتەدەر تـا دەرسێکی قورس بە خۆنیشاندەران دابدا.

---

148 Sharivar

ژەنەڕاڵ رەحیمـــی[١٤٩]، کە سەرپەرشـــتی کـردەوەکەی دەکـرد، لە پشـــتەوەی جێبێـــک بە خـــۆی و چـــاویلکە ڕەشـــەکانییەوە لە گۆشـــەیەکی مەیـــدانەکە وەستابوو، هەموو شتی خستبووە بن چاودێری خۆیەوە.

کاتێکیش گۆڕەپانەکە لە خۆپیشـاندەران ڕەشـهەڵگەڕا، فەرمـانی بە تانکەکـانی کـرد هەمـوو دەرگـا لاوەکیەکـان دابـخەن، بـۆئەوەی حەشـاماتەکە دەرفەتـی هەڵاتنیان بۆ نەمێنێتەوە.

خەڵکەکەش هیچ ئاگایـان لە نەخشـەکەی سـوپا نەبوو، چـونکە ئەوان گوڵیـان پێشکەشی سەربازەکان کرد، سەربازەکانیش گوڵەکانیان لێوەرگرتن.

ئیدی ئاپۆرای جەماوەر هاواریکرد: "ئاشتی. ئاشتی! سوپا، ئاشتی!" ئەفسەرانی سوپاش دەستیان هەڵدەوەشاند و وەڵامی ئاشتیان دایەوە.

خۆپیشـــاندەران نەیـــانزانی، بەڵام مەبەســـتەکەش هەرئەوەبـــوو، بـــڕژێنە نێـــو پەرلەمان و تەلارەکەش داگیربکەن. نوسرەت بە نەخشەکەی دەزانی، بۆیە بە خۆی و کامێراکەی جێگەیەکی باشی گرت.

هەر کاتێکیش ڕیزی یەکەم گەیشتە تەلاری پەرلەمان، یەک دوو گەنج بەسەر شوورەکە کەوتن. ئیدی لە چەکبەدەستانی نزیک ئەوێووە، لەسـەر بانەکـانەوە تەقەیان لێکرا و بە کوژراوی کەوتنە گۆڕێ.

خەڵکەکە بەهەموو لایەکدا هەڵدەهات و بە دەنگی بەرزەوە هاوراین دەکـرد: "لا اله الا الله!"

هەرچەنـدە هەر هەمـوویـان هەوڵوتەقەلایـان هەڵاتـن بـوو، لـێ بەدەیـان گەنـج بەرەو دەرگاکـانی پەرلەمـــان غاریانـــدا و ویســـتیان لەوێ بەســـەر پەرژیـــن و شوورەکەیدا بکەون، بەڵام ئەوانیش بە قورسی سزادران.

"لا اله الا ألـــله!" هـــاواری خۆنیشـــاندەرە توورەکـــان بـــوو. ئیـــدی دەســـتیان بە ڕاکێشـــان و پاڵـــدانی شـــوورەبەندە ئاســـنینیەکەی پەرلەمـــان کـــرد، بەڵکـــو تێکیبشکێنن و لێوەی بچنە ژوور. لێ خۆ ئەو دەرفەتەشیان پێنەدرا، چونکە لە هەمـــوو قوژبنەکـــانی گۆڕەپـــانەکەوە ســـوپا دەســـتی کـــردەوە و ســـێرەی چەکەکانیان لە خەڵکەکە گرت.

---

[١٤٩] Rahimi

لە ماوەی تەنها یەک دوو خولەکدا بە سەدان کوژراو و بریندار لە مەیدانەکەدا کەوتن.

نوسرەت، کە لەسەر قەپەنگێک لەوێ خۆی پەنادابوو، هەموو ڕووداوەکەی بە کامێراکەی گرت.

سەربازەکان راوی خۆنیشاندەرەکانیان نا، هەر کەسێک بکەوتایە بەر سێرەی تفەنگیان، تەقەیان لێدەکرد و بەریان دەدایەوە. ئافرەتانیش لەدەرگای هەر مالێکیان دەدا بەڵکو ڕێگای چوونەژوورەوەیان بدەن، پیاوانیش بەسەر دار و دیواردا هەڵدەگەڕان، کچان و کوڕانیش خۆیان لەژێر ترومبێلەکاندا دەهاویشت، ئیدی لە هەموو لایەک پێڵاو، چاکەت، شەپقە. کامێرا، مێزەر و مەندیلە فڕێدرابوون و زۆر چارشێوی ڕەشیش لەوناوە کەوتبوون.

نوسرەت هیچی لەبەردەست دەرباز نەبوو: ژەنەڕاڵ بە خۆی و چاویلکەی ڕەشەوە کە فەرمانی تەقەکردنەکەی دەرکرد، ئەو پیاوانەی لەسەر شوورەکانەوە کەوتنە سەر زەوی، ئەوانەی بە دوای کونە زێرابەکان دەگەڕان تا لەدەست گوللەکان دەربازیان بێ، ئەوانەی بەسەر پەرژینەکان بازیان دەدا، ئەو تانکانەی شەقامە لاوەکییەکانی گۆڕەپانەکەیان گرتبوو و بەسەر جەستە و تەرمی خۆپیشاندەران دەکەوتن.

حەفت خولەک دواتر گۆڕەپانەکە خامۆش بوو، هەموو ئەوانەی پێیان کرا هەڵبێن، هەلاتبوون، بەسەدانیشسیان لە خانووبەرەکانی دەوروبەری گۆڕەپانەکە خۆیان پەنا دابوو. ئەو باقیەی مابۆوە، تەنیا کوژراو و بریندارەکان بوون.

ژەنەڕاڵەکە بڕیاریدابوو لینەگەڕێن هیچ ڕۆژنامەنووسێک پێ بنێتە گۆڕەپانەکە و هەموو کامێرا دۆزراوەکانیش دەبوایە دەردەست بشکێندرابان.

ژەنەڕاڵەکە چاویلکەکانی لەچاو کردنەوە، نیگایەکی لە شەڕگەکە بڕی و فەرمانیدا دەمودەست گۆڕەپانەکە خاوێن بکرێتەوە. دوابەدوای ئەوە سواری جێبەکەی بووەوە بەرەو کۆشک ڕۆیشت، تا ڕاپۆرتەکەی خۆی بداتە شا.

کاتێکیش ئەو ڕۆیشت، نوسرەت لە ڕێی سەربانەکان توانی دەربازی بێ.

سێ ڕۆژ دواتر، تەلەفزیۆنی ئەی بی سی ABC ڕاپۆرتەکەی نوسرەتی پەخش کرد. لەوێدا زیاتر لە هەزار و حەفتسەد کوژراو هەبوون.



ئاغاجان لە تەلەفزیۆنەکەی مارمیلکەدا خەبەروباسی روداوەکانی زانی.
(شا) کە تۆقابوو، قسەی بۆ گەل کرد: "من گویم لە دەنگی شۆرشەکە بوو! گوێم لە گەلی خۆم بوو. وایە هەڵە کراون، سەروەزیرێکی نوێ بۆ پەرلەمان پێشنیاز دەکەم تا کاروبارەکان ڕاست بکاتەوە. من داوا لەگەل دەکەم هەندێ ئارام بگرێ."
دەنگی شا لەرزۆک بوو، دوانەکەی شێواو و شپرزە بوو و لە کاتی خوێندنەوەشدا زمانی تێدەگیرا.
یەک دوو ڕۆژ دواتر، سەروەزیرێکی نوێی دانا، بەڵام دەستبەجێ خومەینی رەتی کردەوە، بۆیە کابینە نوێکەش زیاتر لە یەک دوو هەفتە نەیتوانی خۆی بگرێ.
شا بەدوای بەربژارێکی دیکەدا گەڕا، لێ کەس نەدەوێرا خۆی لێبدا.
شتێکی حاشاهەڵنەگربوو، دەبوایە شا دەسەڵاتی رەها بداتە هێزی سەربازی.
ژەنەڕاڵ ئەزهاری[150]، کە لەنێو سوپادا پرمەیلترین ژەنەڕاڵ بوو بۆ ئەمریکا، کابینەیەکی سەربازی پێکهێنا. هەر دەستبەجێش فەرمانی قەدەغەکردنی هاتووچۆی شەوانەی لە تاراندا ڕاگەیاند.
بۆ ئەوەی فەرمانەکەی پووچەڵ بکرێتەوە، خومەینی بانگی هەمووانی کرد، شەوان لێوەسەر بانان بکەون.
ئیدی بە ملیۆنان هاوڵاتی گوێڕایەڵی بانگەوازی خومەینی بوون، چوونە سەر بانەکان و بە دەنگەوە هاواریان دەکرد: لەگەڵ ئەمریکا دەفن بە! ألله أکبر!"



ئەرێ بۆچی ئاغاجان لەسەر بانەکە نەبوو؟ باشە تۆ بڵێی ئەو دژی ڕژێم نەبێ؟ ئەرێ ئەو بە کۆتاییهاتنی شا دڵخۆش نەبوو؟ باشە ئەو بەهاتنی خومەینی شادمان نەبوو؟
باشە دەرودراوسێ چی پێدەڵێن کاتێ دەبینین هیچ ئەندامێکی خانەوادەکەی نەچۆتە سەربان؟
- "فەخری؟" ئاغاجان وای بانگکرد.

---

[150] Azhari

بەڵام خـۆ فەخـری لەبەر دەنگەدەنـگ و ژاوەژاوی ئـاپۆراکە گـوێی لە هـیچ نەبوو.

- "ئەرێ کچەکان!"

نەسرین، کیژە گەورەکەی بەپیر دەنگییەوە هات.

- "هەمووان لەسـەر بـانن. منیش وادەچمە سەربان. ئەدی دایکت لە کوێیە؟ ئێوەش دێن؟"

لەسەر پەیژەکە تووشی مارمیلکە هات.

- "دەتوانی بانگدەرەکە بێنی؟"ئاغاجان وای داوالێکرد.

مارمیلکەش خێرا چووە ژێر زەمینەکە تا مامەی بانگدەر ئاگاداربکاتەوە.

هەندێک دواتر، ئاغاجان، بانگدەر و فەخری سادات و کچەکانی، کە چارشێوی ڕەشیان لەخۆدابوو، هەموویان لەسـەر بانەکەوە هاواریـان دەکرد: "ئەڵڵاهـو ئەکبەر، ئەڵڵاهو ئەکبەر!"

مـارمیلکەش لەسـەر قەراغێکـی گـومبەزەکە دانیشـتبوو بە سەرسـوڕمانییەوە سەیری ئەو حەشاماتە جۆشدراوەی دەکرد.



بێهـوودە شـا هەوڵـی دەدا، ئەو سیاسـەتوانە ڕێزلێگیـراوانە بـدۆزێتەوە، تـا لەکـابینە نوێکەیـدا هەوڵـی ئاشـتبوونەوە بـدەن. تـاکە سیاسـەتمەدارێکیش ئامادەنەبوو ئەو ئەرکە قورسە و هیوابڕاوە بگرێتە ئەستۆی خۆی.

لەگەڵ ئەوەشدا شا توانی بەختیار[151]، دووهەمین کەسی نێو پارتی نیشتمانی، ڕازی بکا، تا وەک سەروەزیرێکی ئاشتیهێن دەستبەکاربێ.

بەڵام ئەویش تەنها بەمەرجێک بە ئەرکەکە قایل بوو، دەبوایە دەسـتبەجێ بۆ ماوەیەکی نادیار شا وڵات بەجێ بێڵێ.

شـاش چـووە بـن بـاری مەرجەکە. ئیدی لەو ڕۆژەوە هەمـوو شـتێک زۆر بە خێرایی تێپەڕی. شتەکە وەک ئەوە وابوو بارستە سەهۆڵێکی قەبە لەسـەرەوە بۆخـوار بجـوڵێ و وەک ڕنـوو هەرەس بێنـێ و هەمـوو شـتێک لەگەڵ خـۆی ڕاپێچ بکا.

---

[151] Baktiar

بۆ سپێدەی پاشتر، کاتێ ئاغاجان گەیشتە سەر بوغازە و نووسینگەکەی لەبازاڕ، جەنجاڵییەکی زۆر پەیدابوو.
شا ڕۆیشتبوو. ئاغاجانیش چوە لای کرێکارەکانی و وەستا، کە سەیری تەلەفزیۆنیان دەکرد. شا لەگەڵ فەرەح دیبادا لە فڕۆکەخانەی تاران بوون. ئەوان بە کۆمەڵە کاربەدەستێک دەورەدرابوون.
بەختیاریش دەستی تەوقەی بۆ درێژکرد و هیوای گەشتە فڕینێکی خۆشی بۆخواست.
لەپڕیش ئەفسەرێک خۆی بەسەر پێیەکانی شادا بەردایەوە و کەوشەکانی ماچکردن. لێیپاڕایەوە نەڕوا. (شا)ش بەو دیمەنە ئەوەندە پەشۆکا، فرمێسکی بەسەر ڕوومەتەکاندا هاتنەخوار.
یەکێکیش قورئانێکی هێنا لەسەر سەری شای ڕاگرت تا بە بنیدا تێپەڕێ. ئاخر دابێکی ئێرانییە، بۆ گەشتکردنی خۆشەویستان وایان دەکرد.
شاش قورئانەکەی ماچکرد لێ بەسەر فڕۆکەکە کەوت. دوای ئەو، فەرەح دیباش قورئانەکەی ماچ کردو بەدوای شادا ڕۆیی. ئەوان سواری فڕۆکەکە بوون. فڕۆکەکە بە یاوەری دوو فڕۆکەی نیشانەپێکی جەنگی فڕین و تا سەر سنوور لەگەڵی ڕۆیشتن.



سێزدە ڕۆژ دواتر، ئاغاجان و فەخری سادات لەگەڵ کچەکان و مارمیلکەدا سەیری فڕۆکەخانەی فەرەنسایان دەکرد، کە تەکنیکییەکان فڕۆکەیەکی کۆنکۆرد[152]یان بۆ گەڕانەوە مێژووییەکەی ئایەتوڵلاکە ئامادە دەکرد.
بەختیار هۆشداری دایە خومەینی، ڕێگەنادا لە وڵات بنیشێتەوە، بەڵام خومەینی گوێی بەو هۆشداریە نەدا: "بەختیار هیچ نییە! هەر ئەزم بڕیاردەدەم! من کابینەی حکوومەتی شۆڕشگێڕی دەستنیشان دەکەم. من دەگەڕێمەوە نیشتمان."



ئیدی بەیانی سەر لەزوو، بە ملیۆنان لە خەڵک بەپێ، ڕێگای فڕۆکەخانەی تارانیان گرتەبەر، کە فڕۆکە کۆنکۆردە فەرەنسییەکەی لێدەنیشتەوە.

---

[152] Concorde

شابالیش لەنێو ئاپۆرای جەماوەرەکەدا بوو. دەیەویست هەموو شتێک بە چاوی خۆی ببینێ و وتاریکیشی لەبارەوە بنووسێ.
نوسرەتیش بە خۆی و کامێرایەکی گەورەی سەرشان لەنێو جێبێکی کراوەدا بوو، کە پیاوێکی بە ڕدێن لێیدەخوڕی، بۆ هەر شوێنێک نوسرەت ویستبای دەڕۆیشت. ئەو تاکەکەس بوو، لە نزیکەوە بتوانێ هەموو شتێک تۆمار بکا.
زۆری نەبرد فڕۆکە کۆنکۆردەکە لەسەر ئاسمانی فڕۆکەخانەکە بە دەرکەوت.
"صلی ألله علی محمد! خومینی *خوش آمد*، خومەینی بەخێربێتەوە!"
کاتێکیش فڕۆکەکە نیشتەوەو کەمێکیش دواتر دەرگاکە کرایەوە، خومەینی وەک یەکەمین کەس لە پێشەوە بە دەرکەوت و لە پلیکانەکان دابەزی. بە خۆگرییەوە دەستی بۆ خەڵکەکە ڕاوەشاند.
"*سلام بر خومینی!*" ئاپۆراکەش بە جۆشەوە وای هاواردەکرد.



ئاغاجان چووەدەر. لە کۆلانەکەشدا تووشی مەلا ئەحمەد بوو. هەر بە خۆیشی نەیدەزانی بۆچی وادەکا، بەلام ئامێزێکی تێوەرێنا و توند گرتی. ئەوان هیچ شتاقیان[153] نەیاندەزانی ئاخۆ چی چاوەڕێیان دەکا.

## قازی[154]

"ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا، ئەستەغفیروڵلا." خالخالی کاتێ بەرەو ژووری خومەینی ڕۆیشت، ئەم ئەستەغفروڵلایەی بە ورتەیەکەوە چەندبارە کردەوە.



کەسێک "ئەستەغفیروڵلا" دەڵێ، کاتێ گوناحێکی کردبێ یان بترسێ گوناحێک بکا، یان نەیەوێ ڕووبەڕووی شتێک، کەسێک ببێتەوە، کەچی هەر تووشی

[153] هیچ شتاقیان: هیچ کامیان.
[154] Ghazi

دێ. هەندێ جاریش وشەکە دەربڕی سەرسامبوونێکە بە شتێک، کە چاوەڕێ نەکرێ مرۆ تووشی بێ یاخود داوای لێخۆشبون لە خودای خۆی بکا.
یاخود مرۆ ئەو منگەیەی لە دەم دێتەدەر، هەروەک خالخالی کردی، کە دواتر هەڵەی حەتمی بکا..



خومەینی نەیدەویست کۆشکەکەی شا بکاتە مەنزڵگای خۆی، ئەو ژوورێکی لە قوتابخانەیەکی مەلایەتی لە گەڕەکێکی پشتەوەی تاران بۆ لێژیان دیاریکرد. هێشتا هەر تاریک بوو، کاتێ ئەو چووە هۆدەکە و لەسەر مافوورێک دانیشت. لەوێ پیاڵەیەک چای تازە دێمکراو و هەندێ دەنکە خورمایان لەپێش دانا. کاتێکیش فرێکی لەچایەکە دا، داوای قەڵەم و کاغەزێکیشی کرد.
نیوسەعات بە تەنها لەژوورەکەی دانیشتبوو؛ پاشان بانگی خالخالی کرد. دەستبەجێش خالخالی بەدەم بانگکردنەکەیەوە هات. کاتێ چووە ژوور، دەرگاکەی لە دیوی ناوەوە داخست، لەبەر خومەینی چەمایەوە و دەستەکانی ماچ کردن.
دوای ئەوەی خومەینی وەک ڕابەرێک هاتەوە وڵات، خالخالی یەکەمین کەس بوو، ئەزبەنییایەتی[155] خۆی بۆ دەربڕی. بەمجۆرە خۆی خستە بەردەستی ئیمام خومەینی و دەست لەسەر سینگ بوو بۆ هەر کار و چالاکییەک پێی بسپێرێ.
بە سرتەیەکەوە خومەینی پێیگوت لێی نزیکتربێتەوە. خالخالی تێگەیشت، ئەرکێکی نهێنی پێدەسپێرێ، ئیدی گوێی بردە لای دەمی ئەو و تا باش ببیستێ.
لە کاتێکدا بەڵگەنامەکەی ڕادەستکرد، ئەم قسەیەشی پێگوت: "من وەک دادوەرێکی خودا دائدەنێم."
لە تاو قسەکە، دەستەکانی خالخالی لەزین.
"ئەمریکا هەموو کارێک دەکا، بۆ ئەوەی دەرمان بکاتەوە. من دەمەوێ هەموو پاشماوەکانی ڕژێم لەناوببردرێن. هەر کەسێک دژی شۆڕش بوەستێتەوە،

---

[155] دەروێشایەتی، مریدایەتی، لایەنگرێتی بێ چەندووچوون.

لەناوی بەرە! ئەگەر ئەوکەسە خودی باوکیشت بوو، لەناوی بەرە! ئەگەر برات بوو، هەر لەناوی بەرە! هەموو شتێک تێکبشکێنە کە بکەوێتە سەر ڕێی ئیسلام! تۆ نوێنەری منی، بەلام بەرپرسیارێتیەکەت تەنیا لە بەرامبەر خودا دایە. دەی کارێکی وابکە، سەرکەوتنی شۆڕش حەتمی بکا. دەی هەر ئێستا بە بێ وەخران، ئەرکەکەت بەجێبگەیەنە!"

خالخالی جارێکی دیکە دەستی خومەینی ماچ کردەوە، لەکۆتایدا هەلسایەوە و لە ژوورەکە هاتەدەر و دەستبەجێ بەرەو بەجێگەیاندنی ئەرکەکەی ڕۆیشت.



هەرچەندە تاریکیش بوو، لێ ئەو چاویلکە ڕەشەکانی، کە لە پاریسەوە هێنابوونی، کردیە چاوەکانی.

ئەو خالخالییە چیدیکە ئەو خالخالییەی جاران نەمابوو، کە لە شاری زەنجاندا پشێوی نایەوە و خەلکی دژی کردنەوەی سینەما نوێیەکە لە لایەن فەرەح دیبادا هاندا. ئەو دەبێ بەو پێگەیەی کە تازە پێیدراوە، ببێتە مایەی ترس و بیم و تۆقاندن.

یەک سەعات دواتر، بە خۆی و نەخشەیەک لەبن هەنگلەوە سواری جێبێک بوو، کە بۆ ئەو لەبەر دەرگا وەستابوو.

جێبەکە ئەوی گەیاندە گەورەترین دەباغخانەی شارەکە، کە ڕۆژانە بە هەزاران مانگ و مەڕی بۆ دانیشتوانی تاران تێدا سەردەبڕدرا.

ئاخر ئەویش هەر ئەو جێگایە بوو، کە گرنگترین کاربەدەستانی ڕژێمی پێشوو بە نهێنی تێدا دەستبەسەر کرابوون. خەلک دەترسا نەبادا ئەمریکا ڕزگاریان بکا، بۆیە ئەو کەسانەیان هێنانە نێو تەوێلە بۆگەنییەکەی چێل و مەڕومالات.

خالخالی چووە بن هەیوانێکی تاریک، کە دوو کورسی لێبوون، کورسییەکیان بەرزبوو لە پشت مێزێک بۆ دادوەری خودا و کورسییەکیش بۆ تۆمەتبارەکە داندرابوو.

گلۆپێکی بچووکیش لە بنمیچەکە، لەسەر کورسی تۆمەتبارەکە قایمکرابوو و تەنها ڕووناکاییەکی کزی زەردی بەسەر بیچمی تۆمەتبارەکەدا پەخشدەکرد.

کات خەریکبوو درەنگ بکەوێ، بەیانی لەگەڵ ڕۆژ هەڵاتندا دەبوایە هەمووان لەوە تێگەیشتبان، ئیدی ڕژێمی پێشوو کۆتایی هاتووە، هیچ دەرفەتی گەڕانەوەی شا لە لایەن ئەمریکییەکانەوە نەماوە، تا جارێکی دیکە بیخەنەوە سەر تەخت.

خالخالی فایلەکەی لەسەر مێزەکە دانا و گوتی: :یەکەمین تۆمەتبار بێنن."

یەکەمین تۆمەتباریش هوەیدا[156]ی سەرۆوەزیری پێشووی شا بوو. ئەو بە دەستی کەلەپچەکراوەوە هێنرایە ژوور.

هوەیدا پازدە ساڵ سەرۆوەزیر بوو، بەردەوامیش قاتی کەشخەی لەبەردەکردن. بە خۆی و دارێک بەدەستەوە لە ڕێگا دەڕۆیی، قۆپچەکانی ڕەنگ ئەرخەوانی و هەمیشەش قەلێنێکی بەدەمەوە بوو. لێ هەنووکە تەنیا بێجامەیەکی پیسوپۆخڵی لەبەردایە.

بێجگە لە خالخالی، وێنەگرێکی دەمامکداریش لە هەیوانەکە هەبوو، وێنەی تۆمەتبارەکانی دەگرت.

- "دەکرێ تۆمەتبارەکە دابنیشێ." خالخالی وای بانگرد و خۆیشی چووە سەر کورسییەکەی.

هوەیداش لەسەر کورسییە دەستنیشانکراوەکە دانیشت.

- "تۆ لە بەرامبەر دادوەری خودادا وەستاوی،" خالخالی بە دەنگێکی زبری ئاسنین وای پێگوت، "لە دۆسیەکەی تۆ کۆڵراوەتەوە، تۆ سزای مردنت بەسەردا دەسەپێ. باشە هیچی دیکەت هەیە بیڵێی؟"

هوەیدا، کە هەمیشە وەک میوانی شەرەف لە لایەن سەرۆکەکانی ئەمریکاوە پێشوازی لێدەکرا، هوەیدا، کە تا ئەوکات سێ جاران لە لایەن ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکاوە پێشوازی گەرمی لێکراوە و چەپڵەی بۆ لێدراوە، ئەوەی لە ئەمریکا قانونی خوێندبوو، ئێستاش لەنێو تەویڵەیەکی بۆگەندایە، کە هەرگیز بە دادگا ناناندرێ، وەستێندراوە؛ بۆیە لە حەیفان هیچی نەگوت، بەڵام دواتر لە خۆوە دەمی جووڵا وەک ئەوەی قەڵنەکەی خۆی بکێشێ.

- "شتێکت گوت؟" خالخالی وایلێپرسی.

- "نەخێر، هیچ شتێک." هوەیدا هەر بە ئەوەندە لێگەڕا.

---

[156] Howeeda

- "مـن بڕیـاری مەرگ بەسـەر تۆمەتبـارەکەدا دەدەم! خالخـالی وایپێگـوت. "بڕیاری مەرگیش هەر ئێستا جێبەجێدەکرێ."

هوەیدا کە هێشتا نەهاتبووە سەرخۆی ئاخۆ بەڕاستی سزای مەرگی بەسـەردا دراوە، ڕاستەوخۆ لە لایەن پاسەوانەکانەوە لەوێ لابردرا.

ئەو گواسترایەوە ژوورە کۆگایەکی پشتەوەی هۆڵی سەربڕینی ئاژەڵەکان، کە تـازە بە هەزاران مانگـا تێیـدا سـەریان بڕابـوو، لەوێ لەسـەر یەک کەڵەکە کرابـوون. ئەوێ بـۆنێکی وا بـۆگەنی لێـدەهات، ئەوەنـدە نـاخۆش، دەبـوایە یەکسـەر بە دەسـتی خـۆت کەپـووت بگرتبـایە. پاسـەوانەکان هوەیـدایان لە بەرامـبەر دیـوارەکە ڕاگـرت و چاوەکانیـان بە پـارچە پەڕۆیەک بەسـتن. بە گوێرەی دابی ئیسـلامییانە ئەوان پەرداغە ئاوێکیان پێشکەش کرد، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە هەر دەستیشی بۆ ببا.

هوەیدا لە نێو بێجامەکەیدا دەلەرزی، بەڵام هێشـتاش بـڕوای نەدەکـرد، وەک ئاژەڵێک سـەری ببـڕن، پێیوابوو ئەمە هەوڵوتەقەللایەکە بـۆ ترسـاندن. ئیدی دەنگـی تەپەی پێـی خالخـالی لە ڕاڕەوەکە هـات. کەمێـک دواتـر ئامـاژەی بە پاسـەوانەکان دا، ئەوانـیش دەسـتبەجێ مەودایەک لە بەرامـبەری هـویەدا وەستان.

- "ئامادەبن!" خالخالی وەک فەرماندەیەکی سـەربازی بە دەنگەوە وا بـانگی کرد.

پاسەوانەکان ئەژنۆیان گەیاندە سەر زەوی، لوولەی تفنگەکانیشیان ڕووی لە هوەیدا کرد.

- "من بێ تاوانم!" هویەدا دەستبەجێ بە دەنگێکی لەزرۆکەوە هاواری کرد.

- "تەقە بکەن!" خالخالی وای فەرمان کرد.

ئیدی حەفت جار تەقەی لێکرا، جەستەی کونکونکراوی هوەیدا کەوتەخوار. ڕوومەتـی کە بەر بەردەکـانی نـاوکەوەکە کەوت، شـوێنەکەی تەرکـرد. وێنەگرەکەش وێنەکەی خۆی گرت.

خالخالی گەڕایەوە سەر کورسییەکە و بانگی تۆمەتباری دووهەمی کرد.

بەرپرسـی پێشـووی دەزگـای نهێنـی هەواڵگریـان هێنـا. ئەو گـوێی لە دەنگـی تەقەکە ببوو، لە ترسان زەندەقی چووبوو.

- "دەی دانیشە!"

پاسەوانەکان یارمەتیان دا ، تا دابنیشی.

- "تۆ باسیری[157]؟"

- "بەڵێ." ئەو بەهەندێ وەخرانەوە وای وەڵامدایەوە.

- "تۆ بەرپرسی دەزگای نهێنی هەواڵگری بووی، بە زەمانی ئێوە سەدان جەنگاوەر گیران، ئەشکەنجەدران و کوژران؟"

باسیری هیچ وەڵامی نەدایەوە.

- "ئەرێ تۆ بەرپرسی دەزگای هەواڵگری نهێنی بووی؟" خالخالی پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە.

- "بەڵێ" ئەویش بە نەرمییەوە وەڵامی دایەوە.

- "دادوەری خوا فەرمانی سزادانی مردنت بەسەردا دەدا!" خالخالی وای پێگوت. "حوکمەکەش هەر ئێستا جێبەجێ دەکرێ. باشە هیچی دیکەت هەیە بیڵێی؟"

باسیرییە تۆقاوەکە، ئەو کەسەی جاران، خەڵک تەنیا بەناوهێنانی دەترسان و دەکەوتنە لەرزە، منداڵی گرینۆکی نێو بێشکەیان بە ناوی کڕدەکردنەوە، خەڵک لەبەرامبەری دەستی بەگریان دەکرد و لێیدەپاڕانەوە بەڵکو لێیان خۆش بێ، کەچی هەنووکە بە ئاماژەیەکی خالخالی لەوێ راکێشرایە ئەو کۆگایەی، کە کەمێک پێشتر هوەیدایان تێدا تیرباران کرد. پاسەوانەکان چاوەکانی تۆمەتبارەکەیان بەستنەوە، جامە ئاوێکیشیان دایێ و لە پەنا دیوارەکەشدا رایانگرت.

- "ئامادەبن." خالخالی بە توندی بانگی کردن.

پاسەوانەکان دیسان چۆکیان گەیاندنە سەر زەوی و لوولەی تفەنگەکانیان ئاراستەی باسیری کرد.

- " دەی، تا دوا فیشەک تەقەی لێبکەن!" خالخالی بە متمانە بەخۆبوونەوە وای فەرمان کرد.

ئینجا تەقەیان لێکرد، پاسەوانەکان تا دوا گوللەی پێیانبوو لێیاندا. تیربارانکراوەکە هیچ دەرفەتێکی ئەوەشی پێنەدرا بکەوێتە سەر زەوی. پاشان

---

[157] Basiri

دوای دوا فیشەک، ئەوسا بەسەر دەموچاویدا کەوتە سەر کەلاکی مانگا بەسەر یەکدادراوەکان و هەردوو باسکی لێکبوونەوە.



خالخالی لەسەر کارەکەی تا بەرەبەیانێکی زوو بەردەوامبوو. ئەو هەموو سەرە بەرزەکانی ڕژێمی، کە لە ماوەی ڕابردوودا گیرابوون و لە نێو دەباغخانەکەدا داندرابوون، گوللەبارانکردن.

کاتێکیش لەکارەکەی بووەوە، دەستەکانی خۆی شوشتن و داوای نانی بەیانی کرد. مەجمەیەکی زیویان بۆهێنا؛ شیر، هەنگوین، هێلکەی کولا و نانی گەرم و تازەی لەسەر بوو. لەپاڵ خواردنەکەدا ڕۆژنامەی بەیانیشی بۆداندرا: لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکەدا وێنەیەکی هوەیدا بوو، هی ئەوکاتەی بە چاوبەستراوی یەکەمین گوللەی بەر سینگی دەکەوێ و هەردوو باڵەکانی بەهەوادا فش دەبنەوە.



لە ماوەی هەفتەیەکدا، خالخالی پەنجا مەلای گەنجی لەقوم ڕاهاتووی بینین، ئەوانە قوتابی قوتابخانەی مەلایەتی بوون، کە شەریعەتی ئیسلامییان تێدا دەخوێند.

خالخالی ئەو مەلا گەنجانەی وەک دادوەر دەستنیشان کرد و ناردنیە شارە گەورەکان تا کاربەدەستانی ڕژێمی پێشوو بە هۆی تاوانەکانیان سزا بدەن. ئەو بۆ هەریەکەیان بڕوانامەیەکی دانەدەست، تا بێبەزەییانە دەستیان لە هەموو جۆرە سزایەک واڵا بێ.



لەوێش لە زەنجان، لە دەرگای ماڵی ئاغاجان درا. ئەو هێشتا لە بازاڕ نەگەڕابۆوە، ئیدی مارمیلکە دەرگاکەی کردەوە. سێ پیاوی چەکدار، کە شریتێکی کەسکیان لە نێوچاوان بەستبوو، لێهاتنە ژوور. ئەوان سەربازی لەشکری ئەڵڵا[١٥٨] بوون، لەشکرێک لە کۆمەڵە میلیشیایەک پێکهاتبوون و لە

[١٥٨] ڕۆماننوس لەدەقەکەدا وشەی Allahاللە ی بەکار هێناوە، ئەو وشەکەی وەرنەگێڕاوەتە سەر هۆلەندی، منیش وەک خۆیم نووسیوەتەوە. وەگێڕ

کاتی شۆڕشەکەدا لە مزگەوتەکان دروستکرابوون تا فەرمان و ڕێنماییەکانی ئیمام خومەینی جێبەجێ بکەن.

- "ئەحمەد لە کوێیە؟" یەکێ لە پیاوە چەکدارەکان وای بە مارمیلکە گوت.

(فەخری سادات) لە ناندینەکە بوو، پیاوەکانی بینین، بەڵام لەبەرئەوەی چارشێوی لەسەر نەبوو، نەیدەتوانی ناندینەکە جێبهێڵێ. ئیدی جامی پەنجەرەکەی کردەوە و بانگی کرد: "گەنجۆ، دەکرێ بچی چارشێوەکەم بۆ بێنی؟"

مارمیلکەش چارشێوەکەی بۆهێنا.

فەخری چارشێوەکەی بەسەر خۆی دادا و هاتە بەردەرکە و لێپرسین: "بەڕێزان، فەرموو چیتان دەوێ؟"

- "ئەحمەد لە کوێیە؟" یەکێ لە پیاوەکان بە دەنگێکی زبر و ناشیرنەوە وای لێپرسیەوە.

- "ئێمە ئەرکێکمان پێسپێردراوە کە لەگەڵ خۆمانی بەرین؟"

- "باشە ئێوە بۆ کوێی دەبەن؟"

- "بۆ دادگای ئیسلامی!"

ئیدی هەر لەوکاتەدا مەلا ئەحمەد بەبێ جبە و مێزەر پەیدابوو، لە حوجرەکەیەوە بۆ لای حەوزەکە دەهات. یەکسەر پیاوەکانیش بۆلای ئەو غاریان دا.

ئەحمەد  بە ترسێکەوە سەیری کردن و پرسی ئاخۆ ئیشیان بەو چییە.

- "ئێمە نێردراوین تا تۆ لەگەڵ خۆمان بەرین، تۆ لە دادگایەکی ئیسلامییدا دادگایی دەکرێی."

- "بۆچی؟ ئاخر من چ کارم بەوێ هەیە؟"

- "ئێمە ئەوە نازانین."

- "من بۆ هیچ شوێنێک ناڕۆم!" ئەحمەد وای گوت و لەبەر حەوزەکە نوشتایەوە تا دەست و دەمو چاوی خۆی بشوا.

ئیدی پیاوەکان بن پیلیان گرت و بەدوای خۆیاندا ڕاپێچیان کرد.

ئەحمەد هەندێ بەرگری کرد و هاواری کرد: "باشە ئەوە واتای چی دەگەیەنێ؟ دەی بەرمدەن!"

بەڵام پیاوە چەکدارەکان هەر گوێشیان پێنەدا.
ئەحمەد بە زەحمەتییەکەوە ڕووی خۆی بەرامبەر مەککە وەرسوڕاند و گوتی:
"خوایە، یارمەتیم بدە!"
فەخری ساداتیش داوای لە مارمیلکە کرد دەرگاکە دابخا.
- "جەواد، ئەو شەوە هاتبووە ماڵ، لەژوورەکەی هاتە خوار.
- "زەنگ بۆ ئاغاجان لێبدە! دەی دەستبەجێ!" فەخری سادات وای پێگوت.
فەخری چووە بەردەم پیاوەکان ڕاوەستا و پێیگوتن: "بۆ خاتری خوا ئێوە خەریکی چین؟ ئاخر ئەوە مەلای مزگەوتییە! شەرم لەخۆتان ناکەن؟"
مارمیلکەش گوێی لە دەنگی پێی ئاغاجان بوو لە کۆڵانەکە دەهاتەوە لای ماڵێ، دەستبەجێ دەرگاکەی کردەوە بە زمانە شێواوەکەی خۆی شتێکی پێگوت. ئاغاجان بینی ئەحمەد لەدەستی پیاوە چەکدارەکاندایە و هەر خۆی ڕادەپسکێنێ.
- "بوەستن، بوەستین، دەی جارێ بوەستن! ئەوە چییە؟ دەی پیاوەکە بەردەن!" ئاغاجان وای بە چەکدارەکان گوت.
لەو دەنگەدەگەڕا یارۆی بانگدەریش پەیدابوو، کیژەکانی ئاغاجانیش لە ژوورەکەیان هاتنە خوارێ. ئاغاجان لە پشتەوەڕا یەکێ لە پیاوەکانی گرت. ئەحمەد کەوتە سەر زەوی، دەیەویست غاربداتە لای پەیژەکان و لەوێوە لێوەرسەر بانەکە بکەوێ، بەڵام چەکدارەکان بەرپێیەکیان دایەبەر، بە شێوەیەک لە لای حەوزەکە بە زەوی کەوت. پیاوە چەکدارەکە چووە سەری، ئەژنۆی خۆی لەسەر پشتی دانا، بەهێز بۆ سەر زەوی پاڵی پێوەنا و دەستەکانی کەلەپچە کردن.
مارمیلکەش بە سەرسوڕمانەوە لە لای یارۆی بانگدەر وەستابوو.
ئاغاجان هێشتا هەوڵیدەدا لەگەڵ پیاوەکان بدوێ: "بەڕێزان، من بە خۆم دەیهێنمە دادگای ئیسلامی. من نامەوێ شتەکە بەو شێوەیەی لێبێ. من ئاغاجانم، دەکرێ باوەڕ بە قسەی من بکەن، من لەگەڵ ئێوە دێم. ئەوەی ئێستا دەیکەن، کارێکی ڕاست و دروست نییە."

یەکێ لە پیاوەکان پاڵێکی بە ئاغاجانەوە نا و هەندێ دووری خستەوە. لە کۆتاییدا جەواد کەوتە نێوانیان و باوکی خۆی گرتەوە و گوتی: "دەی بەسەیەتی، تۆ ناکرێ وا لەباوکم بکەی!"

– "ئەڵڵا! ئەڵڵا! ئەڵڵا!" ئەحمەد وای گوت کە پیاوەکان بە زۆر خستیانە نێو جیپەکەیان.

– "باشە ناوونیشانی دادگا ئیسلامییەکەتان چییە؟" ئاغاجان بەبێ دەسەڵاتی وای بانگلێکردن.

ترومبێلەکە پێی پێوەنا و دەرچوو، هیچ وەڵامێکی وەرنەگرتەوە.

فەخری سادات گریا. کیژەکانی دەستی دایکیان گرت و بردیانەوە ژوور.

جەوادیش ویستی ئاغاجان بباتەوە ژوور، بەڵام ئەو لەگەڵی نەچوو.

"ئای، چ ڕەوشێکی سامناکە. دەمەوێ بزانم ئاخۆ بۆ کوێیان برد." وای گوت و لەدەرگەکەوە چووەدەر.



پیاوە چەکدارەکان مەلا ئەحمەدیان بە چاوبەستراوەیی بردە شوێنێکی نهێنی، کە لەو ڕۆژەوە بەدواوە بۆتە بارەگای دادگای ئیسلامی.

کاتێکیش پیاوەکان پەڕۆکەکەیان لەسەر چاوەکانی مەلا ئەحمەد کردەوە، بینی لە ژوورێکی پیس و پۆخڵ دانراوە، لێ هیچ بیرۆکەیەکیشی نەبوو ئاخۆ لە کوێیە. بەڵێ، ئەوەندەی زانی، ژوورەکە ژێرزەمینێکە، ئەو سێزدە پەیژەی ژماردن تا گەیشتە ئەو شوێنەی لێیەتی.

هۆدەکە هیچ پەنجەرەیەکی تێدا نەبوو، دیوارەکانیشی بە پارچە پەڕۆی ڕەشی گەورە داپۆشرابوون، بە بۆیەش دەقی پیرۆزی لەسەر نووسرابوون.

لەوێ لە ژوورەکە، مێزێک و کورسییێکی بڵند کە ئاڵایەکی کەسکی لە پشت چەقێندرابوو هەبوو، ئاڵاکەش نیشانەی ئیسلام بوو، ئاڵاکە بە بزمار و هەندێ بەلاری لە دیوارەکە درابوو.

بەدەر لەوە، کورسییێکی بچوکتر داندرابوو، دەبوایە ئەحمەد لەسەری دابنیشتبووایە. پیاوەکان مەلا ئەحمەدیان بە تەنیا لەو ژوورە شێدارەدا جێهێشت، گڵۆپێکی بچووکییش لەسەر سەری بەکزی داگیرسابوو.

یەک سەعات دواتر، هیچ نەقەوما، ئەو هەر لەسەر کورسییە نزمەکە دانیشتبوو.



بێدەنگی ژوورەکە و نادڵنیایی دۆخەکە مەلا ئەحمەدی ترساند.

پاشان لەوێ لە شوێنێک دەرگایەک کرایەوە و دەنگی تەپەی پێیان لەسەر پەیژەکانەوە هات.

یەکێ لە ئێشکچییەکان هاتەژوور و بانگی کرد: "دادوەری ئیسلام هات! دەی هەڵسەرە سەرپێ!"

مەلا ئەحمەدیش هەڵسا. ئەو بیچمی مەلایەکی گەنجی بینی، کە لە پشت مێزەکە و لەسەر کورسییە بەرزەکە دانیشت.

- "دەکرێ تۆمەتبارەکە دابنیشێ!" ئەو بانگی کرد.

ئەحمەد لەسەر کورسییەکە دانیشت و سەیرێکی بەرامبەرەکەی کرد، بەڵکو مەلایەکە بناسێتەوە، بەڵام بەهۆی ئەو گڵۆپە کزەی لەچاوی خۆی دەدا، نەیتوانی سەروسیمای مەلایەکە بەباشی ببینێ.

- "من ناوی تۆ دەخوێنمەوە، ئەگەر ڕاست بێ، بڵێ بەڵێ. پاشان یەک دوو پرسیارت لێدەکەم، دەبێ وەڵام بدەیتەوە" دادوەرەکە وای پێگوت.

- "من مەلای شارەکەم. بەرلەوەی هیچ وەڵامێک بدەمەوە، دەمەوێ جبە و مێزەرەکەم بۆ بگەڕێنیتەوە. دەنا وەڵامی هیچ پرسیارێکت نادەمەوە!"

- "تۆ ئەحمەد ئەلسابری، کوڕی موحەمەد ئەلسابری."

ئەحمەد بێدەنگ بوو.

- "تۆمەتبار، ئەندامێکی کارای دەزگای هەواڵگری نهێنی بووە،" دادوەرەکە وا لەسەر قسەکانی ڕۆیشت؛ "ئەوەش قورسترین تاوانە کە مەلایەک بیکا."

- "ئەوە وانییە. من هیچم نەکردووە." ئەحمەد ئاوا بێدەنگیەکەی خۆی شکاند.

- "ئاخر هەمووی لێرەدا نووسراوە!" دادوەرەکەش وا وەڵامی دایەوە، ئەمەی گوت و فایلەکەی بەردەمی بەرزکردەوە.

- "ئەوە فایلێکی ساختەیە، چونکە من لە هەموو کەسێک باشتر دەزانم، هیچ شتێکی نارەوام نەکردووە و ئۆباڵی هیچ تاوانێکیشم لە ئەستۆدا نییە."

- "ئێمە بەڵگەی ڕوونوئاشکرامان هەن، کە تۆ ئەندامێکی کارای دەزگای هەواڵگری نهێنی شا بووی." دادوەرەکە وای پێگوتەوە.
- "تۆ هیچ بەڵگەیەکت بەدەستەوە نییە، چونکە من هەرگیز نۆکەری دەزگای هەواڵگری نهێنی نەبوومە. وەک مەلایەکی شارەکە، پەیوەندیم لەگەڵ هەمووواندا هەبووە. ئەوەش جیاوازی نەدەکرد، ئاخۆ کەسەکە سواڵکەرێک بووبێ یان بەرپرسی دەزگای هەواڵگری نهێنی. لەوانەیە ئەوان ڕاپۆرتێکی بەو شێوەیان لەسەر من نووسیبێ. بەڵام خۆ ناکرێ دادوەر ئەو شتە وەک بەڵگەیەک لە دژی من بەکاربێنێ! من لە ماوەی پشێویەکەدا مەلای مزگەوتێ بووم، هەموو جارێکیش کە وتاری توندم دەدان، ئاژانەکان دەهاتن و مەراییان بۆ دەکردم. ئەوەشیان ناکرێ وەک بەڵگەیەک بەکاربهێندرێ. من هیچ هەڵەیەکم نەکردووە."
- "تۆ ئالوودەی تریاکیش بووی." دادوەرکە وا وەڵامی دایەوە.
- "ئەمەیان گوناح نییە، نزیکەی هەموو ئایەتوڵلاکانی ئەم وڵاتە ئالوودەی تریاکن." ئەحمەدیش لە کاردانەوەیدا وای پێگوتەوە.
- "ئێمە بەڵگەمان هەیە، تۆ لەگەڵ ئەندامە پلە باڵاکانی ئەو دەزگا هەواڵگرییە نهێنییەدا تریاکت کێشاوە."
- "ئەمەیان ڕاستە، بەڵام من تەنها تریاکم لەگەڵدا کێشاون، بەدەر لەوە هیچی دیکەم نەکردووە."
- "ئاخر ئەوان پارەیان داوەتە تۆ، لێرەدا وا تۆمارکراوە."
- "ئەوەش پەیوەندی بە ئیشەکەمەوە هەیە، وەک مەلا، کەسێکی متمانەدارم لای خەڵک، هەمووان بە مەبەستی جیاجیاوە پارەیان داومەتێ. ئەوانیش پارەیان داومەتێ، ئەوەش هەمووی گەڕاوتەوە بۆ دەخیلەکەی مزگەوتێ."
- "ئاخر تۆ چەندین جار بە شێوەیەکی ناشیاو پەیوەندیت بە ئافرەتانەوە هەبووە."
- "بەڵێ، من پەیوەندیم بە ئافرەتانەوە هەبووە، بەڵام هەمووی بە پێی شەریعەتی ئیسلامەوە بووە."
- "لێرە من هەندێ وێنەم لەبەردەست دان، کە تۆ بە شێوەیەکی نەشیاو لەگەڵ سۆزانییەکان تریاکت کێشاوە."

- "ئەوەش داوێکی دەزگای هەواڵگری نهێنی بوو تا لەکەدارم بکەن، بەڵام من..."

تا ئێرە هەوڵیدا وەڵامی قەناعەتپێهەنەرانە بەرامبەر پرسیارەکانی دادوەرەکە بداتەوە، بەڵام لەبەر تیشکی گڵۆپە کزەکە ئەوە دەبیندرا، کە دەستەکانی دەلەزن، فرمێسکی وردیشی لە گۆشەی چاوەکانی بەسەر ڕوومەتەکان دەهاتنە خوار.

بەرەبەرە زمانی تێدەگیرا و ڕستەکانی پێتەواو نەدەکران. ئەمەش هەمووی بەهۆی تریاکەوە بوو، ئاخر ئەو قەت لە بەنگکێشان نەوەستابوو، ئەم ڕۆژگارە قەلنە تریاکە کارەباییەکەی دەکێشا کە لە تارانەوە کڕیبووی، هەمووشی بە دزیەوە دەکێشا. ئاغاجانیش بە پرسەکەی دەزانی، بەڵام بە بێدەنگی چاوپۆشی لێکردبوو.

کاتێکیش تریاکەکەی بکێشابا، ئەوا بەهێزەوە بەرگری لەخۆی دەکرد. بەڵام ئەوان لە ساتێکی شاش و ناوەختدا بەسەریان دادا و گرتیان، کتومت ئەو کاتەی پێویستی بە تریاک کێشان بوو، بەرلەوەی بڕواتە مزگەوتێ.

ئیدی لەژێر ئەو فشارەدا، هەموو خانەکانی جەستەی لەجاران زیاتر داوای بڕە تریاکەکەیان لێدەکرد. ئەو هەستی بە قورساییێکی زۆری سەر سینگی کرد، وەک ئەوەی فیلێک لەسەر سینگی پاڵ کەوتبێ.

لە باری ئاساییدا، بەردەوام بۆ حاڵەتی لێقەومان، بڕە تریاکێکی لە گیرفانی جبەکەیدا هەڵدەگرت. خۆ ئەگەر ئێستا کەمێ تریاکی پێبووایە، ئەوا دەیخستە نێو دەمی و هەستەکانی ئاساییانە دەبوونەوە، لێ گەلۆ، پیاوە ریشدارەکان هەر بە کراسی بەریەوە بەبێ جبەی مەلایەتی پەلکێشی دادگاکەیان کردبوو.

هیوابڕاوانە دەستی بۆ بەرکەکانی کراسەکەی برد، بەڵام خۆ هیچیان تێدا نەبوو.

هەوڵیدا قۆپچەی یەخەکەی بکاتەوە، بەڵکو باشتر هەناسە بداتەوە، بەڵام ئەوەش سەری نەگرت، ئاخر خۆ دەسەڵاتی بەسەر قامکەکانیشی نەمابوو.

ئارەقەیەکی سارد نێوچاوانی داگرت، چاوەکانی دەزوورانەوە، گوێکانی دەنگەدەنگیان لێوەدەهات، دەنگەکان بە شێوەیەکی ناڕوون دەهاتنە بەرگوێی

و چیدی لە دادوەرەکە حاڵی نەبوو. بەرچاوی تاریک بوو، ئینجا گرم، لەسەر کورسیەکەی کەوتەخوار.



بۆ سپێدەی پاشتر، ژنەکەی پەلی منداڵەکەی گرت و گەڕایەوە ماڵە کۆنەکەی باوانی.

## گوێدرێژەکە

**كَلَّا سَيَعْلَمُونَ (٤)**
**ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ (٥)**
**وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا (١٠)**
**وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا (١٣)**
**وَأَنْزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا (١٤)**
**إِنَّا أَنْذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنْظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ... (٤٠) -النبأ-**

**{ نەخێر، (هیچ پرسی پێناوێ) زوو دەزانن.**
**هەمیسان (پرسی پێناوێ) زوو دەزانن.**
**شەویشمان دانا بۆ پۆشاک.**
**چرایێ زۆر بە ورشەشمان وەدیهێنا.**
**لەو هەورانە-کە بارانەیان پێوەیە- ئاوی بەخوڕمان داڕژاند.**
**ئێمە لە جەزرەبەیەکی کە نزیکە، ترسن وەبەر ئێوە ناوە،**
**ئەمڕۆ مرۆ چاو بۆ ئەو شتە دەگێڕێ کە پێشیخۆی ناردوویەتی...}**

یەک مانگی ڕەبەق ئاغاجان هەموو شوێنێکی شارەکە بەدوای ئەحمەددا گەڕا و چووە لای هەموو ئەوانەی دەیناسین، بەڵام هیچ سۆراخێکی پێپەیدانەبوو. هەمووانیش دەیانزانی، گیراوە و هۆی گرتنەکەشی هەمووی هەر بەندوباو بوون و بە ناو شارەکەدا بڵاوببوونەوە.

- "ئەرێ ئێستا چی دەکەی؟" فەخری سادات ئاوای لە ئاغاجان پرسی.

- "پێمــوایە چــاوەڕێکردن باشــترین شــتە، بەتــایبەتیش لەو بــارودۆخە نادڵنیاییەدا. پێویستە بێیتە بازاڕ ببینی، چۆن دوکاندارەکان خۆم لێ لادەدەن. ناووڕوومەتم کەوتۆتە سەر سەنگی محەک."



ئاغاجان بە زەنگی دەرگاکەی سڵەمیەوە.

ئەو زەنگەی دەرگاکە سەدایەکی دیکەی هەبوو، هەستێکی وای لا پەیدابوو، کەسێک هاتووە پشت دەرگاکەی تا بارێکی ناکاو و ناچار رابگەیەنێ.

- "کێ لەوێیە؟" ئاغاجان بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وای بانگکرد.
- "دەرگاکە بکەرەوە!" پیاوەکەی پشت دەرگا بە توندی وای وەڵام دایەوە.
- "کێ لەوێیە؟" ئاغاجان دووبارەی کردەوە.
- "ئێمە بۆ ئاغاجان هاتووین."

ئەویش دەرگاکەی کردەوە. پیاوێکی ریشداری بەچەک لەدەرگاکە وەستابوو.

- "شتێک هەیە تا یارمەتیت بدەم؟" ئاغاجان وای بە کابراکە گوت.
- "مەلایەکە دەیەوێ دووبەدوو قسەبکەن."[159] پیاوەکە وای گوت.
- "کامە مەلا؟"
- "ئەوەی لەناو جێبەکە دانیشتووە."

ئاغاجان تا لای جێبەکە رۆیشت، لە جامی ترومبێلەکە مەلایەکی گەنجی لە پشتی جێبکە بینی: "بەخێر بێیت، فەرمو گەر حەز بکەی بچینە ژوور، لەوێ لە ژوورەکەی من قسان بکەین."

مەلایەکە لە جێبەکە دابەزی و لەگەڵ ئاغاجان هاتنەنەژوور.

ئاغاجان فەرمووی لێکرد و ئاماژەی بۆ کورسییەک بۆکرد.

- "لەڕاستیدا دەبوایە بانگی دادگای ئیسلامییت بکەین." مەلایەکە بە تۆنە دەنگێکــــی لەســــەرخۆیەوە وای پێگــــوت؛ "بەڵام رۆژەکەی کــــورتە و راگەیانــدنەکەش پەیوەنــدی بە داوایەکەوە هەیە، کە دەکــرێ راســـتەوخۆ جێبەجێبکرێ."
- "مەبەستت چییە؟ چ داوایەک؟"

---

[159] نووسەر ئیدیۆمی هۆڵەندی با لەژێر چوار چاودا قسە بکەین، لێ ئەم ئیدیۆمە لە کوردیدا بەم جۆرە ناگوترێ. وەرگێر.

- "دادگاکە بڕیاری خۆی داوە، من هاتووم تا پێترابگەیەنم. شتەکەش خراوەتە سەر کاغەز، هەر ئێستا بۆت دەخوێنمەوە."
ئاغاجان بیری بۆ ئەوە چوو، بەڵکە شتەکە پەیوەندی بە مەلا ئەحمەدەوە هەبێ و دەستبەجێ هەستی بە ئۆخژنێک کرد و ئاهێکی خۆشی هاتەوەبەر، چونکە دیاربوو پرسەکە هی قسەلەسەرکردن بوو.
مەلایەکە زەرفێکی کراوەی لە گیرفانی خۆی دەرهێنا، نامەکەی لێهێنایەدەر، قەدەکەی کردەوە و بە ئەسپایی خوێندییەوە:
**"بەناوی أللەوە، کە بێبەزەییانە دژی گوناحکاران دەوەستێتەوە، ئەوانەی نایانەوێ گوێ لە خوا بگرن.**
**بەناوی ڕابەر ئایەتوڵلا خومەینییەوە.**
**دادگای ئیسلامی بڕیاریدا، ماڵباتی قائیمولمەقامی فەراهانی[١٦٠] لە ئەمڕۆوە تا کاتێکی نادیار، هیچ دەسەڵاتیان بەسەر مزگەوتی هەینی لەشاری زەنجاندا نەمێنێ!"**
ئاغاجان بەوەی بۆی خوێندرایەوە هێدمەگرتی بوو: "ئەمە نابێ، ئاخر مزگەوتەکە هی ئێمەیە!"
- "مزگەوتەکە هی خوایە." مەلایەکە بە ئارامی لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت، "مزگەوت هەرگیز موڵکی هیچ کەسێک نەبووە. تۆ دەبێ ئەوە باش بزانی!"
- "بەڵام ئێمە کاغەز و بەڵگەنامەمان هەن کە تیایدا نووسراوە، زەوی و بینایەکەی مزگەوتێ سەر بەو ماڵەوەن، هەموو شتێک لە بڕوانامەکانی ماڵباتەکەماندا تۆمارکراوە. ئەمە میراتی بەجێماوەی ئێمەیە. من بەڵگەم هەن!"
- "ئاوا هەڵمەچۆ. تۆ هیچ بەڵگەنامەیەکی ڕێپێدراوت بۆ ئەمە پێنییە، مزگەوتەکە هی هەمووانە. ماڵباتەکەت تەنیا مافی سەرپەرشتیکردنی مزگەوتەکەی هەبووە، بەڵام خۆ ئەوەش قانونێکی خوایی نییە. هەنووکە ئێمە دەسەڵاتی ئیسلامیین، دادوەرەکە بە بڕیارەکاندا دەچێتەوە. سەرپەرشتیارێتی تۆ لەسەر مزگەتێ جارێ پەسەند نییە. زیاتر لەسەر ڕۆیشتنی ناوێ. دادگای ئیسلامی مافی خانەوادەکەی لەسەر مزگەوتێ هەڵگرت و مزگەوت و

[١٦٠] Ghaemmaghami Farahani

مـاڵەکەی لێکجیـاکردەوە. دەکـرێ خـۆت و خـانەوادەکەت لە خـانووەکەدا بمێننەوە. من هـاتووم کلیلەکانی مزگەوتێ ببەم. دەکرێ کلیلەکانم ڕادەست بکەی؟"

- "نـاتوانم ئەمە بکەم! من نە ئەوەم پێدەکرێ و نەدەشیکەم!" ئاغاجـان وای بەکابرا گوتەوە. "ئەمە چییە، ئێوە، ئێمە تێکوپێک دەشکێنن، باشە ئەو هەموو سوکایەتییە لەپای چی؟"

- "خـۆ ئەگەر کلیلەکـانم هەر ئێسـتا ڕادەسـت نەکەی، ئەوا پیاوەکـان، لە دەرەوە وەستاون، دێن و بەزۆر کلیلەکانت لێدەستێنن."

- "من کلیلەکان نادەمە تۆ!" ئاغاجان لێبڕوانە وایپێگوتەوە.

مەلایەکە هەڵسا ڕۆیشت. گەڕایەوە ناو جێبەکە، بە پیاوەکانی گوت دەبێ بچن کلیلەکانی لێبستێنن.

سێ پیاو لە هـۆدەکەی ئاغاجان وەژوورکەوتن و بەرەو مێزەکەی ڕۆیشتن. ئاغاجانیش کە دەهری ببوو، لە نێوەڕاستی ژوورەکە وەستابوو، ڕێی پێگرتن و هاواری دەکرد: "دەی لە ماڵەکەم بڕۆنە دەر! دەی بڕۆن!"

پیاوەکـان ئاغاجانیـان بەلاوە نـا، لە ژوورەکەدا دەسـتیان بەگەڕان و سـوڕان کرد.

"ئەمە دزیـیە!" ئاغاجـان وای بە پیاوەکـان گـوت، کە خەریکـی کـردنەوەی چەکمەجەکانی مێزەکەی بوون، هەموو شتێکی چەکمەجەکەیان خستە سەر مێـزەکە. ئەو چـووە لای پیـاوەکە و پـاڵێکی پێوەنـا. جەوادیـش لەبەر دەنگەدەنگەکە هـاتە ئەوێ، ئاغاجانی کێشایەوە و لەنێوان پیاوەکە و باوکی وەستا.

پیاوەکـان هەمـوو کلیلەکانیـان بـرد کە لە ژوورەکەدا دۆزیـانەوە و لێیانـدا ڕۆیشـتن، بەڵام کلیلـی ژووری گەنجینەکەیـان نەدیتبـووەوە، ئـاخر کلـیلەکە هەمیشە لەبەرکەی ئاغاجاندا بوو، ئەو بەرکەی کە قورئانە بچووکەکەی تێدا هەڵگرتبوو.



سـێ ڕۆژ دواتـر، بەرەبەرەی ڕۆژئـاوابوون، هەلیکۆپتەرێـک کە ئـایەتوڵڵا ئەراکی[161] هەڵگرتبوو بەسەر مزگەوتەکەدا فڕی. ئەو یەکێک بوو لەو دەیان ئایەتوڵڵایانەی بەناوی خومەینییەوە وەک چاودێری شەریعەت بەرەو شارە گەورەکان فڕیبوون. ئایەتوڵڵاکان یەکە بەیەکە هەموو دەسەڵاتێکیان لەوەوە وەرگرتبوو، تەنها لەبەرامبەر ئەویشدا بەرپرسیار بوون. ئەوان کرانە ئیمام جومعەی شارەکان، ئەوان ئەو مزگەوتانەی، کە نوێژی هەینیان لێدەکرا، کردیانە بنکە و بارەگای خۆیان.

لەسەر شەقامەکانیش بە سەدان لە بڕواداران دەستیان بۆ هەلیکۆپتەرەکە ڕاهێشتبوو و جۆرە دروشمێکی وەک: *"یار امام خوش آمد*، دۆستی ئیمام بەخێر بێ!" دەگوتەوە. هەلیکۆپتەرەکە لەسەر گۆڕاییێکی نزمی بانەکە هەڵنیشتەوە و دەستەیەکیش لە پیاوەکان، نوێنەرانی بازاڕ، لێوەسەر بانەکە کەوتن تا بەخێرهاتنی ئایەتوڵڵا پیرەکە بکەن.

سەدان ئیسلامی نێو شوورەی مزگەوتەکە لەسینگی خۆیان دەدا و هاواریان دەکرد: "جانم بە فیدات، خومەینی!"

دوو پیاوی گەنجی چەکدار یارمەتی ئایەتوڵڵاکەیان دا، تا لەپەیژەکان دابەزێ، ئیجا خەڵکەکە کابرایان لەسەر شانی خۆیان هەڵگرت و بردیانە نێو مزگەوتێ.



ئاغاجان کە دەیەویست هەموو شتێک لە نزیکەوە ببینێ، بە ئەسپایی دەلاقەی یەکێک لە منارەکانی کردەوە و لێیەسەرکەوت. ئەو چووە سەر منارەکە، چووە ئەو شوێنە بەرزەی کە جارێکیان نوسرەت ئافرەتێکی بردبووە ئەوێ. ئیدی لەوێ وەستا، سەیری خوارەوەی خۆی کرد، لەکاتێکدا تیشکە کەسکەکەی منارەکە لە دەموچاوی دەدا، چاوی لە هەموو شتێک بوو.

مـزگەوتەکە دیسـان بـووەوە جەرگەی جـووڵە گرنگەکـانی شـارەکە و ئـایەتوڵڵاش هەمـوو ڕۆژانـی هەینـی وتـارێکی دەدا و هەمـوو ئیمانـدارانی شارەکە و دەوروبەری بۆ دەهاتن.

---

[161] Araki

ئایەتوڵڵا بە دەسەڵاتترین پیاوی شارەکە، لەمزگەوتێ دا دوانی زۆری دەدان و بەبێ پەسندنامەی ئەو هیچ بڕیارێک نەدەدرا.
تەنیا داداگای ئیسلامی لە دەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی ئەو بوو، ئاخر دادگای ئیسلامی سەربە خۆیانە دەجووڵایەوە، لە دۆخە تایبەتیەکانیشدا بۆ خالخالی دەگەڕایەوە.
دادوەرەکە بە تەلەفۆن دەربارەی فایلەکەی ئەحمەد لەگەڵ خالخالی دوابوو، ئەویش بیروڕای خۆی بە ڕوونی پێگوتبوو: "تۆ دادوەری! چاوەکانت بنوقێنە و بڕیارەکەی خۆت بدە!"
لەگەڵ ئەوەشدا دادوەرەکە چووە مزگەوتێ و فایلەکەی خستە بەردەم ئایەتوڵڵاکە و داوای حوکمی ئەوی کرد.
ئایەتوڵڵاکەش لە ماوەی نێوان دوو نوێژدا لە دۆسیەکەی کۆڵیەوە و بڕیاری دادورەکەی پەسەند کرد. "باسم أللە! لەبەرئەوی، ئەو مەلایە، دەبێ سزایەکی قورستر لە هاوڵاتییکی ئاسایی بدرێتێ. والسلام."
ڕۆژی پاشتر، هەر لە ڕۆژهەڵاتەوە تا سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ، جیپێک کە بڵندگۆیەکی لەسەربوو لەو ناوەدا دەسووڕایەوە و رایگەیاند: "ئەی بڕواداارانی بەڕێزی شاری زەنجان! تکایە لە سەروبەندی سەعات دوودا لە گۆڕەپانی بازاڕدا ئامادە بن، لەوێ دادوەرەکە حوکمی خۆی دەربارەی ئەحمەد ئەلسابری، ئەندامی پێشووی دەزگای هەواڵگری نهێنی ئاشکرا دەکا. ئەوەش یەکەمین ڕاگەیەندراوی دادگای ئیسلامییە. خودا میهرەبانە، بەڵام ئەگەر پێویست بکا توند و سزاقورسیشە."
ئاغاجان کاتێ گوێی لە بانگەوازەکە بوو لەنێو حەوشەی ماڵێ، لەپەنا حەوزەکە وەستابوو. بۆ ساتێک هەموو جەستەی تەزی، هەستیکرد، پێیەکانی نەماون، بە توندی دەستی بە ستوندەی دار گڵۆپەکە گرت، وەک سەرێنێک سەری خستەسەر.
فەخری ساداتیش گوێی لە جاڕنامەکە بوو. "باشە ئێستا چیبکەین؟" بە سەرسامییەوە وای پرسی.
- "هیچ، تەنیا خوا دەتوانی بە هانامەوە بێ. یەک مانگی ڕەبەق لە دەرگای هەمووانم دا، دەستی هەمووانم ماچکرد، بەڵام دادی نەدا. هیچ کەسێک

دەربارەی کاروباری دادگاکە شت نازانێ، هەموو شتێک لە پشت دەرگای داخراوەوە بڕیاری لێدەدرێ." ئاغاجان وا وەڵامی خێزانەکەی دایەوە.

- "باشە بۆچی زینەت شتێک ناکا، ئاخر ئەو پەیوەندی بە ئایەتوڵڵاکانەوە هەیە."

- "پێموایە ئەویش ناتوانێ شتێکی وا بکا. تەنانەت ئەویش نازانێ، ئاخۆ چ دادوەرێک حوکمی بەسەردا داوە. وێڕای ئەوەش، زینەت بەتەواوی لەگەڵیاندایە، بۆیە ناتوانێ بەتایبەت بە دوای مافەکانی کوڕەکەیدا بکەوێ."

- "بۆچی نا؟ ئاخر تۆ سەدان جار پێتگوتومە، ئەحمەد بێخەتایە."

- "فەخری، من نایزانم! من چیدیکە نازانم."

- "ئاخر خۆ بەپلەی یەکەم ئەحمەد کوڕیەتی ئینجا مەلای مزگەوتییە، باشە بۆچی تۆ دەبێ بچییە لای هەمووان و دەستیان ماچ بکەی، کەچی زینەت هەر ڕووی خۆیشی دەرناخا؟ بەڕاست ئەو لە کوێیە؟ باشە بۆچی خۆی لێت دەشارێتەوە؟"

- "فەخری، شۆڕشێک بەرپابووە، ئاسان نییە دەسەڵاتێکی سیاسی بڕوخێنی. شتەکە دیارە دڵ و دەروونی خەڵکیشی وەرگێڕاوە. هەندێ شت ڕوو دەدەن، جاران لە ژیانی ئاساییماندا هەر بەخەیاڵیشماندا نەدەهات. خەڵک ئامادەن شتگەلی قێزەون بکەن. سەیرکە، سەیری دەوروبەری خۆت بکە، هەموو گۆڕاون. خەریکە کەسیان نەناسیتەوە. دیارنییە ئاخۆ کەسێک دەمامکی کردووە، یاخود دەمامکەکەی فڕێداوە. ئاخر کێ دەزانێ زینەت چی لێبەسەرهاتووە. کێ بەبیریدا دەهات زینەت ببێتە ئەو کەسە بەرچاوە؟

- "بەرچاو؟ چۆن بەرچاو؟ فەخری بەتوندی وەڵامی دایەوە.

- "ئەو دەسەڵاتی هەیە، ئەو بڕیاردەدا، ئەو شتگەلێک ڕێکدەخا، مەگەر هەر خوا بەخوایەتی خۆی بزانێ چی بەدوادایە."

- "ئەو هیچ نییە. ئەو شتێکی بڵحە. هەموو ئەو ژنانەی لەگەڵ ئەودا هاوکارن، قێزەونن. ئەوانە ژنگەلێک بوون، کەس ئاوڕیشیان لێنەدەدانەوە. ئەوان هەموویان بڵح و ناشیرنن!"

- "فەخری!

- "زینەت لە ناخیدا ناشیرینە." ژنەکەی وا وەڵامی دایەوە، بێ ئەوەی تێبینی کاردانەوەی ئاغاجانیش بکا.

- "ئێستا بەسیەتی، کات نییە باسی ئەو شتانە بکەین. من دەچمە گۆڕەپانی بازاڕەکە، دەچم سەیردەکەم، بەڵکو بتوانم شتێک بۆ ئەحمەد بکەم."

- "پێویست ناکا بچیە هیچ کوێ. چوونت لە سووکایەتیپێکردن نەبێ لە هیچ ناگۆڕێ. جارێ لە ماڵ بمێنەوە تا زریانەکە دەنیشێتەوە."

- "هەردەبێ لەوێ بم، ئاخر ئەوە ژیانی منە. سووکایەتی بێ یان نا، ئەمە بۆمن چیدیکە لە هیچ پرسەکە ناگۆڕێ."



ئاغاجا سەرەتا چوو نوێژێکی کرد، پاشان کڵاوشاپۆکەی لەسەر نا، پشتی قیتکردەوە[١٦٢] بەرەو ڕووی چارەنووسی خۆی هەنگاوی نا.

لە گۆڕەپانی بازاڕەکە قەرەباڵغی هەبوو، ئەو لەوێ چووە شوێنێک کە سەکۆی گۆڕەپانەکەی باش لێدیار بوو، لەبن دارێک وەستا. دیاربوو زۆری نەخایاند، لەسەر سەکۆکە حوکمی دادگاییەک رادەگەیەندرێ. هەمووان سەریان بردبووە بن گوێی یەک و قسەیان لەگەڵ یەکدی دەکرد و مەراقبوون ئاخۆ چۆن شەریعەت، قانونی ئیسلامی بەڕێوەدەچێ.

ئەوسا سێ جێبی سەربازی پەیدا بوون، لەهەر جێبێک یەک دوو پاسەوانی ئیسلامی هاتنەدەر. پاشان مارسیدیسێکی ڕەش گەیشتە گۆڕەپانەکە. دەرگای ترومبێلەکە لە لایەن یەکێ لە پاسەوانەکان کرایەوە، مەلایەکی گەنجی لێهاتەدەر. پاسەوانەکان یاوەری مەلاکەیان کرد تا گەیشتە سەر سەکۆ، لەوێ لەسەر کورسییەکی بەرز دانیشت و بانگیکرد: "بیهێنن!"

ئەحمەد، کە لەوێ لەپشت پەردەیەکی کەسکی کاتیی داندرابوو، هێنرایەدەر. زۆر لاواز و زەبوون دیاربوو. ئاخر لە ماوەی ڕابردوودا هیچ تریاکی نەکێشابوو، بۆیە نەکێشانەکە لەدەمووچاویەوە دیاربوو، بە توندیش ڕەفتارەکانی گۆڕیبوو. ئەو وەک ئاوارەیەکی بێلانەی پیر کە ماوەیەکی زۆر بوو خۆی نەشوشتبوو، ڕێی دەکرد. خۆ ئەگەر دادوەرەکە ناوی نەهێنابا، کەس هەر نەشی دەناسییەوە.

---

[١٦٢] قیتکردەوە: ڕاستکردەوە.

هەمووان بەسەرسامییەوە سەیری ئەحمەد ئەلسابرییان کرد، ئاخر ئەو مەلایە خۆشەویستە، کە جاران دەستەنامەی دڵداری لە لایەن کچ و ژنانەوە پێدەگەیشت، کەچی هەنووکە کەوتۆتە داوی خۆی وای لێبەسەرهاتووە.
دادوەرەکە بردەبردی ئاپۆرەی ئامادەبووی بێدەنگکرد وخەریکی خوێندنەوەی حوکمەکەی بوو: "ئەحمەد ئەلسابری تاوانبارە بە هاوکاری دۆستانە لەگەڵ دەزگای هەواڵگری نهێنی ڕژێمی پێشوو! ئەو لەگەڵ شەیتاندا کاری کردووە. ئەمەش ناپاکییەکی گەورەیە بەرامبەر ئەو مزگەوتەی کە مەلایەتی تێدا دەکرد! بەڵام لەڕوانگەی ئەوەی دەستی بەخوێن سوورور نەبووە، سزاکەی تەنها زیندانیکردنە بۆ ماوەی دە ساڵ."
ئاپۆرەی خەڵکەکە شڵۆقیی تێکەوت، دادورەکەش داوای لە هەمووان کرد بێدەنگی ڕابگرن و لەسەر وتەکەی خۆیشی بەردەوام بوو: "تاوانبار دەبێ ئەوە بزانێ، کە ناتوانێ چیدیکە مەلایەتی بکا، بۆیە مێزەر و جبەکەی لێدەسەندرێتەوە."
ئیدی ئەحمەد لەبن کراسە پیس و بە قرێژەکەی هەڵدەلەرزی.
"لێ گەلۆ، لەبەرئەوەی ناوبراو ئیمامی مزگەوت و خاوەن وتاری هەینی بوو، ئەمەش ئەرکێکی پێشەنگایەتییە، سزاکەی قورستر دەبێ." دادوەرەکە وای جاڕدا. بۆ ساتێک بێدەنگ بوو، پاشان تێهەڵچۆوە: "دەی گوێدرێژەکە بێنن!"
دەستبەجێ پاسەوانەکان کەرێکی سپییان لەپشتی سەکۆی دادگاکەوە هێنا.
ئیدی گۆڕەپانەکە بەتەواوی خرۆشا: "تۆ بڵێی نەخشەیان چیبێ؟ باشە چی لێدەکەن؟"
گوێدرێژەکە، لەبەر حەشاماتە زۆرەکەی خەڵکی سڵەمییەوە، نەیدەویست بێتە پێش، بۆیە پاسەوانەکان پاڵیان پێوەنا تا گەیشتە بەردەم سەکۆیەکە.
ئاغاجان کەرە سپییەکەی مام ڕەمەزانی ناسییەوە. دەستەیەک لە ئیسلامییەکان بە خۆیان و شریتە قەیتانێکی سەر نێوچاوانیان کە دەقی پیرۆزیان لەسەر نووسرابوو، لەوێ دەرکەوتن: "سەربازی خومەینی! ئەوان وا هاواریان کرد: "خودا گەورەیە! مەرگ بۆ نۆکەری شا!"

دادوەرەکەش بانگیکرد: ئێمە تاوانبارەکە بەرەواژی[١٦٣] سواری سەر پشتی کەرەکەی دەکەین و تا لای مزگەوتێی دەبەین. ئەمەش سزایەکی میهرەبانانەیە بۆ کەسێک جبەی مەلایەتی بە بەدنیازی بەکارهێناوە!"

پەرچەکرداری حەشاماتەکەش هێدمەگیرانەبوو، هەمووان بەسەرسامییەوە تەماشای مەلا ئەحمەدیان کرد، کە بە چاوێکی شۆڕەوە سەیری بەرپێی خۆی دەکرد.

ئاغاجان دەستەسرەکەی خۆی لە گیرفان دەرهێنا و ئارەقەی نێوچاوانی پێسڕیەوە. ئەو بڕوای نەدەکرد، ئەحمەد پشتاوپاش سواری گوێدرێژەکە بکەن و بەناو شاردا بیگێڕن.

ئەو دەیزانی زۆرجاران ئەحمەد، کاری گەوجانەی دەکردن، بەڵام بڕوای نەدەکرد هەرگیز نوکەرێکی شا بووبێ. ئاخر شتەکە لەگەڵ کەسایەتییەکەی نەدەگونجا. بەڵام ئاخۆ بۆچی ئەحمەد هیچی نەگوت؟ بۆ دەمی لێکنەکردەوە؟ بۆچی نارەزایەتی دەرنەبڕی، بۆچی بەرگری لەخۆی نەکرد؟

ئاغاجان بە پاڵەپەستۆ خۆی بەنێو ئاپۆرای خەڵکەکەوە برد چووە پێش و پڕ بە گەرووی هاواریکرد: "ئەحمەد! تۆ ناپاک نی! دەی بەرگری لەخۆت بکە!"

هەمووان ئاوڕیان لە ئاغاجان دایەوە.

- "دەی دەمت بکەوە! بێدەنگ مەبە! شتێک بڵێ!" ئاغاجان هەر وا هاواری دەکرد.

کاتێ ئەحمەد گوێی لە بانگی ئاغاجان بوو، لەبەرخۆی راچڵەکی.

دادوەرەکەش لە ئاستی خۆیەوە بانگی کرد: "بێدەنگیی!"

- "ئەحمەد، تۆ نابێ بێدەنگ بی!" ئاغاجان هەر هاواری دەکرد.

- "بێدەنگیی!" دادوەرەکە جارێکی دیکەی وای گازکردەوە.[١٦٤]

دوو لەپاسەوانەکان گەیشتنە سەر ئاغاجان.

---

[١٦٣] بەرەواژی: ناوەژوو، بەپێچەوانە.

[١٦٤] گازکردن: بانگکردن. کاوێس ئاغا لەلاوی شێخ محەمموودا گوتوویەتی: بەسێ دەنگان گازی دەکرد.... وەگێڕ.

- "دەی ئەحمەد! لەبەر خاتری من! لەبەر خاتری هەمووان! بۆ خاتری مزگەوتێ، بێداربەوە!" ئاغاجان هەروا بانگی دەکرد و لەهەمان کاتیشدا لەگەڵ پاسەوانەکان کەوتبووە ململانێ، ئاخر هەوڵیان دەدا لەوێ دووری بخەنەوە.
"تۆ مەلای مزگەوتەکەمان بووی، بەرگری بکە..." ئەو وای بانگرد. بەڵام نەیتوانی هاوارەکەی تەواو بکا، چونکە پاسەوانەکان قۆڵیان گرت، باسکیان سوڕاندەوە لای پشتی، بەسەر دەم خستیانە سەر زەوی.
- "ئەحمەد! دەی لەبەر خاتری ئێمە شتێک بکە!" ئاغاجان هەر وایدەگوت، لەکاتێکدا پاسەوانەکان خەریکبوون فشاری زۆرتری بۆبێنن و بێدەنگی بکەن.
ئەوسا دوو بازرگانی بازاڕەکە بۆپێشەوە چوون و ئاغاجانیان لەبن دەست و پێی پاسەوانەکانیان دەرهێنا و لەگەڵ خۆیان بردە ئەو شوێنەی لێیوەستابوون.
ئەحمەدیش هەموو هێزی خۆی کۆکردەوە، ڕووی خۆی لە خەڵکەکە کرد، دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردنەوە و هاواری کرد: "بە قورئان! من بێ تاوانم!"
- "دەمت داخە!" دادوەرەکە وای بەسەردا قیژاند.
- "بە مزگەوت! من هەرگیز نۆکەر نەبوومە!"
- "بێدەنگ بە!" دادوەرەکە بەتووڕەییەوە بانگی کردەوە.
- "من ناتوانم..." ئەو وای هاوارکرد، بەڵام نەیتوانی ڕستەکەشی تەواو بکا، چونکە دوو پاسەوان بەرزیانکردەوە و ویستیان لەسەر پشتی کەرەکەی دابنێن. گوێدرێژەکەش سڵەمیەوە، هەندێ بۆ دواوە گەڕایەوە، یەکێ لە پاسەوانەکان بەقۆنداغی تفەنگەکەی زەبرێکی توندی سرەواندە چوارپێیەکە. کەری بەستەزمان بەلاداهات، کەوت بەڵام لە دواییدا هەڵسایەوە.
پیاوێکی پیر کە تفەنگەکەی لەسەر پشت دانابوو، شریتێکی کەسکیشی لەنێوچاوان بەستبوو، لەوێ هاتەپێشەوە. دەستێکی بەسەر سەری کەرەکەدا هێنا، بە شێوەیەک بەرزەفتی کرد، پیاوەکان توانیان ئەحمەد لەسەر کورتانەکەی دابنێن.
ئاغاجانیش بەدیتنی پیرەمێردەکە هێدمەگرتی بوو.

تۆبڵێی ئەو بینیبێتی؟ ئاخر پیاوەکە نۆکەرەکەی خۆیان، مام ڕەمەزان بوو. ئەو ببووە سەربازێکی لەشکری ئیسلامی. شتەکە پێشبینی نەکراوبوو، ئاخر ئەو گوێدرێژەکەی ئامادەکردبوو تا سووکایەتی بە ئەحمەد بکا و تێکیبشکێنێ. ئەو بە خۆی ڕێشمەی چوارپێیەکەی گرت.

دەبوایە مام ڕەمەزان شەرمی لەخۆی بکردبایەوە، ئاخر ئەو بەردەوام کلیلی ماڵەکەی ئاغاجانی لە بەرکەدا بوو، ئەرێ چۆن دەکرێ خەڵک ئاوا خێرا بگۆڕێ؟

دیمەنەکە ئەوەندە ئاغاجانی ئێشاند، لەپڕ و بە بێئومێدی بە دەنگی بەرزەوە سورەتی (المرسلات) خوێندەوە:

وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا (١)
فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا (٢)
وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا (٣)
فَالْفَارِقَاتِ فَرْقًا (٤)
إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ (٧)
فَإِذَا النُّجُومُ طُمِسَتْ (٨)
وَإِذَا السَّمَاءُ فُرِجَتْ (٩)
وَإِذَا الْجِبَالُ نُسِفَتْ (١٠)
وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ (١٥)

{سوێند بەوانەی یەک لە دوای یەک ناردراون،
بەو با توندەش هەڵدەکەن، بەهەڵکردن،
بەوانەیش کە ئەپرژێنن، بەپرژاندن،
بەوانەش بە هەڵوەژاردن هەڵداوێرن.
کە هەرچی سۆز و پێدەدرێ، هەر دێتە جێ.
سا هەر دەمێ ئەستێرەکان کوژانەوە،
هەرگاش کەلێن دەکەوێتە عاسمانەوە،
هەرکاتێکیش کەژان هەژان و تێکڕووخان،
ئەوێ ڕۆژێ هاوارە بۆ بێ باوەڕان.}

گوێدرێژەکە جوولا و ئەحمەدیش بە بێدەنگی دەگریا. یەکێک بەردێکی هاوێشت و بەسەری کەوت.
ئاغاجان، چیدی خۆی پێنەگیرا؛ بەرەو پێشەوە چوو، ڕێگای خۆی تا بەردەمی کەرەکە کردەوە: "بوەستن! کەس بەردی تێنەگری. ئەو سزای بەردبارانکردن نەدراوە. باشە ئەو دادوەرە نەفرەتییە لە کوێیە؟"
یەکێ لەپاسەوانەکان پاڵێکی بە ئاغاجانەوە ناو بەتوندی بەسەر زەویدا خست. بە خێراییەک کە لێی چاوەڕوان نەدەکرا هەڵسایەوە و بەرەو لای گوێدرێژەکە ڕۆیشتەوە.
پاسەوانەکە بە قۆنداغی تفەنگەکەی ڕێیلێگرت.
دیسان بەردێکی دیکەی تێگیرایەوە، ئەمجارەیان بەر گوێی ڕاستەی ئەحمەد کەوت. ئاغاجان قورئانەکەی لەبەرکە دەرهێنا، پاڵی بەپاسەوانەکە نا، گەیشتە ئەحمەد، لەپێشی وەستا، قورئانەکەی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و بانگی کرد: "لەبەر خاتری ئەم کتێبە! بەردی تێمەگرن!"
پاسەوانەکە قورئانەکەی لەدەست دەرهێنا، تا هێزیشی تێدابوو زللەیەکی لە ڕوومەت دا. ئاغاجان هاوسەنگی خۆی لەدەستدا، لێ دەستبەجێ خۆی گرتەوە، ئەحمەدی لەنێو قەددا گرت و توند بۆخۆی ڕاکێشا، بە شێوەیەک هەردووکیان کەوتنە سەر زەوی.
دوو لە پاسەوانەکان ئەحمەدیان سواری سەر پشتی کەرەکە کردەوە، هەرچی ئەوانی دیکە بوون بەتوندی بەپێلەقە و قۆنداغە تفەنگ وەرگەڕانە زگی و پشت و لاقەکانی ئاغاجان.
گوێدرێژەکە ڕۆیشت و خەڵکەکەش بەدوایدا بۆ لای مزگەوتێ.
ئاغاجان لەبەر ئازارەکەی لەسەر زەوی گرمۆڵە بوو. لەبەر خۆیەوە هەر دەیگوتەوە:

**"ئەی ئەو کەسەی، خۆت بە جلوبەرگ داپۆشیوە!**
**هۆ ئەو کەسەی پۆشاکت بەسەر خۆتدا داوە!**
**تۆنابێ لەوە زیاتر**
**لەسەر زەویدا بکەوی**
**دەی هەڵسەوە! سوێند بەمانگ،**

**بەو بەیانییەی کاتێ ڕۆژ هەڵدێ!**
**ئیدی دەستی دانەوە بەرخێ، بە زەحمەتییکی زۆرەوە هەڵسایەوە.**

## مانگاکە

لە بەراییدا مانگایەک هەبوو، باقیەکەی بێدەنگیی بوو. فارسەکانی سەرەتا بیروباوەڕیان وابوو. هەر بۆیەشە سەری چێڵەکان لەسەر دینگەکانی کۆشکە کۆنە فارسییەکان لە پارێزگای فارسدا هەن.
کاتێکیش چێڵەکە دەمرێ، باقی ژیان لە کەلاشەکەی دێتە دەرێ. ئیدی ئاژەڵ و ڕووەکەکان لە گۆشتی ئەو دەرچوون و پەیدابوون.
ئەم بیروباوەڕانە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار نەماون و بیروباوەڕی دیکە جێگەیان گرتەوە. ئاگر بە پیرۆز زاندرا و مانگاش لەبیرکرا.
کاتێ زەردەشتیش لە یەزد[١٦٥] لە دایک بوو، هێشتا ئاگر بە بەرزی لەسەر پەرستگاکان هەڵدەکرا. ئەو یەکەمین پێغەمبەری ئێرانی بوو، ڕایگەیاند نابێ نە ئاگر و نە مانگا بپەرسترێ. ئەو خودای بردە ئاسمان و ناویشی لێنا: **ئەهورا مەزدا**[١٦٦].
ئیدی ئاگریش بووە هێمای ئەهورا مەزدا لەسەر زەوی.
پێغەمبەرەکەش ئاڤێستای[١٦٧]، کە وشە پیرۆزەکانی خودای تێدابوون، پێشکەشی گەلەکەی کرد.
بە چەندان سەدە دواتر، ئیسلامەتی لە لایەن موحەمەد جاڕدرا و هەموو بیروباوەڕە ئێرانییەکان لادران و ئاگرەکەش خامۆش کرا.
هەزاروچوارسەد ساڵی ڕەبەق چیدی پەسنی مانگا و ئاگرەکە نەدرا و ڕێزیان لێنەگیرا، بەڵام گیانی بیروباوەڕەکە هەر بە دنەدەری گیانی ئێرانییەکان[١٦٨] مایەوە.

---

١٦٥ Yazd
١٦٦ Ahoera Mazda
١٦٧ Avesta
١٦٨ ڕۆمانووس دەستەواژەی Perzenی بەکارهێناوە، پێموابێ مەبەستی لە وشەکە زیاتر ئێرانە نەوەک نەتەوەی فارس بە تەنیا، بۆیە منیش هەر بە ئێران وەرم گێڕا.



هەنووکە ئیسلام بووە مایەی ئەوەی ماڵباتەکەی ئاغاجان بە خراپی شیرازەیان بپچڕێ. لە ماوەی ئەو هەشت سەدەیەی ڕابردوودا، بەرەبابەکە وەک یەکەیەک وابوو، لە ڕێی کورسی وتاری مزگەوتێ، دژی دوژمنانی ئیسلام وەستا. بەڵام ئەوە بۆ یەکەمین جارە، ئیسلام بە خۆی ببێتە دوژمنی سەرسەختی ماڵباتەکە.

هەرچەندە هەنووکە بەشێکی گەورەی شۆڕشەکە بەسەرچوو، لێ شاباڵ هەر نەگەڕایەوە ماڵێ.

هەرچی دەربارەی نوسرەت بوو، کاروبارەکەی باش دەڕۆیشت. ئەو بە ڕۆژ و شەو سەرقاڵی ئەوە بوو پێگەی خۆی لەنێو سینەمای ئێرانی لە کۆمارە ئیسلامییە ساواکەدا بەهێز بکا. ئەو هیچ کاتی وای نەبوو سەردانی ماڵەوەش بکاتەوە. تەنانەت تەلەفۆنیشی بۆنەدەکردن.

زینەتیش بە تەواوی خۆی دابووە دەستی ئیسلامێتی خومەینی، ئەویش بەدەگمەن دەهاتەوە ماڵ. پەیوەندییەکانی لەگەڵ ماڵباتەکەی پچڕابوون، کەسیش نەیدەزانی ئاخۆ کتومت خەریکی چییە.

یارۆی بانگدەرەیش هەستی بە باشی نەدەکرد و زۆر جاران بە سەفەر بۆی دەردەچوو، جەوادیش بەردەوام لە ماڵ نەبوو.

جەواد لێنەدەگەڕا ماڵێ کەسیان پێبزانێ ئاخۆ بۆکوێ دەچێ، لە ڕاستیدا زۆر جاران دەچووە تاران. ئەو پەیوەندی لەگەڵ شاباڵ گریدابۆوە. ئەو هەمیشە بە بێدەنگی لایەنگری بزووتنەوە چەپەکان بوو، ئەوانەی شاباڵ لەنێویاندا کارابوو.

- "ئەرێ باشە بۆ ناگەڕێیتەوە ماڵ؟" جەواد وای لە شاباڵ پرسی.

- "کاتێک هێشتا خومەینی هەر لە پاریس بوو، بەڵێنی دابوو لەگەڵ ئەوانی دیکەدا لێبوردە دەبێ. ئێستاش کە دەسەڵاتی گرتۆتەدەست، نایەوێ هەر گوێشی لێیان بێ. ئەو، بزووتنەوە چەپەکان بە خەڵکی گومڕا دەزانێ، بەلای ئەو هیچ جێیەکیان لەبن چەتری دەسەڵاتی ئیسلامەتیدا نییە. بۆیە ئێمە هەنگاوێک کشاوینەتە دواوە و ناونیشانەکانمان بە نهێنی هێشتۆتەوە. خومەینی هی متمانەپێکردن نییە."

نەسرین و ئەنسی، کیژەکانی ئاغاجانیش، بڕیاریان دابوو بڕۆن. ئەوانیش دەیانەویست ژوورێک لە تاران بەکرێ بگرن.
ئاخر هەرگیز پێشتر ژنێکی ماڵەکە ئەو کارەی نەکردووە. نەسرین و ئەنسی ببوونە دوو کیژی هەراش، نەیاندەویست چیدیکە بەدیار پیاوێکەوە دابنیشن، گوایە بێت و داوای دەستیان بکا.
فەخری سادات هەمیشە ئەوانی لەبن باڵی خۆی گرتبوو. ڕێگەی پێدابوون کە مەرج نییە هەر دەبێ بچنە مزگەوتێ. دایکەکە ئەوانی ناردبوونە باشترین قوتابخانەی شارەکە.
کاتێکیش ئەوان بڕوانامەی قوتابخانەی ناوەندییان بەدەستهێنا، هەردووکیان چوونە خوێندنی پێگەیاندنی مامۆستایان. خۆ ئەگەر هەموو شتێ وەک خۆی مابایەوە، هەنووکە ئەوان خوێندنەکەیان تەواوکردبوو و دەکرا وەک مامۆستا دەستبەکاربووبان. بەڵام کاتێک شۆڕشەکە هەڵگیرسا، هەموو زانکۆ و قوتابخانەکان داخران. دوای شۆڕشیش، بۆیان نەبوو خوێندنەکەیان تەواو بکەن.
ڕژێمی نوێی ئیسلامی لە کاروباری کارخانە، نووسینگە، قوتابخانە و زانکۆکان خەریکی شۆڕشێکی کلتوری بوو. هەریەکێک بەپێودانگی کۆمیتەکە، بایی پێویست ئیسلامی نەبووایە، دەنێردرایەوە ماڵێ.
نەسرین و ئەنسی لە بەراییەکان بوون کە ساڵی خوێندنەکەیان ڕەتکرایەوە، ئەوەش هەمووی هەر لەبەر ئەحمەد و بەزمی ئەو دیمەنەی ئاغاجان بوو، کە لە گۆڕەپانی بازاڕەکەدا نایەوە.
ئەوان بۆ ماوەیەک لە ماڵدا مانەوە، بەڵام خۆ هیچ ئایندەیەکیان لە شاری زەنجاندا لەپێشدا نەبوو.
– "نەسرین و ئەنسی دەیانەوێ بچنە تاران. ئەوان باسەکەیان لەگەڵ من کردەوە." فەخری سادات بەر لەوەی ساڵی نوێی خوێندن دەستپێبکا، وای بە ئاغاجان گوت.
– "خۆ ئێمە ناتوانین دوو کیژ بە تەنیا بنێرینە تاران." ئاغاجانیش وای بە ژنەکەی گوتەوە.

- "باشە ئەدی چییان لێدەکەی؟ دەتەوێ هەتا هەتایە هەر لە کونجی ماڵێدا بیانهێڵیەوە؟"
ئاغاجان هیچی نەگوت.
- "ئەوان لێرە هیچ پاشەڕۆژێکیان نییە. دەبێ لێیانبگەڕێی بڕۆن."
ڕۆژێکیش نەسرین و ئەنسی بەیەکەوە چوونە ژووری کاری ئاغاجان و پێیان ڕاگەیاند، دەیانەوێ بچنە تاران، تا لەوێ بژین و کاربکەن و پێویستیش ناکا ڕێگەیان لێبگرێ.
- "من ڕێگەتان لێناگرم." ئاغاجان وای پێگوتنەوە.
ئیدی بەرەو تاران کۆچیان کرد و لەوێ بۆ ماوەیەک لای هاوپۆلێکی کۆنیان مانەوە.



ئاغاجان، ڕۆژانە بەردەوام دەچووە بازاڕ، بەڵام خۆ هیچ شتێک وەک خۆی نەمابوو. هەموو پیاوان ڕدێنیان بەردابوو، کێبەرکێیان لەگەڵ یەکدا دەکرد بۆئەوەی لە پیاوانی ئاینی نزیک بکەونەوە. هەمووان لە پێستی خۆیان چووبوونەدەر و کەسیش ڕێزی بۆ دانەدەنا. نۆکەرە دڵسۆزەکەشی بە جلی یەکپۆشیی میلیشیاییەوە دەهاتەسەر ئیش، وایلێهاتبوو کاتێک ئەو لەوێ بووبا، ئاغاجان نەیدەوێرا تەلەفۆنیش بکا.
جاران، کاتێ بچووبایە گوندەکان، شوێنی ئەو ماڵانەی مافووریان بۆ دەچنی، وەک شایەک لە لایەن گوندییەکانەوە پێشوازی لێدەکرا، لێ هەنووکە، کەسێک بۆ بەخێرهاتنیش ئاوڕی لێنەدەدایەوە.
ڕۆژێکیان، کاتێ دۆستێکی کۆنینەی ئیسفەهانی هاتبووە لای، بینی ئاغاجان لەسەر مێزەکەی سەری بەسەر کاغەزەکانیدا شۆڕکردۆتەوە. میوانەکە ئاغاجانی نەناسیەوە، ئاخر ئەو پیر ببوو، ببووە کەسێکی ڕیش بۆزی تێکشکاو.
ئاغاجان هەوڵی دەدا لەسەر کارکردن بەردەوام بێ، بەڵام بۆی نەچووەسەر، نەیدەتوانی بەرگە بگرێ. ئیدی زووتر لە جاران دەگەڕایەوە ماڵ، لەوێ خۆی بە باخچەکەیان سەرقاڵ دەکرد. هەندێ جار دەچووە ژێرزەمینەکە، لەوێ بە

چەندان سـەعات لەنێو کەلوپەلەکـان دەمـایەوە، هەڵیـدەگرتن و دایـدەنانەوە. فەخری ساداتیش بە دوایدا دەچوو:

- "ئەرێ ئەو هەموو کاتە لێرە چیدەکەی؟"

- "من هەرگیز کاتی تەواوم نەبووە تا سـەیری نـاواخنی هەمـوو ئەو بـاول و سندوقانە بکەم."

- "خۆ ئەمڕۆ زیار لەپێویست لێرەبووی، دەی بڕۆ دەسـتەکانت بشـۆ، چایەم تازە دێمکردووە."

ئاغاجـان دەسـتوچاوی لە حەوزەکە شوشـتن و چـووە نانـدینەکە و چـایەکی لەگەڵ فەخری ساداتدا خواردەوە.

- "ئارامـت هەبـێ،" کـاتێ لە دەسـت ئاینـدەی منـداڵەکانی سـکاڵای دەکـرد، ئاغاجان ئەمەی بە خێزانەکەی گوت.

- ئـاخر چـۆن هەدادانـم هەبـێ، خـۆ ئەگەر منـداڵەکانم بەبـێ ئاینـدە ماڵیـان جێهشت تەنانەت ناشزانین چوونەتە کوێ؟"

- "خۆ هەر منداڵەکانی ئێمە نین بەم جۆرە دەناڵێنن، هەزارانـی دیکە هەمـان چارەنووسـیان هەیە. هەمیشـەش ژیـان هەروا بووە و هەرواش دەڕوا، لێرەدا هەقە بزانـی، تەنهـا یەک فریـادرەس هەیە، کـۆمەکی هەمـووان بکـا، ئەویـش ئارامگرتنە و بەس."

- "ئەوە هەر تۆی کە ئیمانێکی بەهێزت هەیە وادەڵێی، دەنـا مـن نـاتوانم، مـن لاوازم، زۆرجار گومان دەکەم، خەریکە نەوێرم شتەکەش دەرببڕم، بەڵام مـن گومانم هەیە، ئاخۆ خوا ئەو هەموو شتە دەبینێ."

- "کچێ فەخری، خۆڕاگر بە، نەکەی بکەویە نێو تاریکی، دەنا ئاسـوودەیت لە دەست دەردەچێ و ئەوەش بۆت باش نابێ."

- "هەریەکێـک بـۆ بەرژەوەنـدیی خـۆی هەوڵـدەدا، هەمـوو کەس تەقەلـلای ئەوەیەتی ژیانی خۆی سەلامەت راگرێ، تۆ تاقەکەسـی، کە ڕاسـتگۆ بووی و هەر بە ڕاستگۆییش ماویتەوە، بەڵام ئاخۆ چیت بەدەست هێنـا؟ ئەنجامەکەت ئەوەبوو، لەژێر زەمینەکە گیرسـایەوە! جاران پیاوەکەی بـازاڕ بـووی، قسـەی تـۆ لەبەر زێـڕ هەڵدەکێشـرا، بەڵام ئەدی هەنـووکە؟ لە سـەردابەکەدا لەنێـو پاشماوەکان دێ و دەچی.

- "فەخری، هەق نییە وابڵێی." ئاغاجان دڵی هێشا.
- "ببورە، بەڵام خۆ تۆ لەمن باشتر لە مەبەستەکەم دەگەی، باشە برادەکانت لە کوێن، ئەو پیاوە دەستڕۆیشتووانەی بازاڕ لە کوێن، بۆ بەهاناتەوە نایەن؟"
- "ئاخر داوای یارمەتیم لە کەسیان نەکردووە." ئاغاجان وا وەڵامی دایەوە.
- "هەمووان دەستبەردارت بوون. ئەرێ زینەت لە کوێیە؟ ئەرێ بەڕاست بانگدەرەکە چی لێهات؟ ئەدی نوسرەتی برات کوانێ؟ ئەرێ شتێکت لە بارەیەوە زانی؟"
-

لەو ساتەدا نوسرەت لە تاران، لە ماڵی خۆی لەژێر دووشی گەرماوەکەدا بوو. بە دوای شێوازێک عەودالبوو چۆن پشکێکی لە پەرەسەندنی سینەمای ئێرانیدا هەبێ. بەڵام دەشیزانی بەبێ پەسەندنامەی خومەینی هەرگیز کارەکەی پێناکرێ. کاتێکیش ئاوەکە بەسەر سەریدا دەپڕژا، بیرۆکەیەکی نایابی بۆهات. مانگایەک. ئیدی بە دەنگێکی بەرزەوە هاواری کرد: "دۆزیمەوە! شتەکەم دۆزیەوە!" دەستبەجێ شێرەی ئاوەکەی گرتەوە، دەستی دایە خاولییێک، خۆی پێ وشککردەوە، جلەکانی کردنەوەبەر و خێرا بۆیدەرچوو. بە سواری تاکسییێک خۆی گەیاندە ئەو کۆشکەی کە بەهەشتی لێیدەمایەوە.
نۆ مانگ بەسەر شۆڕشەکدا تێپەڕیبوون و خومەینیش هێشتا نەیدەزانی ئاخۆ چی لە سینەماکان بکا. دەرگای هەموو سینەماکان داخرابوون، ئاخر هەروەک قەحپەخانە لەقەڵەم درابوون.
بەهۆی ئەو بەیەکەوە کارکردنەی نێوان نوسرەت و بەهەشتی، پەیوەندییێکی متمانەدارانەیان لەنێواندا پەیدا ببوو. بەهەشتی سینەمای دەناسی. لە ئاڵمان زۆر جاران بە دزییەوە دەچووە سینەما، بەڵام وایدەبینی هێشتا کاتەکە لەبارنییە تا لەگەڵ خومەینیدا دەرگای ئەو باسە بکاتەوە.
- "من دەزانم پێویستە چیبکەین،" نوسرەت وای بە بەهەشتی گوت؛ "ئێمە دەبێ ئیمام لەگەڵ خۆمان بەرینە سینەما. ئەو دەبێ بە چاوی خۆی ببینێ، کە سینەما قەحپەخانە نییە و شتێکی تەواو جیاوازە."
- "تکایە واقیعی بە،" بەهەشتی وای پێگوتەوە؛ "ئاخر چی نیشان بدەین تا بڕوای پێبێنین."

- "من مانگام بۆ ئەو هەیە!" ئەمە قسەی نوسرەت بوو.
- "چێڵ؟"
- "ئەوە یەکەمین فیلمی جدی فارسییە، دەکرێ بەشتێکی ئیسلامییانەش دایبنێی."
- "فیلمەکە ناوی مانگایە؟"
- "بەڵێ، مانگا. شتێکی کلاسیکی ئێرانی. من ناڵێم شتەکە شاکارێکە، بەڵام ئەوە باشترین شتە نیشانی ئیمامی بدەین. ئاخر مانگا لە ڕۆحی هەموو فارسێک دایە، تەنانەت لە ڕۆحی ئیمام خومەینیش. من فیلمێک چادەکەم، تۆش بیبە و نیشانی ئیمامی بدە. ئاخر دەکرێ ئیسلام واتای زۆر بە سینەما بدا. من نەخشەی مەزنم هەن. خۆ ئەگەر خومەینی فیلمەکە پەسەند بکا، ئەوا سینەمایەکی سەربەخۆ لە دڵی کلتوورەکەی ئێمەدا سەرهەڵدەدا. شیعەکان نیگایەکی جیاوازیان لەسەر جیهان هەیە، ئێمەش کلتوری کۆنی ئێرانیمان وەک پاشخان هەیە، بۆیە دەتوانین لە ماوەیەکی کەمدا بەسەر هەموو سینەماکانی جیهاندا بکشێین."
- "هەرچی دەربارەی جیهانە، جارێکی دیکە باسی لێوەدەکەین، جارێ با ئەو فیلمە نیشانی ئیمام بدەین."
- "ئێمە ئەوکاتە زۆرەمان لەبەردەستدا نییە، دەبێ لە ماوەیەکی کورتدا بقەومێ، هەموو سینەماکان دەمێکە داخراون و بازرگانە گەورەکانی مافووریش هەڵمەتێکی نیشتمانیانەیان دەستپێکردوە؛ ئەوان دەستیان بە کڕینی سینەماکان کردووە، مزگەوتی لەسەر قیتدەکەنەوە."
- "ئێمە ناتوانین ئیمام ببەینە سینەمایەک."
- "من بە شێوەیەکی دیکە چارەی دەیکەم. سینەما دەهێنمە لای ئیمام."
- "ئەمە بیرۆکەیەکی باشە." بەهەشتی بە خەندەوە وایپێگوتەوە.
- "شتەکە دەبێتە مێژوو، خومەینی چێژی زۆری لێدەبینی، فیلمەکە لە لادێدا سازکراوە، لەو شوێنەی ئەوی لێوەهاتووە."



شەوی پاشتر نوسرەت بە خۆی و پارچەخامێکی لوولدراو لەسەر شان و ئامێرێکیش بەدەستەوە، چووە شوێنی مانەوەی خومەینی لەسەر گردە باکوورییەکانی تاران.

بەهەشتی ئەوی لەگەڵ خۆی بردە حوجرەکەی ئیمام، لەوێ خومەینی لەسەر مافوورێک لە نێوان بالیفەکان دانیشتبوو، پشتی بە دیوارەکە دابوو. لەوەتەی شۆڕش بەرپابووە، نوسرەتیش پرچ و ڕدێنی ماشوبرنجی ببوو، شەپقەیەکی دەستچنیشی لەسەردەنا. بە شێوەیەکی ئاسایی هەرکەسێ چووبایە خزمەت خومەینی، بۆی دەنوشتایەوە و دەستی ماچ دەکرد، بەڵام نوسرەت وای نەکرد. ئەو شەپقەکەی خۆی داگرت هەندێ چەمایەوە کەمێک سەری بۆ پێشەوە برد.

بەهەشتی نوسرەتی بە ئیمام ناساند: "ئەوە ئەو کامێراوانەیە کە ڕاپۆرتەکانی لەسەر شۆڕش زۆر جاران لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی دنیا بڵاودەبنەوە. ئەو پیاوێکە جێی متمانەیە. سەربەماڵباتێکی دینپەروەریشە و ڕایەکی سەرنجڕاکێشی دەربارەی سینەماوە هەیە، ئیدی من ئێوە بە تەنیا جێدێڵم."

کاتێ بەهەشتی لە دەرگاکە ئاودیوی دەرووەوە بوو، بێدەنگییەک باڵی بەسەردا کێشان.

نوسرەت کەلوپەلەکانی خۆی دانان، بە شێوەیەکی گونجاو گەڕا تا پارچە خامە سپییەکەی لێوە هەڵبواسێ. چەکوچێکی هێنا و بەبزمار بێ ئەوەی هیچ بپرسێ خامەکەی لەسەر دیوارەکە لە بەرامبەر خومەینیدا قایمکرد.

ئیجا مێزێک کە لەپاڵ دیوارەکە داندرابوو، گواستیەوە و ئامێرەکەی خۆی لەسەر دانا. پاشان کورسییەکی لەنێوەڕاستی هۆدەکە دانا و گوتی: "دەکرێ بێیتە سەر ئەم کورسییە؟"

- "من لێرە عەیبم نییە!" خومەینی بە سووکە بێزارییەکەوە وای پێگوتەوە.
- "من تێدەگەم، بەڵام کورسییەکە خۆی بەشێکە لە سینەماکە."

خومەینی بە سەیرییەوە لێیڕوانی، ئاخر کەس پێشتر بەو شێوە لەگەڵی نەدواوە. بەڵام ئەو دەیزانی، کابرا کامێراوانە، دەشیزانی دەبێ بەردەوام بە گوێی دوو جۆرە کەس بکەی: پزیشکەکەت و کامێراوان. ئیدی لەکۆتاییدا

لەشوێنی خۆی هەڵسا و چوو لە نێوەڕاستی ژوورەکە لەسەر کورسییەکە دانیشت.

نوسرەت پەردەکانی دادانەوە و گڵۆپی ژوورەکەشی کوژاندەوە تا ژوورەکە تەواو تاریک بێ.

ئینجا ئامێرەکەی پێکرد.

شتەکە دەسوڕا، فیلمەکە ڕەش و سپی و کۆن بوو. لەسەر شاشە خامەکەدا چێڵێک دەرکەوت دەیبۆڕاند.[١٦٩] شتێک خومەینی چاوڕەوانی نەدەکرد. جووتیارێک بە خۆی و چێڵەکەی دەرکەوت، جووتیارەکە ماچێکی لە چێڵەکەی کرد، دەستی بە لاملی دادەهێنا و گوتی: "تۆ چێڵیەکەی منی. چێڵە خۆشەویستەکەم. دەی نازدارەکەم وەرە! بابچین پیاسەیەک بکەین."

جوتیارەکە لە پێشدا ڕۆیشت و مانگاکەشی بە دوایدا تا ناو لەوەڕگایەک. لەوێ لە لەوەڕگاکەدا جووتیارەکە قەلنە کۆنینەکەی دەرهێنا، چوو لەبەر سێبەری دارێک دانیشت و قەلنەکەی دەکێشا، کاتێکیش لە سەبیلەکەی بووەوە، تەماشای مانگاکەی کردەوە. ئیدی لەوێ ژنە جووتیارێک بە خۆی و سەرپۆشەکەی پەیدابوو.

- "مەشەدی[١٧٠]، سەلامون عەلەیکوم!"

- "سەلامون عەلەیکوم، باجی[١٧١]. فەرموو وەرە ئێرە، وەرە بەرسێبەرەکە دانیشە، ئەمڕۆ ڕۆژێکی گەرمە. من مانگاکەم دەبەمە سەر ڕووبار، بەستەزمان لە خۆکەکەیدا[١٧٢] زۆری گەرمابووە. ئەرێ باجی، تۆ چۆنی؟"

ژنە جووتیارەکە چووە لای کابرا لەسەر زەویەکە دانیشت و بەیەکەوە بە بێ دەنگی سەیری چێڵەکەیان دەکرد.

فیلمەکە شتێکی نازدار نەبوو، بەڵام چەند دیمەنێکی جادوییانەی دەربارەی ژیانی گوندنشینەکانی تێدابوو. چیرۆکی فیلمەکە سادەبوو، بەڵام باش چووبووە نێو ژیانە بەراییەکەی جووتیاران.

---

[١٦٩] بۆڕاندن: دەنگی مانگا.

[١٧٠] Mshadi (ئەو موسڵمانانەی زیارەتی مەشهەد دەکەن، دەبنە مەشهەدی)

[١٧١] Badji

[١٧٢] خۆک: شوێنی داکردنی مانگا.

فیلمەکەش بۆ کۆمارە نوێیە ئیسلامییەکەی خومەینی گونجاو بوو، چونکە هاوچەرخایەتی هێشتا بۆ ژیانی دێهات زۆری مابوو. هەموو ژنە جووتیارەکان بە چارشێوەوە بەڕێدا دەڕۆیشتن و قورئانیش لە هەموو شوێنێک ئامادەبوو. لەگونددا هێشتا نە باسی کارەبا و نە لوولەکێشی ئاو لەگۆڕێدا بوو. لەوێدا گوێت لە موزیک نەدەبوو، کەسیش رادیۆی نەبوو. بۆ خومەینی وەک دەستپێک، فیلمێکی لەوە باشتر نەبوو. ئەو خۆی، دایبابی و هاوگوندییەکانی خۆی لە فیلمەکەدا دەبینییەوە.



چیرۆکی فیلمەکە دەربارەی جووتیارێک بوو، هیچ منداڵی نەبوون، بەڵام چێڵەکەی خۆی زۆر خۆشدەویست. ڕۆژێک لەڕۆژان چێڵەکەی نەخۆش کەوت. ڕیشسپییانی گوندەکە ئامۆژگاری ئەویان کرد، تا زووە سەری ببڕێ، دەنا دواتر دەردەکەی لێ توندتر دەکا، ئەوسا مرداردەبێتەوە و لەدەستی دەردەچێ، بەڵام ئەو هەر گوێشی پێنەدان.

ڕۆژێکیان، کە جووتیارەکە لەگوند نەبوو، چێڵەکەی کەوت و مرداربووەوە. گوندییەکانیش دەستبەجێ بڕیاریاندا، بەرلەوەی خاوەنەکەی بگەڕێتەوە، ژێرگڵی بکەن.

کاتێکیش جووتیارەکە گەڕایەوە و لە مانگاکەی خۆی پرسییەوە، هەمووان گوتیان ڕۆیشتووە و نەگەڕاوەتەوە. ئیدی جووتیارەکە پەشۆکا. چەندین ڕۆژ هەر بەدوای سۆراغی چێڵەکەوە بوو، لێ نەیدۆزییەوە. کابرا تێکچوو، ژیانی لەبەر چاوکەوت و چیدی نانیشی پێنەخورا.

ڕیشسپییەکانی گوند سەریان دا، قسەیان لەگەڵدا کرد و دڵنەواییان دایەوە، ئەوەشیان بۆ ڕوونکردەوە، کە نابێ مرۆ تازیەمانە بۆ مانگایەک دابنێ. بەڵام جووتیارەکە ئەوەندە دەردەدار بوو، وایبیرکردەوە، خۆیشی بۆتە مانگا. کاتێکیش ڕیشسپییەکان لێیچوونە ژوور، کابرا وەک مانگایەک لەخەمان دەیبۆڕاند.

ڕیشسپییەکان کە ئەمەیان بینی، دەستەسڕەکانی خۆیان دەرهێنا و بەبێدەنگی فرمێسکەکانیان سڕین.

کاتێکیش فیلمەکە کۆتاییهات، نوسرەت گڵۆپەکەی پێکردەوە. بینی کە خومەینیش دەستی دابووە دەستەسڕەکەی خۆی.



هەینی دوای ئەو، هەموو ئایەتوڵلاکان لەسەرلەبەری وڵاتدا و لە وتاری هەینییاندا ڕاگەیاندنێکی نائاساییان جاڕدا: "ئەمشەو فیلمێک لەسەر تەلەفزیۆن نمایش دەکرێ. فیلمەکە ناوی **مانگایە** و لە لایەن ئیمام خومەینییەوە پەسەند کراوە. دەکرێ ئیمانداران سەیری بکەن!"

ئەو خەڵکانەی لە ماڵی خۆیان تەلەفزیۆنیان نەبوو، بۆ شەوەکەی ڕژانە چایەخانەکان تا سەیری فیلمەکە بکەن.

ڕۆژەکە لە مێژووی هونەری ئێرانیدا پێشهاتێکی گرنگ بوو.

ئاغاجان لەگەڵ مارمیلکە و لە پەناگەکەی ئەو لەسەر بان فیلمەکەی بینی. بۆ ئەو، یەکەمین جاری بوو سەیری فیلمێک بکا. کاتێکیش مانگاکە و ماڵە نەدارەکەی بینی، بڕوای وابوو، فیلمەکە شایستە نییە.

شاباڵیش لای جەواد دانیشتبوو، سەیریان کرد.

نەسرین و ئەنسی، کیژەکانی ئاغاجان، لای هاوپۆلە دێرینەکەیان فیلمەکەیان بینی.

سەدیقەش لە دانیشتنێکی یەک دوو ژنانی ئیسلامی لەتاران بوو. خالخالی لە ڕێی خوشکەکەی کارێکی وای ڕێکخستبوو، ماوەیەک لە پایەتەخت بەسەر ببا.

زینەت خانم لەگەڵ عەزام عەزام دەژیا. ئاخر عەزام عەزامی کردبووە یاریدەدەری خۆی.

لەو دواییانەدا زینەت لە مزگەوت خۆی لە ئەحمەدی کوڕی نەبانکردبوو. قسەیەکی وایکردبوو، گوایە لەجیاتی کوڕەکەی، شەرم لەخۆی دەکاتەوە.

ئاخر خۆ زینەت بە تەنیا نەبوو، کە ڕەفتارێکی وای نواندبوو. زۆر لە دایبابە بڕوادارەکان، ئەوانەی ڕۆڵەکانیان دژی ئایەتوڵلاکان بوون، دەهاتنە سەر تەلەفزیۆن و پشتیان لە منداڵەکانیان دەکرد. هەمووان دەربارەی ئەو شتە قسەیان دەکرد، بەڵام کەسیش تێنەدەگەیشت. تۆ بڵێی ئەمە لەبن سەری بڕوایانەوە بێ؟ یاخود مێشکیان لە لایەن پیاوە ئایینییەکانەوە شورابێتەوە؟

دوای ئەوەی زینەت بێبەریی خۆی لەبارەی کورەکەی ڕاگەیاند، بۆ ڕۆژی پاشتر، ئایەتوڵلاکە بانگی کردە ژوورەکەی خۆی. دووبەدوو قسەی لەگەڵ کرد.

"زینەت خانم، تۆ نموونەی ژنی موسڵمانی، لەم شارەدا پێویستیم پێت هەیە. تۆ بە ڕاستی موحەجەبەی[173]. فاتیمەی زەهرا بە تۆ دڵشادە. هەنووکەش گوێملێبگرە! من ڕاتدەسپێرم تا ڕووخسارێکی ئیسلامییانە بدەیتە ئافرەتانی زەنجان. دەمەوێ ئەوان هەموویان وەک زینەت خانم دەربکەون. ئایا قسەکەم ڕوونە؟"

"بەڵێ، ئایەتوڵلا، ڕوونە! زینەت وای گوت و دوایی لەوێ هەڵسا.

ئیدی زینەت لەگەڵ شەش ژنی پەرگیری دیکەدا، کۆمیتەیەکی ڕەوشتیان پێکهێنا. ئەوان هەڵمەتی ئەوەیان دەستپێکرد، کە هەڵسوکەوتی ژنان ڕاشکاوانە ئیسلامییانە لێبکەن.



زۆرینەی ژنانی شارەکە کاتێ لە دەرگایماڵیان دەچوونەدەرێ، چارشێوێکی ڕەشیان دەپۆشی، بەڵام زۆر ژنی گەنجیش هەبوون، گوێیان بە ڕێنماییەکانی ڕژێمی ئیسلامی نەدا و ڕەتیانکردەوە چارشێو بە خۆیاندا دابدەن. لەنێو شاردا سێ جیبی گەڕۆک هەبوون، دوو ژنی چارشێو بەسەر و پیاوێکی چەکداری تێدابوو، بەنێو شاردا دەگەڕان و چاودێری حیجابی ئافرەتانیان دەکرد.

کاتێکیش ژنێکیان دەبینی، کە بەپێی ڕێنماییەکانی ئیسلامەتی چارشێوی لەسەر نەکردبوو یان ماکیاژی کردبوو، ئەوا لەجیبەکە دەهاتنەخوار، غاریان دەدایە لای ژنەکە و ڕێیان پێدەگرت.

خۆ ئەگەر ژنەکە بەگوێی قسەکەی ئەوانیان کردبا و چارشێوەکەی ڕاستکردبایەوە، لێیدەگەڕان بە ڕێگای خۆیدا بڕوا، لێ ئەگەر دەمی کردبایەوە، ئەوان ڕایاندەکێشایە نێو ئەو پاسەی کە بە دوای جیبەکە دەڕۆیشت، لەوێوە دەیانبردە شوێنێکی نادیار و تەمبێیان دەکرد.

هەموو ژنە گیراوەکانیش دەهاتنە بەردەستی زینەت.

---

[173] Mahdjabe

ئەویش بە هاوکاری عەزام عەزام، شەش ڕێگەیان بۆ ترساندنی ئەو جۆرە ژنانە داهێنابوو.
عەزام عەزام قاچی ژنەکانی بە جۆرە گیراوەیەک بۆیە دەکرد و زینەتیش ئەوانی دەکردە ژوورێکی پڕ لە سیسرکە.
کچە دەمهەراشەکانیشیان لە هۆدەیەکی تاریک، کە جریوەی دەهات لەمشک، زیندانی دەکرد. ئیدی مشکەکانیش بە کەیفی خۆیان بەسەر پێیەکانیان لەجرتوفرت دابوون.
لە دوا جاردا زینەت بە دەستەسڕێکی زبر لێوە سوورەکانی ژنێکی ئەوەندە بە توندی هەڵگڵۆفت، تا بەخوێندا هاتن.



لەو شەوەی هەمووان لە بەردەم شاشەی تەلەفزیۆن دانیشتبوون، سەیری فیلمی مانگاکەیان دەکرد، کۆمەڵەیەکی زۆری خوێندکارە ئیسلامییەکان، بە ڕەزامەندی خومەینی، بەسەر پەرژین و شوورەی باڵوێزخانەی ئەمریکا بازیاندا و لێی چوونەژوور. لە کردەوەیەکی برووسکەئاسادا باڵوێزەکە و بیست و شەش کارمەندیان، کە لەبەر سەلامەتی هەر لەنێو تەلارەکەدا مابوونەوە، گرتن. بارمتەکان دەمودەست بردرانە شوێنێکی نهێنی، ئاخر ڕژێمی ئیسلامی دەترسا نەبادا ئەمریکا دژەکردەوەیەک بکاو هەرهەموویان ڕزگاربکا.
بۆ دڵنیایی زیاتر، کەسە گرنگەکانیان یەکسەر بە ترومبێلی تایبەت ڕەوانەی قوم، ئیسفەهان و زەنجان کردن.



لە نیوەی شەویشدا ئایەتوڵلا ئەراکی لەشاری زەنجاندا لە لایەن یاریدەرەکەیەوە لە خەو هەڵساند.
- "تۆ دەبێ هەر ئێستا خۆت بگۆڕی،" یاریدەرەکەی بە سرتەوە وای پێگوت، "یەکێک لە ژووری میوان چاوەڕێت دەکا."
- "کێیە؟" ئایەتوڵلا وای لێپرسی.
- "پیاوێکی زۆر گەنج، ئەو دەیەوێ نهێنییەکی دەوڵەتت پێبڵێ."

دەستبەجێ ئایەتوللاکە خۆی گۆڕی. لە ژووری میواندا گەنجێک چاوەڕێی دەکرد.
ئایەتوولّلا دەستی تۆقەکردنی بۆ برد، پیاوەکەش دەستی ماچکرد و بە نەرمی پێیگوت: "من خوێندکاری زانکۆی تارانم. پەیامێکی نهێنی ئایەتوللا ڕوحوللا خومەینیم بۆت هێناوە."
ئایەتوللاکەش سەری بۆ بردە پێش و خوێندکارەکەش لەبن گوێیدا بە سرتەوە ڕازەکەی بۆ درکاند: "لە دەرگاکەی دەرێ سێ ترومبێل بە حەفت ئەمریکی چاوبەستراوە وەستاون."
ئایەتوللاکە دەستبەجێ مێزەرەکەی لەسەر نا، دەستی دایە داردەستەکەی و گوتی: "لە گەڵم دێی؟"
ئەویش سواری یەکێ لە ترومبێلەکان بوو، بەرەو بیابان لێیان خوڕی.



چەندان مانگی دووروودرێژ، نوێنەرانی ئێران و ئەمریکا بە ناوبژی سویسڕا زۆریان دەربارەی ئازادکردنی بارمتەکان قسەکردن، بەڵام دانوستاندنە دووروودرێژەکان بە هیچ نەگەیشتن. خومەینی دوو داوای لە ئەمریکاییەکان هەبوو:
1- ڕادەستکردنەوەی شا بۆ دادگاییکردنێکی ئیسلامییانە.
2- گێڕانەوەی ئەو ملیار دۆلارانەی پارەی نەوتی گێلکە نەوتییەکانی ئێرانی، کە لە بانکەکانی ئەمریکا داندرابوون.
ئەوان نەیاندەتوانی شا ڕادەست بکەنەوە، چونکە ئایەتوللاکان دەستبەجێ لە سێدارەیان دەدا. هەروەها نەشیاندەتوانی ئەو ملیار دۆلارانە لە ماوەیەکی کورتدا بگێڕنەوە. ئیدی دانوستانەکان پچڕان و بێدەنگی بەدواداهات.



سەدوحەفتاودوو ڕۆژ دواتر، شەش فڕۆکەی بارهەڵگری ئەمریکایی بەتاریکی بەسەر زەنجاندا فڕین، کەس نە بینینی نە گوێیان لێبوو. نیو سەعات پێشتر ئەوان لەسەر پشتی کەشتی مارینزی ئەمریکای لە کەنداوی فارسدا هەڵسابوون و بە ڕەزامەندی سەدام حوسێن بەسەر ئاسمانی عێراق بەرەو ئێران فڕیبوون.

ئەوان لە ڕێگادابوون بەرەو فڕۆکەخانە نهێنییەکەی بیابان. مەبەستەکەش ئەوەبوو، یەکە کۆماندۆکانی شای پێشوو، بارمتەکان ئازاد بکەن و بە هەلیکۆپتەر بیانگوازنەوە فڕۆکەخانەکەی بیابان و لەوێشەوە وڵات جێبێڵن.
ئەمریکییەکان لە ڕێی کەسێکی متمانەداریان کە لای خومەینی بوو، سیخوڕی بۆکردووون و شوێنی بارمتەکانی ئەمریکی بۆ ئاشکراکردن.
بەڵام کردەوەکە سەرنەکەوت. شتێکی تەلیسماوی ڕوویدا، هەموو شتێک بە ئاودا چوو. هەر خومەینیش زانی چۆنی ڕوونبکاتەوە. "خوا ڕێگەی بە ئەوان گرت!" خومەینی ڕۆژی پاشتر وای ڕاگەیاند، ئەمەش دوای ئەوەی کە چالاکییە سەربازیە نهێنییەکەی ئەمریکا بە کارەسات کۆتایی هات.
"خوا ئەم وڵاتە دەپارێزێ." ئەو بە دەنگێکی ئارامەوە وای گوت؛ "ئەرێ بۆچی ئەمریکییەکان نایانەوێ لەمە تێبگەن؟ شتەکە زۆر سادەیە: خودا ئەمەی کرد."
کاتێکیش دوو لە فڕۆکە ئەمریکییەکان دەیانەویست لە بنکەیەکی نهێنییدا بنیشنەوە، خۆیان بە هەلیکۆپتەرێکدا دا. ئیدی هەردوو فڕۆکەکان و کۆپتەرەکە گڕیان تێبەربوو، ڕووبارێک لە ئاگر لەو بیابانە هەڵسا، بەڵام کەسیش لەبارەیەوە هیچی نەدەزانی.
لەئانجامدا هەشت کەس کوژران و پێنج کەسیش بریندار بوون. دەمودەست دوای ڕووداوەکە هەموو فڕۆکە هەڵفڕیوەکان گەڕانەوە سەر پشتی کەشتی مارینزەکە.



شوانێک کە لە قەراغێکی بیبابان لەبن دارێک لە پاڵ مێرگێک خەوی لێکەوتبوو، لەپڕ بە دەنگێکی تۆقێنەری نادیار بێدار بووەوە. لە کۆتاییدا هاتەوە سەرخۆی، بەو شەوەی بیابان سەیری دەوروبەری کرد، بینی دوکەڵێکی چڕ بەرەو ئاسمانە سافوڕوونەکە هەڵدەکشێ.
دەستبەجێ لێوەسەردارەکە کەوت، ئاگرەکەی لە دووەرەوە بینی. یەکسەر زانی کەشتێکی ترسناک لە گۆڕێدایە، ئیدی مێگەلەکەی هەرلەوێ جێهێشت و بەغار بۆ گوندەکەی خۆی گەڕایەوە. نیوسەعات دواتر، هەموو گوندیەکان چوونە سەربانەکانی خۆیان سەیری دەریایەک ئاگریان کرد.

مەلایەکەی ئەوێش غاریدایە مزگەوتێ، دەرگاکەی کردەوە و دەستی دایە تەلەفۆنەکە، کە تاکە تەلەفۆن بوو لەگوندەکە هەبێ. دەستبەجێ ژمارە تەلەفۆنی ئایەتوڵلا ئەراکی لێدا: "من مەشخەڵە ئاگرێکی گەورە و بەرز لە بیابانەوە دەبینم. ڕیشسپییانی دێ هەرگیز شتێکی وایان نەبینیوە. هەردەبێ شتێکی ناقوڵا قەوما بێ!"

ئایەتوڵلاش بێ وەخران فەرماندەی لەشکری ئیسلامی بۆ بەسەرکردنەوە ڕەوانەی بیابان کرد. سێ چارەگە سەعات دواتر، دەستی دایە تەلەفۆنە سوورەکەی خۆی و ڕاستەوخۆ زەنگی بۆ ماڵی خومەینی لە تاران لێدان لێدا: "مەشخەڵە ئاگرێکی نەناسراو! پێدەچێ یەک دوو فڕۆکە خرابنە خوارەوە. ئاگرەکە زۆر چڕ و قەبەیە، هێشتا ناتوانین نزیکی بکەوینەوە."

بەر لەوەی تاران دەستەیەکی چاودێری خڕبکاتەوە و بینێریتە زەنجان، گوندییەکان بە سواری پشتی کەرەکانیان خۆیان گەیاندە لای فڕۆکە تێکشکاوەکان و هەوڵیاندا بریندارەکان ڕزگاربکەن.

دەسەلاتداران هێشتا دەقاودەق نەیاندەزانی ئاخۆ چی ڕویداوە، ئیدی هەر ئەوکات رادیۆی مۆسکۆ لە هەواڵەکانی سەعات شەشیدا شتەکەی ئاشکراکرد: "سێ فڕۆکەی ئەمریکی لە بیابانی ئێران نزیک زەنجاندا خراونەتە خوارەوە."

بانگدەرەکە، کە هەموو ڕۆژێ گوێی لە رادیۆکەی دەگرت، دەنگوباسەکەی بیست، بەلام بایەخی هەواڵەکەی نەزانی. تەنها دوای ئەوەی لە دووبارەبوونەوەدا گوێی لە ناوی "زەنجان" بووەوە، ئینجا بانگی ئاغاجانی کرد: "ئەمریکیەکان لە بیاباندا کەوتوونەتە خوار!"

تەلەفزیۆنی دەوڵەتیش لە هەواڵەکانی سەعات دوویدا ڕاپۆرتێکی لەسەر بیابان بلاوکردەوە، زوومی کامێراکە لەسەر تەرمی ئەمریکییەکان بوو. ئینجا ئایەتوڵلا ئەراکی لەسەر شاشەکە دەرکەوت، قسەی توندی دەکردن و کلاشینکۆفێکیشی بە دەستی ڕاستەوە گرتبوو:

"ئیسلام شتێکی پەرجووانەیە، ئیسلام هەزار و چوارسەد ساڵە هەیە و بەردەوام هەر پەرجووشە."

"فڕۆکە ئەمریکیەکان لە ڕێی ئاسمانی عێراقەوە دەربازی سنوورەکەی ئێمە ببوون، ئەوان گڵۆپەکانیان کوژاندبووەوە و بە تاریکی دەفڕین، ئامێری

ئەلەکترۆنی هەرە نوێشان بەکارهێنا و ڕادارەکانی ئێمەیان لەخشتەبرد. ئەوان بە ڕێکوپێکی بیریان لە هەموو شتێک کردبووەوە، دەزگای کۆمپیوتەری بالایان، هەموو شتێکی لەبن چاودێریدا بوو، بەڵام ئەوان یەک شتیان لەبیر چووبوو حیسابی بۆبکەن: ئەویش قورئان بوو! ئاخر خۆ ئێمە هیچ دەزگای کۆمپیوتەری پێشکەوتوومان پێویست نەبوو تا حیسابی ئەو جۆرە شتانەی پێبکەین، ئێمە هیچ چاوی ئەلەکترۆنیمان پێویست نەبوو تا هەموو شتێک بخەینە بەرچاومان، ئاخر هەر بەتەنیا یەک کەس ئێشکگری وڵاتەکە بوو، یەک کەس ئێمەی دەپاراست، یەک کەس هەموو شتی لەبن ڕکێفدا بوو، لە کاتێکدا ئێمە هەموو لێمان پاڵدابوو و خەوتبووین ئەو بێداربوو. تاکە کەسەکەش ئەڵڵا بوو.

ئەمریکا کۆمپیوتەری هەیە، ئێمەش ئەڵڵا.

ئەمریکا فڕۆکە هەرە پێشکەوتووەکانی هەن، کە شتیان لێ ون نابێ، ئێمەش ئەڵڵا.

ئەمریکا! خۆ ئەگەر بزانی کێ فڕۆکەکانی تۆی خستنە خوارەوە، دەبێ سورەتی ئەلفیل بخوێنیتەوە:

**أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ (١)**
**أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ (٢)**
**وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ (٣)**
**تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ مِنْ سِجِّيلٍ (٤)**
**فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَأْكُولٍ (٥)**

**{ئەدی نەتدی پەروەرندەت چ پەندێکی بەسەر فیلسوارەکاندا هێنا؟**
**ئەدی فێڵ و گزییەکانی هەموو لێ پووچەڵ نەکردن؟**
**دەستە دەستە باڵداری هەناردە سەریان.**
**گزمووڵەقوڕی وەک بەردیان تێدەگرتن؛**
**تا بەدەردی کایەکی خوراوی بردن.}**

## ئەلحەرب[174]

پێنج مانگ دواتر، لە سەعاتەکانی نیوەڕۆدا، پێنج فڕۆکەی جەنگی عێراقی لەسەر ئاسمانی تاراندا پەیدابوون. ئەوان ئەوەندە نزم دەفڕین، فڕۆکەوانەکەت تێدا دەبینی. هەمووان لەبەر دەنگ و ژاوەژاوە تۆقێنەرەکە، کە گوێی کەڕ دەکردن، هەڵهاتن.

فڕۆکەکان فڕۆکەخانەکانیان بۆمبارانکردن، بەم جۆرە ئەلحەرب(الحرب) جەنگ دژی ئێران راگەیەندرا.

سوپای عێراقی شەوی پێشتر، سنووری ئێرانی بەزاندبوو، هەموو خاڵە ستراتیژییەکانی باشوور، هەی پارێزگا پڕنەوتییەکەی خوزستانی[175] داگیرکردبوو. ئیدی کێڵگە نەوتییە هەرە گرنگەکان کەوتنە بن دەستی سەدام حوسێن.



ڕژێم لەبن باری پێشهاتەکەدا حەپەسا، خەڵکیش نەیاندەتوانی بڕوا بە دۆخەکە بکەن. ئەو کاتەی تەلەفزیۆن یەکەمین وێنەی تانکەکانی عێراقی کە لە سەر کێڵگەنەوتییەکانی ئێراندا وەستابوون، بڵاوکردەوە، ئەوسا لە هەڕەشە مەترسیدارەکە حاڵی بوون و زانییان جەنگێکی جدی بەرپابووە.

خومەینی وتارێکی لە تەلەفزیۆندا بڵاوکردەوە، داوای لە هەمووان کرد، ئەوانەی دەستیان چەک دەگرێت، دەستبەجێ ناویان لە نزیکترین مزگەوت تۆمار بکەن. "شەڕەکە جیهادە!"

لە ڕێی ئەو بانگەوازەدا، بە یەکجار سوپایەکی گەورە لە دینداران خڕبووەوە. بە هەزاران گەنج و ئەو پیاوانەی ئەزموونی شەڕیان هەبوو، بە سواری پاسەکان ڕەوانەی بەرەکانی شەڕ کران.

لەو نێوەشدا فڕۆکە پشکنەرەکانی ئەمریکایی سیخوڕییان بەسەر ناوچەکانی شەڕەکەدا کرد، ئەوان هەموو جووڵەیەکی لەشکری ئیسلامییان خستبووە بن چاوی ڕادارەکانیان و دەیاندایە سەدام حوسێن، ئیدی لەو سۆنگەیەوە

---

[174] لە دەقەکەدا ناونیشانەکە هەر Alharb نووسرا بوو، وەک خۆیم هێشتەوە.

[175] Khozestan

شــوێنی ئەو هێــزانە بەردەوام لە لایەن فــڕۆکە عێراقییەکــانەوە بۆمبــاران دەکران.
خومەینی کە هەستی بە شکست نەدەکرد، بانگی گەلی خۆی کرد: "تەنها مردن ئێمە ڕزگار دەکا. ئەمریکا هەموو شتێکی لە ئاسمانەوە خستۆتە بن چاودێریی خۆیەوە. تەنها یەک بژاردەمان لەبەردەمدا ماوە: ئێمە سەرەتا دەبێ پردێک لە مردووان دروست بکەین تا دژی عێراق بوەستینەوە."



لەشکری ئیمانداران بە کفنەبەرگەوە دەستیان دایە چەک و بەرەو بەرەکانی شەڕ بەڕێکەوتن تا سوپای عێراق دووربخەنەوە. لەکۆتاییدا هێزەکانی ئێرانی گەیشتنە عێراقییەکان و جەنگێکیان هەڵگیرساند، کە هەشت ساڵی خایاند. لەو شەڕەدا و لە هەردوولا بە ملیۆنان سەرباز فەوتان.



ئایەتوڵلاکــان لەوەش دەترســان، نەبــادا ڕکابەرەکــانی نێوخۆیــان دەرفەتــی جەنگەکە بۆ ڕووخاندنیان بقۆزنەوە. ئاخر خومەینی متمانەی بە بزووتنەوەی چەپگەرایی نەبوو، ئەو ئەوانی وەک دوژمنی (ألله) و قورئان تەماشا دەکرد. ئیدی چاوەڕێی دەرفەتێکی لەباری کرد تا بە یەکجاری لەناویان ببا. لە لایەنی خۆشیانەوە، بەرگری چەپخوازانە بە نهێنییەوە خەریکی ئەوە بوو، دەوڵەتە ئیسلامییەکەی ئایەتوڵلاکان بە جارێک بێهێز بکا و جێگەیان پێ لەق بکا.
بــۆ ئەوەی بەرەی نــاوەخۆ ئاسایشــپارێزانە ڕابگــرێ، ڕژێــم بڕیــاری دا ڕاستەوخۆ هەموو بزووتنەوە چەپگەرایەکان لەسەر ڕێگای خۆی ڕابماڵێ.
خومەینی یەکەمجار خالخالی ئاگادارکردەوە: "ئەوان لەڕەگوڕیشەوە دەربێنە. بە زەبیت نەبێ! دەریان پەڕێنە، هەموو کەسێک، کە دژی ئیسلام بوەستێتەوە، وردوخاشی بکە!"
سەرکردەکانی پارتە کۆنەکەی تودەی کۆمۆنیست، کە بە تەواوی پشتگیری خومەینیان دەکرد، هەرهەموویان لە ماوەی سەعاتێکدا گیران.
بەڵام ڕژێم لەو بارەدا نەبوو سەرکردەکانی کۆمەڵە نهێنی و ژێرزەمینییەکان بگرێ. ئەوان ڕادیکالییانە بوون، بە نهێنەوە مشتومڕی ئەوەیان بوو چەک

دژی ڕژێم هەڵگرن و ڕاپەڕن. پارتی تودەش کە نەیدەویست دەست لە بەرامبەر خومەینیدا بەرزبکاتەوە، کەوتە نێو تەڵەکە.
سێ شەو دوای ئەوە، تەلەفزیۆنی ئیسلامی سەرکردە پیرەکەی پارتی تودەی هێنایە سەر شاشەکەی تا هەموو ئەوانی دیکە پێ بترسێنێ. ئەو تێکشکابوو، لەڕ و لاواز، ڕیشە بۆزەکەشی نەتراشابوو. تۆ وات دەبینی، ئەویان ڕاستەوخۆ لە ژووری ئەشکەنجەدانەوە هێنابێتە بەر کامێرا، ئەو دەپاڕایەوە بەڵکو وازی لێبێنن.
دیمەنەکە، دیمەنێکی ترسناک بوو، کۆپلەکانی ڤیدۆکە باش خرابوونە سەریەک، بۆ ئەوەی هەمووان بتۆقێنێ. لە گەیاندنی پەیامەکەشیاندا سەرکەوتن، چونکە هەر هەمان شەو، ئەو ئەندامانەی مابوونەوە و نەگیرابوون، هەموویان بەرەو سنوور هەڵاتن.



لە زەنجانیشدا، ئایەتوڵلا ئەراکی ڕێنمایی ئەوەی بۆ هات گوندی سوور پاک بکاتەوە.
گوندەکە لەو ساڵانەدا لە خۆشترین ڕۆژگاریدا دەژیا، ئاخر ببووە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمیدار کە ڕێسای تایبەتی خۆی هەبوو. گوندێکی نێو جیهانی خەیاڵ، کە گەنجان بیرۆکە پێشەنگەکانی دەوڵەتێکی کۆمۆنیستی بە بچووکراوەیی تێدا دابمەزرێنن. ئاخر بەروبوومی هەموو دێیەکە کۆدەکرایەوە، بە یەکسانی بەسەر گوندییەکاندا دابەش دەکرا. شەوانیش لە گۆڕەپانی گوندەکە خڕدەبوونەوە شیعرەکانی مایاکۆفسکی[١٧٦]، شاعیرە ڕووسییەکەیان دەخوێندەوە.



ئەو شەوەی بەسەر گوندەکەیان دادا، هەمو گوندییەکان سەیری فیلمێکی ڕووسیان دەکرد. لە پڕیکەوە یەکێک بانگیکرد: "تانکەکان! ئەوان وا هاتن. دەی ڕێ بەهەموو شتێک بگرن!"
بەڵام خۆ بۆ ڕێپێگرتنەکە کارلەکار ترازابوو. لە ماوەی چاوتروکانێکدا گوندەکە چۆڵ بوو. هەندێکیان بەرەو چیاکان هەڵاتن، ئەوانی دیکە چوونەوە

---

[١٧٦] Majakovski

ماڵەکانی خۆیان و دەرگاکانیان لەسەر خۆیان پێوەدا، هەندێکیشیان، ئەوانەی چەکیان لە ماڵەوە هەبوو، دەستیان دایە داری تفەنگەکان و لێوەسەر بانەکان کەوتن.
لەسەر ئاسمانی گوندەکە، کۆپتەرێک دەرکەوت، لەسەر بانەکانەوە تەقەی لێکرا. کۆپتەرەکەش بە پێچێکی تیژ گەڕایەوە دواوە.
ئینجا تانکەکان بەرەو ناو گوند کشان، لەهیکەوە بە سەدان چەکداری ئیسلامی، کە پێشتر لە تاریکییدا شوێنی خۆیان گرتبوو، هاتنەدەر. دەستبەجێش دوو هەلیکۆپتەر هەڵسان و بە گلۆپە بە هێزەکانیان، سەربانەکانیان ڕووناک کردەوە. ئیدی هەر شتێک بجووڵابا، تەقەیان لێدەکرد.
هیچ کەس چاوەڕوانی ئەو هێرشە قورسەی نەدەکرد. چەکدارە ئیسلامییەکان ئەو ناوەیان خستبووە بن چاودێریی خۆیانەوە، تەقەیان لەهەر کەسێک دەکرد، هەوڵی هەڵاتنی بدابایە.
لەسەر بانەکانیشەوە شێلگیرانە وەڵامی تەقەکان درایەوە، بەڵام هەر فیشەکێک بە نارجۆکێک وەڵام دەدرایەوە کە لەسەر بانەکە دەتەقیەوە.
ئیدی شەڕکردنەکە واتای نەمابوو، دەرگای ماڵەکان یەک لە دوای یەک کرانەوە و گوندییەکانیش بەدەست بەرزکردنەوە هاتنەدەر .
جیبەکانیش بە دوای ئەوانەدا ڕۆیشتن، کە بەرەو شاخەکان رایانکردبوو، تەقەیان لە هەر یەکێک دەکرد، کە خۆی بەدەستەوە نەدابا.
هەر ئەو شەوەش هەموو گیراوەکان بردرانە گرتووخانە. لەنێو گیراوەکاندا، جەوادی کوڕی ئاغاجانیش هەبوو.



خالخالی، دادوەرە ترسناکەکەی خودا، بە کۆپتەر بەرەو زەنجان فڕی، تا دادگایی گیراوەکان بکا. هەر شوێنێکیش ئەو ڕووی تێکردبا و لێینیشتبایەوە هەر مەرگ و وێرانکاری بەدواوە بوو.
هێشتا ڕۆژ لەکەل سەری دەرنەهێنابوو، خەڵکی شاری زەنجانیش لە شیرین خەودا بوون، کاتێ کوڕە لاوەکانی **گوندی سوور** تیرباران کران.



بـۆ بەیـانییەکەی شـارەکە بە حەپەسـاوی لە خەوەکەی بێـدرابووەوە. ئەو دایبابانەی کوڕ یان کچیان گیرابوو، بەرەو گرتووخانەکان غاریان دەدا، تا لیستی تیربارانکراوەکان بخوێننەوە، بزانن ئاخۆ ناوی ڕۆڵەکەیان تێدایە یان نا. تەرمـی تیربارانکراوەکـانیش درانەوە کەسـوکاریان، بەڵام بە گـوێرەی شـەریعەت ئەوان لاشـەی گڵاو[177] بـوون، نە دەبـووایە لە گۆڕسـتانی ئاسـاییدا بنێژرابان. ئیدی باوکەکان تەرمی ڕۆڵەکانیان بە پاس بردنە شاخەکان، لەوێ بەڕێزەوە دوا ماڵئاواییان لێکردن.



ئاغاجانیش نەیدەزانی کوڕەکەی لەگەڵ ئەواندا گیراوە. هەر وای زانیبوو لە تارانە.

بیرۆکەی ئەوەی، جەواد لە بەندیخانەدا بێ، بەلای ئەودا نەهات. ئەو یەکێک لە گەنجە تیربارانکراوەکانی دەناسی، ئاخر ئەو کوڕی ئەو دەرزیلێدەرە بوو، کە لەبەرامـبەری مزگەوتـێ نـۆڕینگەی هەبـوو. ئاغاجـان بـۆ ئەوان چەنـد ئایەتێکی قورئانی خوێند، لەو کات زەنگی تەلەفۆنەکەی لێدرا. ئەویش دەسکی تەلەفۆنەکەی هەڵگرت.

"من هەر لەکورتی دەیبڕمەوە،" پیاوەکەی ئەودیو هێڵەکەی تەلەفۆن، بێئەوەی خۆیشی بناسێنێ وای پێگوت: "من برادەرێکی جەوادم. ئەو لە **گوندی سوور** گیرا. ئەگەری زۆرە گوللەباران بکرێ. ئەگەر بتەوێ شتێکی بۆ بکەی، دەبێ هەر ئێسـتا دەسـتوبرد بـکەی. خـۆ ئەگەر لە لای دادوەرەکەی خـوداوە لێـی بپێچرێتەوە، ئەوا کار لەکار دەترازێ و لەسێدارە دەدرێ."

کاتێـک ئاغاجـان دەسـکی تەلەفـۆنەکەی دانـایەوە، دەسـتەکانی لەرزیـن. بە هەزاران بیرۆکە لە مێشکیدا هاتن و چوون. دەیەویست بانگی فەخری سـادات بکا، لێ نەشیتوانی. ئاخر کوڕەکەی گیراوە، باشـە بۆچی هیچی لـێ نەزانیوە؟

تۆ بڵێی ئەو کەسەی زەنگی بۆ لێدا لە کوێ بێ؟ ئاخر ئەو کێ بوو؟

وەک دەیزانی جەواد چووبووە تاران، باشە ئەو چی دابوو لەو گوندە؟

ئەرێ چیدەتوانێ بۆی بکا؟

---

[177] گڵاو بموا تا دیینمیەکی نجس.

ئەو نەیدەزانێ لە کوێوە دەستپێبکا. چەند جارێک دەستی دایە تەلەفۆن زەنگ بۆ یەکێک لێبدا، بەڵام هەر زوو دەستی تەلەفۆنەکەی لە شوێنی خۆی دانایەوە.

ئینجا چاکەتەکەی لە سێپێکەکە کردەوە، کڵاوشاپۆکەی خستەوەسەر و هەنگاوی نا، بەڵام هێشتا لە دەرگا دەرنەچووبوو، کە دووبارە زەنگی تەلەفۆنەکە لێدرایەوە. "تکایە لێم مەگرە،" هەمان دەنگی پێشوو بوو؛ "ئەو هێشتا هەر لە بەندیخانەی شارەکە دایە. دادوەرەکە پاش یەک دوو ڕۆژی دیکە دێتەوە، تا دادگاییان بکا. تۆ دەبێ خێرا بجوڵێی."

- "بەڵام ئەو لە گوندەکەدا چیدەکرد؟ ئەرێ تۆ کێی؟"

- "ئێمە بەیەکەوە لە دێیەکە بووین، من لە کاتی خۆیدا توانیم ڕابکەم، ئەویش گیرا. تۆ دەبێ بەپەلە شتێکی بۆ بکەی، ببوورە من ناتوانم زیاتر بدوێم. دەبێ تەلەفۆنەکە دابخەم." پیاوەکە ئاوای گوت.

ئاغاجان خێرا چووە بەردەرگای دەرەوە، لێ خێرا گەڕایەوە و بانگی کرد: "فەخری سادات!"

ژنەکەشی وەڵامی نەبوو.

ئەمجارە توندتر بانگی کردەوە: "فەخری سادات!"

فەخری گوێی لە دەنگی مێردەکەی بوو، دیارە شتێک لە ئارادایە. دەستبەجێ هاتەخوار.

"خۆڕاگر بە،" ئاغاجان وای پێگوت، "جەواد گیراوە!"

خەریکبوو دەردەست لە هۆش خۆی بچێ. "چی؟ بۆچی گیراوە؟" هێشتاش قسەی بۆ نەدەهات.

- "برادەرێکی تازە تەلەفۆنی کرد، ئەو لە گوندی سوور گیراوە."

- "ئەو لە گوندی سوور چیدەکرد؟"

- "نازانم."

- "لەوانەیە لەگەڵ شاباڵ چووبێتە ئەوێ. ئەدی شاباڵ لە کوێیە؟"

- "ئەوەش نازانم. بەرلەوەی کارلەکار بترازێ، پێویستە شتێک بکەین. وای گوت و خەریکیشبوو بڕوا، "بەڵام ناشزانم چیبکەم، بۆکوێ بچم."

- "برۆ مزگەوتێ!" فەخری سادات وایپێگوت و ڕووخساریشی سپی پاتە بۆوە. "برۆ لەوێ قسە لەگەڵ ئایەتوڵلاکە بکە."
ئاغاجان ویستی شتێک بڵێ، بەڵام نەشیگوت، خێرا بەرەو مزگەوتێ ڕۆیشت. لەوکاتەی ئیسلامییەکان مزگەوتەکەیان لێستاندبوو، تەنانەت بۆ نوێژیش نەدەچووە مزگەوتێ. لێ ئەوکات لێوەژوور مزگەوتێ کەوت، بەڵام ئایەتوڵلاکە لەوێ نەبوو.
- "ئەرێ ئایەتوڵلا لە کوێیە؟" ئاغاجان وای لە مجێورە نوێکە پرسی.
- ئەو وادە و دیدارەکانی خۆی هەڵوەشاندنەوە، جاری ئەو نایەتەوە مزگەوتێ، ئاخر ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی سەبارەت بە گوللەبارانکراوەکان دێنە لای."
- "باشە بەڕای تۆ، دەتوانم لە کوێ ببینم؟"
- "نازانم. لەڕاستیدا کەسیش نازانێ، ئەو لەچەند ناونیشانێکی جیاجیا دەژی."
ئاغاجان بەرەو لای بەهارات و دەرمانفرۆشەکەی بەرامبەری مزگەوتێ ڕۆیشت.
- "ئەرێ ماڵی ئایەتوڵلا پێدەزانی؟ من کاری پێویستم پێیەتی!"
دەرمانفرۆشەکە هەستی بەپەرۆشمەندی پرسیارەکەی کرد و گوتی: "لا اله الا ألله. بۆم نییە بیڵێم، بەڵام برۆ ئەو خانووە گەورەیەی جاری جاران بەرپرسی دەزگای هەواڵگری نهێنیی تێدا دەژیا."
ئاغاجان تەکسییەکی گرت و بەرو ئەوێ ڕۆیشت.
دوو پۆلیسی چەکدار لەبەر دەرگای خانووەکەدا بوون. ئاغاجانیش بەرەو ڕووی ئەوان ڕۆیشت، بەڵام بانگیان کرد زیاتر لێیان نەچێتەپێش. دەبووایە لە ڕێی زەنگی دەرگاکەوە هاتنی خۆی ڕاگەیاندبایە. ناچار قامکی لەسەر دوگمەکە داگرت. ماوەیەکی خایاند تا وەڵامێکی وەرگرتەوە.
- "کێ لەوێیە؟" یەکێ بە دەنگێکی زبر و ناقولاوە بە کورتی وای پرسی.
- "دەمەوێ لەگەڵ ئایەتوڵلادا قسەبکەم."
- "ئەوەی هەتە لەسەر کاغەزێک بە جوانی بینووسە و لەنێو کونی پۆستەکەی لای دەستەڕاستت فڕێی بدە."
- "ئاخر من دەمەوێ بە تایبەت لەگەڵیدا بدوێم."

- هەموو کەس دەیەوێ بە تایبەت قسەی لەگەڵدا بکا، ئەوەش هەر ناکرێ.ˮ
- ˮبەڵام شتەکەی من پێویستە. من ئاغاجانم، کلیلهەڵگری پێشووی مزگەوتی هەینی. خۆ ئەگەر وای پێبڵێی، بە دڵنیاییەوە دەمبینێ.ˮ
- ˮئەوە لە هیچ ناگۆڕێ، ئاخۆ تۆ کێی یان نا، ئایەتوڵڵا کاتی نییە. سەرباری ئەوەش، هەر لێرە نییە، ناشزانم کەی دێتەوە.ˮ
ئاغاجان دەستەوەستان لای زەنگە دەنگدارەکەوە وەستا.
- ˮدەی لەوێ مەوەستە! لەوێ بڕۆ!ˮ
ئەو هەر بەپێیان بەرەو ناو شار گەڕایەوە. لە ژیاندا یەکەمین جاری بوو، نەیدەزانی پێویستە چی بکا.
ترومبێلێک بەلایدا هات و ستۆپێکی گرت، لێخوڕەکەی جامی دەرگاکەی هێنا خوار و بەسەریدا قیژاند: ˮئەوە بەتەمای چی؟ چیە دەڵێی دەتەوێ خۆت بکوژی؟ˮ
- ˮتکایە لێم مەگرە،ˮ ئاغاجانیش وا وەڵامی دایەوە، ˮخەتای من بوو!ˮ
شوفێرەکە ئاغاجانی ناسییەوە و نیگا کەساسیانەکەی بینی.
- ˮئەوە بۆ کوێ دەچی؟ دەکرێ تا ئەوێت بگەیەنم.ˮ کابرای لێخوڕ وای پێگوتەوە.
- ˮمن؟ من دەچمە گرتووخانەکە، خۆ بۆ تۆ زەحمەت نابێ؟ˮ
- ˮکامە گرتووخانە؟ کۆنەکە یان نوێیەکە؟ˮ
- ˮنازانم کامەیان، ئەو شوێنەی کە گەنجەکانیان لێ تیربارانکردن.ˮ
- ˮکەواتە کۆنەکەیە، فەرموو سوار بە!ˮ
بەندیخانە کۆنەکە بە خۆی و دیوارە ئەستوورەکانی دەکەوتە دەرەوەی شارەکە. ترومبێلەکە لە گۆڕەپانۆکەی لای بەندیخانەکە وەستا و ئاغاجانی لێهاتەدەر. دەرگا ئاسنینە قەبەکە داخرابوو، سێ پۆلیسیش لەسەر دیوارەکە پاسەوان بوون. بەدەر لەوە هیچ شتێک دیار نەبوو.
هێشتا تاریک دانەهاتبوو، بەڵام گڵۆپە گەورەکان یەکسەر هەڵبوون.
- ˮهیچ کەسێک لێرە نییە،ˮ شوفێرەکە وا بانگی کرد، ˮئەگەر حەز بکەی دەتگەڕێنمەوە ماڵەوە.ˮ

بەڵام ئاغاجان گوێی لە کابرا نەبوو، تا لای دەرگاکە ڕۆیشت، بە دوای زەنگی دەرگاکە گەڕا، بەڵام هیچی لێنەبوو. بە مست لە دەرگا ئاسنینەکەی دا، ئەمما هیچ وەڵام نەبوو.
بە دەنگی بەرزەوە بانگی کرد: "ئەرێ هیچ کەس لێرەیە؟"
دیسان شوفێرەکە بانگی کردەوە؛ "ئەگەر بتەوێ دەتگەڕێنمەوەماڵەوە!"
"بەڕێزان!" ئاغاجان وای بانگی پاسەوانەکانی سەر دیوارەکە کرد، بەڵام ئەوان هەر خۆشیان لە گوورە نەبرد.
"بەڕێزان" توندتر بانگی کردنەوە.
شوفێرەکە دابەزی، بۆ لای ئاغاجان چوو، قۆڵی گرت و پێیگوت: "وا باشترە ئێستا بچیتەوە ماڵێ، بەیانی بگەڕێتەوە ئێرە."
کابرا بنباڵی ئاغاجانی گرت و هێنایەوە بۆ لای ترومبێلەکە، سواربوونەوە، گەڕانەوە شار و لە بەردەم مزگەوتی دایبەزاند.
کاتێکیش گەیشتەوە ماڵ، یەکسەر شتێکی بۆهات: "فەخری!" بە تۆنە دەنگێکی ناکاوییەوە بانگی خێزانەکەی خۆی کرد. "چارشێوەکەت لەخۆت بدە!"
- "بۆچی؟"
- "دەڕۆینە لای مام ڕەمەزان!"
ماوەیەکی زۆریش بوو مام ڕەمەزانیان نەبینیبوو. نەشیاندەزانی ئاخۆ کتومت چی دەکا، هەر ئەوەندەیان دەزانی، کە ئەو گوێدرێژەکەی بۆ ئایەتوڵڵا ئامادەکردبوو، بەرگی یەکپۆشی لەبەرکردبوو. ئاغاجان زەنگی ماڵەکەی لێدا، بەڵام هیچ چرایەک لە ماڵەکەی بەدی نەکرا.
دیسان زەنگەکەی لێدایەوە. دەنگی پێ لەدالانەکەوە بیسترا. قاپییەکە کرایەوە، مام ڕەمەزان لەنێو دەگاکە دەرکەوت. ئەو ڕیشێکی درێژ و دەمانچەیەکیشی پێبوو. لەبەر ئەوەی لە تاریکییدا وەستابوو، لە بەژنی خۆی گەورەتر دیاربوو. ئەو چاوەڕوانی هاتنی ئاغاجان و فەخری ساداتی نەدەکرد.
- "دەکرێ بێینە ژوور؟" فەخری سادات وای لێپرسی.
- "فەرموون." مام ڕەمەزان وایپێگوتنەوە.
لە ماڵەکەی وێنەیەکی گەورەی خومەینی هەڵواسرابوو، بەدەر لەو وێنەیە، چەندین وێنەی بچووکی ئایەتوڵڵاکانی دیکەش لەوێ دەبیندران.

- "مام ڕەمەزان، پێویستمان بە یارمەتی تۆ هەیە." ئاغاجان وای پێگوت، "جەواد گیراوە. شتێکت پێدەکرێ؟"

مام ڕەمەزان بە حەپەساوی سەیری کردن. هەمیشە ئەو وەک نۆکەرێک کاری بۆدەکردن، ئەوان بۆ ئەو باش بوون. هەنووکەش ئەوان بە تێکشکاوی لەبەردەمی وەستاون و داوای کۆمەکی لێدەکەن.

- "چیتان بۆ بکەم؟ نازانم ئاخۆ چیم لەدەست دێ؟"

- "من دەمەوێ لەگەڵ ئایەتوڵلادا قسەبکەم. دەکرێ دیدارێکی لەو جۆرەم بۆ ڕێک بخەی؟ پێویستە دیدارەکەش خێرا بێ، هەر ئێستا! دەترسم دوایی کارلەکار بترازێ."

- "ئێستا؟ ئێستا ناکرێ. من نازانم، مەبەستمە بڵێم، هەندێ بوەستە، فەرموون دانیشن، فەخری سادات دەکرێ پیاڵەیەک چای؟" وای گوت و دەستی دایە تەلەفۆن، کە لەمێژ نەبوو بۆی داندرابوو.

- ئەو ژمارەیەکی لێدا و گوتی: "لەگەڵ من! من دیدارێکم لەگەڵ ئایەتوڵلادا دەوێ. دەکرێ بۆم سازبدەی؟ نەخێر، بۆخۆم نییە. بۆ ناسیاوێکمە... بەڵێ، باش دەیناسم، زۆر لە مێژە، شتەکە گرنگە... ئەگەر بکرێ هەر ئەمشەو... من تێدەگەم. بەیانی..؟ باشە ڕێککەوتین، لە مزگەوتێ، دوای وتاری هەینێ؟ نەخێر، باشترە پێش وتارەکە بێ."

ئیدی فرمێسک بە چاوی ئاغاجاندا هاتنەخوار.



ڕۆژەکە ڕۆژی هەینی بوو، خەڵک پۆل پۆل دەچوونە مزگەوتێ. ئاغاجان لەدەرگاکە چاوەڕێی ئایەتوڵلاکەی دەکرد، بەلام ئەو وەخرا.

کاتێک ئایەتوڵلاکەش ویستی بەرەو مزگەوتێ بڕوا، زەنگی تەلەفۆنە سوورەکە لێدرا.

- "هەفتەی ڕابردوو عێراق بە چەکی کیمیاوی لە هێزەکانی ئێمەی داوە. بە هەزاران کەس مردوون، لە نێویاندا چەند سەد کەسێکی زەنجان و گوندەکانی دەوروبەری تێدایە." گوێی لە ڕێکخەرەکەی نوێژی هەینی بوو دەیگوت: "بەیانی تەرمەکانتان بۆ دێتەوە."

پاشان مارسیدیسە ڕەشەکەی ئایەتوڵلا لەبەردەم مزگەوتێ وەستا. یەک دوو پاسەوانی لێدابەزین. ئاغاجان یەک دوو هەنگاو بەرەو لایان ڕۆیشت، بەڵام یەکێ لە پاسەوانەکان بەری پێگرت.

- "ئاخر من وادە دیدارێکم لەگەڵ ئایەتوڵلادا هەیە." ئاغاجان وای بە پاسەوانەکە گوت.

- "ڕێگاکە بەردە!" پاسەوانەکە وای بانگکرد.

ئایەتوڵلاکە نیگایەکی بڕیە سەر ئاغاجان، بەڵام نەیناسیەوە، پێشتر هەرگیز نەیبینیبوو.

ئاغاجان کڵاوشاپۆکەی لەسەر داگرت و چەمایەوە. ئایەتوڵلاکە بە لایدا تێپەڕی.

"من دیدارێکم لەگەڵ ئێوەدا هەیە!" ئاغاجان وای بانگی ئایەتوڵلا کرد.

ئایتوڵلاکە کەمێک وەستا، سەیرێکی کرد و دیسان ڕۆیشتەوە.

ئاغاجان بە دوایدا غاریدا.

"من کلیلهەڵگری پێشووی مزگەوتێم!" لەکاتێکدا وای گوت پاسەوانێک توند گرتی.

ئایەتوڵلاکە ئاماژەیەکی کرد و بەریاندا.

ئاغاجان خێرا چووە لای. ئایەتوڵلا ئەراکی دەستی درێژ کرد، لەکاتێکدا بەرەو مزگەوتێ دەڕۆیشت. لە بەردەم دەرگای هۆڵی نوێژ، ئاغاجان دەستی ئایەتوڵلاکەی ماچکرد.

دیندارەکانی نێو مزگەوتێ، کە بینییان ئایەتوڵلاکە هاتەژوور، بە دروشم لێدان لەبەری هەڵسانەوە.

هەمووانیش بینیان، کە ئاغاجان دەستی ئایەتوڵلاکەی ماچکرد و ئایەتوڵلاش بۆ ساتێک وەستا و گوێی لێگرت. ئەوەشیان بینی کە هێشتا ئاغاجان هەر قسەی دەکردن، کە ئایەتوڵلاکە بەوەڕەزی ڕۆیشت، بینیان ئاغاجان دامەنی جبەی ئایەتوڵلای گرتبوو، پاسەوانەکانیش بە توندوتیژی ئاغاجانیان بردە لایەک.

ئایەتوڵلا ئەراکی راستەوڕاست بەرە کورسییە بەرزەکەی وتاردان ڕۆیشت و لە لای یەکەمین پەیژەی وەستا. پاسەوانێکیش تفەنگێکی بۆ برد، چەکەکەی وەک هێمایەکی جەنگ توند بەدەستیەوە گرت. ئیدی دەستی بە وتاردان کرد:
"سەدام کە کوڕی باوکی خۆی نییە، خاکی گەوهەری ئێمەی لە ئیسفەهان بۆمباران کرد! سەدام هیچ نییە، ئەو بێزمۆتە ئەڵقەلەگوێی ئەمریکایە. ئەمریکا تۆڵەی خۆی دەکاتەوە! ئەمریکا سەدام وەک ماشێنی جەنگ بەکاردێنێ! ئەوە سەدام نییە، بەڵکو ئەمریکایە مزگەوتەکانمان بۆمباران دەکا!
ئەمریکا! بۆمبارانمان دەکا! ئێمەش لەو ناترسین. ئەمریکا پەرستگا مێژوویینەکانمان خاپوور دەکا! ئێمە لەتۆ ناترسین!
سەدام نۆکەرە!
ئەو لە ئێمە دەترسێ، لە سوپاکەمان دەترسێ، لە ڕۆڵەکانی ئێوە دەترسێ.
ئەی دیندارانی زەنجان! خۆتان ئامادەکەن. من هەواڵی ئازاربەشم بۆ ئێوە پێیە. سەدام بە چەکی کیمیاوی لە کوڕەکانی ئێمەی داوە.
ئەی دایک، خۆت ئامادەکە!
ئەی باوک، خۆت ئامادەکە!
لە ماوەیەکی کورتدا، دەبێ ئێمە ڕۆڵەکانمان بنێژین. بەڵام کوڕەکانمان دەچنە بەهەشتێ و لە لایەن فریشتەکانەوە پێشوازییان لێدەکرێ."
- "ئەڵڵاهو ئەکبەر، ئەڵڵاهو ئەکبەر!" خەڵکەکە وا هاواری کرد.
- "خوا گەورەیە! ئێمە دەیبەینەوە! ئێمە بەغداش دەگرین. ئێمە هەر بە بەغداوە ناوەستین، ئێمە دەبێ بابدەینەوە سەر ئەمریکا و ئیسرائیل. ئێمە دەبێ حەرەمی شەریف[178] ڕزگار بکەین!
- بەڵام ئەی دایک، ئاگاداربە! ئەی باوک، باش بڕوانە! ئێمە لە هەمان کاتدا لە دوو بەرەدا دەجەنگین. لەوێ کوڕەکانمان دژی سەدام شەڕدەکەن. لێرەش ئێمە دژی کۆمۆنیستەکان وەستاوینەتەوە. هەرچەندە ئەوان بچووکیشن، بەڵام دوژمنێکی کوشندەی نێوخۆیین. دەبێ ئەوانیش لە ڕەگوڕیشەوە دەربێنین!"

---

[178] Alharem Alsharief

ئەو ئاماژەی بۆ ئاغاجان کرد و هاواری کرد: "بەزەیی لە گۆڕێدا نییە! بەڵکو سزای قورس!"

- "ألله أکبر!"

ئاغاجان کە لەسەر چۆک لەسەر زەوی دانیشتبوو، هەستی کرد مزگەوتەکە بە کۆڵی دادراوە. بە پشتکوورِییەوە لەبەرخۆی ورتەیەکی لێوەهات:

**" إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥)**
**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦)**
**صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (٧)**

**{ئێمە هەر تۆ دەپەرستین، پشت هەر بەتۆ دەبەستین.**
**لە ڕاستەڕێ شارەزان کە،**
**ڕێی ئەوانەی کە خۆت چاکەت لەگەڵ کردوون، نەک ئەوانەی کە وەبەر تووڕەیی کەوتوون، ئەوانەش کە لاڕێ بوون..}**



لەماڵەوەش، کاتێ ئاغاجان ڕەفتاری ئایەتوڵڵاکەی بۆ ژنەکەی ڕوونکردەوە، فەخری سادات دەستبەجێ چارشێوە ڕەشەکەی بە خۆی دادا و خەرک بوو بڕوا.

- "بۆ کوێ؟"

- "دەچم قسە لەگەڵ زینەت دەکەم. هەر دەبێ یارمەتیمان بدا!"

- "ئەو یارمەتیمان نادا. ئاخر ئەو بۆ کوڕی خۆی هیچی نەکرد، بۆ جەواد هەر هیچ ناکا. دنیا ئاوەژوو بۆتەوە، لەسەر سەر وەستاوە. خومەینی جاڕی جیهادی داوە. ئەو ئەرکەی بەسەر شانی هەمووانـدا داداوە، کە لەبەرامبەر نەیارانـدا بوەستنەوە. تەنانەت خودی دایکەکانیش ناپاکی لە کوڕەکانیان دەکەن."

- "ئاخر، خۆ جەواد هیچی نەکردووە."

- "فەخری خۆت لە گێلی مەدە، هەموو دایکەکان هەرو ادەڵێن. ئەو دەمێکە لە ماڵ ناژی. ئێمە نازانین ئەو چی کردووە و بۆچی چۆتە گوندەکە."

- "هێشتاش، هەر دەچمە لای زینەت."

- "زینەت لە ناو مزگەوتێدا خۆی لە ئەحمەد نەبان کرد. خۆ ئەگەر تۆ بچیە لای و دەربارەی کوڕەکەی خۆت، قسەی لەگەڵدا بکەی، هەرگیز بە هاناتەوە نایەت."

- "ئاخر خۆ ئێمە شتێکی دیکەمان نییە، هەر دەبێ بڕۆین. هەروەها تۆش، دەبێ بەیەکەوە بچین."

زینەت هێشتا هەر لە بەشی ژنانی گرتووخانەکەدا کاریدەکرد، لەوێدا فشاری وای دەخستە سەر گیراوەکان تا بە تەواوی دەستبەردار دەبوون و ئامادەدەبوون هەر ژەمەی حەوت نوێژ لەسەر یەک بکەن. بەبێ شەرمیش ناپاکی لە دۆست و ناسیاوەکانیان بکەن.

کاتێکیش شەوێکیان زینەت بەبێ ئاگادارکردنەوە گەڕابۆوە خانووەکەی مزگەوتێ تا دوا کەلوپەلەکانی بباتەوە، لە تاریکییدا گوێی لەدەنگی ئاغاجان بوو؛ "زینەت، ئەرێ بۆ هەموو شتێک هەر بە دزییەوە دەکەی؟ باشە بۆچی ناتەوێ بمانبینی؟ بۆچی هەر سڵاویشمان لێناکەیت؟"

زینەت هیچ وەڵامی نەدایەوە و لەسەر ڕۆیشتنی خۆی نەکەوت.

ئاغاجان چوو بەرییپێگرت.

- "ناکرێ تۆ هەروا بڕۆی. تۆ دەبێ وەڵامێکت هەبێ. خەڵک لە پاشلمەوە قسەی خراپت دەرهەق دەکەن. خەڵک دەڵێ تۆ بوویتە قامچیوەشێن، ئەرێ ڕاستە؟"

- "خەڵک هەرچی پێیخۆش بێ با بیڵێ،" زینەت وا بێدەنگی خۆی شکاند، "من ئەرکی خۆم ڕاییدەکەم. ئەوەی ئەڵڵا لێم داوادەکا، هەرئەوە دەکەم!"

- "تۆ باسی کامە ئەڵڵا دەکەی؟ باشە بۆچی من ئەو ئەڵڵایە ناناسم؟"

- "ئاخر ڕۆژگار گۆڕاوە!" زینەت وای پێگوتەوە.

ئیدی دەرگاکەی کردەوە و لێیدا ڕۆیشت.

زینەت هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد، هەستێک پێشتر هەرگیز وا ئاسوودە نەبووە. ئەوەی خەڵکیش دەیگوت، هەندێ ساردی دەکردەوە بەڵام خۆ شتێکی هەڵەی نەدەکرد. کاتێکیش ئەحمەد گیرا، زینەت بە نهێنییەوە پەیوەندی بە خالخالییەوە کرد، لە قوم یەکدییان بینی. دیدارێکی چارەنووسسازانە بوو،

خاڵێکی وەرچەرخان بوو لەژیانی زینەتدا. جارناجار زینەت دوودڵ بوو لەوەی لەسەر ڕێگای ڕاست بێ، لێ خالخالی هەموو گومانەکانی ڕەواندەوە.
"ئاخر شۆڕشێکی گەورە هەڵگیرساوە،" خالخالی وای بە زینەت گوت؛ "لە ڕاستیدا ئیسلام ڕەگوڕیشەی دووهەزاروپێنج سەد ساڵەی پاشایەتی دێرینی هەڵکەند. ئێمە هەنووکە خەریکی دامەزراندنی کۆمارێکی شیعەگەریین. ألله زۆر بە سەختی سزامان دەدا ئەگەر ئێمە ئەو دەرفەتە لە کیس بدەین. ألله دوو ڕووی هەن. یەکیان میهرەبانییە، ئەویدیکەشیان سامناکییە. ئێستاش ڕۆژ ڕۆژی ڕووە سامناک و تۆقاندنەکەیە. ئاخر ڕێگایەکەی دیکەمان بۆ بەرزڕاگرتنی ئیسلام لەپێشدا نەماوە. دوژمنەکانمان سەرسەختن. هیچ بژاردەیەک نەماوەتەوە. تۆ یان دەبێ ئیسلامەتی هەڵبگری و باقی دیکە بەلاوە بنێی، یاخود کوڕت، مێردت یان دایکت یان هەر کەسێکی دیکە، کە هیچ جیاوازیان نییە، هەڵبژێری. خواش بە بەهەشت پاداشتت دەداتەوە."



کۆمیتەی خوشکانی ڕەوشتپەرەوەر کە لە ژێر سەرپەرشتی زینەتدا کارابوو، لە باڵەخانەی سەرۆکی شارەوانی ڕژێمی پێشوودا بوو.
کاتێکیش ئاغاجان و فەخری سادات هاتنە کۆمیتەکە، کۆمەڵەیەک دایباب لە هۆڵی تەلارەکە وەستابوون، هەموویان بۆ کچە گیراوەکانی خۆیان هاتبوون. فەخری سادات توند چارشێوەکەی لەخۆی لوولدا و ڕووخساری خۆی شاردەوە و لێوەسەر پەیژەکان کەوت. دوو لە ژنە چارۆگە ڕەشەکان بەریان پێگرت.

- "چیت دەوێ؟" یەکێکیان وای لێپرسی.
- "من دەمەوێ قسە لەگەڵ زینەت خانم بکەم."
- "خوشک، خوشکە زینەت!" ژنەکەی دیکە قسەکەی بۆ ڕاستکردەوە.
- "تکایە لێم مەگرن،" فەخری سادات وەڵامی دانەوە، "هەڵبەتە، من مەبەستم خوشکە زینەت بوو!"
- "خوشکە زینەت کاتی نییە، ئەو هیچ کەس نابینێ."
- "ئاخر پرسەکە پرسێکی خێزانییە، پێویستە ببیینم."
- "پێتدەڵێم خێزان یان نا، هیچ لە پرسەکە ناگۆڕێ، ئەو کاتی نییە."

- "مـن براژنـی ئەوم. ئەوەش ئاغاجـانە، کـۆنە خەزووریەتـی. پێویسـتە دەسـتبەجێ قسـەی لەگەڵـدا بکەیـن. ئەگەر بکـرێ ئاگـاداری بکەیـتەوە، بە دڵنیاییەوە پێشوازیمان لێدەکا."
- "وا دەچم بزانم چیم بۆ پێدەکرێن. بەڵام تۆ بگەڕێوە ئەوێ بوەستە."
- "هەڵبەتە." فەخری ساداتیش وای پێگوتەوە.

زینەتـیش لە درزی پەردەی ژووری کـارکردنی ئاغاجـان و فەخـری سـاداتی بینین لەنێو خەڵکە چاوەڕوانەکەدا وەستابوون.

زینەت بە پرسی گرتنی جەوادی دەزانی، بەڵام ئەوەشی دەزانی، کە هیچی بۆ پێناکرێن.

ناوبەناو خالخالی زەنگی بۆ لێدەدا، بەڵام ئەو نەیدەتوانی زەنـگ بۆ خالخالی لێبداتەوە. زینەت نەیدەزانی ئاخۆ کتومت خالخالی چی دەکا، قەت گومانیشی بۆ ئەوە نەدەچوو، خالخالی ئەو دادوەرە دڵڕەقە تۆقێنەرەی خودا بێ.

تـۆ بڵێـی گەر بەڕاسـتی جەواد لە مەترسـیدابێ، یـارمەتی بـدا؟ زیـنەت لە بێدەسـەڵاتیدا دەلەرزی، نەخێر، ئەو نـاتوانێ یـارمەتی بـدا، زیـنەت ئەو کەسـە نیـیە، دژی ئەو شـتانە بوەسـتێتەوە، ئەو تەنهـا فەرمانەکـان جێبەجێـدەکا. خـومەینی لە وتارەکـانی خۆیـدا بە ڕوونوئاشـکرا باسـی خوشـکانی ڕەوشـتپەروەری کردبـوو: "ئەمـڕۆ ئیسـلام لەسـەر شـانی ئێـوەدا وەسـتاوە. ئەگەر پێویست بکا منداڵەکەی خۆتی لەپێناو دابنێ!"

زینەت جارێکی دیکە سەیری خوارەوەی کرد.

"من نامەوێ ئەوان ببینم. پێیان بڵێ، من لێرە نیم." وای بە ژنە پاسەوانەکە گوت.

ئیدی ژنەکەش گەڕایەوە لایان و بە فەخـری سـاداتی گـوت: "خوشـکە زیـنەت لێرە نییە. ئەو دەرچووە."

هیـوابڕاوانە فەخـری سـادات سـەیرێکی دەوروبەری خـۆی کـرد، سـەیری پەنجەرەکانی کرد، لە پڕ نیگای چاوی چووە سەر ژنێک لەپشت پەردەکەوە. زینەتی ناسییەوە. پەردەکە داخرا.

- "ئەو لەوێیە،" فەخری وایگوت، "هەر تازە لەپشت پەردەی ئەوێدا بینیم."

- "ئەو لێرە نییە، من وا پێتدەڵێم، دەی برۆ و ڕێگاکە بەردە." ژنە پاسەوانەکە بە جەختکردنەوە وای پێگوت.
ئاغاجان پیلی فەخری ساداتی گرت.
- "وەرە، با بڕۆینەوە!"
- "نەخێر، نایەمەوە، من لێرە دەمێنمەوە، هەر دەبێ قسە لەگەڵ زینەتدا بکەم." وای بە مێردەکەی خۆی گوتەوە.
- "دەی لێرە بڕۆن! دەنا بانگی براکان دەکەم!" ژنە پاسەوانەکەش وای وەڵامدایەوە.
- "زینەت!" فەخری وای بانگرد.
پیاوێکی چەکدار هات بە قۆنداخی تفەنگەکەی پاڵێکی بە فەخرییەوە نا بەرەو دەرگاکەی برد. "دەی بڕۆن، لێرە نەمێنن!"
"زینەەەەەەەەەەەەەەەەەەەت!" فەخری سادات تا هێزی تێدابوو هاوارکرد.
کابرای ڕیشدار قۆنداخە تفەنگێکی لە کەلەکی فەخری دا. فەخری سەرسمێکی برد و بە دەرگاکە کەوت، چارشێوەکەی لەسەر سەر لاکەوت. ئاغاجانیش یەخەی پیاوەکەی گرت پاڵێکی بۆلای دیوارەکە پێوەنا، ژنە پاسەوانەکە داوای یارمەتی کرد. دوو پیاوی چەکداری دیکە کەوتنە سەر ئاغاجان، زینەت پەنجەرەکەی کردەوە: "لێی نەدەن! لێی گەڕێن با بڕوا!"
ئاغاجان چارشێوەکەی فەخری لەسەر زەوی هەڵگرتەوە، بەسەر سەرو و شانی فەخری ساداتی دادایەوە پێیگوت: "دەی بابڕۆینەوە ماڵێ!"



دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو، خالخالی گەیشتە زەنجان.
هەنووکە کە ژمارەیەکی ئەوەندە زۆر لە سەربازانی دەوڵەت، لەبەرەی شەڕدا سەریان تێیداچووبوو، ساتەوەختێکی لەبار بوو، تا نەیارانی ڕژێم دادگایی بکرێن.
ئەو تۆمەتبارەکانی لە تەویلەی پێشووی گرتووخانە کۆنەکە، کە هێشتاش بۆنی ریخە ئەسپیان لێدەهات، بینی. لەوێ لەسەر دیوارەکانی تەویلەکەدا، ناڵی ئەسپ، زین و کورتان، قیاسە و ڕێشمە هەڵواسرابوون. خالخالی هەمیشە هەر گۆشە تاریکەکانی شاری هەڵدەبژارد.

لەوێ سێ گەنجیان هێنانە بەردەم خالخالی، ئەویش لە ماوەی چارەگە سەعاتێکدا حوکمی بەسەردا دان، یەکێک لەو سێ کەسە، سزای مەرگ و دووهەمیان دە ساڵ و سێهەمەکەشیان سێزدە ساڵ سزای بۆ بڕیەوە.
دوای ئەوان نۆرەی کیژۆڵەیەک هات.

- "ناوت؟"
- "مەحبوبە!"[179]
- "تۆ لەکاتێکدا گیرای، هەوڵی ڕاکردنت دەدا، باشە بۆچی هەڵدەهاتی؟"
- " لە ترسی گرتن هەڵدەهاتم."
- "ئاخر چیت کردبوو، تا ترسی گرتنت هەبێ؟"
- "هیچم نەکردبوو."
- "هەندێ بڵاوکراوەت لەنێو جانتاکەتدا هەبوون!"
- "ڕاست نییە. هیچ لەناو جانتاکەمدا نەبووە."
- "تۆ لە گوندی سووردا گیرای، ئایا لەوێ دەژی؟"
- "نەخێر."
- "ئەی لەوێ چیت دەکرد؟"
- "سەری برادەرەکانم دەدا."
- "ناوی برادەرەکانت چییە؟"
- "ناکرێ ناویان بدەم."
- "تۆ ناتەوێ هیچ بڵێی. زۆر باشە. ئایا پەشیمانی لەوەی کردووتە؟"
- "من هیچ شاشییەکم نەکردووە، شتێکم نەکردووە، هی ئەوەبێ داوای لێبوردنی بکەم."
- "ئەگەر ئەم شتە واژۆ بکەی و داوای لێبوردنیش بکەی، سزاکەت لەسەر سووک دەکەم."
- "خۆ ئەگەر هیچ کارێکی هەڵەم نەکردبێ، بۆچی دەبێ کاغەزەکە واژۆ بکەم؟"
- "شەش ساڵ!

پاشان خالخالی بانگی پاسەوانەکانی کرد. یەکێکی دی!"

---

[179] Mahboeb

کیژەکەیان لەوێ لابرد، ئینجا دوو چەکدار جەوادیان هێنا.
- "ناوت؟ خالخالی بەبێ ئەوەی هەر تەماشاشی بکا وای بانگ کرد.
- "جەواد!" بەندکراوەکە وای وەڵام دایەوە.
- "ناوی باوکت؟"
- "ئاغاجان!"
دەستبەجێ خالخالی سەری بەرزکردەوە، هەروەک ئەوەی مێشوولەیەک بە ملی وەدابێ. ئەو لەبن چاویلکە ڕەشەکەیەوە سەیری جەوادی کرد.
تیشکێکی زۆر لەسەر دەموچاوی تۆمەتبارەکە بوو، بۆیە نەیدەتوانی ڕووخساری دادوەرەکە ببینێ. خامەی دەستی خالخالی بەربووە سەر زەویەکە، لە چرکەیەکدا خۆی نوشتاندەوە تا هەڵیبگرێتەوە، ئەوسا جەواد بە شێکی دەموچاوی خالخالی بینی.
بیرۆکەیەکی ڕاگوزەرانەی وای بەمێشکدا هات، کە پێشتر دادوەرەکەی بینیبێ.
خالخالی کاغەزەکانی بەردەمی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکردن، دەیەویست کاتێکی زۆرتری هەبێ. "پەرداخێک ئاو!" وای بانگی دەرەوە کرد.
دوو پاسەوان هاتنەژوور و قۆڵی جەوادیان گرت تا هەڵیبگرن و بیبەنە دەرێ.
وایان زانی دادوەرەکە بۆ ئەوە بانگی کردن، تا لەوێی لابەرن.
"لەو گەڕێن. پەرداخە ئاوێک بۆ من بێنن!" خالخالی وای پێگوتن.
خۆ من ئەو کابرایە دەناسم، جەواد لە مێشکی خۆیدا هەر وایدەگوت. ئاخر دەنگەکەی غەریب نەبوو.
یەکێک لە پاسەوانەکان گڵاسە ئاوێکی هێنا و لەبەردەم خالخالی دانا. خالخالی قومێکی لە ئاوەکە دا و گوتی: "تۆ فایلێکی قورست هەیە. تۆ ئەندامێکی کارای پارتێکی کۆمۆنیستی، تۆ ئەو مێشکە بزوێنەرەی پشت پەردەی. بە دەمانچەیەکی بەر پشتێشەوە گیراوی، کە سێ فیشەکی پێ تەقێندراوە. خەڵک تۆیان بینیوە تەقەت لە کۆپتەرەکە کردووە. بۆ ئەو تاوانە قورسانە سزای مەرگت بەسەردا دەسەپێ. ئایا شتێکت هەیە بیڵێی؟" خالخالی وای پێگوت.
- "ئەو قسانە هەمووی درۆن. سەرباری ئەوەش من دان بەو دادگایەدا نانێم. ئەوەی تۆ دەیکەی ناقانونییە! من مافی پارێزەرێکم هەیە! مافێک بۆ بەرگری لەخۆکردن!"

- "دەمت داخە و گوێبگرە!" خالخالی بە توندی وەڵامی دایەوە. "من کاتێکی زۆرم بۆ تۆ تەرخان کرد، زیاتر لە ئەوانی پێش خۆت. فایلەکەت پوختەی تاوانە قورسەکانە."

- "دۆسیەکە ساختەیە، زانیارییەکان دروست نین. من هەرگیز دەمانچەم لەبەر پشتم نەبووە، قەتیش تەقەم لە هەلیکۆپتەر نەکردووە."

- "من کاتی ئەوەم نییە، مشتومڕت لەگەڵدا بکەم. ئامۆژگاریت دەکەم، باش گوێم لێبگری، تێگەیشتی؟ من بابت دەناسم، ئەگەر هاوکارم بی، دەمەوێ یارمەتیت بدەم."

خۆ ئەوە خالخالییە! شتێکی وای بۆهات. خالخالی دادوەرەکەی خودایە!

جەواد بەو بیرۆکەیەوە هەژا، دەمی وشک بوو. دەستەکانیشی لەرزین. خالخالیش تێگەیشت، کە جەواد ئەوی ناسییەوە.

- "گەنجۆ، گوێم لێبگرە. سەر لەبەیانی ئەمڕۆ زیاتر لە سێسەد تەرم لەبەرەکانی شەڕەوە هێنرانەوە ئەم شارە، هەمووشیان گەنجی هاوتەمەنی تۆ بوون. ئەوان لەوێ دژی دوژمن جەنگابوون، تۆش تەقەت لە کۆپتەرەکەمان کردووە. بۆمن هیچ لە پرسەکە ناگۆڕێ، ئاخۆ کوڕی کێی، تەنانەت گەر برای منیش بی، من سزای مەرگت بە سەردا دەدەم. بەڵام لەبەرئەوەی باوکت دەناسم، لێرەدا ڕێزپەڕییێک دەکەم. من سێ پرسیارت لێدەکەم. بەرلەوەی وەڵامیان بدەیتەوە، باش بیری لێبکەوە. خۆ ئەگەر کوڕێکی زیرەک بی، وەڵامی ڕاست دەدەیتەوە. تۆ دەبێ باش تێبگەی، پێشتر من هەرگیز ئەو دەرفەتەم بە کەس نەداوە و بە کەسیشی نادەم.

پرسیاری یەکەم: تۆ کۆمۆنیستی یان باوەڕت بە ئیسلام هەیە؟"

جەواد هەستی بە جدییەتی قسەکانی خالخالی نەکرد. ئەو لە توڕەییدا دەکوڵا: "من هیچ وەڵامی ئەو پرسیارەت نادەمەوە. تۆ وەک دادوەرێک بۆت نییە ئەو جۆرە پرسیارانە بکەی. سەرباری ئەوەش، خۆ ئێرە دادگا نییە، بەڵکو تەویلەیە!"

- "باش بیر لەو قسەیەی خۆت بکەوە،" خالخالیش وای پێگوتەوە؛ "دووهەمین پرسیار: دەبێ ڕۆژانە هەفت جار لەگەڵ گیراوەکانی دیکەی بەندیخانەدا، وەک سزا نوێژ بکەی؟"

- "نوێژکردن پرسێکی کەسییە. هەر بۆیە هیچ وەڵامت نادەمەوە."
- "پرسیاری سێهەم"دەبێ ئەو فۆرمە پەشیماننامەیەت واژۆ بکەی؟"
- "باشە بۆچی داوای لێبوردن بکەم، لە کاتێکدا هیچ هەڵەیەکم نەکردووە؟ نەخێر، نایکەم."

خالخالی کەوتە گومان، گەر هاتبا و هەندێ لەگەڵیدا هاوکاربا، لە مردن دەیگەڕاندەوە.

- "من هێشتا یەک دەرفەتی دیکەت دەدەمێ و ئامۆژگاریت دەکەم ئەم هەلە لەدەست خۆت نەدەی." خالخالی وایپێگوت.

ئیدی قورئانێکی قەبارە بچووکی لە گیرفان دەرهێنا و دایە جەواد و پێیگوت: "ئەگەر بەم قورئانە سوێند بخۆی، کە هیچ دەمانچەت پێنەبووە و هیچ تەقەشت نەکردووە، ئەوا سزایەکەت سووک دەکەم! لێ ئەگەر وا نەکەی، دەستبەجێ لە بەرامبەر دیواردا ڕاتدەگرم!"

- "تۆ سەدان بێتاوانت لە سێدارە داون. ئەمەش خۆی تاوانە. تاوانە دژی ئەم قورئانە. من ئەوەی تۆ دەیڵێی، نایکەم. هەر لەبەر ئەوەش کە باوکم دەناسی، وا ناکەم. بە هۆی ڕەفتارەکانت، شەرم لەخۆم دەکەمەوە. کەسایەتی تۆ لای ماڵی ئێمە ناسراوە. تۆ دەتەوێ چاکەیەکم لەگەڵدا بکەی، بەڵام من چاکەکەت وەرناگرم. تۆ لەبەرامبەر ماڵباتەکەمدا هەست بە خەتاباری دەکەی، لێ من لەجیاتی تۆ شەرم لەخۆم دەکەمەوە. من هیچ سزایەکی سووککراوەم لە جەللادێک ناوێ، کە دەستبەرداری ژن و منداڵەکەی خۆی بووە، جەللادێک کە بەدڕەفتاری لەگەڵ هاوسەرەکەیدا نواندووە، ئەشکەنجەی داوە. من هەرگیز لەبەرامبەر کەسێک، کە بەیەک جار سەدان کوردی تیرباران کرد، چۆک دانادەم. گەر وابکەم، کوڕی باوکی خۆم نیم. دەی قورئانەکەت بخەرەوە نێو گیرفانت، من پێویستم پێی نییە."

خالخالی بەتوندی بانگی کرد: "مردن!"

پاسەوانەکان ڕژانە ژورەکە و جەوادیان بردە ئەو جێیەی، کە گیراوەکانیان لێ گوللەباران دەکردن.

یەکێـک لە پاسـەوانەکان چاوەکـانی جەوادی بەسـتنەوە و لە بەرامـبەر دیـوارەکەدا ڕایانگرت. جەواد پێیوابـوو، خالـخـالی ئەو گوللەبـاران ناکـا، بەڵکە هەر دەیەوێ بیترسێنێ و وایلێبکا داوای لێبوردن واژۆبکا.

تەنـانەت دوای ئەوەی پاسـەوانەکان چاویشـیان بەسـتنەوە و لە بەرامـبەر دیوارەکەدا وەستاندیان، جەواد لەو بڕوایەدا بوو، هەڵسوکەوتەکەیان هەر بۆ ترسـاندنە و بەس. ویـڕای ئەوەش، ئەو هەرگیـز دەمـانچەی هەڵنەگرتبـوو، چ جـای ئەوەی تەقە لە کـۆپتەرەکە بکـا. ئـاخر ئەوان هۆکـاری ئەوەیـان نەبـوو، لەبەردەم دیـوارەکەدا ڕایبگرن. ئیـدی دەنگـی تەپەی پێیـان هـات، گومـانی بـۆ خالـخـالی چـوو، گـوایە دێـت و لەگەڵیـدا قسـەبکا. جەواد لەوە دڵنیـا بـوو، کە خالخالی بۆ لای ئەو دێ، لەبەر خاتری ئاغاجانیش لە سێدارەی نادا.

کەچـی خالـخـالی نەچـووە لای. جەواد چـاوەڕوانی ئەوەبـوو خالـخـالی پێیبڵـێ: "دەی بەسیەتی، چاوەکانی بکەنەوە، بیبەنەوە بۆ نێو زیندانەکە."

- "ئامادەبن!" خالخالی وای بە پاسەوانەکان گوت.

دوو پاسـەوان چۆکیان گەیاندە سـەر زەوی و لوولەی تفەنگەکانیان لە سـینگی جەواد کرد.

جەواد پشـتی خـۆی ڕاسـت ڕاگـرت تـا نیشـانی خالـخـالی بـدا، کە ناترسـێ. ئەو وایدەزانی خالخالی لەوە زیاتر ناڕوا.

- "تەقە!" خالـخالی وای بانگکرد.

تەقەکە کـرا. سـەرەتا جەواد هەسـتی بە تەقەکـان نەکـرد، کە بە جەسـتەی کەوتـن. بـۆ چـرکە سـاتێکی چاوتروکانێـک بیـری کـردەوە: دەبینـی، ئەوان ویستیان بمترسێنن.

ئەو بەلادا هات.

ئیدی کەوت.

سەری کەوتە سەر زەوی و چاوەکانی داخران.

## کێوەکان

ئاغاجان تەرمی جەوادی وەرگرتەوە، تەرمەکە لەناو ترومبێلێکدا لە بەردەم دەرگای ماڵیان بوو.

فەخری ساداتیش لە لای پەنجەرەکە وەستابوو، سەیری خوارەوەی دەکرد، ئەو شوێنەی بانگدەرەکە بەبێ ئۆقرە هەر دەهات و دەچوو. فەخری لەپشت جامی پەنجەرەکەوە وەک ئەوەی وێنەیەکی ڕەش و سپی بێ، وێنەی دایکێکی ماتەمبار.

بە گوێرەی دابونەریتی ئێرانییانە، دەبوایە کردبایانە شینوشەپۆر، قیژاندبای، سەری لە داروبەرد دابووایە و پرچە ماشوبرنجەکەی خۆی دەرکێشابایە. دەبوایە ژنەکان غاریانـدابایە لای بیانگرتبایە و هەر هەموویان بە یەکەوە گریابان.

بەڵام ئەو شتانە هەمووی قەدەغەکرابوون، ئەوان نەدەبوایە خەمباری خۆیان بۆ کەس دەرخستبایە.

ئاغاجانیش نەیدەزانی، ئاخۆ تەرمی جواد لە کوێ بەخاک بسپێرێ. ئەو هەموو دوای نیوەڕۆکە هەر خەریکی تەلەفۆن و تەلەفۆنکاری بوو، بەڵکو مۆڵەتی ئەوە وەربگرێ لە شارەکەدا بینێژێ، بەڵام کەس نەیدەوێرا لەگەڵیدا شانی بداتەبەر و لەو بارەیەوە یارمەتی بدا.

لەوێ لە کۆلانەکەی لای ماڵیان دەنگی تەپەی پێ هاتن، بانگدەرەکە گوێکانی قوڵاغ کردن، ئەو تەپەی پێکانی نەناسینەوە.

کلیل لە کونی کیلۆنی دەرگاکەیان وەردرا، دەرگایەکە کرایەوە، ئەوەی هاتە ژوور شاباڵ بوو. مارمیلکەش خێرا بۆلای ڕۆیشت.

بانگدەرەکەش چووە لای شاباڵ، باوەشی پێداکرد و بە بێدەنگی لەسەر شانی ئەو گریا.

شاباڵ هەواڵی گوللەبارانکردنەکەی بیستبوو، هەرچەندە بە هاتنی بۆ شاری زەنجان ژیانیشی لە مەترسیدابوو، لێ دوای هەواڵەکە دەستبەجێ بەرەو ماڵ گەڕایەوە.

ئاغاجانیش لە ژوورەکەی هاتەدەر، شاباڵی بینی و هەروەک جاران سڵاوی لێکرد. شتەکە وەک ئەوە دەچوو، کە شاباڵ ئەو چوارسەد و پەنجا

کیلۆمەترەی هەر بۆ هیچ بڕیبێ و گەڕابێتەوە ماڵ، ئاغاجان سۆزەکانی دەرنەبڕین.

- "سوپاس بۆخودا لەوەختی خۆت هاتیەوە، من پێویستم بە تۆیە. باشە لە کوێت بیست؟" ئاغاجان وای پێگوت.

بەڵام خۆ ئەو چاوەڕێی وەڵامەکەی نەکرد: "ئێمە دەبێ دەستوبرد کەین! ئەو لەبەردەم دەرگا! لەناو ترومبێلەکە دایە."

ئەویش قۆڵی گرت و ئامێزێکی تێوەرینا.

- "ئاغاجان، پرسەمان، ئەی ئاغاجانی بەستەزمان تازیەمانەت لێدەکەم."

شاباڵ لەکاتێکدا دەگریا وای بە ئاغاجان گوت.

شاباڵ هەستی بە خەتاباری خۆی کرد. دەترسا نەبادا ئاغاجان ڕووی خۆی لێوەرگێڕێ.

- "گەنجۆ، ئەوە ئیرادەی خودا بوو،" ئاغاجانیش وای پێگوتەوە، "دەی، با بڕۆین. دەنا زۆری دیکە نابا، تاریکی دادێ، کاتی زۆرمان بەدەستەوە نییە."



شاباڵ سویچی ترومبێلەکەی لەناو دەستدا بوو، خۆ شتەکەش ڕاستی بوو، بەڵام دەیەویست بە چاوی خۆی جەواد ببێنێ، ئەوسا بڕوا بە مردنی بکا.

بەرەو لای ترومبێلەکە ڕۆیشت، دەرگای پشتەوەی کردەوە. جەواد لەوێ درێژکرابوو، هەمووی بە خامی سپی داپۆشرابوو. دیاربوو سارد ببووەوە، دەستەکانی لەنێو ڕانیدا بوون، لەسەر لا داندرابوو. بەتانیەکەی کەمێ لەسەر لادا، سەری بەدیارکەوت. بەڵێ ئەو بوو، جەواد بوو، گوللەیەکی لە لاجانگی چەپەوە درابوو.

"ئێمە دەبێ پەلە بکەین." ئاغاجان وای پێگوت.

شاباڵ دەرگای پشتەوەی ترومبێلەکەی پێوەدایەوە، خۆشی چووە پشت سوکانەکە.

- "بەرەو کوێ؟" کاتێ لە کۆڵانەکە دەرچوون وای لە ئاغاجان پرسی.

- "ئەم لایە!" ئاغاجان ئاماژەی بۆ کێوەکانی لای باکوور بۆکرد.

شاباڵ نەیدەزانی چ نەخشەیەکی هەیە، لێ ئاغاجان خۆ پیاوێک نەبوو لێبگەڕێ کوڕەکەی لە شوێنێک، لە گوندێکی لاپەڕگەی شاخەکان بنێژرێ.

ئەو بەتاسەوە دەیەویست لەگەڵ ئاغاجان دەربارەی خەمە هاوبەشەکەیان بدوێ، بەڵام ئاغاجان ئەوەندە بەقووڵی چووبووە نێو دنیای خەیاڵ، لەخۆی ڕانەبینی هەراسانی بکا.

کەواتە بەبێ دەنگی بەرەو چیاکانی باکوور لێیخوڕی.

- "ئەرێ نەخشەیەکت هەیە؟" دوای ماوەیەک شاباڵ وای لە ئاغاجان پرسی.
- "بەرەو مەرزیجاران"[180] دەڕۆین."
- "بەرەو مەرزیجاران؟" شاباڵ بەسەرسامییەوە لێیرسی؛ "ئاخر ئەوە ئەستەمە، گوندییەکانی ئەوێ هەموویان لایەنگری خومەینین. خۆ ناتوانین لەوێ داوای گۆڕێک بکەین؟"

ئاغاجان هیچی نەگوت، بەڵام بۆ شاباڵ شتەکە ڕوونوئاشکرا بوو، ئاخر ئاغاجان لە ماڵەوە ڕاوێژی بە قورئانەکەی کردبوو. مشتومڕ لەو بارەوە بێسوود بوو، بۆیە ئاساییانە ترومبێلەکەی لێخوڕی.



ڕێگاکە بۆ ترومبێلێکی بچکۆلانە دروستنەکرابوو، لەڕاستیدا هەر جادە نەبوو، بەڵکو شوێنەواری تایەکانی پاسی گوندەکە بوو.

مەرزیجاران گوندێک بوو لەنزیک شارەکەدا هەڵکەوتبوو، لە دوای یەکەمین گرد لە بەرامبەر بەرزایی شاخە بەرزەکان. شاباڵ بە ئەسپایی بەسەر گردەکە کەوت و لەدیوەکەی دیکەش دابەزی. لەوێوە هەندێ خانوو دەبیندران.

کەشەکەش سارد بوو، ئەمەش بە هۆی ئەو بەفرە بوو کە لووتکەی کێوەکانی داپۆشیبوو. هێشتا تاریکیی دانەهاتبوو، بەڵام شاخەبەرزەکان سێبەری ڕەشیان بەسەر گوندەکە دادابوو. خانووەکان لە بەردی سروشتی دروستکرابوون. خۆ ئەگەر نەتزانیبا کە گوند لەوێیە، خێرا نەتدەتوانی لە گاشەبەردەکانی جیابکەیتەوە.

کاتێکیش ئەوان نزیک کەوتنەوە، دووکەڵی بۆڕیە زۆپای گەرماوەکەیان بینی، ئەوەش تاکە شوێنەواری ژیانی ئەوێ بوو.

[180] Marzedjaran

لە گونـدێکی وەک ئەوێ، هەمیشــە چـاوەڕوانی لە گۆڕێـدا بـوو: چـاوەڕێی کەسێک بۆی بچێ یان یەکێکی لێوە دەربچێ، چاوەڕێی لەدایکبوونی منداڵێک، یان کەسێک بمرێ.

هەمیشە گوندە خەواڵووەکە چاوەڕێی ڕووداوێکی دەکرد، ئینجا دوای ئەوە جووڵەی تێدەکەوت.

شاباڵ بۆ ناو گوندەکەی لێخوڕی، خۆ ئەوان پێویست نەبوو هیچ شت بڵێن، ترومبێلێکی وا نەناسراو لە شاخەکە دابەزێ، لەخۆوە واتای ئەوەی دەگەیاند شتێک قەوماوە.

ئاخر، تۆ بڵێی کێ بەو زستانە بەنێو شاخەکاندا دەڕوا؟ کەسێک نییە بەدەر لە نەیارێک، کەسێک کە هەڵبێ یان یەکێک تەرمێکی لەنێو ترومبێلەکەدا دانابێ.

لە پڕێکەوە گوێیان لە دەنگی وەڕین بوو، یەک دوو کسۆک لە پەنا بەردێکەوە کێویانە بازیان هەڵدا، بەغار بۆلای ترومبێلەکە هاتن. ئینجا پیاوێکی قەڵەو بە خۆی و تفەنگێکەوە پەیدابوو.

"ئەڵڵا!" ئاغاجان وای هاوارکرد.

ســـەگەکان بە حەپەحەپەوە بڵاوبـــوونەوە. پیاوەکـــانیش لە تـــرومبێلەکە نزیکبوونەوە.

"شاباڵ، لەشوێنی خۆت دانیشە." ئاغاجان لە ترومبێلەکە دابەزی.

ئەو بەرەو پیاوەکان هەنگاوی نا، ویستی لەگەڵیان بدوێ، ویستی بڵێ لەگەڵ مەلای گونـدەکە بـرادەرە. ئەو دەسـتی بـۆ ڕاهێشـتن، بەڵام ئەوان تەوقەیـان لەگەڵدا نەکرد، ئەویان پشتگوێ خست و بەرەو ترومبێلەکە هاتن.

ئەوان نـاحەزانە سـەیری شـاباڵیان کـرد و زیـاتر بـۆ لای تـرومبێلەکە هـاتن. دەیانەویست دەرگاکەی پشتەوەی بکەنەوە. ئاغاجانیش بەرەو ڕوویان چوو، حەپەحەپی سـەگەکانیش ئەو ناوەیان پڕکردبوو. شـاباڵ خێرا لە ترومبێلەکە دابەزی و ئاغاجـانیش خێرا پـاڵێکی بە پیاوەکـانەوە وەنـا و پشـتی بە دەرگەی پشتەوەی ترومبێلەکەوە دا. یەکێ لە پیاوەکان لفکەی کراسی ئاغاجـانی گـرت و ڕایکێشـا و لەوێ لایبــرد، ئەوی دیــکەش دەرگەکەی کــردەوە. یەکــێ لە سـەگەکان بازیـدایە نێـو تـرومبێلەکەو گـازی لە کفنـی تەرمەکە گـرت. شـاباڵ دەســتی دایە ئەو خاکەنــازەی لە تەنیشــت تەرمەکە دانــدرابوو، بە تونـدی

خاکەناسێکی لەپشتەملی سەگەکە دا. ئاژەڵەکە بە نوزەوە لە ترومبێلەکە دوورکەوتەوە.
شاباڵ بە تەواوی جڵەوی لەدەستدابوو، پاڵی بەپیاوەکانەوە نا و دووری خستنەوە. بەو بێڵەی لە دەستی دابوو لە بەردەم دەرگەی ترومبێلەکە وەستا، ئێشکی لە تەرمەکە گرت.
پیاوەکان لە گوندەکەی خۆیان لە ڕەفتارە توند و زبرەکەی شاباڵ تورەبوون، ئیدی بەسێ کەس پەلاماریان دا. ئاغاجان هەوڵیدا ڕێگەیان پێبگرێ. بەڵام هەوڵەکانی دادیان نەدا. شاباڵ ئەوەی لەسەری بوو کردی بۆ ئەوەی خۆی لە مست و پێلەقەی پیاوەکان بپارێزێ، تا ئەو کاتەی کۆمەڵە گوندیێکی دیکە هاتن و لەیەکیان کردنەوە. ئاغاجان دەستەکانی بۆ درێژکردن و گوتی: "من داوای یەک گۆڕتان لێدەکەم. من تەرمی کوڕەکەم پێیە"
لە گوندییەکانەوە هیچ کاردانەوە پەیدانەبوو، هیچ وەڵامیان نەدایەوە. وەک ئەوە وابوو ئەوان لەبەرد بن، پیاوە بەبەردبووەکان بە واقوڕمانەوە سەیری ئاغاجانیان دەکرد.
- "لەگەڵ گوناحکاران لێرە برۆ! لێرە جێگەی گۆڕ نییە!" یەکێ لەپیاوەکان وای بانگ کرد.
- "من داواتان لێدەکەم..."
- "پێمگوتی، دەی، لێرە برۆ!" پیاوەکە بە تورەیی وای پێگوت و ڕووبەڕووی ئاغاجانیش ڕۆیشت. شاباڵیش دەستی دایەوە خاکەناسەکەی. بەڵام ئاغاجان خاکەنازەکەی لەدەست شاباڵ دەرهێنا و گوتی: "ئێمە دەڕۆین."
سوار بوونەوە، شاباڵیش ترومبێلەکەی سوڕاندەوە.
هێشتا زۆریش لە گوندەکە دوورنەکەوتبوونەوە، شاباڵ لەسەر تەنیشت نیگایەکی لە ئاغاجان بڕی. ئەو ئەوق مابوو، پیاوێکی تێکشکاو لە تەنیشتی دانیشتبوو. شاباڵ ئەمەی لە چۆنیەتی دانیشتینی ئاغاجانەوە تێبینی کرد. ئەو ڕاوێژی بە قورئانەکەی کردبوو، بەڵام شتەکەش لەدەست دەرچوو. ئەو وەک مەلێکی پیر دیاربوو، زاتی ئەوەی نەبوو چیدی بفڕێ.
تاریکیش داهات، شاباڵ بێ مەبەست بەنێو شاخەکاندا دەیهاژۆت، تا ئەوکاتەی ئاغاجان ڕێک دانیشتەوە و کتێبە پیرۆزەکەی نێو گیرفانی

دەرهێنایەوە. ئیدی هێز و توانای خۆی کۆکردەوە، چاوەکانی نوقاندن و قامکەکانی وەک نابینایەک لەسەر دێرەکانی قورئانەکە جوولاندان. دوای خولەکێکی دوورودرێژ بە خۆراگرییەوە گوتی: "بابرۆینە سارج[181]." ئینجا کتێبەکەی خستەوە باخەڵ.

شاباڵ لەگەڵ ئاغاجان هاوڕا نەبوو. ئەو هیچ جیاوازییەکی لە نێوان ساروخ و ئەو گوندە نەدەبینی کە لێی دەرکران. دەکرێ ئەوان سەدان گوند بکەن، لێ هەرهەمان شتیان لێ ڕوو دەداتەوە.

ئاغاجان نەیدەویست کوڕەکەی هەروا بەبێ ڕێزنیشاندان بە خاک بسپێرێ، ئەو بەدوای گۆڕێکی فەرمییدا دەگەڕا، ئەمەش ئەستەم بوو.

"لەوێش خەڵکەکەی یارمەتیمان نادەن." شاباڵ بێدەنگییەکەی وا شکاند؛ "ئێمە دەبێ قبوڵمان بێ."

ئاغاجان هیچ وەلامی نەدایەوە، وای لەخۆی کرد هەر گوێی لەقسەکەش نەبووبێ.



گۆڕستانەکەی ساروخ لە دەرەوەی گوندەکەوە بوو. شوێنێکی چۆڵگە و سارد.

"لێرە چاوەڕێ بکە، من بەخۆم دەچمە نێو گوندەکە." ئاغاجان وای بە شاباڵ گوت.

شاباڵیش لەوی بەجێما. قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد: "ئەو ڕاست دەکا، هەنووکە تێدەگەم بۆچی ئەو بە دوای گۆڕێکی فەرمیدا دەگەڕێ بێ ئەوی گوێ بە مەترسیەکانیشی بدا. من زۆر شەرم لە خۆم دەکەمەوە، کە پێشتر پەیم پێنەبرد. ئاخر ئێمە هیچی هەڵەمان نەکردووە، نابێ جەواد بە دزییەوە بنێژرێ."

ئینجادەستی دایە خاکەنازەکە و وەستا. کاتێکیش گوێی لە دەنگەدەنگ بوو، پێنج پیاو بە خۆیان و لایتەکانیان دەرکەوتن. ئەوان کەسانی بەتەمەن بوون و ئاغاجانیشیان لە نێویاندا بوو. هیچ سەگیشیان پێنەبوون.

---

[181] Saroeg

ئەو لە هەڵسوکەوتەکەی ئاغاجان ئەوەی بینی، کە نەیتوانیوە قەناعەتیان پێبێنێ. ئەوان برادەری ئاغاجان بوون، ئەوان تا دەرەوەی گوندەکەش لەگەڵی هاتبوون، تا دڵنەوایی بدەنەوە. بەڵام خۆ ئەوان لایەنگرانی ڕژێمیان دەناسی، دەیانزانی گەر تەرمەکە لە گۆڕستانەکەیان بنێژرێ، چ ئەنجامێکی لێدەکەوێتەوە.

ئەوان بەرەو شابالیش هاتن، ویستیان سڵاوی لێبکەن، تازیەنامەی لێبکەن، بەڵام خۆ لەبارێکدا بوو نەیتوانی شتەکەیان لێقبووڵ بکا. ئەو دەهری ببوو، لە هەمان کاتیشدا هەستی بە دەستەوەستانی خۆی دەکرد. ئیدی دەرگای ترومبێلەکەی کردەوە و دیسان چووە پشت سوکانەکە، ئاغاجانیش خواحافیزی لە پیاوەکان کرد و سوار بووەوە.

ئەوان تازە بەڕێکەوتبوون، گوێیان لە کەسێک بوو بانگی کردن.

"هۆۆۆو، کەمێ ڕایگرە!" ئاغاجان وای بە شابالْ گوت.

شابالْ ترومبێلەکەی ڕاگرت. ئاغاجان جامەکانی داهێنانە خوار. یەکێ لە پیاوەکان بە هەناسەبڕکێوە رایکردە لایان: "ئێوە دەبێ بەرەو ڕەحمان عەلی[182] برۆن،" پیاوەکە وای پێگوتن، "ئەو تاکە کەسە یارمەتیتان بدا."

ئاغاجان یەک دوو جار سەری بۆ لەقاند، ئەمەش نیشانەی ئەوەبوو، پیاوەکە ڕاست دەکا.

"بەرەو جیریا بازۆ،" ئاغاجان وای بە شابالْ گوت، "دەڕۆین بە دوای رەحمان عەلیدا دەگەڕێین."



جیریا ئەو گوندە بوو زۆرترین دەرفەتی ئەوەیان هەبوو، جێی گۆڕێکی تێدا دەستبکەوێ، چونکە گوندەکە هی خانەوادەکەی خۆیان بوو. زۆر لە ئەندامانیماڵباتەکەی ئاغاجان و فەخری سادات هێشتا هەر لەوێ دەژیان، وێڕای ئەوەش گۆڕی کازم خانیش هەر لەوێ بوو.

خۆی دەبوایە ڕاستەوخۆ بۆ ئەوێ چووبان، بەڵام کتێبە پیرۆزەکە هیچ ئاماژەی بۆ ئەوێی بە ئاغاجان نەدابوو. ئێستاش پیاوەکە کە ناوی رەحمان عەلی بیرخستەوە، ئاغاجان لەوە دڵنیا بوو شوێنێکی شایستەی دۆزیوەتەوە.

---

[182] Rahmanali

ڕەحمان عەلی پیاوێکی وردیلەی بە تەمەن بوو، ڕیشێکی بۆزی درێژی هەبوو. گوندەکە شانازی پێوەدەکرد. ئەو تەمەنی گەیشتبووە سەدوچوار ساڵ، لەنێو خەڵکیدا بە پیاوە پیرۆزەکە دەناسرا. خەڵک دەیگوت ئەو دەتوانێ جادوو بکا، هەتا دەتوانێ منداڵە مردووەکانیش زیندوو بکاتەوە. قسەی ئەو دوا قسەی گوندەکە بوو، هەمووانیش ئەمەیان دەزانی. ئەگەر کەسێک پەنای بۆ ببردبایە، ئەوا لە سەلامەتییەکەی خۆی دڵنیا دەبوو. لە لایەن گوندییەکانەوە ماڵەکەی ئەو بە پیرۆز دادەندرا. لە دۆخە سەختەکاندا، لەو کاتانەی کە نەتدەتوانی پشت بەکەس ببەستی، ئەوا هەمیشە ئاغاجان دەیتوانی ڕاستەوخۆ بگەڕێتەوە لای ڕەحمان عەلی. ئەوان یەکدییان باش دەناسی، ئاغاجان هەر کاتێک هاتبایە جیریا، سەری لە ڕەحمان عەلی دەدا، ئەگەر پێویستیشی پێبووایە پارەشی دەدایە.

جیریا لە نێو کێوەکاندا، لە بەرزایی هەڵکەوتبوو، لە بەفرەوە نزیک بوو. ڕێگایەکی خۆشیشی نەبوو، تەنها ڕێگایەکی لمین بوو، کە پاس و جیپەکان بە زەحمەت بەسەردا دەڕۆیشتن. بە زەحمەتییەکەوە ئەوان بەسەر ڕێگاکەدا ڕۆیشتن، دەشترسان نەوەک ترومبێلەکەیان بخلیسکێ و بکەوێتە چاڵێک و دەرنەیەت. سەرمایەکەش هی دەرەقەت هاتن نەبوو، گەرمی ترومبێلکەش دادی نەدان. ئاغاجان نیگایەکی خەمخوارانەی لە تەرمەکە بڕی، کە لە پشتەوەی ترومبێلەکە داندرابوو.

خەریکبوو بگەنە گوندەکە، ئاغاجان گوتی: "لایتەکانت بکوژێنەوە، لەوێ لەپشت گاشەبەردەکە ڕایگرە. ئێمە بە ترومبێلەوە ناچینە ناو گوند. تۆ لێرە بمێنەوە، من دەچم ڕەحمان عەلی دەدۆزمەوە."

- "لێگەڕێ بامن بچم بیدۆزمەوە." شاباڵ وای وەڵامی ئاغاجان دایەوە.
- "واباشترە خۆم بچم و قسەی لەگەڵدا بکەم."
- "من نامەوێ تۆ بە تەنیا بڕۆی."
- "ئاخر لەوە زیاتر ناکرێ، خۆ ناکرێ تەرمەکە بە تەنیا لێرە جێبێڵین."
- "من متمانەم بەم گوندەش نییە. هەموو شتێک گۆڕاوە. ئەگەر یەکێک بتناسێتەوە، ئەوا دەمودەست دەزانن، کە چی لە ئارادایە."

ئاغاجان دەستی بۆ گیرفانی خۆی برد، بە دوای قورئانەکەیدا گەڕا ئاخۆ لە شوێنی خۆی ماوە.

- "ئێمە هیچ بژاردەیەکمان بۆ نەماوەتەوە. من خۆم چارەی دەکەم." ئاغاجان وای پێگوت و لە ترومبێلەکە هاتەدەر.

ئەو بەنێو بەفرەکەدا ڕۆیشت و بەسەر پردە دارینەکەشدا پەڕیەوە. لێرە سەگەکان بۆنیان نەکرد.[183] شنە بایە ساردەکە، کە بەسەر سەهۆڵەکەدا هەڵیدەکرد، پێستی وەک چەقۆ شەق دەکرد. تاکە شتێک کە بیری لێدەکردەوە: من دەبێ بەر لەوەی ئیسلامییەکان بمبینن، خۆم بگەیەنمە ڕەحمان عەلی. خۆ ئەگەر ڕێگاشم لێبگرن، پڕ بە دەنگم بانگی ڕەحمان عەلی دەکەم، لەحەفت خەویش دابێ، گوێی لێم دەبێ و بێداردەبێتەوە.

ئیدی بە ئەسپایی چووە نێو گوندەکە. دوای بڕینی چوار کۆڵان، گەیشتە ئەو گۆڕاییەی کە خانووەکەی ڕەحمان عەلی لێبوو.

ئینجا لەوێ سەگەکان بۆنیان کرد. بەو نیوە شەوە، لە زستانیشدا بۆنێکی نامۆ، هەر واتای مەترسییەکی دەگەیاند. ئیدی سەگەکان بەیەکەوە کەوتنە وەڕین. بەم جۆرە ئەو هەموو گوندەکە بێدار دەکاتەوە. باشە دەبێ چی بکا، ڕابکا یان ئاساییانە بڕوا؟ لە کۆڵانەکەی بەردەمیدا کسوکێکی کەتەی ڕەش بەسەر پەرژینەکەدا بازی دا. "ألله!" ناچار ڕایکرد.

سەگەکانی گوند بەیەکەوە و بە توندی وەڕین. سەگە زەبەلاحەکەش بەدوایدا کەوتە بازبازێن. ئاغجان زیاتر غاریدا و بە سەرسوڕمانیشەوە خەڵکەکی لە کۆڵانەکەدا بینی. یەک دوو پیاو ویستیان ڕێگەی پێبگرن و بەرزەفتی بکەن. ئەویش تا هێزی تێدابوو ئەوانی پاڵنا و هاواری کرد: "ڕەحمان عەلـیییییی!" ئەو ئەوەندە توند غاریدا، خەریکبوو دڵی لە گەروودا بێتەدەر و لەبەر فرمێسکەکانیشی هیچی نەبینی. ئەو نابینایانە بەرەو گۆڕاییەکە غاری دەدا. ئیدی هەموویان زانیان بۆکوێ دەڕوا.

"ئەڵڵا! ڕەحمان عەلـییییییییییییی! هاوار! بۆ پەنایەک بۆ کوڕەکەم هانام هێناوەتە بەرت!"

---

[183] ڕۆمانووس دەق نووسیویەتی"سەگەکان گوێیان لێنەبوو" بەڵام دیارە کاتەکە شەوبووە، سەگیش زیاتر بە بۆنەوە ناسراوە، بۆیە من وام لێکرد. وەرگێڕ.

لەیەکێ لە کۆلانەکان، سێ چەکدار لە ئاغاجان پەیدا بوون، یەکێک لەوان قۆنداغە تفەنگێکی لە قاچی ئاغاجان دا. ئاغاجان سەرپەلۆ[١٨٤] چوو، کەوتە سەر بەفرەکە. بە لایەتێکی دەست پیاوەکە لەبەردەمی پەیدابوو: "تۆ کێی؟"
یەکسەر ئاغاجانیان ناسییەوە، لە کۆتاییدا دەستیان گرت و لەگەڵ خۆیان بردەوە لای ترومبێلەکە، کە لە دەرەوەی گوند راگیرابوو، لەوێ بە دەیان لە گوندییەکان خڕبوونەوە.
ئەمە چاوەڕوان نەکراوبوو. ئاغاجان باوەڕی بە هەڵسوکەوتیان نەکرد. ئاخر ئەوە گوندەکەی خۆی بوو، هەموو مردووەکانی لێرە نێژراون، باشە بۆچی وای لەگەڵدا دەکەن؟ بەڵێ شۆڕشەکە لایەنە هەرە خراپەی خەڵکی بە دەرخست. ئیدی کەس نەماوە متمانەی پێبکرێ، تەنانەت برا و خوشکی خۆشت. ئەو لەنێو پەڕەی کتێباندا ژیاننامەی پاشاکانی خوێندبووەوە، ئەو پیاوانە هەمیشە هەر هەبوونە. ناپاک و تاوانبار سەر بە مرۆڤەکانن.
ئاغاجان سواری ترومبێلەکە بووە، شاباڵیش سوکانەکەی سوڕاندەوە.
"بگەڕێوە ماڵ." ئاغاجان وای بە شاباڵ گوت.
"بۆ ماڵێ؟"
"من ئەو لەناو حەوشەی ماڵێ، لەنێو باخچەکە، لە ژێر دارەپیرەکەدا دەنێژم."
شاباڵ ویستی وەڵامی بداتەوە، بەڵام هیچ قسەی بۆ نەهات.
بە ئەسپایی لە شاخەکان دەهاتە خوار و تا ڕێگای شار بگرێتەوە بەر. لەوێ هەڵۆیەکان بەرز بەرز لە ئاسمانەوە دەفڕین، ئاخر تازە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتن بێدارببونەوە، ڕۆژ لەدیوەکەی دیکەی شاخەکانەوە لە کەل دەرچووبوو. بەو بەرەبەیانە هەڵۆیەکان یەکەمین گەشتە ئاسمانیان بوو. هێشتا سەعاتە وەختێکی دیکەی دەویست تا تیشکی ڕووناکاییەکە بگاتە شارەکە. دەبێ ئەوانیش دەستوبرد بکەن، بەڵام شاباڵ نەیدەوێرا خێرا لێبخوڕێ. هەر جارێک کە ستوپی دەگرت ترومبێلەکە دەخزی و تەرمەکەش لەپشتەوە بە کورسیەکەی ئەو دەکەوت.
لە پڕێکەوە نیگای ئەو بەر ترومبێلێک کەوت کە لەپشت ئەوانەوە دەهات. شوفێرەکە بە لایتەکانی هەر ئاماژەی بۆدەکرد. ئاغاجانیش ترومبێلەکەی بینی.

---

[١٨٤] سەرپەلۆچوو: ساتمەی برد

- "کەمێ بوەستە، هەر دەبێ شتێک لە گۆڕیدا بێ."
ئەویش لایتە گیرفانییەکەی لە نێو ترومبێلەکە بۆ ترومبێلەکەی دواوەی لێیدایەوە، بۆئەوەی بزانێ، ئاگایان لێیەتی.
ترومبێلەکە لەپشت گاشەبەردەکان بزربوو بەڵام دیسان دەرکەوتەوە.
"ئەوە خۆ جیبێکە!" شاباڵ وای بە ئاغاجان گوت.
جیبەکە وەستا، شوفێرەکە لایتەکانی کوژاندنەوە و لە ترومبێلەکە دابەزی. پیاوێک بە خۆی و شەپقەیەکەوە کە جزمەشی لەپێدا بوو، دەرکەوت. ئەو خێرا بۆ لای ئاغاجان هات و بەنەرمی پێیگوت: "سەلام،" باوەشی پێداکرد و نێوچاوانی ماچکرد و پێیگوت: "من تەرمەکە لەگەڵ خۆم دەبەم. تا دنیا ڕووناک نەبۆتەوە، دەبێ پەلە بکەم."
شاباڵ لەوەی ڕوویدا، تێنەگەیشت. پیاوەکە کۆنە دۆستێکی ئاغاجان بوو، بەڵام شاباڵ نەیناسی.
"دەی وەرە! با تەرمەکە لە ترومبێلەکەی من باربکەین!" پیاوەکە وای بە شاباڵ گوت.
ئیدی بە هەر سێکیان تەرمەکەیان داگرت و باركردەوە.
پیاوەکە ئامێزێکی دیکەی لە ئاغاجان وەرێنا، دەستێکیشی لەسەر شانی شاباڵ دانا. سواری جیبەکەی خۆی بووەوە، وەستایانە سووڕایەوە و بەرەو شاخەکان سەرکەوتەوە.
ئاغاجان و شاباڵ لە پاڵ ترومبێلە بەتاڵەکەیان وەستان و سەیری جیبەکەیان کرد، کە لە تاریکاییەکەدا ونبوو. هەڵۆکان جارێکی دیکە بەسەر ترومبێلەکەیاندا سوڕانەوە، ئینجا بەرز بەرز بەرەو ئاسمان هەڵکشان.

## هۆشمەندەکە

ماتەمییەکە وەک چارشێوێکی ڕەش بوو بەسەر ماڵەکە دادرابوو. کەس هیچی نەدەگوت، کەس نەدەگریا، کەسیش بێدەنگییەکەی نەدەشکاند. بەڵام کەسێک هەبوو بێ وچان هەر لەبەرخۆی دەیگوت و دەیگوتەوە" هەر ئەو ژیرە، هەر ئەو زانایە!
**إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ (٦)**

**وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ (٢١)**
**وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ ...(٢٢)**
**وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ ...(٢٣)**
**وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنْكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ (٢٤)**
**إِنَّهُ حَكِيمٌ عَلِيمٌ (٢٥)**

**{ بە ڕاستی تۆ شێتی!**

**گەنجینەی هەموو شتێکیش لای ئێمەیە و**

**ئەوەشمان هەر بە ئەندازەی دیاریکراو ناردۆتەخوار.**

**بامان ناردن ئاوسبکەن...**

**هەر خۆمانین گیان بەخشین و گیان ئەستێنین!..**

**ئاگادرین لەوانەی بەر لە ئێوە بوون. دەشزانین کێن ئەوانەی لە دوای ئێوە دێن.**

**هەر خۆی کارزان و زانایە.}**

ماتەمییەکە درەختەکانیشی سیس کردبوو، یەک دوو ماسیش بە مردوویی سەرئاوکەوتن، پشیلە بە تەمەنەکەش لەسەر بانی مزگەوتێ تۆپی.

دەمودەستیش کۆمەڵە بەرهەڵستکارەکان لە سێدارەدران، هەرهەمووشیان لە دەرەوەی شارەکە، لە دامێنی شاخەکاندا نێژران، نەدەبوایە کەسیش سەری لە گۆڕەکانیان بدابایە. هەموو بایەخێک پەڕیەوە سەر شەهیدەکانی بەرەی جەنگ، کە هەفتانە و لەیەک کاتدا بە سەدان تەرم لە کاتی نوێژی هەینیدا ڕەوانەی شارەکان دەکرانەوە.

قەلەباچکەکە یەکەمین گیانلەبەری خانووەکە بوو، بێدەنگیەکەی شکاند، ئەو بەرز فڕی، بە توندی قیغاندی و هەواڵی هاتنی مێوانێکی ڕاگەیاند.

فەخری سادات لە ناندینەکە بوو، خەریکی ئامادەکردنی چێشتی شێوان بوو، کە مارمیلکە دەرگاکەی کردەوە.

پیاوێکی نەناسراو بەقات و شەپقەیەکەوە هاتە ژوور و گەیشتە لای حەوزەکە.

فەخری سادات بە کەسە لایدەکە سەرسام بوو، کەوا ئارامانە بەرەو پەنجەرەی لای ئەو هات.

پیاوەکە لە لای حەوزەکە وەستا و سەیری ماسییە سوورەکانی ناو ئاوەکەی کرد. پاشان دەستی بۆ پشتی برد و لەوێ لە حەوشەکە کەوتە پیاسەکردن. ئەو تا لای پەیژەکان ڕۆیشت، چووە سەر بانەکە، پاشان چووە ئەو ژووری مانەوەیە کە پەنجەرەکانی بەسەر حەوشەی ناوەوە دەیڕوانی. ئەو زیاتر ڕۆیشت تا گەیشتە ژووری تریاکەکە، سەیری کرد ئاخۆ دەرگەی هۆدەکە کراوەیە.

فەخری سادات پەنجەرەی ناندینەکەی کردەوە و بانگی کرد: "ئەرێ بەڕێز بە دوای کەسێکدا دەگەڕێی؟"

پیاوەکە هیچ وەڵامی نەدایەوە و بەرەو ژووری کتێبان ڕۆیشت.

فەخری ویستی بە دوایدا بڕوا تا بزانێ ئاخۆ بە تەمای چییە، بەڵام نەیوێرا.

"ئەرێ مامەی بانگدەر،" فەخری وای بانگ کرد، "لایدەیەک لێرە هاتوتە ژوور! دەکرێ لێی بپرسی چی دەوێ؟"

مارمیلکەش، کە لەبن پیرە دارەکەدا وەستابوو، چاوی لە هەموو شتێک بوو، ئیدی خۆی خشاندە ژێرزەمینەکە و ئاگاداری دایە بانگدەرەکە.

پیاوەکە لە پشت دارەکە بزربوو.

لە پڕێکەوە فەخری گوێی لە دەنگی تەپەیەکی نابەڵەد بوو.

بانگدەرەکە بە خۆی و داردەستەکەی لەپاڵ مارمیلکەدا، لەژێرزەمینەکەدا هاتەدەر.

"پیاوەکە قاتێکی لەبەردایە و شەپقەیەکیشی لەسەرە. ئەو بەرەو ژووری کتێبان ڕۆیشت، پێموابێ دەرگای ژووری کتێبانی شکاند. گوێت لێیە؟" فەخری سادات بوو وای گوت.

یارۆی بانگدەرەکەش چووە کتێبخانەکە و بانگیکرد: "ئەوە تۆ خەریکی چی؟ تۆ کێی؟ ئەوە تۆ خۆت پێ کێیە؟"

فەخری سادات چارشێوەکەی بەسەر خۆی دادا، بینی کابرا بە بەردێکی گەورە وەرگەڕاوەتە دەرگای کتێباخانەکە و خەریکە بیشکێنێ.

- "ئەرێ ڕووخساری ئەو کابرایە چۆنە؟" بانگدەرەکە وای لە فەخری سادات پرسی.

- "من ئەو باش نابینم. ئەو لەبەر سێبەرەکەیە."

- "ئایا ڕیشی هەیە؟"
- "نەخێر، پێموابێ نییەتی، ئەو تەنها شەپقەیەکی لەسەرە."
بانگدەرەکە ویستی بەرەو لای کابرا بچێ، بەلام فەخری سادات ڕێگەی پێگرت. "پێموابێ، کابراکە شێتە! ئەو بێلانەیەکە!"
مارمیلکەش چووە سەر دارەکە و چاوی لە کابرا کرد.
"دەی بڕۆ بە دوای ئاغاجاندا بگەڕێ!" فەخری سادات وای بانگی مارمیلکە کرد.
ئەویش لەسەر دارەکە بازی دایە سەر بانەکە و لەبەر چاوان ونبوو.
بانگدەرەکە داردەستەکەی بە ئاراستەی پیاوەکە ڕاگرت و بانگیکرد: "تۆ کێیت؟ باشە خەریکی چیت؟"
پیاوەکە وەلامی نەدایەوە.
"دەی شێتۆ، بوەستە!" بانگدەرەکە وای بانگکرد و بە داردەستەکەشی هەڕەشەی لێکرد. "من واپێت دەڵێم، بوەستە، هەی خوێڕی! دەنا بەو دارە لێت دەدەم."
بەلام پیاوەکە نەیدەویست بوەستێ. بانگدەرەکە بەرەوڕووی ڕۆیشت ویستی بە داردەستەکەی پیای بکێشێ.
"نەکەی!" فەخری سادات وا هاواری کرد. "نەکەی لێی بدەی. ئەو تێکچووە!"
ئیدی بەم جۆرە بانگدەرەکە چاکەتی پیاوەکەی لە پشتەوە ڕاکێشا.
کاتێکیش ئاغاجان پەیدابوو، پیاوەکە لە لێدانی دەرگاکە وەستا.
"ئەوە لێرە چی ڕودەدا؟" ئاغاجان وا بانگی کرد.
پیاوەکە لە سایەی دیواری کتێبخانەکە وەستا.
- "ئەرێ تۆ کێیت؟"
ئەو هیچ کاردانەوەی نەبوو.
- "دەی وەرە پێشەوە! دەستم بدەرێ، من هیچت لێناکەم، من دەتبەمە دەرێ." ئاغاجان وای بە کابرا گوت. ئاغاجان بە هێواشی بۆ کابرا چوو، توند باسکی گرت و هێنایەبەر ڕووناکی.
- "دەتەوێ شتێک بخۆیتەوە؟ لەوانەیە برسیت بێ؟"
فرمێسکیش لەچاوەکانی پیاوەکەدا دەهاتنەخوار. ئەو چاوانە!

"ألله ألله." ئاغاجان کەوای بینی گوتی: "فەخری! ئەوە ئەحمەدی خۆمانە."
بانگدەرەکەش باسکەکانی بۆ ئەحمەد درێژ کردن، دەستی لە شەپقەکەی دا، دەستی لە دەموچاوی دا، بەرەو خۆی ڕاکێشا و لەباوەشی گرت.
فەخری ساداتیش سەری خۆی خستەسەرشانی و گریا: "دەی ئەحمەد وەرە! ئەحمەدەکەی خۆمان! وەرە با بچینە ژوور. ئەرێ ئەوە چییان لێکردووی؟ چۆن وێراون ! دەی وەرە، هەموو شتێک چاک دەبێتەوە."
ئاغاجانیش دەرگای کتێبخانەکەی بۆ ئەحمەد کردەوە، بەڵام ئەو نەچووە ژوورێ. ئەو بەرەو ژووری لێمانەوەی میوانان ڕۆیشت، دەرگاکەی کردەوە، پێڵاوەکانی داکەندن، چووە سەر پێخەفەکە. "لێیگەڕێن با بنوێ." فەخری سادات وای بە ئاغاجان و بانگدەرەکە گوت.



ئەحمەد بە یارمەتی خالخالی زووتر ئازادکرابوو، بەڵام ژیانی لێتاڵکرابوو. کاتێک ئەویان گرتبوو، ژن و منداڵەکەی گەڕابوونەوە ماڵە باوانی. لەوێ باوکە دەوڵەمەندەکەی، کە لەگەڵ ئیسلامیەکان کاری دەکرد، تەلاقی بۆ کچەکەی و سەرپەرشتی و ڕاسپاردەیی منداڵەکەشی بۆ کچەکەی داواکرد. ئیدی بەم جۆرە ئەحمەد باوکایەتی خۆی لەدەست دا.



بۆ ڕۆژی پاشتر فەخری سادات چوو بانگی بکاتە سەر نانی بەیانی، بەڵام ئەو لەبارێکدا نەبوو کاردانەوەی هەبێ. فەخری چووە ژوورەکە و یارمەتی ئەحمەدی دا بێتەدەر. خەمخۆرانە لە لای حەوزەکە دەست و دەموچاوی لێشوشتن، ئینجا بردییە ژووری کتێبخانەکە، بۆئەوەی نیشانی بدا کە دەرگاکە کراوەیە.
ئەو چووە ژوور، چووە لای دۆڵابەکان دەستی لە ڕەخی دۆڵابەکان دا. گڵۆپە ئەنتیکەکانی سەر مێزەکەی پێکردن، دەستی لە کورسییەکەی خۆی دا، بەڵام لەسەریشی دانەنیشت، لەوێ دەرچوو، گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی.
ئەو سەیری پێخەفەکەی خۆی، کورسی خۆی، سەیری ئەو دەفتەرانەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆ دوانی ڕۆژی هەینی تێبینی لەسەر دەنووسین، سەیری هەموو ئەمانەی کرد، ئینجا چوو لەسەر پێخەفەکەی دانیشت.

ئەو هەموو ڕۆژەکە لەوێ مایەوە هەر تەماشای کەلوپەکانی دەکرد. ئاغاجان خواردنی بۆ برد، هەوڵیدا قسەی لەگەڵدا بکا، بەڵام تێبینی ئەوەی کرد، هێشتا زووە بۆ هەوڵەکەی، ئاخر ئەو پێویستی بە کاتی پێویست هەیە تا دێتەوە سەرخۆی.

هەر هەمان شەویش، ئەحمەد دەستی دایە جانتاکەی و ڕۆیشت و ونبوو.

مارمیلکە ئەوی بینی و بە دوای ئاغاجاندا غاریدا تا ئاگاداری بکاتەوە. بەڵام کارلەکار ترازابوو، ئەحمەد لە هیچ شوێنێک دیار نەما.

## (موجاهیدین)ەکان

لە بەرەکانی پێشەوەی جەنگ شەڕێکی قورس و کوشندە بوو، ئێران چەند شوێنێکی ستراتیژی گرتبووەوە و بەرەیەکی نوێی شەڕیشی دژی عێراق کردبووەوە. بەڵام هێشتا هەر ئەستەم بوو سوپای عێراق لە شارە نەوتییە گرنگەکانی خورەمشار و ئابادان وەدەربنێ.

سەدام چەک و بۆمبی کیمیایی بەکارهێنا و لێشنەدەگەڕا کەسێک تخونی شارەکان بکەوێ.

بەرهەڵستکارە چەپەکانیش خەریکبوون بە تەواوی بەلاوە بنرێن، بەڵام هێشتا یەک دوژمنی ڕێکخراوی ڕژێم بە سەلامەتی مابووەوە، کە (موجاهیدین)ەکان بوون. ئەندامانی موجاهیدین موسڵمان بوون، بەڵام بەدوای ڕاڤە و شیکارییێکی دیکەی قورئاندا کەوتبوون. لە بەردەم جەماوەردا بە ئاشکرا پشتگیری خۆیان بۆ ڕژێم نیشان دەدا، بە نهێنیش چەکیان کۆدەکردەوە تا لەساتەوەختی گونجاودا دەستی خۆیان بوەشێنن.

خومەینی ئەوانی بە دوژمنێکی دژوار ناوبردبوو و گوتبووی ئەوان دەیانەوێ حکومەتەکە لە ناوەوە هەڵتەکێنن. هەنووکەش کە وڵات تووشی شەڕێکی بێکۆتایی هاتووە و تا دەشهێت لاواز دەبێ، ئیدی دەبێ ئەو دوژمنە ناوخۆییە ریشەکێش بکرێ. لێ لەبەر ئەوەی موجاهیدینەکانیش موسڵمان بوون، نەیدەتوانی هەروا بە ئاسانی لە ناویان بەرێ.

لە کۆبوونەوەیەکی بەپەلەدا، کۆمیتەی شۆڕش پرسەکەی تاوتوێ کرد. ئەوان بە کۆدەنگی بڕیاریاندا موجاهیدەکانیش هەروەک بزووتنەوی چەپگەرایی لەناوببەن.

کە شەوداهات جیپەکان بەرەو ماڵی سەرکردەی موجاهیدینەکان ڕۆیشتن. پۆلیسە چەکدارەکان بەسەر بانەکانی دوژمنەکانیان بازیاندایە نێو ماڵەکانیان، بەلام خۆ ئەوان هیچ سەرکردەیەکیان پێ نەدۆزرایەوە، ئەوان لەدوا ساتدا توانیبوویان لەدەستیان قوتار ببن.

ئیدی دەستبەجێ بە ئەنجامێک گەیشتن: هەر دەبێ سیخوڕێکیان لەنێو کۆمیتەکەدا هەبێ.

ئایەتوڵلا بەهەشتی، سەرۆکی کۆمیتەکە، بانگی هەموو ئەندامەکانی کرد. ئەو ڕەچاوی ئەوەی نەدەکرد، جاسوسەکە بوێرێ ئامادەبێ، بەم جۆرە ئاشکرا دەبێ. بەلام هەموویان ئامادەبوون، لە کۆبوونەوەکەشدا مشتومڕێکی دوورودرێژ سەبارەت بەوەکرا، ئاخۆ کێ بێ دزەی بە هەواڵەکە کردبێ.

یەکێ لە ئەندامانی کۆمیتەکە، کە بە پرکێش و بڕیاردەری خێرا ناسراوبوو، گوتی: "پێموایە من بزانم کێ بڕیارەکەی ئێمەی بردۆتە دەرێ و کێ کارەکەی کردووە."

هەمووان بەواقوڕماوی سەیریان کرد و تاسەمەندبوون زیاتر لەسەر پرسەکە بڕوا.

بە دزیش و لە بنەوە پاڵێکی بە جانتا ڕەشەکەی خۆیەوە نا. جانتاکەی لەبن مێزەکەی دانابوو، کەس هەستی پێنەکردبوو، لەبەر پێی بەهەشتی بوو، ئینجا هەڵسا سەرپێی و گوتی: "من بەڵگەم هەن، بەڵگەکان لە نێو چەکمەجەکەی مێزەکەمدان، دەچم دەیانهێنم، زۆری پێناچی دەگەڕێمەوە."

کاتێکیش ئەو لە هۆڵی کۆبوونەوەکە هاتەدەر، خێرا بەرەو پەیژەکان ڕۆیشت و لەوێ بەغار چووە نێو ترومبێلەکەی، سواربوو، تیژ لێیخوڕی.

ئەو هێشتا لە شەقامەکە دەرنەچووبوو، کە باڵەخانەکە لە پشت ئەوەوە تەقیەوە و داروپەردووی بەئاسماندا بڕد. دووکەڵەکە وەک هەور بەری ئاسمانی گرت. هەموو ئەندامانی کۆمیتەکە سەریان تێدا چوو.



هەواڵەکە لە ڕادیۆدا پەخشکرا، ئاپۆرەی خەڵک بە پرکێشەوە بەرەو شوێنی لێمانەوەی خومەینی ڕۆیشتن، تا ماتەمباری خۆیان ڕابگەیەنن. ئەویش لەسەر بانی قەپەنگەکەی دەرکەوت، بە ئارامی وتارێکی دا: "انا لله وانا الیه راجعون. ئەمجارەیان دەستی ئەمریکا لەبن کراسەکەی موجاهیدینەکانەوە دەرهات. ئەوەش هیچ لە پرسەکە ناگۆڕێ. خوا لە پشتی ئێمە! من کۆمیتەیەکی نوێم ڕاگەیاندووە. نیو سەعات پێش ئێستا دەستیان بە کارەکانی خۆیان کرد. هیچ شتێک و هیچ کەسێک ناتوانێ ڕێگەمان پێبگرێ!"

هاوکات لەگەڵ دوانەکەدا، ڕاونانی دۆست و لایەنگرانی موجاهیدەکان دەستپێکرد. ئەوان لە هەموو لایەکەوە و هەر لەڕەشەوە بەر گولله دەدران. هەوادارانی موجاهیدینەکان شەقامەکانی ناوجەرگەی تارانیان گرت و دەستیان دایە چەکەکانیان. شەڕی شەقام و کۆڵانەکان لە نێوان ئەوان هێزە ئاسایشیەکانی ئیسلامییەکان هەڵگیرسا.

هەر کەسێک لەو ڕۆژەدا گیرابێ، ئەوا بۆ شەوەکەی بەبێ هیچ لێپێچینەوەیەک گوللەباران کراوە.



لە هەفتەی دواتردا، بەرپرسی دەزگای هەواڵگری نهێنی ئیسلامی چووە لای خومەینی تا پرسێکی گرنگی ئاساییشی لەگەڵدا باس بکا.

ئەو بۆ خومەینی چەمایەوە و دەستی ماچ کرد بە سرتەیەکیشەوە پێیگوت: "ئەندامانی موجاهیدین لە هەموو جومگە گرنگەکانی ڕژێمدا هەن. لە ماوەی ڕابردوودا، کاتێ هەموو بایەخێکمان چووبوە سەر بەرەکانی شەڕ، ئەوان بە شێوەیەک لە شێوەکان شوێنە ستراتیژییەکانیان خستۆتە بن جڵەوی خۆیانەوە. تەنانەت ئەوان خۆیان گەیاندۆتە دادگاکەی تۆش. من لیستێکی کەسانی تۆمەتبارانم کۆکردۆتەوە کە پێگە و پایەی گرنگیان لە وەزارەتەکان گرتووە. ئەگەر جەنابتان بە باش بزانن، سەرەتا سەرۆوەزیر ئاگادار دەکەمەوە، ئینجا دەستبەجێ تۆمەتبارەکان دەگرین.

خومەینی چاویلەکەکەی کردە چاو، لە لیستەکەی کۆڵیەوە، ئەوسا ڕێگەی دا کە هەمووان دەستگیر بکەن.

دوای ئەوە سەرۆکی دەزگاکە چووە شوێنێکی نهێنی، کە کابینەکەی لێ کۆببووەوە دووبەدوو سەبارەت بەناوەڕۆکی باسوخواسی لەگەڵ خومەینیدا، قسەی لەگەڵ سەروەزیر کرد، ئینجا بەیەکەوە چوونە کۆبوونەوەی کابینەی حکوومەت و تا بابەتەکە بە وەزیرەکانیش ڕابگەیەنێ.

دەستبەجێ سەرۆکی دەزگا نهێنیەکە جڵەوی قسەکردنی گرتەدەست. "من تازە لە لای ئیمام خومەینی هاتوومەتەوە." ئەو سەرەتا وای پێگوتن، "من دووبەدوو لەگەڵ ئەودا دوام. ئەو دەزانێ ئێستا من لێرە لەگەڵتاندام، من لەهەر ساتەوەختێکدا چاوەڕێی تەلەفۆنی ئەو دەکەم. هەروەها قسەم لەگەڵ سەروەزیریش کردووە. موجاهیدینەکان بە خشکەیی، بێ ئەوەی تێبینی بکرێن، دزەیان کردۆتە نێو هەموو جومگەکانی سیستەمەکەمان..."

ئینجا زەنگی تەلەفۆن لێدرا، بەرپرسەکە جانتایەکی ڕەشی قەبەی لەسەر مێزەکە دانا، داوای لێبووردنی کرد و خۆیشی بۆ ئەو نووسینگەیە ڕۆیشت کە ئامێری تەلەفۆنەکەی لێبوو.

لەوێوە دەستی دایە تەلەفۆنەکە و بە دەنگێکی بیستراو بۆ هەمووان گوتی: "بەڵێ، من لەوێم. بەڵێ، بەدڵنیاییەوە، لەگەڵ سەروەزیردا قسەم کرد. شتەکەم پێیە، لەناو ترومبێلەکەدایە، نا نەخێر، من تەواو دڵنیا نیم، دەچم دەیهێنم، یەک خولەک لەسەرم دەوەستێ؟" ئەم دوا قسەیەی بە دەنگێکی بەرزتر کرد، بۆ ئەوای هەمووان بە باشی گوێیان لێبێ. ئینجا تەلەفۆنەکەی لەسەر مێزەکە دانایەوە، بە پێیان لە ژوورەکە چووە دەر، بۆ لای پەیژەکان ڕۆیشت، سواری ترومبێلەکەی خۆی بووەوە، بە تەناش هەڵسا و تیژ بۆی دەرچوو. کەسیش گومانی لاپەیدا نەبوو، کەس نەیزانی، مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە. تەقینەوەکە شەقامەکانی دەوروبەریشی هەژاندەوە.



شەڕی موجاهیدین دژی ڕژێم بەردەوام بوو. بە چەندان هەفتە شوێنە جۆربەجۆرەکان لە گۆترە لە ناو شاردا دەتەقێندرانەوە. تەنانەت کابینە نوێکە، کە خومەینی تازە دایمەزراندبوو، بە هەمان فێڵ و تەڵەکەی پێشوو لەناوبرا. بەڵام تیرۆری موجاهیدینەکان دەسەڵاتی ئایەتوڵڵاکانی کز نەکرد. هەرچەندە بە دڵنیاییەوە دوای ماوەیەک، موجاهیدینەکان پاشاگەردانیان لەنێو شاردا

خولقاند. ئەوان ، پاس، بانک و باڵەخانەکانی میرییان دەسوتاند و هەر کەسێکیش تووشیان هاتبا تەقەیان لێدەکرد.

هەموو ئەو ڕەفتارانەش، لە سیاسەتێکی خۆکوژی دەچوون، چونکە پاسەوانە ئیسلامییەکان ژمارەیەکی زۆری لایەنگرانی موجاهیدینیان گرتن و بێبەزەییانەش هەرکەسێ هەڵهاتبا، دەیانکوشت. بە سەدان لە ئەندامانی موجاهدین لە ماوەی یەک دوو ڕۆژدا بە بێ ڕێورەسمی داداگییکردن لە سێدارە دران.

ئیدی موجاهیدەکانیش لەسەر جادەکان کشانەوە و دەستیان بە تۆڵەسەندنەوە کرد.

ئەوان ڕووی تووڕەیی خۆیان کردە ئایەتوڵلاکان لە شارە گەورەکان و هەوڵیان دا لەناویان بەرن.

مایەی سەرسامی هەمووان بوو، کە دوای کوشتنی ئایەتوڵلاکانی ئیسفەهان و یەزد، تەنانەت ئایەتوڵا مورتەزەویشیان[185] لەناوبرد. ئەو فەیلەسووفی ئیسلامییەکان بوو، یەکێ بوو لە گرنگترین تیۆریستەکانی ڕژێم، بەڵام هیچ پایەکی سیاسییانەشی وەرنەگرتبوو.

مورتەزەوی دەرسی بە مەلا گەنجەکان دەدا، بۆیە دەبوایە هەموو ڕۆژێ بچووبایە قوتابخانەی پێگەیاندنی مەلایان. کاتێکیش سەر لەبەیانی لە ڕێی مزگەوت بوو بۆ نوێژی بەیانی، گەنجێک دێتە سەر ڕێگای و قسەی لەگەڵدا دەکا.

- "سەلامون عەلەیکوم، ئایەتوڵلا!"
- "وە عەلەیکوم سەلام، کوڕی گەنج." ئایەتوڵلاش وا وەڵامی دەداتەوە.
- "من شتێکم هەیە پێتبڵێم."
- "بیڵێ!"
- ڕاڤەکردنی تۆ بۆ قورئان کۆتایی پێهات!"
- "چۆن، کۆتایی پێهات...؟
- "بەهۆی ئەوە! ئیدی گەنجەکە سێ گوللەی لێ خاڵی دەکاتەوە.

---

[185] Mortazawi

ئەم زنجیرە دەستکردنەوانە ڕژێمی تووشی شڵەژانێکی زۆر کرد. خەڵک نەیدەزانی ئاخۆ لە کێ و لە کوێ دەقەومێ، ئاخۆ کامە ئایەتوڵڵا دەبێتە قوربانی کردەوەی دادێ.

ئایەتوڵڵاکەی قەزوێنیش لە دەست کوشتن قوتاری نەبوو، بکوژەکەشی ئامۆزای خۆی بوو. هەر بۆ ئاسایشپارێزی خۆی، ئایتوڵڵاکە چەند ڕۆژێک پێشتر داوای لێکردبوو ببێتە شوفێری تایبەتی خۆی.

ئایەتوڵڵاکە وتارێکی توندی دژی کردەوە تەقینەوەکان و کوشتنەکان دابوو: "ئەمریکا ئێمە دەکوژێ! سەدامیش دەمانکوژێ. موجاهیدینش هەر دەمان کوژێ، بەڵام ئێمە هەر دەمێنین. ئێمە ئاوا لەسەدامیش دەکەین، هەروەها لە موجاهیدینەکانیش!"

- "ئای ئەم ڕۆژانە چ ڕۆژگارێکی سەختن." ئەو بۆ شەوەکەی لەناو ترومبێلدا ئاوا لەدەست بارودۆخەکەدا دەینالاند و وای بە شوفێرەکە گوت کاتێ دەگەڕانەوە ماڵەوە.

- "شەوانی سەختیش." ئامۆزایەکەی وای گوت و بە ڕێگایەکی لاوەکیشدا ترومبێلکەی لێخوڕی.

- "ئەرێ ئەوە تۆ دەمبەیتە کوێ؟" ئایەتوڵڵاکە وایلێپرسی.

- "بەرەو دۆزەخ." ئامۆزاکە وا وەڵامی دایەوە. ئیدی هەر لەوێ چەند گوللەیەکی لێدان و ساردی کردەوە.



بەم جۆرە کەس پارێزراو نەمابوو، ئەوەی لە لایەن دراوسێکانییەوە بە تۆمەتبار خەبەری لێدرابا، دەمودەست دەگیرا. هەمووان خۆیان دەشاردەوە. ئەوەی دەیتوانی هەڵبێ هەوڵی ڕاکردنی دەدا.

بەڵام کردەوە ناچاوەڕوانکراوەکان وەنەبێ هەر لە لایەن موجاهیدەکانەوە کرابن، بەڵکو ئەندامە چەکدارەکانی کۆمەڵە چەپەکانیش لەسەر ئاستی تاکدا، تۆڵەی خۆیان دەکردەوە.

هەرچەندە ترسوبیم لە هەموو لایەکەوە باڵکێش بوو، ئایەتوڵڵاکان نەیاندەویست مل بۆ تیرۆر شۆڕ بکەن، ئەوان لەسەر چالاکییەکانی خۆیان

بەردەوام بوون. لە زەنجانیش ئایەتوڵلا ئەلراکی لەسەر بەزم و چالاکیی خۆی هەر سووربوو.
خەڵک دەیزانی، ئەو جێ نیشانەیە. هەر بۆیە بەقورسی پاسەوانی دەکرا.
ئەراکی ئایەتوڵلایەکی توندڕۆبوو، خوازیاربوو زەنجان بکاتە پێشەنگە نموونەییەکەی ئیسلامیتی بۆ سەرتاسەری وڵات. ئەو زۆر بە ڕق و کینەوە دژی ئەوماڵباتانە دەدوا، کە کەسوکاریان لەسێدارە درابوو، دەستی زینەت خانمیشی والاکردبوو بۆ ئەوەی ئافرەتان بگرێ و فشاریان بخاتەسەر، بۆ ئەوەی وایان لێبکا، دواتر هەروەک ڕۆبۆتێک بە ئاماژەیەکی ئەو ڕووبکەنە مەککە.
دانیشتوانی شارەکە هەناسەی خۆیان ڕاگرتبوو، چاوەڕێی کەسێکیان دەکرد، تا ئایەتوڵلاکە ساردبکاتەوە.[١٨٦]
زۆریشی پێنەچوو، کە ساتەوەختە چاوەڕوانکردنەکە هات.
هێشتا ڕۆژ ئاوانەببوو، کەشە گەرمەکەی دەرێ خەریکبوو بە شنەبای تازەی ئێوارە درەنگ فێنک دەبووەوە. دەرگای هۆدەکەی ئاغاجان لەسەرخۆ کرایەوە و یەکێکی لێهاتەژوور. ئاغاجان لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتبوو کتێبێکی دەخوێندەوە، ئەو وای بۆچوو ئەو کەسەی هاتەژوور مارمیلکە بێ.
ئەو سەری خۆی بەرزکردەوە. هەر لەو شەوەی کە بەیەکەوە تەرمی جەوادیان بردبووە نێو شاخەکان، شاباڵی نەبینیبووەوە. کاتێکیش ئەوێ شەوێ لە کێوەکان تەرمی جەوادیان ڕادەستی کابرای جێبەکە کردبوو، گەڕابوونەوە، شاباڵ دەستبەجێ ڕۆیشت و لە زەنجان نەما. کەچی ئێستا ناوەخت لە بەرامبەری قیت ڕاوەستاوە.
ئاغاجان چاویلکەکەی لەچاو کردەوە.
- "تۆ لەپڕ هاتی، لە کەیەوە لێرەی؟"
- "هەر تازە هاتم."
- "باوکی خۆت بینیوە؟"
- "نەخێر، هێشتا نا. بەڕێکەوت هاتمە شار و ویستم بێمە لای تۆ."
دەنگی شاباڵ لەرزی گرتبوو.

---

[١٨٦] لێرەدا مەبەست لە ساردکردنەوە، کوشتن و لەناوبردنە. وەرگێر

ئاغاجان هەستی کرد، قەدەر دەست دەکاتەوە.
دەرگاکە بە نەرمی کرایەوە و مارمیلکەش هاتەژوور، بەڵام ئەو شتێکی وای لە چاوەکانی ئاغاجاندا بینی، پێی خۆش نەبوو بێتەژوور، بۆیە هەر بەنەرمی دەرگاکەی پێوەدایەوە لەپشت دەرگاکە بە کڕی لێیدانیشت.
- "چۆن بوو بە ڕێکەوت هاتیە شارەکە؟" ئاغاجان وای لێپرسی.
- "من دەبوایە چەند شتێک لەشارەکە ئەنجام بدەم، پێشم باش بوو سەرێک بدەم و سڵاوێکت لێبکەم."
- "باشە بۆچی دانانیشی، دەی کورسییێک بێنە."
- "زۆر نامێنمەوە، دیسان دەڕۆمەوە، هاتوومماڵئاواییت لێبکەم."
- "ماڵئاوایی لێکردن؟ بۆچی؟ بۆ کوێ دەچی؟"
- " هێشتا دڵنیا نیم، سەرەتا دەبێ یەک دوو شت کۆتایی پێبهێنم، ئینجا لەوانەیە بۆ ماوەیەک ولات جێبێڵم. من ویستم جارێکی دیکە تۆ ببینمەوە، ببوورە، من دەبێ بڕۆم." وای گوت و سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەستی خۆی کرد.
- "ئەرێ کوڕی گەنج، ئەوە مانای چییە؟"
سەروسیمای بانگدەرەکە لە پشت جامی پەنجەرەکە بە دیارکەوت، بەڵام نەهاتە ژوور.
- "بانگی باوکت بکەم کەمێ بێتە ژوور؟"
- "نەخێر، بە ڕاستی درەنگمە و دەبێ بڕۆم، دواتر زەنگی بۆ لێدەدەم، تەنها لەبەرتۆ هاتم، من خەمی تۆم بوو، دەبێ بڕۆم، یەکێک لەناو شار چاوەڕێم دەکا." شاباڵ وای بە ئاغاجان گوت.
ئاغاجان هەستی بە شتێک کرد، کە تەواو نییە، کاتەکەش دەستپێکی شەو بوو، باشە بۆچی ئەو کاتی ماڵئاوایی کردنی لە باوکی خۆی نییە؟ باشە بۆ ئەوەندە هەر سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکا؟ ئەو ماڵئاواییە فەرمییەی هی ڕوونکردنەوە نییە. ئینجا بە مێشکی داهات کە چی دەگوزەرێ. دوای دە خولەکی دیکە نوێژ لە مزگەوتێ دەستپێدەکا و مارسیدیسەکەی ئایەتوڵلاش لە ئانوساتدایە دەربکەوێ.
هەردەبێ بەر بەو شتە بگیرێ، بەڵام چۆن؟

"من دەڕۆم." شاباڵ وای گوت و باوەشێکیشی بە ئاغاجاندا کرد. کاتێک لە باوەشی گرت، ئاغاجان هەستی بە دەمانچەیەکی بەرپشتی شاباڵ کرد. ئاغاجان بە جووڵەیەکی ناچاوەڕوانکراو پاڵێکی بۆلای دیوارەکە پێوەنا و دەمانچەکەی لەبەر قایشی پشتی دەرهێنا.

"گەنجۆ، ئەوە چیت لێقەوماوە؟" ئاغاجان بە توندی وای پێگوت.

مارمیلکە لەسەر دەست و پێیەکانی وەستا.

"ئاغاجان بۆ تۆ ڕوونکردنەوە شتێکی زیادەیە،" شاباڵ بە ڕووێکی قایمەوە وای پێگوت، "من کاتم بە دەستەوە نەماوە. تکایە بەر لەوەی وەدرەنگ بکەوێ، بمدەرەوە!"

ئاغاجان خۆی لە بەرامبەر شاباڵدا بە دەستەوەستان زانی. ویستی بە دەنگەوە بانگی بکا: "ئەمە نابێ! بڕۆدەر! دەی لە ژوورەکەم بڕۆدەر!"

بەڵام نەیتوانی وابکا. ئەو خۆی بە سەرسام زانی، نەیویست دژی هەڵوێستەکەی بوەستێتەوە، ئیدی ڕەفتارەکەی پێ باش بوو.

شاباڵ دەمانچەکەی لە دەستی ئاغاجان دەرهێنایەوە.

ئاغاجان ویستی قۆڵی بگرێ، بەڵام شاباڵ دەستێکی بەرزکردوە و هەندێک لە دوورەوە پێیگوت: "هیچ مەکە! هیچیش مەڵێ! قسەکانت بۆ دوایی هەڵگرە! بەختەوەریم بۆ بخوازە!"

ئاغاجان بە پەشۆکاوی لە ژوورەکەی بەجێما. وەک ئەوە وابوو کە بۆ ساتێک گیانی دەرچووبێ. بۆ ماوەی خولەکێکی ڕەبەق نە توانی لە شوێنی خۆی بجووڵێ، نە توانیشی یەک وشەی لە دەم بێتەدەر.

شاباڵ لەبەر مارمیلکە دانەویەوە، ماچی کرد و بە پەلەپرووزێ چووەدەر. کە چوە دەر لە باوکی هەڵنگووت. بانگدەرەکەش بەربووەوە سەر زەوی.

شاباڵ چەمایەوە، سەری باوکی بە هەردوو دەستەکانی گرتن و ماچێکی لەنێوچاوان کرد." باوکە، من پەلەمە، دواتر زەنگت بۆلێدەدەم!

مارمیلکەش بە دوای شاباڵدا کەوتەغار.



مارسیدیسەکەی ئایەتوڵڵا تازە لە بەردەم مزگەوتێ ڕاوەستا. شاباڵ لە کۆڵانەکە، لەبەر تاریکی وەستابوو، هەموو شتی خستبووە بن چاودێری

خۆی. سێ پاسەوانەکانی ئایەتوڵلا لە ترومبێلەکە دابەزین و دەوروبەرەکەیان پشکنی، تەنانەت خشپەی مارومووریش نەدەهات. یەکێک.لە پاسەوانەکان دەرگای لای ئایەتوڵلاکەی کردەوە. پاسەوانەکەی دیکەش لەپێشدا رۆیشتە مزگەوتێ. شاباڵ دەمانچەکەی لەبەر کەلەکەی دەرهێنا. مارمیلکەش تا ئەوکات بە بێدەنگی لە دوای شاباڵ لەسەر زەویەکە گرمۆڵە ببوو، ئینجا بەرەو مارسیدیسەکە خشی. شاباڵ ویستی رێی لێبگرێ، بەڵام کاتەکە درەنگ کەوت. بەدەست و پێی بەرەو ئایەتوڵلاکە رۆیشت. ئەو پاسەوانەی یارمەتی ئایەتوڵلاکەی دەدا لە ترومبێلەکە بێتەخوار، لە مارمیلکە سڵەمیەوە. وەک ئەوەی مارمیلکە سەگێک بێ، ئایەتوڵلاکە دەستەوەستان هەنگاوێک گەڕایەوە دواوە و بانگی کرد: "دەی وەل بە!"

بەڵام مارمیلکە خێرا بۆ لای ئەو خشی، سەری بردە بن جبەکەی، هاوسەنگیەکەی ئایەتوڵلای لەنگ کرد.

شاباڵ بە دەنگەوە بانگیکرد: "ئایەتوڵلا!"

ئایەتوڵلا بە هێدمەگرتوویی ئاوڕی دایەوە، بەڵام نەشیدەزانی کتومت سەیری کوێ بکا.

سێ تەقە کران. ئایەتوڵلا دەستەکانی لە هەوا ڕاوەشاند، سێ هەنگاو بۆ دواوە کشایەوە و کەوتە سەر زەوی.

پاسەوانەکانیش دەستیان دایە تفەنگەکانیان بە کوێری بۆ هەر شتێک بجووڵابا دەیانتەقاند.

"ئەڵڵـــــــــــــــا!" دەنگی ئاغاجان بوو لەسەر بانەکەوە هات.

بروسکەئاساش ماتۆڕێک لە سووچی کۆڵانەکە پەیدابوو، شاباڵ خۆی هەڵدایەسەر و تیژ بۆی دەرچوون.

لە بەردەم مزگەوتێ تەرمی ئایەتوڵلاکە کەوتبوو. مێزەرەکەی چەند مەترێکی لێ دوور بوو، لەو شوێنەی کە مارمیلکەش لەسەر زەوی کەوتبوو. چیدیکە وەک مارمیلکە نەدەیترا، بەڵکو لەو تاریکییەدا وەک منداڵێک دەبیندرا، کە لەسەر شۆستەکە لەنێو گۆمی خوێنی جەستەی خۆی، خەوی لێکەوتبێ.

ئاغاجان لە ئاستیدا نوشتایەوە، ماچێکی لە ڕوومەتە ساردەکەی کرد، لەسەر زەوی بەرزی کردەوە و لەباوەشی کرد.

## تەییارە[187]

خـۆ ئەگەر لە حەوشـەکەدا بوەسـتی، بەردەوام گوێـت لە دەنگـی فڕۆکەکـان دەبێ، کە بەسەر شارەکەوە دەفڕن. ئەوان لە تارانەوەڕا دێن، بیابانەکە دەبڕن و زیـاتر دەفـڕن تـا دەگەنە کەنـداوی فـارس و لەوێـوە بەرەو ئەمریکـا یـان ئەورووپا دەڕۆن.

لە گەڕانەوەشـدا بە زۆری ڕێگـایەکەی دیـکە دەگـرنەبەر، بەسـەر زێـی عومانەوە[188] لە ڕێی بەندەر عەباسەوە دێنەوە ناو وڵات.

کاتێـک منـداڵەکان هێشـتا بچـووک بـوون، هەر کاتێـک دەنگـی فڕۆکەیەکیـان ببیسـتبا، یەک دوو کـۆپلە گۆرانییـان دەگـوت، ڕوویـان لەو تەلیسـمە فـڕۆکە بچکۆلەیەی بەرزی ئاسمان دەکرد و دەیانگوت:

تەیارە، تەییارە

بۆکوێ دەڕۆی تەییارە؟

ئەوە کێیە سوارە، تەییارە؟

ئەدی نۆرەی من کەیە، تەییارە؟



فەخـری سـادات لە بەردەم حەوزەکە دانیشـتبوو شـتێکی دەچنـی. ئەو کـاتی خۆی دەستی بە چنینی بلوزێک بۆ مارمیلکە کردبوو، بەڵام هەر پێی تەواو نەکرا.

ئاغاجانیش بە باخچەکەوە سەرقاڵ بوو. ئەو خەمەکانی لەگەڵ گەڵا مردووە وەریوەکان لە گۆڕ دەنا. تا لەپڕ گرمەگرمێکی زۆری فڕۆکەیەکی نەفەرهەڵگری گوێ لێبوو، کە زۆر نـزم بەسـەر خـانووەکەدا دەفـڕی. تیشـکی ڕۆژ بـریقەی لەسـەر باڵەکـانی فـڕۆکەکە دەدەیـاوە، تیشـکەکەش لە ڕووخسـاری فەخـری سادات، لە دارەکان، لە حەوزو جامی پەنجەرەکانی ماڵێی دایەوە.

ئاغاجان وایزانی فڕۆکەیەکی شـەڕکەربوو تێپەڕی، بۆیە باسـکی ژنەکەی بـۆ ژێرزەمینەکە ڕاکێشـا، ئەو شوێنەی بانگدەرەکەی لێدەژیا.

---

[187] Tajjare

[188] Omanzee

لەوێ لە دەلاقەکانەوە سەیری ئاسمانیان کرد، بەڵام خۆ فڕۆکەکە لەبەرچاوان ونببوو.

دوای ئەوەی لە شڵەژانەکەوە ڕاستبوونەوە، بینیان بانگدەرەکە لەپشت مێزەکەی خۆی وەستاوە. هیچ قورپیشی بەدەستەکانیەوە نەبوو، ئەو قاتێکی قاوەیی تۆخی لەبەرکردبوو، چاویلکەی سەفەریشی لەچاوکردبوو شەپقەکەشی لەسەر نابوو. لەبەردەمیشدا جانتایەک داندرابوو.

- "ئەرێ مامەی بانگدەر، ئەوە بەسەفەر دەچی؟" فەخری سادات بە خەمەوە وای لێپرسی.

- "من دەبینم جانتات پێچاوەتەوە، بۆ کوێ دەڕۆی؟" ئاغاجانیش هەر وای پێگوت.

- "تۆ، کە هەموو شتێک تۆماردەکەی، ئەمەشیان بنووسە. من ماڵەکە جێدەهێڵم."

- "منداڵەکە کە هەموو شەوێ لەم ماڵەدا دەگریا، مرد، بەڵام هێشا بەردەوام دەخشێتە نێو ژێرزەمین و کاتێ من خەریکی کار بم لەبەر پێمدا دێتو دەچی و یاری دەکا. ئەو لەوێ لەنێو باخچەکەدا نێژراوە، بەڵام خۆ ئەو لەسەر دارەکە دانیشتووە. ئەو شەوان لە بەردەم قاپیەکەی مندا دەگریێ. ئەو خۆی دەخزێنێتە نێو خەونەکانم."

فەخری سادات بە نەرمی گریا.

- "ئەمە بۆ ئێمەش هەروایە، ئێمەش لەناو باخچەکە گوێمان لێیەتی، بەڵام ئەمە خۆ هۆکارێک نییە تا ماڵەکە جێبێڵی."

- "خۆ من نامەوێ بڕۆم، بەڵام خانووەکە من دەردەکا، فڕێم دەداتە دەرەوەی دەرگا. سەیری دەستەکانم بکە، ناتوانم چیدی کاربکەم. ژێرزەمینەکە پڕیەتی لە دەستکردەکانم، باخچەکە پڕە لە گوڵدان، هەروەها سەربانەکەش هەر پڕە، شوێن نەماوە. کەس ئەو شتانەم لێناکڕێ. من دەردەکرێم، تکایە هیوای بەختەوەریم بۆبخوازن. دەی برایەکەم، لێمگەڕێ بابڕۆم."

بانگدەرەکە بەرەو ئاغاجان ڕۆیشت، ئامێزێکی تێوەرێنا، فەخریشی ماچ کرد، دەستی دایە جانتاکەی و لە پەیژەکانی ژێرزەمینەکەدا سەرکەوت. هەندێک لە

حەوشەکەدا ڕاوەستا، گوێی لە دەنگەکانی ماڵەکە گرت و بانگی کرد: "هۆ قەلە پیرەکە! ئاگات لەم ماڵە بێ. من وا دەڕۆم."

کاتێکیش دەرگای لە دوای خۆی پێوەدایەوە، سێ فڕۆکەی جەنگی بە ژاوەژاوێکی بێزارکەر بەسەر ماڵەکەدا فڕین و بەنێو هەورەکاندا ونبوون.
"عێراقییەکان!" ئاغاجان وا هاواری کرد.
بەلام خۆ ئەوان فڕۆکەی شەڕکەری عێراقی نەبوون، بەڵکو سێ فڕۆکەی جەنگاوەری هێزی ئاسمانی ئێرانی بوون، لە ڕێگادابوون تا فڕۆکە نەفەرهەڵگرەکە بگەڕێننەوە.
لەنێو فڕۆکە نەفەرهەڵگرەکەدا بەنی سەدر[١٨٩]ی سەرۆکی ئێران دانیشتبوو، بەتەمابوو لە وڵات رابکا. فڕۆکە جەنگاوەرەکانیش بە دوایەوە بوون بەڵکو ڕێگەی لێبگرن و بیگێڕنەوە. خومەینی هەفتەیەک پێشتر ئەوی لەسەر کار لادابوو. ئەو بەنی سەدری بە پشتیوانی موجاهیدینەکان تاوانبار کردبوو.
سەرۆک خۆی شاردبووەوە، موجاهیدینەکانیش نەخشەیەکی وەستایانەیان بۆ ئاودیوکردنی لە وڵات بۆ دانابوو. هەموو شتێک بەوپەڕی وردەکارییەوە نەخشەی بۆ دارێژرابوو، تەنانەت سەدامیش ئاگای لەو هەلاتنە هەبوو و فڕۆکەی جەنگی عێراقیش ئامادەبوون تا یاوەری فڕۆکەکەی سەرۆکی هەڵاتوو بکەن.
فڕۆکە ڕاوەدوونەرەکانی ئێرانی درەنگ کەوتبوون، چونکە فڕۆکە نەفەرهەڵگرەکە لە کاتی خۆی گەیشتبووە ئاسمانی عێراق و بەرەو ئاراستەی ئەورووپا فڕی.
چوار سەعات و نیو دواتر، فڕۆکەکە لە پاریس نیشتەوە. فڕۆکەوانەکە پەیوەندی بە کاربەدەستە فەرەنسییەکانەوە کرد: "نیشتنەوەیەکی ناچارییە. سەرۆکی ئێرانم هەڵگرتووە. داوای پەنابەری دەکا!"
بەڕێوبەری فڕۆکەخانەکەش لە داوایەکە ئاگادارکرایەوە، ئەویش پەیوەندی بە سەرۆکی فەرەنساوە کرد. پاشان چەند پرسیارێکی لەسەرۆکی ئێران کرد، ئەویش بە فەرەنسییەکی بێ گرێوگۆڵ وەلامی دانەوە: "من سەرۆکە

---

[١٨٩] Bani Sadr

هەڵبژێـردراوەکەی کۆمـاری ئیسـلامی ئێـرانم. لەسـەر پشـتی فـڕۆکەکەدا سەرکردەی موجاهیدینەکانیشم لەگەڵدایە. من داوای مافی پەنابەری بۆ خۆم، بۆ سەرکردەی موجاهیدینەکە و بۆ فڕۆکەوانەکەش دەکەم."

فڕۆکەکە یەک دوو جار بەسەر پاریسدا سووڕایەوە، ئەوەش بۆ ئەوەبوو، تا بەڕێوەبەری فڕۆکەخانەکە کاتی هەبێ پرسەکە لەگەڵ سەرۆکدا تاوتوێ بکا.



بەنی سەدر سالانیکی زۆربوو لە پاریس دەژیا، ئەو ئابووری خوێندبوو. ئەو هێشـتا کلیلـی ئەپارتمـانەکەی پاریسـی هەر لەگیرفانـدا بـوو. ئەو خەریکـی خوێنـدنی پۆسـت دۆکتـۆراکەی بـوو، کـاتێ خـومەینی عێراقـی بەرەو پـاریس جێهێشت.

بەنی سـەدر لە کاتی خوێندنەکەیدا مۆدیلێکی ئابووری داهێنـا، تیایدا هـزرە سـەرمایەدارەییەکانی لەگەڵ ئیسـلامەتیدا تـێکەڵاو کردبـوو. نەخشـەکانی بـۆ خـومەینی شـتێکی نمـوونەیی بـوون، ئەویـش فـڕی بەسـەر کاروبـاری ئابوورییەوە نەبوو.

کـاتێکیش خـومەینی لە پاریسـەوە بەرەو تـاران فـڕی، بەنـی سـەدر یەکـێ لە حەفت پیـاوە بڕوانـامەدارە بالاکانی ڕۆژئاوابوو، کە یاریـدەری بـوون. پاشـان ئەو وەک یەکەمین سەرۆکی ئێران هەڵبژێردرا.



فڕۆکەکە لەچوارەم گەڕی خولانەوەیدابوو بەسـەر پـاریس، کاتێـک تەلەفۆنە دەسـتییەکەی لێیـدا. بەڕێـوەبەری فڕۆکەخـانەکە پەیـامێکی دایە بەنـی سـەدر: "حکـوومەتی فەرەنسـا مـافی پەنـابەری بە تـۆ و هاوسەرنشـینەکانت دا. فڕۆکەکەت دەتوانی بنیشێتەوە. بەخێر بێێت."



هەواڵنامەی فەرەنسی هەواڵی گەیشتنی بەنی سەدری ڕاگەیاند.

خـومەینی تـازە لەنوێژی مەغریـب ببـووەوە کـاتێ ڕەفسـەنجانی سـەرکردەی ئەوکاتی سوپا، لەپاڵ ئەودا کڕنووشی برد و هەواڵەکەی پێڕاگەیاند.

هەرچەندە خومەینی لە نوێژەکەی ببووەوە، لێ دیسان هەڵسـایەوە و نـوێژێکی دیکەشی کرد. هەنووکەش کە هەواڵێکی نەخوازراوی پێگەیشتووە، هەوڵیدا بە

نــوێژی زیــاتر لەخــوا نــزیکببێتەوە پرســـی پێبکــا. کــاتێکیش دواهەمــین سـوژدە(رکعات)ی نـوێژەکەی هەڵوەشـاندەوە، چاوەکـانی بریقەیـان لێوەهـات. ئینجـا ڕووی بەرەو ڕەفســەنجانی وەرســوڕاند و گــوتی: "ســاتە پیــرۆزەکە گەیشت."



هەرلە دەســتپێکی جەنـگەکەوە، سـوپای ئێـران چـاوەڕێی کـاتێکی گونجـاوی دەکرد، تا شارە پڕ کێڵگە نەوتییەکانی خوڕەمشار وەربگرێتەوە. لەو بەندەرە ستراتیژییەدا کێڵگەی نەوتی هەرە گەورەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەبوو. تـا ئەوکـاتیش ئەم ئۆپەراسـیۆنە سـەربازییە ئەسـتەم بـوو، چـونکە سـەتەلایتە ئەمریکییەکـان هەمـوو جـووڵەیەکی دەوروبەری ئەو شـارەیان بە هێزەکـانی عێراقی ڕادەگەیاند.

"خودا پشتوپەنای ئێمەیە." خومەینی وای بە ڕەفسەنجانی گوت، "ئێمە دەبێ خوڕەمشار ڕزگاربکەین. ساتەکەی هاتووە. دەی ژەنەڕاڵەکانت کۆ بکەرەوە!" ئەوێ دەمــێ ســەدامیش پێکـی بەخـتەوەری دەخـواردەوە، ئەو لەڕێگـادابوو، بچێتە کۆبـوونەوەی کـابینی حکـوومەتەکەی کـاتێ گەشـتەفڕینی بەنـی سـەدر گەیشــتە فەڕانســە. ئەو دەیویســت بە خــۆی هەواڵە خۆشـــەکە بگەیەنێــتە وەزیرەکانی.

ئەو هێشـتا نەگەیشـتبووە شـوێنی کۆبـوونەوەکە، کـاتێ سـوپای ئێـران لەیەک کاتدا و لەشەش لاوە چوونە نێو خوڕەمشار.

لەوێ لە شـارەکەدا لە هەمـوو لایەک، بەسـەدان سـەربازی ئێرانـی و عێراقـی سەریان تێداچوو، زەوی لە تەرمەکانیان ڕەش ببوو. دوای شـەڕێکی سـەختی نیـو ڕۆژە، دوو سـەربازی ئێرانـی توانیـان، ئەو ئـاڵا عێـراقیەی لەسـەر کێڵگە نەوتییەکەی شارەکەدا هەڵکرابوو، بە ئاڵای ئێران، بە ئـاڵا کەسکەکەی ئیسـلام بگۆڕنەوە. عێراقیەکانیش هەموو هێزی خۆیان خڕکردەوە، بەڵام ئایەتوڵڵاکـان لەناکاو، بەناچاوەڕواننەکراوی بەرەیەکی دیکەی شـەڕیان لە بەندەرە شـاری بەسرادا کردەوە. ئەو هێرشە لەپڕە سـەری لە سـەربازە عێراقییەکـان شـێواند، ئیدی هەموو خانووەکانی خوڕەمشـاریان ڕووخاند و کێڵگە نەوتییەکانیشـیان

بـۆمبڕێژکرد. ئینجـا بە دۆڕاوی کشـانەوە، بە هیـوای ئەوەی فریـای بەسـرا بکەون.



دوای ئەم سەرکەوتنە مێژووییە، بۆ یەکەم جار خومەینی بە خەندەوە لەسەر شاشـەی تەلەفزیـۆن دەرکەوت. ئەو سوپاسـی خـودای کـردو پیرۆزبـایی لە دایبابی کوژراوەکان کرد و پەسنی ئازایەتی ڕۆڵەکانیانی دا. ئیدی بە ملیۆنـان موسڵمان ڕژانە سەر جادەکان و بۆ ڕزگارکردنی خورەمشار ئاهەنگیان گێڕا. یاری ئاگرینە تەقێندرا و ترومبێلیش بەناو شـارەکاندا بە هـۆڕن و فلاشـیانەوە دەڕۆیشـتن. خەڵکیش لەسـەر پشتی پاسـەکان دەڕەقسـین و کێک و نوقڵ و شیرینیان بەسەر یەکدیدا دابەش دەکرد.

بەزمەکەش تـا درەنگـانیکی شــەو بەردەوام بـوو، ئەوەش لەوەتەی ئـایەتوڵلا هاتبووە سەرتەخت، یەکەمین جیژنی سەرتاسەری وڵات بوو.

هەر لەم شەوەشدا مانگ بەپڕی لەئاسمان دیاربوو، ئەمەش دڵنەواییەکی بە خەڵک دەدا کە لە جەنگەکەدا قوربانی زۆریان دابوو.

بەڵام خۆ هەموو خەڵکەکە ئاهەنگی نەدەگێڕا، هەندێکیان ئەو بۆنە خۆشـەیان بۆ تۆڵەکردنەوە بەکارهێنا. تیشکی هەمان مانگ کەوتە سەر ئاوە سوێرەکەی قەراغی بیابانەکەی زەنجان، لەوێ تەرمی زینەت خـانم نیوەی لەنێو ئـاو و نیوەکەی دیکەشی لەنێو لمدا چەقی بوو.

پـارچە کـاغەزێکی لە پلاسـتیک گرێـدراو بەملـی تەرمەکە وەکرابـوو، تێیـدا نووسـرابوو: "ئەوەی کیـژە گەنـجە مێردنەکردووەکـان، ئەوانەی بە مەرگ مەحکوم کرابـوون، ناچاردەکرد بەر لە لەسێدارەدانیان لەگەڵ یەکێ لەپیـاوە ڕیشدارەکانی ڕژێم سەرجێی پێبکا، ئیدی لەم دەریاچە سوێرەدا دادگایی کراو سزا درا. ئەمەش خواستی دایکانی ئەو کیژانەبوو کە بە ناچـاری دوا شـەوی ژیانیان بەزۆر بەبووک بردران."

زۆریشی پێنەدەچوو مانگ جێگەی خۆی بۆ ڕۆژ دەکردەوە. باڵندەکانی بیابان هەر زوو تەرمەکەی زینەتیـان دەدۆزیـیەوە، ئیـدی بە ژاوەژاو بەسـەر دەریاچەکەدا دەفڕین. ڕێبوارێکیش بەسەر پشتی حوشترەکەی بەوێدا دەڕوا، سەیری شتەکە دەکا، بەدوادا دەچێ ئاخۆ چی لە گۆڕێدایە.

حوشتر سوارەکە لەسەر پشتی حوشترەکە دێتەخوار، بەرەو لای تەرمەکە دەڕوا، هەندێ دەچەمێتەوە، ئینجا نووسینی سەر پارچە کاغەزەکە دەخوێنێتەوە.

## وێنەگرەکە

دوای نوێژی بەیانی، ئاغاجان نەگەڕایەوە ماڵ و پیاسەیەکی بە قەراغ ڕووبارەکەدا کرد. ئەو چووە سەر کەنارەکە و لەسەر گردێکی لمین دانیشت. هەرچەندە ئاوەکەش سارد بوو، لێ ژنێک لەوێ پێیەکانی لەنێو ئاوەکەدا دەشوشتن.

ئافرەتەکە پێیەکانی خۆی بە چارشێوەکەی وشککردنەوە. ئینجا پێڵاوەکانی کردنەوەبەر و بەرەو ڕووی ئاغاجان هات.

- "ئەرێ هیچ قرۆشێکت بۆمن هەیە، من هیچ قرۆشێکم لەدەمدا نییە." ژنەکەبوو وای گوت.

- "قودسی، ئەوە خۆتی؟"

قودسی کە هەمیشە گەنج و بەجووڵەبوو، ئێستا پیر دیارە. سەری ماشوبرنجی و دەموچاویشی چرچ ولۆچ ببوو.

- "من دەمێکە نەمبینیوی، ئەرێ قودسی ئەو ماوەیە لە کوێ بووی؟ ئەدی دایکت چۆنە؟"

- "ئەو مرد." بە خەمبارییەوە وای پێگوتەوە.

- "کەی کۆچی دوایی کرد، باشە بۆمن هیچم لەبارەیەوە نەزانیوە؟"

- "ئەو هەروا ئاساییانە مرد." ژنەکە هەر ئەوەندەی گوت.

- "ئەدی خوشکەکەت چۆنە؟"

- "ئەویش مرد."

- "ئەویش مرد؟ چۆن؟ کەی؟"

قودسی هیچ وەڵامی نەدایەوە.

- "ئەدی برات لە کوێیە؟"

- "ئەویش مرد."

- "ئەوە چی دەڵێی، هەر هەموویان؟"

- "بەڵام خۆ تۆ نامری،" قودسی وایڕاگەیاند، "تۆ هەر دەمێنی تا هەمووان دەڕۆن و تا هەموانیش دێنەوە."
قودسی سوڕایەوە و دیسان کەوتەوە جووڵە.
- "قودسی، ئەوە بۆکوێ دەڕۆی؟ خۆ تۆ هیچ هەواڵت پێنەدام."
- "هێشتا حەفت پیاو ماون، سێ لەوان دێن، یەکیان دەڕوا، یەکیشیان دەمێنێتەوە، یەکیان دەمرێ و یەکیشیان تۆو دەڕوێنی. بەڵام تۆ هەر دەمێنیەوە تا هەموویان دێنەوە و تا هەر هەمووشیان دەڕۆن." قودسی بێ ئەوەی ئاوڕیش بداتەوە، وا وەڵامی ئاغاجان دایەوە.
- ئاغاجانیش بەدرێژایی ڕووبارەکە پیاسەی دەکرد.
- تۆ بڵێی کێی دیکە بڕوا؟ کێش بێتەوە؟ هەر بیری لێدەکردەوە.
- ئینجا لەپڕ نوسرەت هاتە نێو مێشکییەوە.



لە ماوەی شەوە پڕئاشووبەکانی تیرۆر، کەس نەدەگەیشتە خومەینی، تەنها یەک پیاو: نوسرەت نەبێ.
لەگەڵ نوسرەتدا خۆی لەجیهانی ڕۆژانەی دەرەوەی دەسەڵاتەکەی دادەبڕی. نوسرەت دەیبردە جیهانێکی دیکە، جیهانێک هیچ جێگەی فڕۆکە جەنگاوەرەکانی عێراق و بۆمب و لەسێدارەدانەکانی تێدا نەدەبۆوە.
بە کامێراکەی، خومەینی بردبووە دونیای خەیاڵ. ئەو کۆپلەی فیلمەکانی، فیلمی دۆکیومێنتاری لەسەر سروشت، دەربارەی باڵندەکان، دەربارەی مێشە هەنگ و مار و سەبارەت  بە ڕووباری ئەستێرەکان نیشان دەدا. ئەوەش ڕازێکی نێوانیان بوو، کەس نەیدەزانی لەودیو دەرگا داخراوەکانی ژوورەوەی خومەینی چی دەگوزەرێ.



خومەینی ڕابەری جیهانی شیعە بوو، کەسێک بوو بە وتارەکانی ملیۆنان خەڵکی دەبزواندن، بەڵام ئەو تەنیاش بوو. هەموو ڕۆژەکەی، هەندێ جار هەموو هەفەتەکەش هەر بەتەنها لە حوجرەکەی خۆی دادەنیشت.
ئەو سەکردەیەکی کاریزمایی بوو، هەموو کەسێکیش ئەوپەڕی توانای خۆی بەکاردەهێنا بەڵکو لێی نزیکببێتەوە، کارێکی وابکا ببێتە مایەی تێبینی ئەو،

بەڵام نوسرەت هەرئەوەبوو کە هەبوو، خوازیاریش بوو وەک خۆی بمێنێتەوە، بۆ ئەوەی وەک کەسایەتی خۆی لێی نزیک ببێتەوە. خومەینی هیچی دەربارەی بیرکاری نەدەزانی و سەریشی لە فیزیا(سروشتناسی) هەر دەرنەدەچوو، بەڵام ئەو مەیلێکی زۆری بۆ تیشک، بۆ مانگ، بۆ ڕۆژ، بۆ گەردوون و گەشتی ئاسمانی و لەسەرووی هەمووشیانەوە بۆ بەردە ئەستێرەکشاو (نەیزەک)ەکان هەبوو. خومەینی بە سەرسامییەوە سەیری فیلمەکانی دەکرد، تەنانەت کوڕەکەی خۆیشی لای ئەو هەستی بە ئاسوودەیی نەدەکرد. ئەو زۆرجار بیستبووی کە هونەرمەندەکان شتێکی دیکەن، بەڵام ئەو پێش نوسرەت کەسێکی وای نەبینیبوو.

ئەوەی نوسرەت کردی، شتێک بوو پەیوەندی بە ژیانی پاشا کۆنە فارسەکانەوە هەبوو. پاشا هەمیشە مەلیچک[190]، لێبووکێک، کەسێکی قسەخۆشیان لەنێوماڵێدا هەبوو، تا دڵی شا بە قسە پێکەنیناوییەکانی خۆش بکا. مەلیجەکیش تاکە کەسێک بوو دەیتوانی بچێتە نێو ژیانی تایبەتی پاشاوە و هەموو ئازادییکیشی هەبوو، هەرچییەکی بگوتبا و بکردبا تا ئەو کاتەی پاشای بخافڵاندبا، ڕێپێدراو بوو.

- "ئەرێ دیسان ئەو کەناڵە ناوی چییە؟" خومەینی وای لێپرسی.
- "کامە کەناڵ؟"
- "ئەوەی ئەمریکییەکە، ئەوان چەند جارێک چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کردم."
- "مەبەستت سی ئێن ئێنە؟"
- "بەڵێ، ئەوە." خومەینی وای وەڵامدایەوە.
- "دەتەوێ چی لەبارەیانەوە بزانی؟"
- "هیچ، من هەرئەوەندە دەزانم، سەرۆکی هەموو وڵاتە گرنگەکان ئامێرێکی تەلەفزیۆنیان هەیە و بەردەوامیش لەسەر سی ئێن ئێنە."
- "بەڵێ وایە، پێم سەیرە، لە ژوورەکەی ئێوەدا هیچ تەلەفزیۆنێک نییە."
- "پێموابێ ئەوان بە ئینگلیزی قسەدەکەن."

---

[190] Malidjak (میلجک) بە هەندێ زاراوەی دێهاتی بە پاساری دەگوترێ. ناسرەدین شای قاجار، خولامێکی هەبوو، وەک لێبوکێک دەیهێنایە پێکەنین. ڕۆژێکیان لەبەردەمی شادا وشەی گنجشک(پاساری) ی فارسی نەزانی، بۆیە هەر بە زاراوەی خۆی گوتی ملیجک، بەدی پاشا وشەکەی پێ جوان بوو، براکەی خۆی ناونا ملیجک. (نا. وەرگێر)

خـومەینی هـیچ ڕادیـۆ و تەلەفزیـۆنی لە حـوجرەکەی خۆیـدا نەبـوو، هەمـوو هەواڵەکانی بە نووسراو بەدەست دەگەیشت.

- "کەنـالێکی عەرەبیش هەیە، هەروەک سی ئێن ئێن هەموو هەواڵەکانی بە زمـانی عەرەبـی پەخـش دەکـا." نوسـرەت وای پێگـووتەوە، "مـن شـتێکی وا ڕێکدەخەم، تۆ یەکێکی وات لێردا هەبێ و سەیری بکەی."

ڕۆژی پاشتر، تەلەفزیۆنێکی بچووکی بردە ژوورەکەی و لەنێو دۆلابی جلکان داینا بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ. ئیدی خومەینی فێرکرد چۆن ئامێرەکە پێبکا و چۆن کەناڵەکانیش بگۆڕێ.

- "خـۆ ئەگەر لەسـەر کەنـالە عەرەبـیەکە دابنـدرێ، ئەوا زۆر بـاش دەبـێ." خومەینی ئەو قسەیەی ئەوەندە نەرم لەدەم دەرچوو، هەروەک ئەوەی شتێکی بە دزییەوە کردبێ وابوو.



چەند هەفتەیەک دواتر، لەناکاو پەیامنێرێکی سی ئێن ئێن زەنگی بۆ نوسرەت لێدا. ئەو دەیزانی، کە نوسرەت هاموشۆی لەگەڵ خومەینییدا هەیە. ئەوان لە چایەخانەیەکـدا لە لای وێسـتگەی مەیـدان دانیشـتن و نوسـرەتیش باسـی کـارەکەی خـۆی بـۆ پەیـامنێرەکە کـرد. دوای گفتوگۆکەیـان، پەیـامنێرەکە بە ئەسـپایی لێپرسـی ئـاخۆ ئەو مەیلـی لەسـەر ئەوەیە بەڵگەنـامەیەک لەسـەر خومەینی ساز بکا.

- "کتومت شتەکە بۆ چییە؟" نوسرەت بەسەرسامییەوە وای لێپرسی.

- "ڕیپۆرتاژێک دەربارەی خومەینی و ژیانی ڕۆژانەی."

نوسـرەت بە داوایەکە غـافڵگیر بـوو، ئەو مـاوەیەک بـوو بیـری لە شـتێکی وادەکردەوە، بەڵام دیاربوو بەدیهێنانی بیرۆکەکە ئەستەم بێ.

"سی ئێن ئێن دەیەوێ دۆکیومێنتێکی بێ وێنەی نیو سەعاتی دەربارەی ژیـانی تـایبەتی ئەو چـاک بکـا." پەیـامنێرەکە وای بە نوسـرەت گـوت؛ "هەڵـبەتە ئێمە بەخشیشێکی باش بە دۆلار دەدەینە بەڕێزتان."

نوسرەت زۆر مەیلی بە لای بەخشیشـی پارەوە نەدەچوو. شـتەکە پەیوەسـت بـوو بە توانسـی ئەو ڕیپۆرتـاژە نـاوازەیە. ڕەنگبـێ ئەوە دەرفەتـی ژیـانی بـێ، بەڵام خۆ بەدیهێنانیشی ئەستەم بوو.

- "ئیشەکە ناکرێ،" نوسرەت وای بە یارۆی سی ئێن ئێن گوتەوە؛ "باشە بۆچی ئەو ڕێگەم دەدا فیلمێکی لەبارەوە ساز بدەم."
- "خۆ دەتوانی هەموو کاتێک هەوڵ بدەی،" پەیامنێرەکەش وا وەلامی دایەوە؛ "بیری لێبکەوە، دواتر ئەگەر هەر شتێکی دیکە بوو، پەیوەندیم پێوەبکەوە."
- "باشە ڕێککەوتین" نوسەرەتیش وا وەلامی دایەوە.

لە مێشکی نوسرەتدا ئەو دیمەن و کۆپلانە دەهاتن و دەچوون کە ئەو دەیەویست. لە وروژاویان شەو هەر خەویشی لێنەکەوت.

ئەو ویستی لەو بارەیەوە، لەگەڵ یەکێک قسە بکا، بەلام زاتی ئەوەشی نەدەکرد لە هیچ شوێنێک دەمی بکاتەوە، دەترسا نەوەک بەختی نەیگرێ.



شەوێکیان کاتێ نوسرەت لەگەڵ خومەینیدا لە دەریاچەکەی پشتماڵیان پیاسەیان دەکرد، چیرۆکێکی سەیرو سەرنجڕاکێشی دەربارەی سەتەلایت و چۆنیەتی ئیشکردنی بۆباسکرد.

ئەو گوتی؛ لەبواری تەکنیکەوە شۆڕشێکە، کە مرۆڤ سەرۆکی ئەمریکا زیندوو لەسەر شاشەی تەلەفزیۆندا ببینی، کەچی ئەو هەر لە ژوورەکەی خۆیدا لە کۆشکی سپییدا خەریکی قاوەخواردنەوەیە.

"خەڵک پرسنە[191]،" ئەو زیاتر لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت؛ "بۆ ئەوەی پرسنییەکەی خۆیشی ڕاییبکا، بیری لە جۆرە ئامێرێکی وا کردۆتەوە و بەهەوادا پەخشی کرد. خەڵک خوازیارە هەموو شتێک بزانێ. خەڵک زۆر تاسەمەندە بزانێ ئاخۆ چۆن دەژی، لە کوێ دەژی و چی دەخۆیت. خۆ پرسەنیش شتێکی ئەوەندە خراپ نییە."

هەوڵوتەقەللای نوسرەت ئەوەبوو، خۆی بۆ پرسیارەکەی ئامادە بکا، بەلام دەیزانی ئەگەر ناوی سی ئێن ئێن بێنێ، لەهەمان کاتدا ناوی ئەمریکاش دێتە گۆڕێ. نوسرەت لەوە دەترسا، ئەگەر پرسیارەکەی کرد، چیدیکە پێشوازی لێنەکرێ، ئیدی دەبێ دەستبەجێ ئامێر و کەلوپەلەکانی تێکبنێ و باربکا.

---

[191] پرسن: واتە تاسممەند بۆ نموەی شتێک، زانیارییکی نوێ بزانێ، فزولی. بڕوانە مامۆستا مەسعسود محمد، زاوارسازی پێوانە.

بەڵام هزرەکە ئەوەندە بەسەریدا باڵکێش ببوو، نەیدەتوانی چۆن خۆی لەبەر بگرێ. نوسرەت بۆ هەر کوێ دەچوو، کامێراکەی پێبوو، کەواتە ئەو شەوە کاتێک لەگەڵ خومەینیدا لە حوجرەکەیدا تەلەفزیۆنەکەی بۆ دانا، بە دزییەوە دوگمە سوورەی کامێراکەی داگرت. ئەو فیلمی خومەینی بە خۆی و پێپەتی کە لەسەر زەویەکە دانیشتبوو، هەروەها چۆن بە دزیشەوە لەپشت دەرگەی دۆلابەکەی سەیری تەلەفزیۆنەکە دەکا، گرت.



لەمیانەی چەند مانگێکدا نوسرەت بە دەیان گرتەی ڤیدیۆیی خومەینی گرت. ئەو چۆن بە قەراخ دەریاچەکدا پیاسەی دەکرد و چۆن سەیری قازەکانی دەکرد. چۆن پاسارییەکان دەردەکەوتن و بەسەر سەریدا دەفڕین. چۆن لەپڕ خۆی لەقەدی دارێک دەدا و مێزەرەکەی بەردەبۆوە ودەکەوتە نێو دەریاچەکە. چۆن قازەکان لەنێو ئاوەکەدا بەرەو مێزەرەکە دەکشان و بە دەنووک لێکیان دەکردەوە.

لەیەکێک لە گرتە ڤیدیۆییەکانیدا، خومەینی لەسەر جێ پاڵکەوتبوو. ئەو لەسەر لا درێژ ببوو، ڕووی لە مەککە بوو، کتومت چۆن بە پێی دابی ئیسلامەوە مردووە دەنێژرێ. تەنانەت ژنەکەشی لە گرتەکەدا دەردەکەوێ، بە نەرمی دەستێک لەسەر نێوچەوانی دادەنێ، ئینجا بە نەرمی دەچێتەدەر.

لە گرتەیەکی دیکەشدا، ئەو لە ژووری دانیشتندا دێت و دەچێ. دەڕوا تا دەگاتە لای دەستشۆرەکە. لەوێ دەستونوێژ هەڵدەگرێ و دەگەڕێتەوە، دەست دەداتە قورئانەکەی، بە تاسەوە لاپەڕەیەکی لێدەخوێنێتەوە. کاتێکیش لە خوێندنەوەکەی دەبێتەوە، دەست دەداتە خامەکەی، شتێک تۆمار دەکا، کاغەزەکە دەخاتە نێو زەرفێک، زەرفەکە دادەخا و بانگی ژنەکەی دەکا: "بەتول!"

ئەویش دێتە ژوور، زەرفەکەی ڕادەست دەکا و پێیدەڵێ: "بیدەرە سوپا!"

ژنەکەشی نامەکە وەردەگرێ، دەیخاتە بن چارشێوەکەی، خێراش لەوێ دەچێتەدەر.

خومەینی هەر زوو سەرنجی دابوو، کە نوسرەت بە دزییەوە وێنەی دەگرێ. نوسرەتیش لەو بڕوایەدا بوو، خومەینی بە نهێنییەوە لەگەڵیدا هاوکارە.



ڕۆژێکیان پەیامنێرەکەی سی ئێن ئێن پەیوەندی بە نوسرەتەوە کردەوە.

- "تۆ زەنگت بۆ لێنەدامەوە. من وای دادەنێم ، تۆ بە داوایەکەی من قایل نی."
- "من شتێکی جوانم ئامادە کردووە." نوسرەت وای بە کابرا گوتەوە.

یەک چارەگە سەعات دواتر، کابراکە لەبەر دەرگای ماڵێی وەستا.

نوسرەت لەوە تاسەمەندتربوو لەوەی بزانێ ئاخۆ دەزگا هەواڵگرییە نوێکەی ئیسلامی ئەوی خستۆتە ژێر چاودێرییەوە یان نا. ئەو نەیدەزانی ئەوان بە پەیوەندییەکانی ئەو بە کەناڵی سی ئێن ئێنەوە دەزانن.

پەیامنێرەکە هاتە ژوور. نوسرەت چایەی بۆ دانا، یەکێک لە گرتە ڤیدیۆیەکانی لێدا، پەیامنێرەکە خەریکبوو بە چاوەکانی خۆی بڕوا نەکا.

"نایابە!" کابرا وایپێگوت.

ئەوان هێشتا نیوەی گرتە ڤیدیۆیەکانیان لێنەدابوو، کە پێنج کەسی چەکدار لەسەر بانی قەپەنگەکەوە بازیاندا نێو حەوشەکە. دەرگایان بەزۆر کردەوە، ڕژانە نێو ژوورەکە و نوسرەت و پەیامنێرەکەشیان گرت. دوو سەرباز مانەوە تا ماڵەکە بە وردی بپشکنن. ئەوان هەموو شتە گوماناوییەکانیان لەگەڵ خۆیاندا برد.

بۆ ڕۆژی پاشتر دەستبەجێ پەیامنێرەکەی سی ئێن ئێن لە وڵات دەرکرا، نوسرەتیشیان لە ژوورێک کرد و لێپێچینەوەیان لەگەڵدا کرد. لە زیندانەوە بۆی دەرکەوت، پرسەکە زۆر زیاتر لەوەی بیری لێدەکردەوە، بە هەند هەڵگیراوە. ئیدی پەی بەوە برد کە سەرچڵێیکی گەورەی کردووە. دەشیزانی سزایەکی توند لەسەر گرتە ڤیدیۆییەکانی وەردەگرێ، بەڵام بە تەمای ئەوەش بوو، خومەینی بەهانایەوە بێ.

نوسرەت هەوڵیدا لێکۆڵەرەوەکەی بهێنێتە قەناعەت، کە زۆر ڕێزی خومەینی گرتووە و بە هەوادارییەوە لەگەڵ خومەینیدا ڕەفتاری نواندووە.

ئەو ڕوونیکردەوە کە گرتە ڤیدیۆییەکانی، تایبەتمەندییەکی مێژوویی بۆ پاشماوەی کلتووری وڵاتەکەی هەیە.

پێشـی لەسـەر ئەوە داگـرت، هەرگیـز نیـازی نەبـووە گـرتە ڤیـدیۆییەکان بفرۆشێتە ئەمریکییەکان، ئاخر ئەو هەر بۆ خۆشەویستی کامێرا، ئەو گرتانەی تۆمارکردوون.

ئەو سـوێندی خـوارد کە بەقەد دڵسـۆزییەکەی بـۆ کـامێرا، بـۆ خـومەینیش دڵسۆزە.

هەروەهـا ئەوەشـی پێراگەیانـدن، کە خـومەینی ئاگـای لە گـرتە ڤیـدیۆیەکانیی هەیە و ئەگەر پێویستیش بکا دەتوانێ بیسەلمێنێ.

دیاربوو بەرگری لەخۆکردنەکەی نوسرەت دەیخوارد. گەرهاتبا و لە ماڵەکەی ئەودا شـریتە گومانلێکراوەکەیـان نەدۆزیبـایەوە، باوەڕیـان پێـدەکرد. ئەو تۆمارانەی سەر شریتەکان ئەوەندە ترسناک و جوان گیرابوون، نوسرەت بە خۆیشـی نەیـدەزانی چییـان لێبکـا. بـۆیە لەنێـو سـاپیتەی سـتۆدیۆکەی شـاردبوونەوە، گـوایە کەس نایانـدۆزێتەوە. لەبەر ترسـە زۆرەکەشـی هەر لەبیری نەمـابوون. کەچـی هەنـووکە، ئاژانەکـانی دەزگـا نهێنییە هەواڵگـرەکە شریتەکانی دۆزیبوونەوە.



ئاغاجان زۆرجاران بە نوسرەتی دەگوت: "تۆ دەبێ ئاگات لەخۆت بێ، نەوەک لە ڕێی مەیل بۆ ژنان، بە تەڵەوە ببی."

ئەو هەمیشە بە دوای ژنە ناوازەکانەوە بوو، بەڵکو وێنەیەکی نایابیان بگرێ.

هەرگیزیش باکی بەوە نەبوو، ئاخۆ خانمەکە خێزانی خومەینییە یان نا.

لێکۆڵەرەوەی دەزگـای هەواڵگـری نهێنـی، بە چـاوەڕواننەکراوی ئەو شـریتە ڤیدیۆیە قاچاخەی خستە سەر مێزەکەی بەردەمی. کاتێ نوسرەت شـریتەکەی ناسیەوە، ڕەنگی بزرکا، ئیدی زانی کار لەکار ترازاوە. هەر لە جێوە لە ترسان ڕەق هەڵات.

باشـە تـۆ بڵێی ئەو لەو ژنە پیرەدا چـی دۆزیبـووەوە، کەوا لەناکـاو دوگـمەی تۆماری کامێراکەی دابگرێ؟

بەتـول ژنـی دەسـەڵاتدارترین پیـاوی شـیعی بـوو لە جیهانـدا، لەگەڵ ئەوەشـدا ژنێکی بێدەسەڵات بوو.

نەسرەت نەیدەتوانی ڕوونکردنەوە بدا، ئاخر ئەو ژنێکی بەستەزمان بوو، بێدەنگی ناچاری کردبوو وێنەی بگرێ، گرتەی ڤیدیۆی لێ تۆمار بکا، فیلمەکە هەڵبگرێ، لەوانەشە ڕۆژێ لە ڕۆژان نمایشیشی بکا.

بەتول لە هەموو ژیانیدا هەر بە چارشێو سوڕاوەتەوە، هیچ پیاوێکی بیانی هەرگیز پرچەکەی، ڕووخساری، دەست و قاچەکانی نەبینیوە. هەر بۆیە هەندێک جار ژنەکە پێویستی بەوەهەبوو، خۆی نمایش بکا.

سەرەتا نوسرەت نەچووە ژێربار. کاتێ لە دەرگای ژووری لێدانیشتنەکەیان دەدا، بەتول دەرگاکەی لێدەکردەوە هەمیشە بە خەندەوە پێشوازی لێدەکرد.
ژنەکە نزیکەی بیست ساڵ لە خومەینی بچووکتر بوو، ئەمەش بە ڕووخسارییەوە دیاربوو.

ئەو هەمیشە میواندۆستانە پێشوازی لە نوسرەت دەکرد، ئەمەش لە ژنێکی دیندار ڕەچاو نەدەکرا. بەڵام نوسرەت دەیزانی شتەکە پەیوەندی بە ئەوەوە نییە، بەڵکو لەبەر خاتری کامێراکەیەتی.

بەتول جوان بوو، دەیەوست جوانیەکەی نیشان بدا، دەیەویست لە ڕێی زوومی کامێراوە سەیری بکرێ.

خواستی ئەویش، خواستی هەموو ژنانی نیشتمانەکەی بوو، کە سەدەگەلێکە لە لایەن پیاوانەوە چەوسێنراونەتەوە و هەرگیزیش ئەو دەرفەتەیان نەبووە جوانییەکەی خۆیان نمایش بکەن.

ئەو وادە دیدارێکی بێدەنگانەی لەگەڵ نوسرەتدا ڕێک خستبوو. نوسرەتیش بە بێدەنگی وێنەی دەگرت.

بە هەزاران وێنەی خومەینی لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوببوونەوە، بەڵام هیچ کەس تەنانەت وێنەیەکی بچکۆلانەی بەتولی لەسەر ڕۆژنامەکان نەبینییوە. خەڵک وای ڕەفتار لەگەڵ ئەو ژنە دەکرد، وەک ئەوەی هەر نەبووبێ.

بەتول لەپێش پەنجەرەکە وەستابوو، سەیری دەریاچەکەی دەکرد. ئەو چارشێوە ڕەشەکەی بە یەکێکی ڕەنگ شیری بە گوڵوکی شینەوە گۆڕیبووەوە. نوسرەتیش زوومی کامێراکەی خستبووە سەر ڕووخسارەکەی، سەر پرچە زیوینەکەی کە هەندێ لەبن چارشێوەکەیدا

هاتبووەدەر. هێدی هێدیش لێگەڕا چارۆگەکەی لەسەر سەر بخزێتە سەر شانەکانی. ئەمەش خۆی هێمایەک بوو.
بەڵام گرتەیەک هەبوو، نوسرەت هەموو شتێکی بە قوربان کردبوو. ئەو فیلمەکەی لە ژووری بەتولدا گرتبوو، دەرگاکە نیوە کرابووەوە. ئەو وێنەی هۆدەکەی ، پێخەفی کەسیی و مێزی شەوانە و ئاوێنەیەکی بچکۆلە و قوتوە نیڤیایەکی کۆنی لە ژوورەکەدا گرتبوو.
کاتێکیش ئاژانەکەی دەزگای هەواڵگری نهێنی ئامێری ڤیدۆکەی گرت و بە هەموو هێزی خۆی بە سەروچاوی نوسرەتیدا دا، ئامێرەکە شکا و نوسرەتیش بێهۆش کەوتە گۆڕێ.
پاشان بێدەنگی بە دواداهات.
بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو شوێنەکاندا کێشا.
سەدام حوسێن چیدی شارەکانی بۆمبابارا‌ن نەکردن، خومەینیش چیدی ڕاوێژی بە قورئان نەکرد ئاخۆ زیاتر بڕواتە نێو سنووری عێراق یان نا.
بێدەنگییەکی زۆر باڵکێش بوو. لەسێدارەدانەکانیش وەستابوون، تەقە لە هیچ ئایەتوڵلایەکی دیکە نەکرا. هەمووان ماندوو ببوون، هەر هەمووشیان پێویستیان بە پشوویێک هەبوو.

## پێشقەڕەوڵەکان

**وَالطُّورِ (١)**
**أَفَسِحْرٌ هَذَا أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ (١٥)**
**وَكِتَابٍ مَّسْطُورٍ (٢)**
**فِي رَقٍّ مَّنشُورٍ (٣)**
**وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ (٤)**
**وَالسَّقْفِ الْمَرْفُوعِ (٥)**
**وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ (٦)**
**فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ (١١)**
**وَالطُّورِ (١)، وَالطُّورِ (١)**
**{بەکێوی توور،**
**ئاخۆ ئەمە جادووە، یان ئێوە کوێربوونە و نابینن؟**

بە کتێبێ کەنووسراوە،
لە کەوڵ بڵاوبۆتەوە،
بەماڵە ئاوەدانەکە،
بەو بانەی بڵندکراوە،
بەو دەریایەی بڵق دەدا،
ئیتر ئەو ڕۆژە هاوارە لەو کەسانەی بێباوەڕبوون.
بەکێوی توور، بەکێوی توور...}

ئەرێ چەند ساڵ هاتن و تێپەڕین؟ ئەرێ چەند مانگ ڕابردن؟
ئەرێ کێ ڕۆیشت و نەما؟ کێش هات و پەیدابوو؟



ئیدی ساڵەکان نەدەژمێردران و هەژمارکردنی پێشوەختەی مانگەکان کەڵکی نەبوو. کات بۆ ئەوانەی بەنێو ناخی ژان وناسۆرەکانیاندا ڕۆچووبوون، لە شوێنی خۆی چەقی بوو، بۆ ئەوان مردووەکان هەبوون، بۆ ئەوان هەر ماتەم بوو.

هەروەهـــا بـــۆ ئەوانەی باخچەکانیـــان پێمەڕەدەکـــرد تـــا لەگەڵ ژانە بە سوێیەکانیان ڕابێن، بۆ ئەوانەش لە ناندیندا حەلوای خێریان دروست دەکرد و تا خەمەکانیان بە دەفری بچووک بچووک بەسەر دەروجیرانانـدا دابەش بکەن.

وڵات وادیاردبوو هاتبێتەوە سەرخۆی، بەڵام کەسێک کە بە خۆی و دەمانچە سوارکراوەکەی ژێر پشتێنی[192] بەسەرپشتی حوشترێکەوە هەدادانی نەبوو، دەشتودەر بە دوای دادگاییکردنی دادورەکەدا دەگەڕا.

پاشان لەوانەبوو کۆتایی بە ماتەمییەکە هاتبا. ئیدی هەر هەر ئەودەم، کات نۆژەن دەبووەوە. ئێمە ئەوە دەبینین، کە بە چەندان ساڵ هاتن و تێپەڕین کاتێ کە ئەوان هاتن و ڕۆیشتن.

•

---

[192] لێرەدا مەبەست قایشی کەمەرە.

لە ماوەی خامۆشییە باڵکێشەکەدا، خومەینی بەرەبەرە یادەوەری خۆی لەدەست دا. ئیدی ئەو ڕۆژە هات، کە خۆی نەیتوانی کەسە نزیکەکانی دەوروبەری خۆیشی بناسێتەوە.

ڕەفسەنجانی و خامنەیی، دوو کاربەدەستی گرنگ بوون، دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرت و خومەینیان ناچارکرد بکێشتەوە دواوە.

خالخالی یەکەمین کەس بوو، بۆی دەرکەوت، خومەینی وڕێنە دەکا.

ئیدی لە پاڵیدا کڕنووشێکی برد، کاتێ زانی نایناسێتەوە هێدمەی گرت.

خالخالی تاکە کاربەدەستێک بوو، وەک درێژەپێدەرێکی خومەینی، سەربە خۆییانە کارەکانی خۆی ڕادەپەڕاند. لە ڕێی ئەوەوە دەسەڵاتدار بوو، بەبێ ئەویش هیچ نەبوو، ئیدی هەنووکە کاتی هات، جێگەکە بۆ یەکێکی دیکە چۆڵبکا.

سەربارى ئەوەش، کاتی لەسێدارەدانەکان کۆتایی هاتبوو، ڕژێم ڕووخسارێکی دیکەی نیشاندەدا. ئەوان داگیرکەرە عێراقییەکانیان لە سەر خاکی وڵات وەدەرنابوو، هەموو ناحەزەکانیشیان لەناوبردبوون. هیچ مەودایەک بۆ دادوەرێکی قێزلێهاتووی وەک خالخالی نەمابۆوە.

دەبوایە کارێکی دیکەی بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام خۆ ئەمەش شتێکی ئاسان نەبوو. دەمودەستیش ژمارەیەک لە ئەندامانی موجاهیدین و کۆمەڵە و گرووپە چەپیگەراییەکان بە ڕۆڵە نەگریسیەکەی خالخالیان دەزانی، کە چ جۆرە تاوانێکی سامناکانەی کردووە. لە هەموو لایەکەوە بۆی لە بۆسەدابوون، تا لەناوی بەرن.

خالخالی بە خۆی زۆری پێخۆش بوو، بگەڕێتەوە قوم، تا لەوێ دەرسی دادوەری ئیسلامێتی بڵێتەوە، کەچی ئەمەشیان هەر ئەستەم ببوو.

ئەو پەی بەوە بردبوو، کە کۆتایی ئەرکە ئیسلامییەکەی هەروەک خومەینی نزیکبۆتەوە.

خومەینی هێشتا نەمردبوو، بەڵام لە مێژە بەمردوو دادەندرێ. خالخالیش نەوەک هەر پاشەڕۆژی نەبوو، بەڵکو لە ئێستاشیدا جێگەی بۆ نەمابۆوە. ئەو دەبوایە بگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو، لێ پرسەکە ئەوەبوو چۆن چۆنی بۆی بگەڕێتەوە.

خۆشبەختانە مریدەکانی خومەینی زانیان چۆن خالخالی بگەڕێننەوە ڕابردوو.
لەو سەردەمدا تالیبان لە ئەفغانستانی ولاتی دراوسێیاندا، خەریکی دامەزراندنی حوکمێکی ئیسلامییانە بوو. ئەوان توندوتیژییەکی زۆریان بۆ چەسپاندنی شەریعەتی ئیسلام لە ئەفغانستاندا بەکاردەهێنا.
ئایەتوڵلاکانی ئێران پەیوەندییەکی تۆکمەیان لەگەڵ تالیبانەکاندا هەبوو، بەردەوام لەگەڵ یەک کۆدەبوونەوە تا پێگەی یەکدی لە بەرامبەر نەیارە ڕۆژئاواییەکان بەهێزبکەن.
ڕژێم هاتە سەر ئەو بیرۆکەیەی، خالخالی وەک دیاری پێشکەشی تالیبان بکا، ئەمەش بۆ تالیبانە توندڕۆکان واتایەکی بەجێی دەگەیاند.
شتەکە چارەسەرییەکی بێ وێنە بوو، خالخالیش لە ناخی دڵیەوە پێی قایلبوو. ئاخر ئەو پەرگیرییەی تالیبانەکانی زۆر بەدڵ بوو، ئیدی بوخچەکەی خۆی پێچایەوە و بە نەناسراوی وەک بازرگانێک بە خۆی و شەپقەکەی و ڕدێنێکەوە بە سواری قەتار تا سەر سنووری شاری مەشهەد ڕۆیشت.
شەو لە خانێک مایەوە، بۆ ئێوارەی پاشتر شەرکەرێکی تالیبان هات لەگەڵ خۆی بیبا. لەوێ جلی ئەفغانی پۆشی، لەگەڵ پیاوە ئەفغانیەکەدا سنووری ئەفغانستانی بەرەو کابول بڕی. لەوێ لە لایەن سەرکردەی تالیبانەکان پێشوازی لێکرا و خانوویێکی لە کابول پێدرا.
ژیانی خالخالی لەوێ بە تەواوی گۆڕا، گەیشتبووە گۆمە مەنگەکەی خۆی.
بە فەرمیش لە ئەرشیفخانەی دەوڵەتەوە کارێکی پێدرا، بەڵام بەنهێنییەوە پیاوێکی گرنگ بوو بۆ سەرکردایەتی تالیبانەکان.
لەو شارە کە نەناسراو بوو، سوودی وەرگرت، ئەو بوارە گونجاوە هێمنەی هەبوو تا لەبواری شەریعەتی ئیسلامییدا باشتر قووڵبێتەوە. هەموو ڕۆژەکەی بە دیار کتێبخانە کۆنەکەی ئەرشیفی شارەکەوە خەریکبوو، لە بەڵگەنامە ناوازە ئیسلامییەکانی دەکۆڵیەوە، نەخاسمە ئەوانەی لە کتێبخانە شاهانەکەی عەرەبستانی سعودییەوە هێندرابوون. دوای چەند مانگێک ژنێکی ئەفغانیشی هێنا و کەوتە نێو ژیانی خێزانداریییەوە.
ئەو بەختیار دیاربوو، ژیانە نوێکەی پێخۆش بوو. ئازادانەش بەناو شارەکەدا دەسوڕایەوە، بازاڕی دەکرد، شتێک کە پێشتر هەرگیز نەیکردبوو. هەروەها

بەردەوامیش سەردانی ماڵە خەزوورە ئەفغانییەکەی دەکرد. کەسیش دەربارەی ڕابردووەکەی نەدەزانی، ئەو خۆی بە لێکۆڵەرەوەیەکی ئیسلامی دانابوو، کە بە مێژووی ئیسلام سەرقاڵە و تا لەو بابەتە شتێک بنووسێ.
ئەوەی لەحیسابی خۆی دانەنابوو، ئەوەبوو، کەسێک هەبێ بەدوایدا بگەڕێ، بەڵام خۆ خەڵکانێک هەبوون هەرگیز تاوانەکانی ئەویان لەبیرنەدەچۆوە.



شاباڵ یەکێک لەو کەسانەبوو بەدوای خالخالیدا دەگەڕا. بەڵام سەروسۆراغی پێهەڵنەگیرابوو.
لە ڕاستیدا تەنها سێ ئەندامی سەرکردایەتی حزبەکەی شاباڵ مابوونەوە. باقیەکەی، گیرابوون، لەسێدارەدرابوون یان هەڵاتبوون. لە دوا کۆبوونەوەی بە پەلەی ئەوانەی مابوونەوە، شاباڵ ئەرکی ئەوەی پێسپێردرا، خالخالی لەناوببا. دواتر دەرکەوت کە ئەوە دوا بڕیارە پارتەکەیان دابێتی. شاباڵ دەیەویست هەر بە خۆی لەبەر کوشتنی جەواد، تۆڵە لە خالخالی بکاتەوە. ئاخر ئەو، ئەو لێگەڕانەی ئەوێ شەوێ، بەو سەرماو ترسە، کە بە دوای گۆڕێک بۆ جەواد لە شاخەکان دەگەڕان، نەیدەتوانی لەمێشکی خۆی بباتەدەر. سووکایەتییەکەی بۆ قوت نەدەدرا. دەبوایە شتێک هەر بکا، دەنا خەوی لێحەرام دەبوو. دوای ئەوەی تۆڵەی خۆی دەکاتەوە، ئینجا دەیتوانی سەرەداوی ژیانێکی نوێ هەڵوێزنێتەوە.
لە کاتی چالاکی لەناوبردنی ئایەتوڵلاکەی زەنجاندا، کەس لە ماڵباتەکەی ئەو نەیدەزانی چۆتە کوێ. ئاغاجان وایدەزانی، وڵاتی جێهێشتووە، پێیوابوو لە شوێنێک لە ئەوروپا یان ئەمریکا گیرساوەتەوە.
بەڵام شاباڵ نەڕۆیشتبوو. ئەو هێشتا هەر لەتاران مابۆوە. ڕدێنێکی بەردابۆوە، وەک شوفێری تاکسی لەو هەزاران تاکسییە نارنجییانەی شار کاریدەکرد.
پارتە ژێرزەمینییەکان لەبەر پرسی ئاسایشی خۆیان، ترومبێلی تایبەتییان بەکارنەدەهێنان. زۆر جاران چەندان تاکسییان هەبوون و ئیدی بۆ هەموو لایەک هەر بەتاکسی دەڕۆیشتن.

شاباڵ لەو کاتەی لەدەستەی کارگێڕی پارتەکەی بوو، تاکسی هەبوو. ئەو تاکسییەکەی وەک هۆیەکی گواستنەوە بەکاردەهێنا و هەندێ داهاتیشی پێپەیدادەکرد. لەبەر پرسی سەلامەتی، چیدیکە ئەندامانی پارتەکەی کۆنەدەبوونەوە. لێ لە چایەخانەکانی بازاڕی تاران یەکدییان دەدی.

لە میانەی ئەو دیدارانەیاندا، شاباڵ بیستی، کەوا خالخالی چۆتە کابول.

- "دەبوایە بمزانیبووایە." ئەمەی بە حەپەسانێکەوە گوت؛ "باشە چۆن ئەو زانیارییەتان دەستکەوت؟"

- "پارتی تودە." یەکێک لەوان دوای کورتە دیدارێک وای پێگوت و پارچە کاغەزێکیشی پێدا، کە ناونیشانەکەی لەسەربوو.

کەواتە پارتی تودەش لەبارەیەک هەڵوەشاوەتەوە. ڕژێم ئەوانیان بنخەم کردبوون. بەڵام ئەندامە کۆنەکانی ئەو پارتە کۆمۆنیستە هەوادارەی ڕووسیا، هەمیشە پەیوەندی بە کۆمۆنیستەکانی دەوروبەر، بە یەکێتی سۆڤیەتەوە هەر هەبووە و ماوە.

کەواتە شاباڵ زانی کە چ ئەرکێکی کەوتۆتە سەرشان.



لە ماوەی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان لە ئەفغانستاندا، گرووپە ژێرزەمینەییە ئێرانییەکان پەیوەندییان لەگەڵ هەوادارە ئەفغانییەکان پەیداکردبوو. کاتێکیش تاڵیبان دەسەڵاتیان گرتەدەست، کۆمۆنیستەکان ڕایانکردە یەکێتی سۆڤیەت. بەڵام زۆریشیان هەر لە وڵات مابوونەوە. چەند مانگێکی خایاند تا شاباڵ توانی کاروبارەکانی خۆی لەگەڵ کۆمەڵەیەکی ئەفغانی ڕێکبخا، تا ئاودیوی ئەفغانستانی بکەن. ئەو سواری حوشترێک بوو، بە تاریکی بەنێو بیاباندا بە ئاراستەی مەرزی ئەفغانستان ڕۆیشت، لەوێش ئەفغانییەک بە خۆی و ماتۆرەکەی چاوەڕێی دەکرد.

کاتێکیش گەیشتە سەر تخووب، حوشترەکەی بردە تەویلەی حوشترانی خانێک لەوێ، بە پێیان تا ئەو شوێنە چوو، کە ئەفغانییەکە لەودیو تەلبەندی تێلدڕی سنوورەوە چاوەڕێیدەکرد. کاتێکیش وشەی نهێنییان لەگەڵ یەکدیدا گۆڕییەوە، ئەفغانییەکە ئاماژەی بۆکرد لەسەر زگ بەبن تێلدڕەکەدا بخشێ و بپەڕێتەوە.

ئیدی شابالْ لە پشتی ماتۆڕوانەکە سواربوو و تیێیتەقاند. دوای نیو سەعاتێک، ئەفغانییەکە لای شوانێک وەستا. لە ڕەشماڵی شوانەکە چووە ژوور، دەستە جلێکی نەریتییانەی ئەفغاستانی بۆ هێنا. کاتێکیش شابالْ خۆی گۆڕی، خێرا بەرەو یەکەم گوند لێیانخوڕی، لەوێشەوە بۆ بەیانی بە سواری پاسێک بەرەو کابول ڕۆیشت.

هێشتا هەر پایز بوو، بەڵام بەفر لووتکەی شاخەکانی داپۆشیبوو، بایە ساردەکەش ڕوومەتی دەتەزاند. پیاوەکە نانی گەرم و هەندێ خورمای بۆ شابالْ کڕی لەناو پاسەکەی دانا.

دوای گەشتێکی پێنج سەعاتی بەنێو شاخاندا، لەکۆتاییدا پاسەکە گەیشتە ناوەندی شاری کابول.

شابالْ لە پاسەکە دابەزی و بەرەو چایەخانەیەک ڕۆیشت تا نان و چایەک بخوا. ئەو سوپە چڕە ئەفغانییێکی داواکرد و یەک دوو چای گەرمیشی بەسەرداکرد.

ئاخر، سێ شەوی ڕابردوو بە ئاستەم چاوی چووبوونە خەو، بۆیە چووە هوتێلێکی نزیک چایەخانەکە و یەکسەر چووە بن جێگا و بەتانی بەخۆداد و لێکەوتەخەو.

بۆ بەیانییەکەی بێدارکرایەوە، پێشخزمەتی هوتێلەکە لەقاپی ژوورەکەی دا، بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ سەلامەتە.

ئەو پێویستییێکی زۆری بە خۆشوشتن هەبوو، بەڵام هوتێلەکە هیچ گەرماوی تێدانەبوو. بۆ گەڕان بەدوای گەرماوێک، مزگەوتێکی دۆزیەوە. لەوێ بەباشی خۆی شوشت و ئینجا بەرەو لۆقەنتەیەک چوو تا بەرچایییەک بخوا.

ئەرشیفخانەی دەوڵەت، ئەو شوێنەی خالخالی ئیشی تێدادەکرد، هەر چەند شەقامێک لە وەوە دووربوو. ئەرشیفخانەکە بۆ جەماوەر کراوە نەبوو، بەڵام لەپشت جامەی پەنجەرەکانی کزە ڕووناکییێک دیاربوو.

ژووری کاری خالخالی لە نهۆمی سەرەوەدا بوو. ئەو لەوێ بەتەنیا دادەنیشت. مێزەکەی لەبەردەم پەنجەرەکەدا بوو، خۆ ئەگەر سەری هەڵبڕیبا، خەڵکەکەی سەر شەقامەکەی دەبینی. ئەویش هەر وەک باقی کارمەندان، بەیانییان زوو دەهاتە سەرکار، بەڵام کاتێک ئەرشیفخانەکە لە سەروبەندی

سەعات چواردا دادەخرا، سەعاتێک زیاتر دەمایەوە و دوا کەس بوو باڵەخانەکەی جێدەهێڵا.
کاتێک خالخالی لە باڵەخانەکە هاتەدەر، هەرچەندە جلی ئەفغانیشی لەبەردابوون، بەڵام شاباڵ دەمودەست ناسییەوە. هەندێک قەڵەویش ببوو، بەڵام شێوازی ڕۆیشتنەکەی هەروەک جاران بوو. تازە تاریک داهاتبوو، کە شاباڵ بەدوای خالخالیدا بۆ لای نانەواخانەکە ڕۆیشت. خالخالی نانی گەرم و تازەی کڕی و خستییە بن هەنگڵ و بەرەو ئەو عارەبانەیە چوو، کە دوا بەری ترێی پایزەی دەفرۆشت. هەندێ ترێشی کڕی و بەرەوماڵ بووەوە.
شاباڵ تا ماڵەوە وەکو سایە لە دوای خشا. ئیدی ماڵ و دەوروبەرەکەی پێزانی و گەڕایەوە هوتێلەکەی. ئەو دەیەویست لەکاتێک بەسەر خالخالیدا بدا، بەتەنها لە ماڵ بێ، بەڵام کاتێ بۆ شەوی پاشتر لەبەردەم پەنجەرەی ماڵیان وەستا، بینی خالخالی لەگەڵ ژنە نوێە ئەفغانییەکەی لە ژوورەکە دانیشتوون و نان دەخۆن. شاباڵ نەیدەتوانی زیاتر چاوەڕێ بێ، خۆی دەبوایە زوو کارەکەی جێبەجێ بکا، بەرلەوەی دەزگای هەواڵگری نهێنی ئەفغانی پێیبزانن.
ئیدی پێچێکی بە دەوری ماڵەکە لێدایەوە، دەرفەتی ئەوەی بە خالخالی دا، نانەکەی خۆی بخوا. کە جارێکی دیکە هاتەوە بەردەم پەنجەرەکەی، بینی خێزانەکەی لە ناندینەکەدایە. گڵۆپی نهۆمی دەرەوە داگیرسابوو. ئیدی هەلەکەی لەبەر پێی خۆی بینی، بە هێواشی لە ڕێی پەنجەرەکەوە خۆی گەیاندە ناندینەکە. ژنەکە خەریکی هیربار[193] شوشتن بوو. ئافرەتەکە خۆی سوڕاندەوە، بینی پیاوێکی چەکدار لەبەردەم قاپیەکەدا وەستاوە، بەڵام بەرلەوەی دەرفەتی هاوارکردنی هەبێ، شاباڵ گرتی؛ دەستێکی لەسەر دەم دانا و بە چرپەیەکەوە پێیگوت: 'ئارام بە! من هیچ ئازارت پێناگەیەنم. گوێم لێبگرە، پیاوەکەی تۆ تاوانبارێکی ئێرانییە، ئەو سەدان بێخەتای لەسێدارە داون. خۆ ئەگەر لە شوێنی خۆت بێدەنگ بی، سەلامەت دەردەچی. تۆ لە فارسییەکەی من حاڵی؟'
ئافرەتەکە بە هێدمەوە سەری بۆ لەقاند.

[193] قاپوقاچاخ، دەفر و ئامان.

- "من کاتم بەدەستەوە نییە، من دەمت دەگرم و دەستەکانیشت توند دەبەستمەوە. تۆ نابێ بجوولێی، هەر جوولای، تەقەت لێدەکەم و دەتکوژم. لێم تێدەگەی؟"
ئافرەتەکە دیسان سەری بۆ لەقاندەوە.
- "زۆر باشە،" وای گوت و ژنەکەی توند بەستەوە. ژنەکەی لەسەر ناوکەوی ناندینەکە درێژکرد، بە خۆیشی بە هێواشی لە پەیژەکان وەسەرکەوت، بۆ هۆدەکەی خالخالی چوو.
لە سەرەوەی پەیژەکان، دەمانچەبەدەست لە درزی دەرگاکەوە سەیری ژوورەوەی کرد. خالخالی لە پشتی مێزێک دانیشتبوو، چاویلکەی لە چاودابوو، کتێبێکی دەخوێندەوە و تێبینیشی لەسەر دەنووسین.
شابال بەهێورەیی دەرگاکەی کردەوە و لێچووەژوور. خالخالی پێیوابوو ژنەکەیەتی چای بۆی هێناوە، بۆیە هیچ سەریشی هەڵنەبڕی. لێ کاتێ بەرامبەرەکە هیچی نەگوت، ئیدی چاویلکەی لەچاو کردەوە سەیری لای دەرگاکەی کرد، بینی پیاوێکی ئەفغانی چەکدار لەوێ وەستاوە.
- "نەجوولێی!" شابال وای بانگکرد.
شێوە فارسییەکەی ئاشکرابوو، ئیجا زانی بەرامبەرەکەی ئەفغانی نییە. بە حەپەساوییەوە سەیری شابالی کرد.
شابال شەپقە ئەفغانییەکەی داکەند و بە دەنگێکی ساردەوە پێیگوت: "موحەمەد خالخالی! ئەوەی پێیدەگوترێ دادوەرەکە! دادگای ژێرزەمینی منی راسپاردووە تا بڕیاری لەسێدارەدانت بەسەردا جێبەجێبکەم!"
خالخالی شابالی ناسییەوە، لێی تۆقی، ویستی شتێک بڵێ، بەڵام زمانەکەی گۆنەکرد. ئەمەش کۆتاییەکەی بوو، هیچ شتێک دادی نەدەدا. ورتەیەکی لەدەم هاتەدەر.
- "من لێت تێناگەم."
ئەو ئاماژەی بە پەرداخە ئاوێکی سەر مێزەرکە کرد.
- "دەی بخۆرەوە!" شابال وای بانگ کرد.
بە دەستی لەرزۆکەوە قومێکی لە پەرداخە ئاوەکە دا.

- "دەکرێ ڕووم لەمەککە بکەم؟ دواتر ئەمەی بە دەنگێکی خەفەبووەوە گوت.

- "دەکرێ!"

خالخالی هەڵسایەوە. هەنگاوێک بەرەو پەنجەرەکەی هەڵێنا، بەو تاریکییە بە ئاراستەی مەککە وەستا و منگەمنگێکی لێوەهات:

**وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ (٢٧)**
**وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ (٤١) الواقعة**

**{ئەوەی تیرەی دەستەڕاستن' ئەوان چۆن بەختەورێکن؟**

**ئەوانەش کە دەستەی چەپن، تووشی چ نەگبەتییێک هاتوون؟}**

شاباڵ گوللەیەکی لە سینگی خالخالی دا.

خالخالی بەلاداهات، بەڵام خۆی بەچوارچێوەی پەنجەرەکە گرتەوە، زیاتر ورتەی لێوەهات:

**يَا أَيُّهَا الْإِنْسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ (٦) الانشقاق**
**إِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ (١)**
**وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انْتَثَرَتْ (٢) الانفطار**

**{ئەی مرۆ! ڕەنجی زۆر دەدەی بگەی بە پەروەرێنی خۆت، سا تووشی دێی.**

**هەرگا کە ئاسمان قەڵەشا،**

**کاتێکیش ئەستێران وەرین،}**

شاباڵ دوو فیشەکی دیکەشی پێوەنان.

خالخالی دەستی لە چوارچێوەکە بەربوو، تەپەی لە زەوەیەوە هێنا.

لە کاتێکدا لەسەر زەوی دەگەوزی، ورتەی دەمی هەر دەهات:

**وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ (١٠)**
**أُولَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ (١١)**
**فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ (١٢) الواقعة**

**{تیرەیەکیش لەپیشەوەن، وەپێش کەوتوون،**

**کە ئەوانە لە ئێمەوە نزیک کەوتوون،**

**لەباغاتی تژی لەخۆشیدا دەژین.}**

شاباڵ خێرا هاتەخوار، دەست و پێی ژنەکەی کردنەوە و پێیگوت: "دەی بڕۆوە ماڵە باوانت!"

ئافرەتەکەش بەلەز لە ماڵ دەرپەڕی.

شاباڵماڵەکەی جێهێشت، بە دەستەچەپ وەرسوڕا و بەهێواشی چووە سەر شەقامەکە. لەوێ بە تاریکیی بە کۆڵانەکان خۆی گەیاندە ناوەندی شار. لەوێ نانێکی گەرم و چەند وشییە ترێی کڕین و سواری پاسی شەوانە بوو، بەرەو پاکستان کەوتەڕێ.
پاسەکە بەنێو شەقامە نیوە ڕووناکەکانی کابولدا لێیخوڕی. شارەکە جوان بوو. لەبەرخۆیەوە گوتی: تۆ بڵێی ڕۆژێک دابێ بگەڕێتەوە ئەو شوێنە تەلیسماوییە.

## باخچەکانی بەختەوەری

**ئەلیف لام میم ڕا.** سالان هاتن و ڕۆیشتن، خەموخەفەتی ماڵەکەش هەر وەک درەختی باخچەکە گەشەیان کرد.
دەمێکە بارمتە ئەمریکاییەکان لەنێو ماڵ و حاڵی خۆیان دەخەون. خومەینیش کۆچی دواییکرد.
جەنگەکە کۆتاییهات و ئەمریکاش کە هیچی لە سەدام نەچنییەوە، فڕۆکە چاودێرییەکانی[194] گەڕاندەوە سەر زەوی.
ڕەوە باڵندە کۆچبەرەکان وەک هەمیشە هاتنە شار و بەسەر خانووەکەی مزگەوتیدا فڕین. لێ لەبەر ئەوەی هیچ دانێکیان نەبینی ڕووکرابێ، نەنیشتنەوە و درێژەیان بە گەشتە فڕینی خۆیان دا.
کیژەکانی ئاغاجان لە تاران دەژیان، ئەوان لە ساڵە سەختەکانی جەنگ و لە سێدارەداندا بە بێدەنگی شوویان کردبوو. ئەنسی کوڕێژگەیەکی پەیدابوو، بەناوی جەوادیان کردبوو. بەردەوامیش لەگەڵ مێردەکەی دەگەڕایەوە خانووەکە و جەوادی لە باوەشی فەخری سادات دادەنا. فەخریش کە پیوابوو، هەرگیز بەسەر خەموخەفەتەکەیدا زاڵ نابێ، منداڵەکەی ماچ دەکرد و لە کۆتاییدا گوتی: "ئەرێ ئاغاجان، ئەوە لە کوێی، دەی وەرە سەیری کە، تەواو لە جەواد دەچێ!"

---

[194] مبەست فڕۆکەکانی ئەواکسە.

قەلە پیرەکە گوێی لە فەخری بوو، سوورێکی بەسەر ماڵەکەدا لێدایەوە. ماسیە بە تەمەنەکـانیش لەنێـو حەوزەکەدا بە بەختـەوەری جرتوفرتیـان بـوو، پیرەدارەکەش قەدی پشتی ڕاست ڕاگرتبوو پێدەکەنی، مەلەکان هاتنەوە سەر بانەکە نیشتنەوە، بایەکەش کە تازە لە شاخەکانەوە هەڵیکردبوو، گەیشتبووە ئەوێ، بۆنی گوڵ و گوڵوکە کێویلکەکانی لەگەڵ خۆی هێنابوو. ئاغاجان چاکەتەکەی خۆی کردەوەبەر، کڵاوشاپۆکەی لەسەر نا، دەستی دایە گۆپاڵەکەی بە دڵشادییەوە بەرەو بازاڕ ڕۆیشت تا پاکەتە کێکێکی تازە بکڕێ.
ئەرێ کەی بوو دواجار بە شادمانییەوە پاکەتە کێکێکی کڕیبوو؟
هێشتا هەر لەبیری مابوو، ئەو ڕۆژە بوو، کە دادەکان بۆ حەج چوونە مەککە.



لە ڕۆژێکی بەهاری دڵڕفێندا، ئاغاجان ترومبێلە فۆردە کۆنەکەی لە گەراج دەرهێنا و هەر بۆیەکەم جار خۆی شوشتی و لەبەردەم دەرگای ماڵەوەی ڕاگرت. جانتای فەخری ساداتی لە پشتەوە بارکرد و یارمەتی ژنەکەی دا تا سوار ببێ، بە خۆیشی چووە پشتی سووکانەکە، لێخوڕە بۆ جیریا.
جاران هەموو ژنەکانی گوندی جیریا، بە گەنج و پیرییانەوە، مافووریان بۆ ئاغاجان دەچنی. لە گوندەکەدا وەک شازادەیەک پێشوازی لێدەکرا. بەڵام ئەو ڕۆژەش هەبوو، هەر گوندییەکان هیچ گوڕێکیان بە کوڕەکەی ڕەوا نەبینی.
بۆ خۆشبەختی ئەو ڕۆژە تەنگانانە بەسەرچوون، چونکە کاتێک ترومبێلەکەی لە مەیدانی گوندەکە ڕاگرت و بە خۆی و فەخری ساداتی هاوسەری بەپێ لە مەیدانەکە تێپەڕین. گوندییەکان ڕێیان بۆچۆڵکردن و بە ڕێزەوە بەخێریان هێنان.
هەنووکە شەپۆلی توندوتیژی بەسەرچووە، جەنگ کۆتایی هاتووە، تۆزی شۆڕشەکە نیشتۆتەوە، مرۆ لە هەموو شتێک بۆتەوە. ئەوان بەرهەمی ئەو هەموو ساڵانەی ململانێیان بینی.
لە سۆنگەی ئەو ژمارە زۆرەی کوژراوان و جیاوازی بیروڕای سیاسییانە، شـیرازەی زۆر بنەمـاڵە تێکچووبـوو. زینـدانەکان لە ڕکـابەر و بەرهەڵسـتکارەکانی ڕژێـم پڕبووبـوون. بێکـاری یەکجـار زۆر بـوو، پێداویستییەکانی ژیانیش کورتهێن بوون.

ئاغاجان هەرگیز دەنگوباسی ئەوێ شەوێ، کە چی لە گوندەکە قەوما، بە فەخری سادات نەگوتبوو؛ بەلام فەخری لە ڕێی خانەوادەکەیەوە زۆر چیرۆکی لەو بارەیەوە بیستبوون.

- "من هێشتا لەوە تێناگەم، چۆن خەڵک بە ڕۆژێک و دوو ڕۆژ دەگۆڕێن."

کاتێ فەخری دەچووە ماڵەکەی پێشووی دایبابی وای بە ئاغاجان گوت.

- "ئاخر ئەوانە کەسانی سادەن و نزیکەی هەموویان نەخوێندەوارن. شا هیچی بۆ ئەوان نەکرد و ئایەتوڵلاکانیش لەو باشتریان بۆ نەکردن. من لەوان ناگرم. وێڕای ئەوەش ڕەگوڕیشەی ئێمە بەقووڵی لێرە لەم خاکەدا، ڕۆچووە، مردووەکانمان هەر هەموویان لێرەدا نێژراون. خۆ ئەگەر باش بێ ئەوا بە هۆی ئێمەوەیە، ئەگەر خراپیش بێ، هەر بۆ ئێمە دەگەڕێتەوە."

ئەو قەڵا کۆنینە کە هەمیشە جاران لەوێ دەمانەوە، هەنووکە لە لایەن سوپای ئیسلامییەوە داگیرکراوە. بۆیە شەوی یەکەم لە ماڵە کۆنەکەی باوانی فەخریدا مانەوە، کە هەنووکە خوشکە بچووکەکەی تێدا دەژیا.

بۆ ڕۆژی پاشتر سەردانی ماڵی کازم خانیان کرد. بە تەنیشت یەک بە بن دارە بادەمەکاندا دەڕۆیشتن، کە بە یەک پارچە خونچەی نەرمونیان داپۆشرابوو. چۆلەکەکانیش ئەوەندە شادمانانە دەیانخوێند، وەک ئەوەی بیانەوێ بە کۆتاییهاتنی خەمەکان، ئاهەنگ بگێڕن. بەشە کۆنەکەی گوندەکە هیچ نەگۆڕابوو، بەلام کوڕ و کچە تازە پێگەیشتووەکان، خانووی نوێیان لەسەر گردۆڵکەکان دروستکردبوون. جیریا بە مافوور و زەعفەران بەناوبانگ بوو. ئەو زەعفەرانەی لە گردەکانی دەوروبەری گوندەکە شین دەبوو، زۆر بۆندار بوو. خۆ ئەگەر جاران بە سواری ئەسپ چووبایە ماڵی کازم خان، ئەوا بەدەر لەیەک پارچە زەعفەرانی زەرد کە هەموو گردەکانی داپۆشیبون، هیچی دیکەت نەدەبینی. هەنووکە سەد خانووێک لەسەر گردە نزمەکان قیت کراونەتەوە. لەسەر گردە هەرە بەرزەکەشدا و لەڕۆژگاری شادا، خەریکبوون عەمباراوێکی لێ دروست بکەن، بەلام دواتر هیچی لێ پێکنەهات.

- "دارودرەختەکان پیربوونە." فەخری سادات بوو وای گوت.

- "منیش پیربووم." ئاغاجانیش وا وەڵامی دایەوە.

بەر لەوەی کەشەکە سارد بێ، هەموو کیژوکارەکانی گوند بەو گردانەدا هەڵدەگەڕان تا بەری زەعفەران بڕنن، کە بە زێڕ هەڵدەکێشرا. کاتێکیش بە دەستی زەردهەڵگەڕاوە دەهاتنەوە و بۆنی زەعفەرانیان لێدەهات، گۆرانی خۆش خۆشیان دەچڕی.

کیژەکانی جیریا داواکاری زۆریان لە گوندەکانی دیکەوە بۆ دەهاتن، بەڵام پێشیان زەحمەت بوو دەستیان لە گوندەکەیان بەربێ.

لە میانەی زستانە دوورودرێژە سارد و سەختەکاندا، کچان بە ڕۆژ و شەو لە کونجی ماڵ دەمانەوە، مافووریان دەچنی. کاتێکیش بەهار دادەهات، پەنجەرەکانیان دەکردنەوە گوێت لە گۆرانی و حیتەی پێکەنینان دەبوو. هەنووکەش پەنجەرەکان کراوەن، بەڵام گوێت لە هیچ نییە، ئاخر بۆیان نەبوو چیدیکە گۆرانی بچڕن.

ئاغاجان و فەخری سادات بە هێواشی بەلای دارگوێزەکان بەرەو ماڵی کازم خاندا دەڕۆیشتن. خانووەکەش لە بەرزاییێک لە بەرامبەر گردی زەعفەران هەڵکەوتبوو.

لەوێ لە دوورەوە دوو سوار دەرکەوتن، ئەوان بە گورکەلۆقە بەرەو ڕوویان دەهاتن. چەند مەترێک لە دووری ئەوانەوە لە ئەسپەکانیان دابەزین، لغاوی ئەسپەکانیان گرتن و بەرەو ڕووی ئاغجان هاتن. پیاوەکان بە یەک دەچوون، هەندێ چەمانەوە و سڵاویان لە ئاغاجان کرد. زیاتر لەوە هیچی دیکەیان نەگوت.

ئاغاجان ئەوانی نەناسینەوە، بە پرسیارەوە ئاوڕێکی لە فەخری سادات دایەوە: "هەر وەک پێمگوتی، ئەوانە دوو کوڕە کەڕولاڵەکەی نۆکەرە کۆنەکەی کازم خانن." فەخری بە خەندەوە وای بە ئاغاجان گوت.

ئاغاجانیش سڵاوی لە پیاوەکان کردەوە و بە ئاماژەی دەست لە هەواڵی ژن و منداڵەکانیانی پرسی.

پیاوەکان هەر بە ئاماژە وەڵامیان دایەوە، کە ئەوان و ماڵەکە باشن و منداڵەکانیش گەورە بوونە.

"ئێمە ئەو ئەسپانەمان بۆ ئێوە هێناوە،" یەکێ لە پیاوەکان بە ئاماژەوە پێیگوتن: "ئێوە بۆ مانەوەی ئێرە پێویستتان پێیان دەبێ."

ئاغاجان بە خەندەوە سەیری فەخری ساداتی کرد و گوتی: "ئەوان ئەسپیان بۆ هێناوی، چی دەڵێی؟"

- "نەخێر نابێ." فەخریش هەر بە بزەوە وەڵامی دایەوە؛ "بۆ تۆ دەبێ، بەڵام بۆمن هەر نابێ. من فەخرییەکەی جاران نەماوم، ناوێرم سواری ئەسپ ببمەوە."

- "ئاخر ژنەکانی ئەوان بانگهێشتیان کردووی سەرێکیان لێبدەی." ئاغاجان وای پێگوت.

- "زۆر باشە، بە خۆشییەوە، بە دڵنیياوە دەچم." فەخری بە هێماوە وای بە پیاوەکان گوت.

پیاوەکان سەری لغاوەکانیان ڕادەستی ئەوان کرد و خۆشیان پیادە بەرەو ماڵەکانیان گەڕانەوە.



خانووەکەی کازم خان وەک گەوهەرێک لەنێو دارەکاندا دیاربوو، خۆ نەشدەکرا شتێکی دیکەبێ، ئاخر ئەوە خانووی شاعیری گوندەکە بوو. گۆڕی کازم خانیش لە کۆتایی باخەکەیدا لەبن دارە بادەمەکاندا بوو، هەمووشی بە خونچەگوڵ داپۆشرابوو.

کاتێک ئەو هێشتا لە ژیاندا مابوو، چۆلەکەکان لەسەر پەلەسواندەی[195] ماڵەکەیدا هەر دەیانخوێند، تا پەنجەرەی ژووری ترياکەکەی دەکردەوە و دووکەڵی تریاکەکە لە بۆریە زۆپاکەوە هەڵدەکشا.

کاتێکیش لە تریاککێشان دەبووەوە، بانگی دەکرد: "دەی وردیلەکان هەنووکە بۆ هێلانەکانتان، شەوشادا" ئیدی مەلەکانیش لە شەقەی باڵیان دەدا و دەفڕین.

ئەو جووتیارە و ژنەکەی کە لەوێ سەپان بوون، هەموو ئامادەکارییکیان بۆ ئاغاجان و فەخری سادات کردبوو. ئەوان هەردووکیان لە باخەکەدا نانیان دەخوارد، دەربارەی کازم خان دەدوان بەوەش پێدەکەنین، چۆن بە شیعرەکانی ئافرەتانی شاخەکانی شێتوشەیدا کردبوو.

[195] پەلەسواندە: گوێسەبانە.

بۆ شـەوەکەش ژنە جووتیـارەکە چـووە لای فەخـری و پێیگـوت: "ئەگەر پێت نـاخۆش نەبـێ، چەنـد ژنێکـی گونـدیی هەن و دەیـانەوێ سـەرێکت بـدەن و سڵاوێکت لێبکەن."

- "کامە لە ژنەکان؟" فەخریش بەسەرسوڕمانەوە وایلێپرسی.

- "ژنەکانی ئەو گوندە، کە جاران مافووریان بۆ ئێوە دەچنی."

ئافرەتەکـان بە جـوانییەکە و ڕەفتـارە شـیرینەکەی فەخـری سـادات سـەرسـام بوون. هەردەم ئەوان کەیفیان پێدەهات.

- "کەی دەیانەوێ بێن؟"

- "ئەگەر تۆ ئامادەبێ، کەمێکی دیکە."

ئاغاجانیش چووە کتێبخانەکەی کازم خان.



سەرەتا چەند پیرەژنێک هاتن، فەخـری ساداتیان مـاچ کـرد و بە کـرِی لەسـەر زەوییەکە دانیشتن. دوای ئەوان دەستەیەک ئـافرەت بەدوای یەکدا هـاتنەژوور، ئەوانیش فەخرییـان مـاچ کـرد و هەریەکە لە شـوێنی خـۆی دانیشـت. فەخـری سەرسام بوو. زۆرینەی ژنەکان ئەوانە بوون، جـاران بـۆ ئەو ئیشـیان دەکـرد، دەمووچـاوی ئەوانــی ناسـییەوە. لە دواییـدا دەسـتە ژنێکـی حەفـت کەسـی هاتنەژوور. ئەوانیش باوەشیان بە فەخریدا کرد، ئەوان کـۆمەڵە کیژێـک بـوون کە جاران مافووریان بۆ دەچنی.

- "ئـای چ سـەرسـامییەکە. بەهـۆی بەسـەرکردنەوەتان دڵـم گەشـایەوە. ئەمەم هیچ کات چاوەڕێ نەدەکرد، وام دەزانی ئێمەتان لەیاد کردووە." فەخـری وای بە ژنەکان گوت.

یەکێـک لە ژنە بە تەمەنەکـان سـەری قسـەی داهێنـا و گـوتی: "فەخـری، ئـێمە دەزانین، لە ڕابردوودا ئازارێکی زۆرت چەشتووە، کوڕەکەی خـۆتـت لەدەسـت دا، ئێمەش گۆڕێکمان پێڕەوا نەبینی. ئێمە بەم شـەوە هـاتووینەتە لات، داوات لێبکەین کۆتایی بە ماتەمبارییەکە بێنی. ئێمە فستانێکمان بۆهێناوی. دەمـانەوێ جلە ڕەشـەکانت بگەڕێنییەوە نێو دۆڵاب و ئەمەمـان لێوەبگری لەبەری بـکەی. خـۆی دەبـوایە زووتـر ئەمە ڕوویـدابایە، ئەوانە سـاڵانی سـەخت بـوون و تێپەڕین."

ژنەکە دەستی دایە فستانیکی گوڵگوڵی و ڕادەستی فەخری ساداتی کرد. فەخریش بە فرمێسکەوە سەیری جلە ڕەشەکانی خۆی کرد. ئەو قسەی بۆ نەهات، بە کڕی دەگریا و دەستیشی بە دەمەوە گرتبوو.

دەیەویست بە خۆی و فستانە گوڵگوڵیەکەی غاربداتە نهۆمی سەرەوە لای ئاغاجان، بەڵام بینی یەک دوو پیاو لە پەیژەکان سەرکەوتن.

ئەوان ڕیشسپییەکانی گوندەکە بوون، جاران بۆ ئاغاجان کاریان کردبوو.

یەکێک لەوان لە قاپی کتێبخانەکەی دا، داوای چوونەژوورەوەی کرد.

"هەڵبەتە!" ئاغاجانیش وا بانگی کرد: "ئێوە بەخێربێن!"

ئەوانیش چوونەژوور و لەسەر کورسییە کۆنینەکان لە لای پەنجەرەکەوە دانیشتن. بۆ ماوەی خولەکێکی ڕەبەق کەس هیچی نەگوت. ئینجا یەکێ لە پیاوەکان کەوتە قسە: "ئاغاجان، نزیکەی هەمووماڵێک لەم گوندەدا، کوڕێکی لەم جەنگەدا تێداچووە. ئەوانە هەموویان ئێستا لە گۆڕستاندان. ئێمە کاتی خۆی ڕێگەمان نەدا گۆڕێک بۆ کوڕەکەت لێرە لەگۆڕستانەکەدا لێبدەی. ئێمە تەرمی کوڕەکەتمان لەنێو وێژدانمان هەڵگرتووە. تکایە لێمان خۆش بە!"

- "هەر خوا زانایە. هەر خواش لێبوردەیە،" ئاغاجان بە دەنگێکی ئاشتەواییانە وای پێگوتن؛ "هاتنی ئێوە خەمەکانم سووک دەکا. من هەمیشە باوەڕم بە لایە باشەکەی خەڵک هەبووە. سوپاسی هاتنتان دەکەم."

پیاوە پیرەکە، کراسێکی سپی دەرهێنا و گوتی: "کاتی ماتەم بەسەرچوو. ئەمەمان لێوەربگرە و کراسە ڕەشەکەشت بخەرەوە نێو دۆلابی جلوبەرگ."



لەناو پێخەفیشدا، فەخری سادات سەری خستە سەر سینگی ئاغاجان و گوتی: "ئای چ شەوێکی خۆشە، من زۆر دڵشادم، دەتوانم دیسان بێمەوە گوندەکەمان."

ئەوان لە جامی پەنجەرەکەوە سەیری ئاسمانی پڕ ئەستێرەیان کرد.

- "ئەوان خۆیان چاککردوە. ئەوان، ئەو گوندییە دێرینانە، خەڵکی بە ئەزموونن. ئەوان ئاوەزدارن[١٩٦]، ئاوەزەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ دابونەریتە دەوڵەمەندەکەی دەڤەرەکە، ئەوان دەزانن چۆن برینە کۆنەکان سارێژبکەن."

- "بەیانی چەند برادەرێکم دێن و خەنەم بۆدەگرنەوە، بۆ بەخت، پرچم لەخەنە دەنێن." فەخری بە جۆشەوە وای گوت.

- "من بەدڵخۆشیت شادمانم! تۆ شایستەی!" ئاغاجانیش وای پێگوتەوە.

ئیدی لە باوەشی یەکدی خەویان لێکەوت.



سەرلەبەیانی دەنگی کێژوولەکان ئاغاجانیان بەخەبەرهێنا. دوای نوێژی بەیانی پیاسەیەکی بەناو باخەکەدا کرد. ئەو کراسە سپییەکەی، ئەوەی گوندییەکان بۆیان هێنابوو، پۆشیبوو، هەستی بە باشی خۆی دەکرد. سەیری لق و پۆپە یەکساڵەی درەختەکانی دەکرد، کە چۆن پشکۆیان داوە، ئیدی هەستی بە هێزوتینی قاچەکانی کرد. قەدەمێکی بۆ لای گۆڕی کازم خان لێدا، لەبەردەم بەردەکێلەکانی نوشتایەوە، دەستی دایە بەردێکی بچکۆلانە، بە نەرمی لە کێلەکەی دا و پارچەیەک لە شیعرەکانی خوێندەوە:

**روزگار است این که گه عزت دهد گه خوار دارد**
**چرخ بازیگر از این بازیچەها بسیار دارد**[١٩٧]

---

[١٩٦] ئاوەزدار: هۆشمەند.

[١٩٧] دێرە شیعرەکە هی (ئەردەشێر بابەکان)ە، تەواوی شیعرەکەش بەم جۆرەیە (وەرگێڕ):

روزگار است این که گه عزت دهد گه خوار دارد
چرخ بازیگر از این بازیچه ها بسیار دارد
آدمی که راه خود را می نهد سوی بساتین
گاه سوی دوزخ این جان عزیزش خوار دارد
گاه در باغ جنان می شد روان در کوی دلبر
که ز مهجوری عیان جان خودش تیمار دارد
عاشق و معشوق را حایل نباشد در دو عالم
جان خود را چون حجاب این آدمی در کار دارد
هست یکتا جلوه معشوق در چشمان عاشق
آدمی در بوستان یک دلبر و دلدار دارد

ڕۆژگارە دەمێ ڕاست و دەمێ خوار
بەزمی وای زۆرە چەرخی گەمەکار



شنەی شەماڵێکی خۆشی بەهاری لە شاخەکانەوە هەڵیکرد. لە هیکەوەش ئاغاجان ئەو خەونەی بە هۆشەنگ خان[198] بینیبووی، بیرهاتەوە.

هۆشەنگ خان کۆنە دۆستێکی بوو، ئەو پیاوێک هەڵۆئاسا لە شاخە بەرزەکان دەژیا. ئەو پیاوە بوو، کە شەوی گوزینێ گەیشتە سەریان، بە خۆی و جێبەکەی لە چیاکان دابەزی و تەرمی جەوادی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و بردی. ئەو لە قەڵایەک، لە گوندەکەی خۆی، دوور لە دێیەکانی دیکە، لە نێو شاخەکاندا دەژیا.

لەو شەوەی کە هۆشەنگ خان تەرمی جەوادی لەگەڵ خۆ بردبوو، ئاغاجان نەگەڕابۆوە ناو شاخەکان. ئەو دەیزانی تا ڕۆژ و کاتی خۆی دادێ، دەبێ ئۆقرە بگرێ.

ئێستاش لەسەر گۆڕەکەی مامی وەستاوە، خەونەکەی بیرهاتەوە. بۆنی یادەوەری جەواد وەک بۆنی هەڵکردووی خونچەگوڵەکان، لەنێو دڵ و دەرونیدا هەڵیکرد.

ئیدی ئەسپێکی لەنێو تەوێڵەکە دەرهێنا و زینی کرد، خۆی هەڵدایە سەرپشتی و ئاوزینگی لێداو بە نەرمەغار بەرەو ساوجبلاخ[199] ملی لێنا.



هۆشەنگ خان حەفتا ساڵێک دەبوو، ئەو کوڕی پیاوێکی خانەدان بوو. نموونەپیاوێکی تایبەت و ناوازە بوو، ئەو نەیدەویست وەک باوکی بێ، لە هەمان کاتیشدا فڕی بەسەر ڕژێمی (شا) شەوە نەبوو.

---

راه مــــا قـــانع شــــدن باشـــد بــــه انـــوار خـــدایی
کـــز تجلـــی هـــــای او جـــــان هــــا نشــــان از یـــار دارد
در طریـــــق عشـــــق هـــــر کــــس راه خــــود دارد ولــــیکن
در طریقت راه ما صد جلوه دشوار دارد

[198] Hoshang Khan

[199] Sawodjbolag

هۆشـەنگ چـوار ژنـی هەبـوون، لەهەر ژنێکیش پێنج منداڵی هەبـوون. ئەو لە نشینگەیەکی تاڕادەیەک سەربەخۆ دەژیا، بە ئاستەمیش پێویستی بە جیهانی دەرەوەی خۆی هەبوو.

هۆشـەنگ خـان جێبێـک، جـووتە تراکتۆرێـک، دەیـان مانگـا، ئەسـپ و مەڕی هەبوون. ئەو کارگەیەکی بچووکی دروستکردنی شـەڕابی لە ژێرزەمینەکەی بۆ بەکابردنەکەی خۆی دانابوو.

ئەو هیچ پەیوەندی لەگەڵ جیهانی دەرەوەی خۆیدا نەبوو، تەنیا برادەرەکانی جاروبار سەردانیان دەکرد. ئەوانیش کەسانی ئاسایی نەبوون، بەڵکو شاعیر و نووسـەر و مـوزیکژەنی ئیسـفەهان، یەزد، شـیراز و کاشـان بـوون. ئەوانە هەمیشە بە گەرمی بەخێرهاتنیان لێدەکرا، ئەوان لەگەڵ هۆشـەنگ خاندا لەنێو چیاکـان پیاسـەیان دەکـرد، تریاکیـان دەکێشـا، لە شـەڕابە دەسـتکردەکەی دەیـانخواردەوە و چێژیـان لە بەرهەمـی میوەجـاتی باخـاتەکەی وەردەگـرت. ئەوێش ڕێگای ترومبێلی بۆ گوندەکەیان نەبوو، ئەو تاکە کەس بوو جێبێکی کـۆنینەی هەبـوو، بەسـەر بەرد و گـرد و زوورگەکـانی دۆڵەکەدا هەڵـدەگەڕا. میوانەکـانی بە پـاس دەهـاتنە گونـدی جیریـا، لەوێشـەوە بـاقی ڕێگـاکە بـۆ هەوارەکەی، بە پشتی ئێستر سەردەکەوتن.



هۆشـەنگ خـان لە پـاریس خوێنـدبووی، لەوێ مـاوەیەکی زۆر ژیـابوو، بەڵام ڕۆژێکیان لە کەللەی دا و بارگەوبنەی تێکنا و گەڕایەوە، هاتەوە نێو باوەشـی چیاکان.

ئەو هەمیشە جزمەی درێژی لە پێ دەکرد، شـەقپەیەکی تایبەتی لەسـەردەنا و بۆنی پاریسییانەی لەخۆی دەدا. هەمـوو ڕۆژێـک سـەردەکەوتە سـەر دونـدی شاخ تا چۆنیەتی ڕۆژ لەکەل دەرچوون ببینـێ. ڕادیـۆ گەورەکەشـی هەمیشـە لەسەر وێستگەی فەڕەنسیزمان بوو، لەوێوە گوێی لە موزیـک و هەواڵـی نـوێ دەگرت.

هەر چەندە چوار ژنیشـی هەبـوون، بەڵام بە خـۆی بە تەنیا لە قەڵایەکە لەنێو کەلوپەلەکانی خۆیدا دەژیا.

ئەو شاخانەی دەورەی ساوجبلاخیان دابوو، تەلیسمدار بوون. لە شاخە هەرە بەرزەکەیاندا دەمی گڕکانێک هەیە، هەنووکەش دووکەڵی هەڵچوونە گڕکانە دێرینەکەی لێهەڵدەستێ. قەلاکەشی لەسەر ملی گردێکی یەکێک لە چیاکانە و بەسەر دۆڵە وشکەکەدا دەڕوانێ.

لەڕێگای چوونە قەلاکەدا، سێ ئەشکەوتی ڕازدارت دێنەپێش. ئەشکەوتەکانیش بەشێکن لە دیرۆکی دێرینی فارسی. لە قوڵترین خاڵی یەکێ لە ئەشکەوتەکاندا لە بەردێکی ئاساییدا پەیکەری شا شاپوور[200]، یەکێ لە شایە یەکەمینەکانی ساسانی لەسەر هەڵکەندراوە.

لەسە دیواری ئەشکەوتێکی دیکەشدا، نیگاری شێرێک کێشراوە، کە دژی پاشایەکی ئەخمینی[201] بە سواری گایەکەوە، لە شەڕدایە. لە ئەشکەوتی سێیەمیشدا دیمەنێکی شا داریوش، مەزنترین پاشای سەردەمی خۆی، لەسەر هەڵکەندراوە.

لە دەمی ئەشکەوتەکانیشدا ئالای کەسک بە دەقی پیرۆزەوە هەڵواسراون. زیارەتکەران بەسەر پشتی ئێسترەوە دێنە ئەو ئەشکەوتانە تا دیمەنەجوانەکان ببینن.

هەڵۆیەکانیش بەسەر ئەشکەوتەکاندا پێچ دەدەنەوە، چاودێری هەموو شتێک دەکەن، ئەوان لە لایەن زیارەتکەرانەوە وەک پاسەوانی ئەشکەوتەکان دادەندرێن.

❖

لەسەر تۆپکی شاخەکەدا زەنگێکی کڵێسایی لەسەر داندراوە. میوانەکان دەتوانن زەنگەکە لێبدەن، بەمجۆرە هۆشەنگ خان لە هاتنیان ئاگادار دەکەنەوە.

ئاغاجانیش زەنگەکەی لێدا و شەپقەکەشی ڕاوەشاند. "هۆۆۆۆۆۆۆۆ خاااااااااااااان!" دەنگی بەناو دۆڵەکە و لەژێر قەلاکەدا سەدای دایەوە.

---

[200] Shapor
[201] Achaemeniden

ئەو منـدالانەی لەبەردەم قەلاکە وازییـان دەکـرد، گوێیـان لە بـانگەکە بـوو، ئەوانـیش بە هەموویـانەوە بانگیـان کـردەوە: "ئەرێ هــۆ کــابرا تــۆ کێێێێێێێێێێێێێێێێێێێێێێێێیی؟"

- "ئاغـاجاااااااااااااااان!"

ئیدی منداڵەکان غاریاندایە نێو قەلاکە و هۆشەنگ خانیان لە هاتنی میوانەکە ئاگادارکردەوە.

ئاغاجان کە لغاوی ئەسپەکەی لەدەست بوو زیاتر هاتە پێش.

هۆشـەنگ خـانیش بە گورگەلۆقە غاریدا، شـەپقەکەی بۆ ڕاوەشـاندەوە. ئینجا ئاغاجان لە ئەسپەکەی دابەزی و باوەشی بە خانەخوێکەدا کرد.

- "برادەرە ڕاستەقینەکەم، بەخێربێی! ئای چ بەسـەردادانێکی لەپڕ و خۆشـە! ماڵەکەم ماڵی خۆتە!"

بەیەکەوە بە پێیان زیاتر لە دەروازەی قەلاکە چوونە پێش.

- "دەی دۆستەکەم، پێمبڵێ، چی تۆی گەیاندۆتە ئێرە؟"

- "باوەڕ بکەی یان نا، خەونێک منی هێناوەتە ئێرە." ئاغاجانیش وا وەڵامـی دایەوە.

- "چ خەونێک؟"

- "دوێنێ شەو لەگەڵ فەخری لە گوندی جیریا بووم، خەونم بە تۆوە بینی."

- "باشە بۆچی فەخریشت لەگەڵ خۆت نەهێنا؟"

- ئـاخر بەتەمـا نەبـووم بـێمە ئێـرە، لـێ کـاتێ ئەم بەیـانییە، خەونەکەم بیرکەوتەوە، خۆم پێنەگیرا و یەکسەر هاتم."

- "باشە خەونەکەت دەربارەی چیبوو؟"

- "کتومـت وردەکـاری خەونەکەم لە بیـر نەمـاوە، بەڵام کە لای زەنـگەکە وەستام، بینیم تۆ لە دۆڵەکە دەهاتیە خوار، ئیدی زەنگەکەم لێدا، تۆش گوێت لێنەبـوو، پەتەکەم زیـاتر ڕاکێشـا و زەنـگەکەم تونـدتر لێدا، تـۆ هەر ئـاوڕت نەدایەوە. تـا گەرووم وشـک بـوو هەر هـاوارم کـردو زەنگەکەشـم بێوچـان لێـدەدا، تـا هەمـووان بەدەر لەتـۆ گوێیـان لێبـوو. بـاقیەکەی دیکەشـم لەبیـر چۆتەوە."

- "من باقی خەونەکەت دەزانم ، دەی دوام کەوە." هۆشەنگ خان وای بە ئاغاجان گوت و سواری سەرپشتی ئەسپەکانیان بوونەوە و بەرەو دۆڵەکە لێیانخوڕی.



دۆڵەکە دۆڵێکی وشک بوو، تۆ بەدەر لە بەردی رەنگ قاوەییێکی تۆخ هیچت نەدەبینی ، لەوێدا هیچ ئاماژکەیەکی ژیان نەبوو. هۆشەنگ خان بەسووکی لە نشێوەکە دابەزی، تا بە تەواوی گەیشتە دامێنەکەی و لە ئەسپەکە هاتەخوار. بۆ گەیشتنە نێو قووڵایی دۆڵەکە ئەو پێش ئاغاجان کەوت.

- "لێرە خاکەکە ئەوەندە تینوە، تەنانەت کەنداوی فارسیش بێنیت و بەسەریدا بڕژێنی، تینوێتی دۆڵەکە ناشکێنێ. بەڵام بڕواش ناکەی، کە خاکوخۆڵەکەی چەند بە پیت و فەڕە. من خەونێکم هەیە، بۆ ئەوەی ڕۆژێک لەڕۆژان ئەم دۆڵە بکەمە باخ و ڕەزە بەهەشتەکانی عەدەن. من دەمەوێ شتێکت پێ نیشاندەم. ئەرێ بۆ شتەکە خۆت ئامادەکردووە؟"

- "بۆچی؟"

- "بۆ شتێکی ئازاربەخش، بەڵام لەهەمان کاتیشدا شتێکی جوان و نایاب."

هۆشەنگ خان بەسەر چەند گاشەبەردێکدا ڕۆیشت و ئاغاجانیش بە دوایەوە.

- "سروشت لێرە پەرجووی داهێناوە." ئەو وا لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت، "لێروکانە تۆ تەنیا خاکوخۆڵێکی وشک دەبینی، بەڵام لە پشت قەڵایەکە، خاکەکە نەرم و شێدار دەبێ. لەوێ ڕازەکەت پێدەڵێم. ئایا دەتوانی ئەوە پێشبینی بکەی، کە من لەژێر قەڵایەکەدا بێرمەئاوێکی گەورەم هەبێ.[٢٠٢]

- "بێرمە؟"

- "بەڕاستیمە، عەمباراوێکی سروشتی بۆ ئاو. منیش نازانم چۆن دروستبووە، یان ئاوەکەی لە کوێ هاتووە، لەوانەیە بناوانەکەی لە شاخەکانی باکوورەوە بێ، کە لەوێدا بەفری بێکۆتایی لێدەباری. ئەوەش نهێنی قەڵایەکەمە، کەسیش پێی نازانی، منیش هەر سێ ساڵێک دەبێ بۆم

[٢٠٢] بێرم: گۆل ، گۆم، عەمباراو، دەریاچە. وشەکە ناوی چەند گۆمێکی بەفراوە لە دامێنی شاخی هەڵگورد. هەر لەسنووری باڵەکایەتی و برادۆست ناوی بێرم هەیە. بەڵام بۆ ئەو شوێنەی لە ڕۆمانەکدا هاتووە، پڕبەپێستیەتی، چونکە لە زۆر ڕووەوە لەیەک دەچن. بۆیە لێرەدا بەکارم هێناوە. وەرگێڕ.

دەرکەوتــووە، ئەوکــاتەی بــرادەرێکم لە فەرەنســاوە هــاتبوو. میــوانەکەم وێنەگرێک بوو، حەزی لە کانی و سەرچاوەکانی ئاو دەکرد. بە گوریسێک خۆی شۆڕکردەوە نێو کانیاوەکەی ئێرە. کاتێکیش لەکانیاوەکە هاتەدەر، گوتی: "لێرە لەبن ئەو قەلایەدا زێڕ هەیە!"

- "زێڕ؟" منیش بەسەرسوڕمانەوە لێمپرسی.

- "ئاو، لێرە بێرمێکی مەزنی ئاو لەژێر ئەم زەمینە هەیە، بەهۆیەوە دەتوانی زێڕی پێبکڕی." برادەرەکەم وای پێگوتمەوە.

منیش هێشتا بەهیچ کەسم نەگوتووە، چونکە لە ئایەتوڵلاکان دەترسام، گەر هاتبا و پێیان زانیبایە، دەستبەجێ دەستیان بەسەر قەلایەکەم دادەگرت و منیشیان دەربەدەر دەکرد. تا ئەو کاتەی لەژیاندا بمێنم، ئەو ڕازە نادرکێنم، بەلام هەر بەدزییشــــەوە بە یــــارمەتی ئەنــــدامێکی خێـــزانەکەی تـــۆ، تاقیکردنەوەیەکم ئەنجام داوە."

- "کامە ئەندامی خێزان؟"

- "دوایی پێتدەڵێم. من ترۆمپا ئاوێکی بە هێز و لولەی درێژم کڕین. باقیەکەی بە چاوی خۆت ببینە. دەی چاوەکانت بنوقێنە، ئینجا دەتبەمە سەر ئەو شوێنەی، باسم بۆکردی. بەلام خۆت بە هێز ڕابگرە و دوام کەوە!"

ئاغاجانیش چاوەکانی نووقاندن، دیاربوو باوەڕیشی نەدەکرد. ئیدی ئەو ڕەز و باخێکی مەزن و بەرفراوانی هاتەپێش. ئەو باخەی بۆنی گوڵخونچەی بەهاری لێدەهات و بەهەموو ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە ئاودامان بوو، بەهەموو لایەکیشدا بلاوبووەوە، نەمامەکانیش پڕخونچە ببوون.

- "ئەمەیان بڕواناکری!" ئاغاجان وای گوت.

- "خاکی ئێرە هەمیشە بە هۆی گڕکانە دێرینەکە گەرمە و پڕ لە کانزایە. باخەکەش بە هۆی ئەو گاشەبەردە زەبەللاحانە پارێزراوە. ئەمەش بەشێکە لە خەونەکەم بۆ هەموو دۆڵەکە. تۆ دوێنێ شەو خەونێکت دیوە، بەلام کتومت وردەکارییەکەی نازانی. من واپێتدەڵێم کە تۆ باسی چی دەکەی. سەیری ئەوێ بکە، لەژێر ئەو درەختە، لە بەرامبەر گاشەبەردە ڕەنگ زەردەکەی ئەوێ. کوڕەکەت لەوێدا بەخاک سپێردراوە، من هێشتا کێلەبەردم بۆ دانەناوە، بەلام ئەو بەگوڵ بە خونچەگوڵ داپۆشراوە.

ئاغاجان قۆڵی هۆشەنگ خانی توند گرت.
- "تەنانەت چۆلەکەی ئاساییش ناوێری بێتە ئێرە،" هۆشەنگ خان وا لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت؛ "ئێرە پاوانی هەڵۆکانە. ئەوان بەسەر دۆڵەکەدا دەفڕن و ئێشکی لێدەگرن."
بە چاوی تەڕەوە ئاغاجان سەیری گۆڕە بە خونچەگوڵە پڕتەقاڵ و نارجە داپۆشراوەکەی ڕوانی. ئەوان بە چڕی شین ببوون، وا پاڵیان بەیەکدابوو دەترسان نەوەک گۆڕەکە ئاشکرا بکەن. فرمێسکەکانی ئاغاجان بەسەر ڕوومەتەکانیدا هاتنەخوار، ئیدی لە بەردەم گۆڕەکەدا چۆکی دادا و خۆڵەکەی ماچکرد:
"ئەلیف لام میم را
خۆی بەکاروبار ڕادەگا
هەر ئەویش ئەم زەمینەی ڕاخست
کێوی بە کۆڵەکە دانان
ڕووبارەکانی بەناودا هێنان
ئەوەی ئاسمانی بە بەبێ دینگە بەرزڕاگرت
ئەو کەسەی کە نابیندرێ
ئەوەی ڕۆژ و مانگی خستە بەردەست
هەریەکەشیان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دێن و دەڕۆن
تا ئەوکاتەی وادەی خۆی دێ
ئەو هەموو شتی ڕێکخستووە
شەو بەسەر ڕۆژ هەڵدەکێشێ
بە پێچەوانەشەوە،
لە هەموو بەروبوومێکیش
جووتێک، نێرومێیەکی لێ بەدیهێناوە
لەم زەویەدا گەلێ پارچە بە پەنای یەکدیەوە هەن
باخی ڕەزو ترێ
مەزرای دانەوێڵە و دارخورما
بەیەک ڕەگ یان بە قەدی زۆرەوە

**بەیەک ئاو پاراو دەبن**
**ئەو هەموو شتێک ڕێکدەخا**
**ئەو ئاماژەکانی ڕوون دەکاتەوە،**
**ئەلیف لام میم ڕا**[٢٠٣]



- "خان، من سوپاست دەکەم." ئاغاجان وای پێگوت؛ "سوپاس، ئەی دۆست. من لەناخی دڵمەوە ئاسوودەم."
- "هێشتا شتێکی دیکەشم ماوە، دڵخۆشت بکا." هۆشەنگ خان وای پێگوتەوە.
- "هیچ شتێک لەوە زیاتر دڵخۆشم ناکا."
- "لەوانەیە وا نەبێ. من جارێ پێت ناڵێم، من پشتگیریيم کرا، یارمەتیم لە کەسێک وەرگرت کە هێزی یەک فیلی هەیە. بەبێ پشتیوانی ئەو، ئەستەم بوو ئەو ڕەز و باخە لێبدەم. دەی لە گەڵم دێی؟ دەتەوێ بیبینی؟ ئەو لەپشت قەڵاکە ئێش بە تراکتۆرەکەی دەکا. لەوێ بە زەوییەکی نوێوە خەریکین، گوڵەبەڕۆژەم چاندووە. تۆوەکەی کابرای فەڕەنسی بۆی لەگەڵ خۆیدا بۆی هێنام. ئاخر گوڵەبەڕۆژەکانی ئێمە، لێرە لەنێو شاخەکەندا زیاتر لە مەترێک بەرز نابن، لێ ئەوانەی فەڕەنسی زۆر باڵا دەکەن. ئیدی زۆر نابا بە هەزاران گوڵەبەڕۆژە پێدەگا و دەنکی شیرین و نایاب بەرهەم دەهێنن. پارساڵ تاقیکردنەوەیەکمان کرد، ئەمساڵیش دەتوانین ڕۆنی خۆماڵی لە دەنکەکانیان دەربهێنین. ئەو پیاوەی کە هەنووکە نیشانتی دەدەم، زۆر دەسترەنگینە! ئەو بە ڕۆژ و شەو کاردەکا، زەوی دەکێڵێ، تۆوی پێوەر دەکا، ماشینەکانی

---

[٢٠٣] لێرەدا نووسەر پەنای بۆ چوار ئایەتە بەراییەکەی سورەتی (الرعد) بردووە، بەڵام ڕیزبەندییەکەی تێکداوە، دێڕ و نیوەدێڕەکانی تێکەڵکێش کردوون. بۆ تەواوی دەقەکە بڕوانە ئایەتەکان وەک خۆی: {المر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ (١) اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ (٢) وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٣) وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (٤)} وەرگێڕ.

کشتیاری چاک دەکاتەوە و ڕاوێژیش دەدا. من هەرگیز کرێکارێکی وا کارامەم نەبووە."

بە ڕێشمەی ئەسپەکان کە بەدەستیانەوە بوو، بە هێواشی چوونە ئەودیوی گردەکە.

کاتێکیش گەیشتنە دامێنە پڕ داروبارەکەیی قەدپاڵی گردەکە، هۆشەنگ خان ئەسپەکەی خۆی لەدارێک بەستەوە و گوتی: "بابچین لەهێکەوە بەسەری دابدەین، بۆیە بە ئەسپایی بڕۆ."

ئیدی ئەوان بەنێو دارەکاندا بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشتن، کە پیاوەکە کاری لێدەکرد.

"دەی لێرە بوەستە." خان بە سرتەیەکەوە وای بە ئاغاجان گوت.

ئاغاجانیش تەماشای کابرای سەر تراکتۆرەکەی کرد، لینەوەڕاما، ئەو شەپقەیەکی لەسەر بوو، بۆیە بەشێکی ڕووخساری دیارنەبوو. کابراش تراکتۆرەکەی تا لای دارێک لێخوڕی، ئینجا ڕایگرت و لێی دابەزی و بەرەو لای دارەکە ڕۆیشت، کە کەلوپەلەکانی لەبن دانابوون. هەڵسوکەوتی پیاوەکە و شێوازی ڕۆیشتنی بۆ ئاغاجان بەڵەد بوو.

خان زەدەخەنەیەک گرتی.

پیاوەکە دەستی دایە نانەکەی خۆی، لەسەر زەویەکە دانیشت، پشتی بە دارەکە دایەوە، سەرێکی هەڵبڕی، تیشکی ڕۆژ کەو تەسەر چاوانی.

- "ئەحمەد! خۆ ئەوە ئەحمەدە!" ئاغاجان وا بانگی کرد.

هەنگاوێکی دیکە چووەپێشەوە، زیاتر سەیری کرد، بەڵی هەڵەی نەکردبوو، ئەو ئەحمەد بوو، ئەحمەدەکەی خویان، کوڕی ماڵەکەیان، مەلای مزگەتەکەیان.

- "دەی بڕۆ لای، باوەشی پێدا بکە!" خان وای پێگوت.

یەک دوو هەڵۆش لەسەر ئاسمانی کێڵگەکە دەرکەوتن، خولێکیان بەسەر سەریان لێدایەوە.

ئاغاجـان چـووە نێـو وەردەکە[٢٠٤]. ئیـدی ئەحمەدیـش ئاغاجـانی بینـی بەرەو ڕووی دەهـــات. لە دوایيـــدا ئەويـــش لە شـــوێنی خـــۆی هەڵســـا و بە جۆشوخرۆشەوە سەیری دەکرد. ئاغاجان باوەشی کردەوە و لەئامێزی گرت.
- "هەر بەڕاســتی بــوویتە جووتیــار، جووتیــارێکی هــاوچەرخ، تەنــانەت تراکتۆریش لێدەخوڕی، بۆنی گازت لێدێ، دەستەکانت هی فیتەرن." ئاغاجان وای پێگـوت و لە خۆشـیانیش شاگەشـکە ببـوو؛ "دیـارە بـوویتە پیـاوێکی بە ئەزمـوون، تۆ زۆر ڕووی ژیانت بینین. ئای خودایە، سوپاس بۆ ئەو ساتە موبارەکبادییە."
ئەحـمەد لەبەر ئەوەی لەناکـاوە بەسـەریان دادابـوو، نەیـدەتوانی چـی بڵـێ، بەدەستە لەرزۆکەکانی چاوەکانی وشک دەکردنەوە.
- "دەی، کــوڕەکەم، هەمــوو شــتێک بــاش دەبــێ، مــن ســوێند دەخــۆم، کوێرەوەریەکە تێدەپەڕێ. مزگەوتەکەشمان بۆ دەگەڕێتەوە، ئینجـا دەتـوانی بێیتەوە حوجرەکەت." ئاغاجان وای پێگوت.
- "جارێکی دیکە ئەو نـایەوێ بێیتەوە مەلا." خان بە خەندەیەکەوە وایگوت؛ "جبە و مێـزەرەکەی بـۆ ئایەتوڵلاکـان فرێـدە. دەی وەرە، ئەو دەبـێ کاربکـا، دەچـین نـانی نیـوەڕۆ دەخـۆین، ئێـوە هەردووکتـان دەبـێ لەسـەر خـوانەکە ئامادەبن."
سەرســامانە، وروژاوانە، بەلام شــادامانانە ئاغاجــان لەگەڵ خانــدا گەڕایەوە قەلایەکە.

- "خان، تۆ برادەری ڕاستەقینەی. نـازانم بۆ ئەو هەمـوو چاکەیەی لەگەڵتدا کردم، چی بڵێم."
- "پێویست ناکا هیچ بڵێی، بەلام تۆ دەبێ شتێک بۆ من بکەی." خـانیش وا وەلامی دایەوە.
- "بە خۆشییەوە، دەی پێم بڵێ چیت بۆبکەم."
- "جارێ زۆرمان ماوە، هێشتاش کاتی زۆری بە بەرەوە ماوە."

---

[٢٠٤] وەرد: ئەو زەویەی کێڵدراوە.

کاتێکیش گەیشتنە قەلایەکە، ئاغاجان بە خۆشییەوە لە لایەن منداڵەکان پێشوازی لێکرا.

- "پێموایە دەرزەنێکت بێچوو ناوەتەوە." ئاغاجان وای پێگوت.

- "ئەوە نازانم،" خان بە پێکەنینەوە، "ئەوە دەبێ لە دایکەکانیان بپرسی."

خان ڕێنوێنی ئاغاجانی بۆ ژوورێکی شیکی دانیشتن کرد، کە نیوە مۆمی داگیرساو لە گوڵدانە شێوە تولپە کۆنینە کریستیالیەکانیان داندرابوون. چرایەکە تیشکی لە ئاوێنە ئەنتیکەکە ڕەنگ دەدایەوە. ژوورەکە بە باشی گەرم کرابوو، مافووری کۆنی ئێرانی لەسەر زەوی ڕاخرابوون، کە گەرم و گوڕێکی زۆرتریان بە ژوورەکە بەخشیبوو.

مۆبیلیاتی ژوورەکەش هی سەردەمی ڕینیسانس بوو[٢٠٥]، بەلام هێشتا نوێ دیاربوو. لە دۆلابە گەورەکەی کتێبان، هەم کتێبی فارسی و هەم فەرەنسیشی تێدا بوون.

- "هیوادارم هەفتەیەک بمێنییەوە." خان وایپێگوت.

- "تۆ قسەی دڵی من دەکەی. بە خۆشییەوە، بەلام پێمناکرێ. فەخری بە تەنیا لە جیریایە. ئەمرۆ چەند ژنێکی دێنە کن، ناشزانێ من هاتوومەتە ئێرە، من تەنها بە نۆکەرەکەم ڕاگەیاندووە کە دەگەڕێمەوە.

- "تێدەگەم، بەلام لێش ناگەڕێم بڕۆی. کەسێک دەنێرم فەخریش بهێننە ئێرە."

- "پێموایە هێشتا ئێرە بۆ ئەو زووە. ئەو تازە هەستدەکا کەمێ هاتۆتە سەرخۆی. من هەرگیز هەواڵەکەی ئەوێ شەوێم پێ نەگوتووە، کە تۆ تەرمەکەت لەگەڵ خۆتدا هێنا. من وا دەبینم هێشتا نایەوێ دەربارەی ئەو باسە، قسە بکرێ.

- "باشە، ئەوە نابێتە ئاریشە، کەواتە کەسێک دەنێرم، تا ئەوە ڕابگەیەنێ، تۆ ئەمشەو لێرە دەمێنیتەوە. خۆ ئەو دەتوانێ لای خوشکی بمێنێتەوە؟ تۆ نابێ ژنان هەر لەباوەشی خۆت ڕابێنی. دە لێگەڕێ با شەوێک بە تەنیا بخەوێ، بۆ ئەویش باشە وابێ." خان وای پێگوتەوە.

دوو پێشخزمەتچی خواردنیان لەسەر مەجمەیەکی زیوین هێنا.



[٢٠٥] لێرەدا مەبەستی لە ڕێنسانس لەوانەیە کۆنی و بەسەرچوونی ماوەکە بێ.. وەرگێر.

دوای نیوەڕۆکەی ئاغاجان گەڕایەوە ناو پاوانەکە و لەگەڵ ئەحمەددا پیاسەیەکیان بەناو شاخەکاندا کرد. قسەیان دەربارەی هەموو بویەرەکانی ڕابردوو کردن.
بۆ ئێوارەکەش کاتی نانی شێوان، هۆشەنگ خان ئاغاجانی بردە لای ژنەکانی، لەوێ چایە و کولیچەیان پێشکەش کردن.
لەوێش لە لای ژنە گەورەکەی نانی شێوانیان خوارد.
پاشان گەڕایەوە قەڵایەکە، خان ڕێنوێنی کرد بۆ ژووری میوانان، کە لە هەموو لایەکیەوە هەر مۆم بوو دادەگیرسا.
- "تکایە، ئەی میوانی شەرەفمەندم، فەرموو دانیشە." خان وای بە میوانەکەی گوت.
ئاغاجانیش یەکسەر هەستی کرد خەم دایگرت، ڕۆژە سەختەکەی باندۆری خۆی لەسەردانابوو. لێبڕاوانە سەیری پێش خۆی دەکرد و چاوەڕێی خان بوو. کەمێک دواتر خانەخوێکەش هات، بوتڵێکی بە دەستەوە بوو. بوتڵێک کە تەنکە تۆزێکی لەسەر نیشتبوو، لەسەر مێزەکەی دانا. لەنێو دۆڵابەکەشدا دوو پەرداخی شریت زێڕینی دەرهێنان.
- "ئەمشەو، هۆکاری تەواومان بۆ خواردنەوە هەن. شەوێکی جوانی خەتەبارانەیە، من ئەوە بە سیماتەوە دەبینم."
ئاغاجانیش، کە لەژیانیدا ئەلکحولی نەخواردبووەوە، بە بزەیەکەوە سەری نەخێری بادا.
- "من ناخۆمەوە."
- خۆت بە هەڵەدا مەبە. ئاخر تازە دەتەویست سوپاسم بکەی، بەڵام نەتدەزانی چۆن. شتەکەش زۆر سادەیە، لەگەڵ من دەخۆیتەوە و منیش سوپاسگوزاریەکەت قبووڵ دەکەم. گوێبگرە، من کۆنترین بوتڵم لە ژێر زەمینەکەوە بۆ تۆ دەرهێناوە، کە زیاتر لە 30ساڵە لەوێ هەڵگیراوە! بوتڵەکە هی ڕۆژگاری باوکمە. ئەو هەموو ساڵانە چاوەڕێی شەوێکی وام دەکرد، چاوەڕێی برادەرێک، پیاوێکی پیاو. کەمێ بوەستە، خۆ مەرج نییە دەمودەست وەڵام بدەیتەوە. من دەزانم شتەکە پەیوەندی بە بنەمایەکانتەوە هەیە، لێ دەمەوێ ئەو شەڕابە لەسەر شەرەفی کوڕەکەت، کە لەوێ نێژراوە و لەسەر

شەرەفی ئەحمەد بخۆینەوە کە بەساغ و سەلامەتی تراکتۆر داژوا. ئاخر ئەمە شەویکی گوڵبژێرانەیە، هەق نییە بەهۆی دینەوە بیشێوێنی. من پێکێکت بۆ تێدەکەم، تۆ بێدەنگ بە، ئەگەر پێکەکەم هەڵدا، تۆش هەڵیدە و بەیەکەوە دەیخۆینەوە."

هۆشەنگ خان سەری بوتڵەکەی بادا، بۆنی کرد: "ئەڵڵا ئەڵڵا، هەمووان دەیانەێ بخۆنەوە، بەڵام من دەمەوێ، تۆ ئەم شەرابەم لەگەڵدا بخۆیتەوە."

ئاغاجان بێدەنگ بوو. خان، سەرەتا تا بنی پێکەکەی دیار نەما بۆخۆی تێکرد، ئینجا دەستی دا پێکەکەی و بەنەرمی هەژاندی. "بۆنی بەهەشتیانەی شەرابی سوور، کە لە قورئاندا ناوی هاتووە، لەم شەرابەدا هەیە."

ئاغاجان بە بێدەنگی سەیری کرد.

- "وا سەیر مەکە،" خان وای پێگوت؛ "من هیچی شاشم نەگوتووە، خۆ هەر تۆ بەتەنیا قورئان ناخوێنیتەوە، منیش دەیخوێنمەوە، هەمووان بە شێوازی خۆیان دەیخوێننەوە. لە قورئاندا وشەی زۆر هەستیارانە دەربارەی بەهەشت، دەربارەی ئافرەتان هاتووە، کە لەوێدا خزمەت دەکەن، ژنانی شۆخوشەنگ، لێوەکانیان تامی شیر و هەنگوینیان لێدێ. ئەوان شەرابی خوداییت بۆتێدەکەن. لێرەش، دەی پێکەکەت بەرزکەوە، هەر ئەم شەرابەیە لە دواییدا لە بەهەشت پێشکەشت دەکرێ!"

ئاغاجان دەستی نەگەیاندە پێکەکەی.

- "من زۆر گوناحم کردوون،" خان وا لەسەر قسەکەی ڕۆیشت؛ "بەڵام تۆ نەتکردوون، منیش هەرگیز داوات لێناکەم گوناح بکەی. ئەم شەرابەم لە ترێی سوور، لە ڕەزی مێوی خۆمان چاک کردووە. لە ماوەی ترێ ڕنیندا، جوانترین کچ لە چیاکان دێنمە ئێرە تا ترێیەکەم بۆ بڕنن و گۆزە قەبە کۆنینەکانیش لە ژێرزەمیندا هەڵبگرن."

خان قومێکی لە پێکەکەی خۆی دا، تامی شەرابەکەی کرد و بە ئەسپاییەوە گوتی: "نایابە، باوەڕ ناکرێ، هەموو بەشێکی ئەم پیرە گرکانە، هەموو گەردیلەیەکی گەردوون لەم شەرابەدا هەیە. دەی ئاغاجان، دەست دەیە پێکەکەت!"

زیاتر لەوە هیچی دیکەی نەگوت، هەڵسا و ئاغاجانی بە تەنیا جێهێشت.

هەنووکە شەمشەکوێرەکان بەسەر زەویە پاوانکراوەکەدا فڕین، بەسەر تراکتۆرەکە، کە لە سەر بەرزاییەکە ڕاگیراوە. خان ئەحمەدی بینی، لەنێو ڕەزەکەدا دەڕوا، شتێکی لەسەر شان داناوە و بەرەو تەویلە هەڵیگرتووە. ئەو قومێکی دیکەی لەشەڕابەکە دا، گوێی لە دەنگەکانی شەوەکە گرت. هێشتا منداڵەکانی لە دەرەوەن، لەو تاریکییەدا یاری دەکەن. گوێی لە کیژەکانی بوو، لە تاریکیدا یەک بەدوای ئەوی دیکەدا غاردەدا. جاران ئەو لە پاریس دەژیا. پاریسی ساڵە هەژانەکان، ئەو ساڵانەی پارتە چەپەکان بەناو شەقام و کۆڵانەکاندا ڕێڕۆیشتیان سازدەکرد، ئەو ساڵانەی وجودییەکان لە ئەوپەڕی هەرمێنی خۆیاندا بوون و سیمۆن دی بۆڤواریش بە خۆی و کتێبەکانی، پاریسی لەبن هەنگڵدا بوو. ئەو لەوێ زۆرجار دەکەوتە دوای خۆشەویستییەوە. لەوێ و لە لایەن دۆستەکانییەوە وەک شازادەیەکی ئێرانی پێشوازی لێدەکرا. دەکرا بۆ هەمیشە لای برادەرەکانی پاریسی بمێنێتەوە، بەڵام دوای ماوەیەک ڕەوشەکە گرژ بوو. هەستیکرد چیدیکە لەوێ بەختیار نییە، غەریبی نیشتمانی کرد، غەریبی گردەکانی سەردەمی منداڵی و غەریبی ژنانی چیانشین. پاریس جوان بوو، بەڵام جوانییەکە بۆ ئەو نەبوو. ئەو پاریسی خستە نێو یادەوەرییەکانی و بۆ هەتا هەتایە گەڕایەوە قەڵایەکەی.

خان بە پێکەکەی دەستی، زیاتر بە ڕێگای بەردەمی ماڵیدا ڕۆیشت. بۆ ساتێکیش ئاوڕێکی دایەوە، بینی ئاغاجان لە بەردەم پەنجەرەکەدا وەستاوە. تۆ بڵێی فڕێکی لێدابێ؟ ئەو ویستی جارێکی دیکەش سەیر بکاتەوە، بەڵام واشی نەکرد. ناچاوەڕوانییانە بەشێک لە خەموخەفەتە کۆنینەکەی دوا ساڵەکانی پاریسی بۆ گەڕایەوە، ئەو حەزیشی نەدەکرد لەگەڵ خەمەکانی بەتەنیا بێ، بۆیە چووە ماڵی ژنە هەرە گەنجەکەی، کە لەباوەشیدا هەستی بە ئاسوودەی و ئارامی دەکرد. لە قاپی ماڵی ژنەکەی دا، ئەویش دەرگای بۆکردەوە.

- "ئەرێ بۆ وا خەمبار دیاری؟"
- "ئەوە بەشە خەمی برادەرێکمە." وای وەڵامدایەوە.

ئیدی ژنەکەی هیچی دیکەی لێنەپرسییەوە، دەستی گرت و لەگەڵ خۆی بردە ناو جێگا و سەری پیاوەکەی لەسەر کۆشی خۆی دانا.



بۆ بەیانییەکەی پیرە خزمەتچییەکە ڕینوێنی ئاغاجانی بۆ گەرماوە شاهانەییەکە کرد. ئەو چووە نێو گەرماوەکە، هەستی بە گەرمی بەردەکانی بندینەکە[206] کرد، دوای شەوێکی نائاسایی، ئەمە ساتێکی بەختەوەری بوو. ئاو تا ئەژنۆکانی هات، ئیدی خۆی ژێر ئاو کرد و بردەبردێکیشی لێوەهات:

وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ (١٠)
فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ (١٢)
عَلَى سُرُرٍ مَوْضُونَةٍ (١٥)
مُتَّكِئِينَ عَلَيْهَا مُتَقَابِلِينَ (١٦)
يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ (١٧)
بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ (١٨)
لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنْزِفُونَ (١٩)
وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ (٢٠)
وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ (٢١)

{تیرەیەکیش لەپێشەوەن، وەپێشکەوتوون.
لەباغاتی تژی لە خۆشیدا دەژین.
لەسەر تەختی جەواهیربەند،
هەمبەر بەیەک پاڵ دەکەڤن،
تازە لاوی هەمیشە لاو، لەدەورەیان دێن.
بەزەرک و بە تونگە و پیاڵە، بادەی ڕەوان لەسەرچاوەیان دەدنێ.
نە لەخورما سەریان دێشێ و نەئاوەزیش لەدەست دەدەن.
میوەجاتیش هەر کامی هەڵیدەبژێرن.
گۆشتی مەلیش لەوانەی ئارەزووی دەکەن..}



ئەو خۆی لەنێو ئاوەکەدا نقووم کرد، تا ئاوەکە گەیشتە لێواری گەرماوەکە. ئەو دەمی بەش کردەوە[207]، بۆ ماوەیەک لەژێر ئاوەکەدا مایەوە، هەروەک ئەوەی گوناحێکی کردبێ.

---

[206] بندین: ناخ، بنی بنەوە.
[207] بەشکردەوە: لێککردەوە.

کاتێکیش سەری لەنێو ئاوەکە دەرهێنا. هەناسەی هەڵکێشایەوە و بەهەموو هێزی خۆیەوە هاواری کرد: "باخەکانی بەختەوەری!"

پاشان جلەکانی کردنەوەبەر، کڵاوشاپۆکەی خستەوەسەر و ئاماژەی بە خزمەتچییەکە کرد، تا ئەسپەکەی بۆبێنێ. خۆی هەڵدایە سەر زینەکە و ڕکێفی لێدا و بە نەرمەغار تێیتەقاند و بۆی دەرچوو.

## ئەو، ڕووناکی لەبان ڕووناکییە

چیرۆکی خانووەکەی مزگەوتێ، هێشتا کۆتایی نەهاتووە، بەڵام ئەویش هەروەک ژیان، هەموو کەسێ دەبێ لە شوێنێک بێتەدەر.
ڕستەیەک هەیە، لە کۆتایی هەموو چیرۆکێکی فارسییدا دووبارە دەبێتەوە: "چیرۆکەکەمان لێرەدا کۆتایی هات، بەڵام خۆ هێشتا قەلەکە نەگەیشتۆتە سەر هێلانەکەی خۆی."



ڕۆژێکیان کاتێ ئاغاجان لەبازاڕ بوو، نامەیەکی سەرنجڕاکێشی بۆهات. نامەیەک لە هەندەرانەوە بۆی نێردرابوو. ئەویش سەرسام بوو، ئاخر ماوەیەک بەسەرچوو بوو، کە زەرفەنامەیەکی لە دەرەوە بۆهاتبوو. بەڵام ئەم نامەیەیان جیاوازە، ئەو پوولی سەر نامەکەی نە ناسییەوە. پوولی ئاڵمانی هەمیشە بە شکۆن، وێنەی ڕووخساری موزیسیانێک، فەیلەسووفێک یان وێنەی باڵەخانەیەکی مێژوویی لەسەرە. کەچی ئەم پوولە ڕەنگینە، دەسکە گوڵاڵەسوورەیەکی لەسەرە.
ئاغاجان دەستی دایە وردبینەکە و لە پوولەکە وردبووەوە. لەدڵی خۆیدا گوتی، لەوانەیە لە سویسراوە هاتبێ، جارێک لەجاران بارە مافوورێکی بۆ ئەوێ ناردبوو.
ئەو هیوایەکی بە زەرفە نامەکە پەیدابوو بەڵام کێ چوزانێ، هەواڵی ناخۆش هەمیشە لە قوژبنێکەوە سەرهەڵدەدا. ئەو نامەکەی لەسەر مێزەکە دانا و داوای لە پێشخزمەتەکەی کرد پیاڵەیەک چای بۆبێنێ.

کاتێکیش چایەکەی بۆهات، دەستی دایە ڕاستەی زەرفلێککەرەوە، بە ئەسپایی سەری زەرفەکەی هەڵپچڕی. نامەکە بە فارسی و بەقەڵەم پاندانیش نووسرابوو:

"خۆشەویستم ئاغاجان، سەلام![208]
سلاو لەناخی دڵمەوە.
سلاوێک بۆنی غەریبی ماڵەوەی لێبێ.
ئەی ئاغاجانی خۆشەویست و قەدرگرانم، من لە وڵاتێک نامەت بۆ دەنووسم، ڕۆژێک لەڕۆژان بیرم لێی نەکردبووەوە، لێیدا بگیرسێمەوە. خۆ ئەگەر سەیری ناو چاوت بکەم، ئەوا دەڵێم کە خواستی خودا بوو من لێرە بم، بەڵام ئەگەر بە گوێرەی وشەکانی خۆم بێ، ئەوا ڕێکەوتی بەسەریەک کەڵەکەبوو، منی گەیاندە ئێرە. ئیدی ڕەوش وا ڕۆیشت و تۆش منت وافێر کرد شتەکان وەک خۆیان وەربگرم.
من دەبێ پێ لەوەبنێم، کە ئامۆژگاریەکانی تۆم هەمیشە وەک ملوانکەیەکی دێرین لەمل کردووە.
وشەکانی تۆ هیوایان بەمن بەخشی و یارمەتیان دام تا بژیم و درەباز بم، بۆ ئەوەی ژیانێکی نوێ بنیاتبنێم، بۆئەوەی زیاتر هەنگاوبنێم و کورێکی ڕاستەقینەی خانووەکەی مزگەوتیم لێدەربچێ.
خۆشەویستم، ئاغاجان؛
من تاسەی ئەو ڕۆژە دەکەم، جارێکی دیکە لەبەر دەگای ماڵی خۆمان بوەستم و دەرگاکە بکەمەوە و بێمەوە ژوور. هێشتا کلیلی دەرگاکەشم لەبەرک دایە.
تۆ منت فێرکرد، هەرگیز لە بەردەم سەختییەکاندا چۆک دانەدەم، بەڵکو ماندوونەسانە کاربکەم و حەوسەڵەم لەدەست نەدەم. گوێم لە ئامۆژگارییەکانت گرت.
من ماڵەکەی خۆمانمان بە جێهێشت، هەرگیز بۆی نەگەڕامەوە. هەنووکەش لێرە دەژیم، خەونیش هەر بەو ڕۆژە دەبینم، بەیەکەوە بە بەردەم کۆڵانەکەی ماڵماندا پیاسە بکەین. ئەم ڕۆژەش هەر دادێ! هەر دەبێ دابێ، ئاخر خۆ تۆ

---

[208] Salam

پێتگوتم، دەبێ هەمیشە خەون ببینم و پێویستە خەونەکانیشم بێنە دی. منیش هەروا دەکەم. مـن نهێنیـی وام هەن کە تەنیـا لە ئـازادی شـارەکەدا دەتـوانم بیدرکێنم.

ئێوارەیەکیان دەبێ تۆ لێرە بی، ئەوسـا برادەرەکانم بانگ دەکەم و پێتیـان دەناسێنم. من ئەوەنـدە لەگەڵ ئەواندا باسـی تـۆم کردووە، وایـان لێهاتووە بەقەد من تۆ بناسن.

هۆ مامە خۆشەویستەکەم، بەردەوام نامەت بۆ دەنووسم. ساڵەکانی ڕابردوو، هیچم نەکرد مەگەر هەر دارشتنەوەی چیرۆکەکانم نەبێ. ئەوەشم بۆ تۆ و بۆ وڵاتەکەم کردووە.

زمانی نووسینەکەشم گۆڕیوە، ناشزانم ئاخۆ پێیەوە شادمان بم یان پاساوی بـۆ بهێنمەوە. ئیـدی بە یەکجـار ڕەوتەکە واهـات. ئەوەش بـووە فریادڕەسـم. ئەمە تاکە ڕێگا بوو، کە ئازاری تۆ و هـی وڵاتەکەمـی پێ بهێنمە سـەرکاغەز. من زمانی نووسینەکەم گۆڕی، بەڵام هەمیشە هەوڵم داوە زمانی شیعرییانەی زمانە کۆنە قەشەنگەکەمان لە شوێنێکی شایستەی چیرۆکەکانمدا دابنێم.

مامە خۆشەویستەکەم، من زۆر خەون بە ماڵەکەمان و بە ئێوەوە دەبینم، بە شێوەیەک کە لەڕاستیدا نەوەک لێرە بەڵکو لەوێ، لە خانووەکەدا بژیم.

تۆ نـابێ بمـری. تـۆ دەبێ بمێنیتەوە تـا هەمـووان دەڕۆن و تـا هەمـووانیش دێنەوە.

## شاباڵ

بەشـەو ئاغاجـان چـاکەتەکەی کـردەبەر، کڵاوەکەی خستەوەسـەر، دەسـتی دایە گۆچانەکەی، ژووری کارەکەی جێهێشت و هاتە نێو حەوشە.

کەشـەکە سـارد بـوو، حەوزەکە بەسـتبووی، لـق و پـۆپی دارەکـان بە تەنـکە بەفرێک داپۆشرابوون.

ئاسمان شینێکی تۆخ بوو، ئەستێرەکانیش بەرەو مەککە دەکشـان. ئاغاجـان بە ئەسپایی بەرەو پەیژەکان ڕۆیشت، لەوێوە بە هێواشی لێوەسەر بانەکە کەوت.

قەلەباچکە پیرەکەی مزگەوتێ، کە جێ پێیەکانی ئاغاجانی ناسینەوە، یەک جار قیغاندی، بەڵام هەر لەسەر هێلانەکەی خۆی لەژێر گومبەزەکەدا مایەوە و چاودێری ئاغاجانی کرد.
"قەلەکە، سوپاس! خەم مەخۆ وریا دەبم." کاتێک بەلای گومبەزەکەدا بۆ مزگەوتێ تێپەڕی وای بە قەلەکە گوت.
قەلەکە قیغاندی.
"هۆ قەلێ، سوپاس. زۆر باشە کە منت ناسییەوە. نەخێر، گڵۆپەکە داناگیرسێنم. هۆ قەلەکە، ژووری گەنجینەکە نهێنیی ئێمەیە."
ئەو دەستی بە دارەکانەوە گرت، پێهاتەخوار و چووە نێو مزگەوتێ. لەوێ بە تاریکی ڕۆیشتە لای گۆڕەکانی سەردابەکە و بە هێواشی دەرگاکەی کردەوە. ئەو هیچ شتی لەپێش چاوی خۆیدا نەبینی، دوودڵ بوو ئاخۆ گڵۆپەکە هەڵبکا یان نا. گڵۆپەکەشی پێنەکرد، لە پەیژەکانی ژێرزەمینەکە دابەزی، هەر بەگوێرەی هەست، ڕۆیشت ڕۆیشت تا بەر قاپی ژووری گەنجینەکە.
لەوێ خامۆشییەکی تەواو بوو. تەنها گوێت لە تەپەی پێی و تەپەی گۆچانەکەی دەبوو.
بۆ ساتێک دەنگەکە نەما. ئاغاجان کلیلی لە کونی کیلۆنەکە بادا، هێندەی نەبرد کرتەیەک لە کیلۆنەکە هات و دەرگا سادە قورسەکە کرایەوە.
بیچمی ئاغاجان ئەوەندە تارماییانە بوو لە ڕەشایەتی شەو جیا نەدەکرایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لێوەژوور کەوت و لەگەڵ تاریکاییەکەدا یەکانگیر بوو.
لەسەر مافوورە سوورەکە تا لای دوا دۆلابی ڕیزەکە ڕۆیشت. لەوێدا نامە قەدکراوەکەی شاباڵی لە باخەڵی دەرهێنا و هەندێ چەمایەوە تا بیخاتە نێو باولی ئەرشیفەکە. ئینجا بێدەنگییەکەی بە بردەبردێک شکاند:
اَللّٰهُ نُورُ
مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ
الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ
الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ
يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ
يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ

نُورٌ عَلَى نُورٍ[٢٠٩]

{ئەو ڕووناکییە
ڕووناکی ئەو وەک تاقێکە چرای تێدا هەڵکرابێ
چراکە لەجامێکدا بێ،
جامەکە وەک ئەستێرەیەک تروسکەی بێ
ماکی چرا بە زەیتوونێکی ممبارەک دەستکەوتبێ،
هەر لەخۆیەوە تیشک دەدا
ڕووناکی لەبان ڕووناکی}

کۆتایی

---

[٢٠٩] لێرەشدا ئایەتی 35ی سورەتی (النور)ی بە ڕیزبەندی خۆی نەهێناوەتەوە، دەقەکەشی بەم جۆرەیە: ﴿ اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ ۖ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ ۗ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ ﴾ النور: ٣٥ وەرگێڕ.

## تێبینینامەی ڕۆماننووس

چەند بەندێک لە خانووەکەی مزگەوتێ، هەروەک سەرەتای چەند سورەتێکی قورئـان، بە پیتەکانی ئەلیف بای عەرەبییەوە دەست پێدەکەن. لە یەکەم خوێندنەوەدا، ئەم پیتانە هیچ ناگەیەنن، بەڵام لە جیهانی ئیسلامییدا چەندان کتێب دەربارەی ئەو پیتە جیاجایانە نووسراون. ئەم پیتانە بە ژمارەی نهێنی، بە کۆدی گەردوون دەزاندرێن. بە گوێرەی هەندێ لە ئیمانداران ئەو پیتانە دەروازەی کلیلی ڕازی بوونەوەرن.

گێڕانەوەی چیرۆکی بەندی "ماسییەکان" لەسەر بنەمای بڕگەیەکی چیرۆکەکانی نووسەری ئێرانی جەلال ئال ئەحمەدەوە هاتووە.

شیعرەکانی بەندی "خێزان" لە کتێبی "کاروانێک لە ئێرانەوە" کە لە لایەن J.T.P de Bruinwerg ەوە وەرگێردراون، هاتووە.

هەموو بڕگەو ئایەتەکانی قورئـان، کەم تـازۆر لە کۆنتێکستەکەی خۆی دەستکاری کراون. من لەو بابەتە لە کۆمەڵێک دەق و ڕاڤەدا گەڕاوم. سوپاس و ڕێزم بۆ بۆ Fred Leemhuis کە بە شێوەیەکی نایابانە قورئانی وەرگێڕاوە و دەزگای چاپ و پەخشی Fibulaش بڵاوی کردۆتەوە.

هەرچەندە چیرۆکەکانی خانووەکەی مزگەوتێ لەسەر ڕوداوە مێژووییەکان هەڵهێنجدراون، کە دەکرێ هەموو ناوەکان و چیرۆکەکان ڕاستی بن و بەگوێرەی ڕێساکانی ئەدەبیات بخوێندرێنەوە.

قادر عەبدوللا

## چەند سەردێڕێک لە ژیاننامەی وەرگێڕ

- لە ١٩٦٨ لە گوندی گرتک لە دۆڵی ڕوستێی دەڤەری باڵەکایەتی لە دایک بووە.
- لە ١٩٨٨دا بە کالۆریۆسی لە قانون لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- لە ١٩٩٧ەوە تا ٢٠١٢ ئاوارەی ئەوروپا (هۆڵەندا و بەریتانیا) بووە.
- لەپاڵ زمانی زگماکدا؛ زمانەکانی عەرەبی، هۆڵەندی و ئینگلیزی دەزانێ.
- لە ١٩٨٦ەوە هەوڵی نوسینی داوە. تا ئێستا دە کتێبی لە زمانەکانی هۆڵەندی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاون. دەیان وتار و لێکۆڵینەوەی قانونی سیاسیشی بڵاو کردونەتەوە.

## چاپکراوەکانی وەرگێڕ

١. نهێنییەکانی مۆساد، نوسینی گۆردۆن تۆماس، وەرگێڕان لە زمانی هۆڵەندییەوە، سێ جار چاپکراوەتەوە؛ چاپی یەکەم ٢٠٠٨ چاپخانەی هێڤی، هەولێر. چاپی دووهەم دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەلات، هەولێر ٢٠١٤. چاپی سێهەم ڕۆژهەلات ٢٠١٦.
٢. مادلین ئۆلبرایت، سیاسەتی ئەمریکا و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سەنتەری نما ٢٠٠٩، هەولێر.
٣. داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل، نوسینی ڕۆبەرت سەنت یۆهن، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپخانەی هێڤی ٢٠١١، هەولێر.
٤. کوردستان لە نێوان سیڤەر و سنورە دەستکردەکاندا، نوسینی: هیسەر لیهەر واگنەر. مێژوو. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە. چاپی یەکەم؛ لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی هەولێر ٢٠١٣. چاپی دووەم، ئاوێر ٢٠١٥.
٥. وەرزێکی سپیی وشکوبرینگ، ئەندریێ برینک. ڕۆمان. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٣.
٦. ژیانی من، چۆن ئیسرائیل دامەزرێنرا؟ گۆلدا مایەر، یاداشت، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر. ٢٠١٤.
٧. ئینفێرنۆ، دۆزەخ، دان براون، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.
٨. شەرەف، ئەلیف شەفەق، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.
٩. یاخیبوون، مناحیم بێگن ، یادەوەری، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر 2016.

حسین سجادی قائمقامی فراهانی، دوای شەهیدبوونی دوو برادەری چەپی کورد بە ناوی قادر و عەبدوللا، واز لە ناوە دووروردرێژەکەی خۆی دێنی و ناوی ئەوان دەکاتە ناو و پاشناوی خۆی و دەبێتە قادر عەبدوللا.
نووسەر لە ١٩٨٨ لە هۆڵەندا دەبێتە پەنابەر. زیاتر لە بیست کتێبی بە ڕۆمان و غەیرە ڕۆمان بە زمانی هۆڵەندی نووسیوە.
شاکاری (خانووەکەی مزگەوتێ) بە یەکێک لە باشترین دە ڕۆمانی هۆڵەندی دادەندرێ.
ڕۆمانەکە بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش ڕووداوەکانی سەردەمی ڕووخانی ڕژێمی شای ئێران و هاتنی ئایەتوڵلاکانی کۆماری ئیسلامیمان بۆ دەگێڕێتەوە.
ڕۆمانەکە وەرگێڕدراوەتە سەر زۆرترین زمانە زیندووەکانی جیهان.



KADER ABDULAH

# THE HOUSE OF THE MOSQUE

T: SHAFIQ H. KHIDR



نرخ: ١٠٠٠٠ دینار